


# حەلاڵ و حەرام لە ئیسلامدا

نوسەر:
د. یوسف قرضاوی

وەرگێڕ:
مامۆستا ملاحمەئەمین حمەکریم




# حەڵاڵ و حەرام لە ئیسلامدا

مؤلف: د- یوسف قرضاوی

مترجم: ماموستا مەلا حمە ئەمین حمە کەریم

لە بلاّوکراوەکانی کتێبخانەی رۆشنبیر سلێمانی




Qaradawi, Yusuf
قرضاوی، یوسف، ۱۹۲۶ - م.
حەلال و حەرام لە ئیسلامدا/ تألیف یوسف قرضاوی؛ ترجمه حمەئەمین حمه کریم رسول. - تهران: احسان، ۱۳۸۲.
۳۲۸ ص.
ISBN 964-356-269-7
کردی.
فهرستنویسی بر اساس اطلاعات فیپا. عنوان اصلی: الحلال و الحرام فی الاسلام.
کتابنامه به صورت زیرنویس.
۱. حلال و حرام. ۲.فقه شافعی — فتواها.
الف. رسول، محمدامین محمدکریم. ب. عنوان.
BP۱۷۷/۸۰۴۷ح۴ق
۱۳۸۲
۲۹۷/۳۳۳
کتابخانه ملی ایران
۱۶۱۸۳-۸۲م



فروشگاه شمارهٔ ۱: تهران - خیابان انقلاب - روبروی دانشگاه - مجتمع فروزنده - شماره ۴۰۶ - تلفن: ۶۹۵۴۴۰۴
فروشگاه شمارهٔ ۲: تهران - خیابان ناصر خسرو - کوچه حاج نایب - شمارهٔ ۱/۱۱ - تلفن: ۳۹۰۲۷۵۰
صندوق پستی: تهران ۳۸۵ - ۱۱۴۹۵

ناوی کتێب: حەڵاڵ وحەرام لە ئیسلامدا
نووسینی: د. یوسف قەرزاوی
وەرگێرانی: مەلا حمە ئەمین حمە کەریم
بڵاوکار: نەشری ئیحسان - تاران
نۆرەی چاپ: یەکەم - ۱۳۸۲ هـ. ش - ۲۰۰۳م
تیراژ: ۳۰۰۰ دانە
ژمارەی نێونەتە وایەتی: ۷-۲۶۹-۳۵۶-۹۶۴

لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی رۆشنبیر سلێمانی

## بەشی یەکەم

بسم الله الرحمن الرحيم

إنّ الحَمْدَ للّه نَحْمَدُه وَنَسْتَعِينُه ونَسْتَغْفره، ونَعُوذُ باللهِ مِن شُرور أَنْفُسِنا وَمِن سَيِّئات أَعْمالِنا ، مَنْ يَهدِ الله فَلا مُضِلَ لَهُ ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلا هَادي لَه . الصَّلاة وَالسَّلام على أَفْضَل خَلْقِ الله سَيِّدنا مُحَمد وَعَلى آله وَصَحْبه أجْمَعين .

وە لە پاشاندا " ئێمە هەستاین بە پێشکەشکردنی ئەم چاپە لەم کتێبە بە بەهاو ناوازەیە ، کە بە حەلاّلی ( ١٢ ) جارو بەحەرامی و بەهۆی دەست پیس و ناپاکانەوە" چەندجارێك چاپ کراوە.

گومانیشی تیادا نییە ، ئەمە ئەو کتێبەیە کە گەلی موسڵمان بەدەستی هێناوە ، چەشنی مرۆڤێکی تینوو ئەگات بەئاوێکی ساردی سازگار ، بەهۆی دەستگرتنی تەواوی کۆمەڵێك بەئاینەکەیانەوە لەچاولێکەری نابینایانەو، دۆگما بوون لەسەر گوفتاری پیاوان ، چونکە زانیارن بەوەی کە خوای گەورە ، مرۆڤی پابەند کردووە بە قورئان و سوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ کە هەردووکیان بەڵگەن لەسەر بەدیهێنراوانەوە.

وەئەم کتێبە بەهەموو ئەوانەی گرتوویەتیە خۆ ـ ئەم میتۆدە ئەنوێنێ بێگومان زۆرێك لە قەڵەمو زمانە دڵسۆزەکان هەندێجار هەستاون بەوەی کە ﴿غاية المرام في تخريج احاديث الحلال والحرام﴾ کە لەدانانی زانای فەرموودەناسی بەناوبانگ (شێخ محمد ناصرالدین ئەلبانی) ، پێی هەستاوە ، هەندێ جاریش مەبەستدار بووە بەوەستانەوە بەرامبەر کتێبەکەو نووسەرەکەی ، من گومانم وەهانییە کە ئەو دژایەتی‌یە شاراوەیەی هەندێکیان بۆ دانەر هەیانە ، بۆ خودی ئەو زانا گەورەیە بێت ، بەڵکو ئەو دژایەتی‌یە بۆ میتۆدە سەربەستەکەیە ، کە دەردراوی گرێی چاولێکەرییە لەزۆربەی گوفتارەکانی ئەو بەرەنگارانەدا جگە لەم دەستەواژانە شتێکی دی نادۆزییەوە: زانای فلانی سەرپێچی کرد ، یاخود فیسارە نووسەری ناسراو ، یاخود تۆ پابەند نەبوویت بە مەزهەبی یەکەم یان دووەمەوە ، بەبێ هیچ لارییەك لەسەر ئایەتێك یاخود بەڵگە هێنانەوە بە فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ ، یاخود" تەنانەت گەڕانەوە بۆ وتەی پێشەوایانی پێشینی ئەم میللەتە.

ئەمە ئەڵێم ، لەکاتێکدا بێگومانم کە دانەر ـ خوای گەورە پارێزگاری بکات

ـ بەڕاستی هەموو تواناو کۆششێکی خۆی خستووەتەگەڕ بۆ گەیشتن بەڕاستی. گەر پێکاندی ، ئەوا دووجار پاداشتی هەیە ، وەگەرنا ئەوە بە هەر جۆرێك بووە پاداشتێکی دەست ئەکەوێت ، ئەمانەم وت و پێشم وانییە کە دانەر لە هەموو بۆچوونێکدا پێکابێتی ، بەڵکو هەندێ جارو لە هەندێ بریاردا ئەشێت دووچاری هەڵە بووبێت ، بەڵام ڕەخنەگرانی جوزئیات ، بەهەمان چەشنی دانەر، هەندێ جار سەرکەوتوون لە رەئییەکاندا و ، هەندێ جاریش بەپێچەوانەوە ، بەڵام دوژمنانی ئەم میتۆدە لەنێوەندیاندا پابەندی چاولێکەرییەکی نابینایانە بوون بۆ هەموو ئەوانەی پێش خۆیان دۆزیویانەتەوە لە کەسایەتی چەرخەکانی کۆتایی ، بێگومان ئەوانە لە هەموو حاڵەتێکیاندا لە ڕاستی دوورکەوتوونەتەوە.

دەستی پاڕانەوەمان بەرەو بارەگای پەروەرگار بەرز ئەکەینەوە" خوای گەورە! ئەم میللەتە بگەڕێنێتەوە بۆ سەر ئاینە بە بەهاکەی ، و ڕێبازە راستەکەی ، بە لەئامێز گرتنی قورئان و وەرگرتنی سوننەتی ڕەسول ﷺ.

ئەو خاسییەتەی کە ئەم چاپەی لە چاپەکانیتر پێ جیادەبێتەوە ئەوەیە کە هەموو فەرموودەو ئاپارەکانی گەڕاندوەتەوە بۆ کتێبی ﴿ غاية المرام في تخريج احاديث الحلال والحرام ﴾ کە لە نووسینی زانای بەناو بانگی فەرموودەناس ( شێخ محمد ناصرالدين ئەلبانی ) بە ژمارەی فەرموودەکانەوە.

ئەمەش ئاسانکارییەك بۆ خوێنەری بەڕێز فەراهەم ئەکات بۆ زانینی پلەی فەرموودەکە بەشێوازێکی بەر فراوان ، وە سوودمەند بوون لە تەعلیقاتی (محمد ناصرالدين ئەلبانی) لەسەر بۆچوونەکانی مامۆستا قەرضاوی.

ئەمەش وا لەخوێنەر ئەکات ، کە لە میانەی راجیاوازیی نێومندهەردوو ئەلبانی و قەرضاوی یاخود هاودەنگییان ، سوودو کەڵکی بۆی تیادابێت ، چونکە بێگومان هەردوو زانای پایەبەرز هەموو تواناو تێکۆشانێکی خۆیان خستووەتە گەڕ بۆ گەیشتن بەڕاستی ، خوای گەورە پاداشتیان بداتەوەو ، خۆیان و زانیارییان زیاتر سوودمەندبێت.

بێگومان ئەوەی لە هەندێ لە چاپەکانی پێشووتری کتێبی ﴿ الحلال والحرام في الاسلام ﴾دا هاتووە ، دەرهێنانی فەرموودەکانە لەلایەن (شێخی ئەلبانییەوە) بۆ ئەوەی ئاماژە بە ژمارەی فەرمودەکان بکات.

لەڕاستیدا دەرهێنانە چاپکراوەکان بۆ فەرموودەکان لەحاشییەی

کتێبەکەدا خاوەکانیان مامۆستا قەرزاوییە، جگە لەژمارەی ئامارە پێکردنەکانی بۆ (تخريج الحلال والحرام) وە (محمد ناصرالدين ئەلبانی) شتێکی تێدا نییە.

سەرەتای ئەم هەڵەیە لەکاتێکدا کەوتەوە کە ئامادەبوونی خۆم لەو کاتەدا نەبوو ئەمەش فەزڵی خوای گەورەیە تکاکاری بەردەم بارەگای پەروەردگارێك کە لەپابەند بوون پێوەی بێهۆشمان نەکات.

ئێمەش لەبەر زۆری ژمارەی چاپە براوەکان ، بەباشمانزانی کەئەم کتێبە بەنرخێکی داشکاو پێشکەش بکەین ، بەجۆرێك لە بەرژەوەندییە کەسییەکان هاتووینەتە خوارەوە ، تاوەکو ئەم دەروازەیە لەبەردەم ئەم جۆرە چاپکراوانەدا دابخەین ، وە دەروازە والآبکەین بەڕووی هەر بەڕێزێکدا کە ئەیەوێت بەدوور کەوێت لە ئەنجامدانی حەرامو ئەوانەی لە مامەڵەکردنیدا گومانی تێدایە.

سەرکەوتنیش هەر لە خوای گەورەیە ...

وَآخِرُ دَعْوَانَا أَنِ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ

جمادى الأولى/ ١٤٠٥ هـ

زهير الشاويش / بيروت

## پێشەکی دانەر

بسم الله الرحمن الرحيم

إنَّ الحَمْدَ للّه نَحْمَدُه وَنَسْتَعِينُه ونَسْتَغْفِرُهُ، ونَعُوذُ باللهِ من شُرور أَنْفُسنا وَمن سَيِّئات أَعْمالنا ، مَنْ يَهد اللهُ فَلا مُضِلَ لَهُ ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلا هَادي لَه . وَأَشْهدُ أن لاإلهَ إلاّ اللهُ وَحْــدَهُ لاشَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَ مُحَمداً عَبْدُه وَرَسُولُه ، صَلَىالله وَسَلَّمَ عَلَيه وَعَلى آلِه وَصَحْبِه وَمَــنْ إهْتَدى بِهَدْيِه إلى يَوْمِ الدِيْن.

لەپاشاندا " چاپی شەشەمە بۆ ئەم کتێبە ، کە داواکارم بەهۆیەوە خوای گەورە دانەری و بلاوکاری و خوێنەری سوودمەند بکات.

بێگومان ئەوەی جەستەی موسوڵمان ئارام و دڵنیا ئەکات لەم چاخەدا ئەوەیە کە ئەم کتێبە ئیسلامییە ، نوێنەرو ئارەزووە ئەو عاشقی لە رۆڵەکانی ئیسلام بێت ، ئەوانەی ئەیانەوێت ئاینیەکەیان بەو راستییەی هەیەتی بناسێنن و ، ئاکارو ڕەوشتیان هەماهەنگ بێت لەگەڵ بڕیارو حوکمەکانی ئیسلامدا ، و گرنگی ئەوان بە ئایدۆلۆژیا ناوخۆیی و ڕێبازە هێنراوەکان.

ئەوەی زیاتر بەهابەخشی ئەم پرۆژەیە ، تێکۆشان و ماددەو وزەو توانایەکی لە ڕادە بەدەر لەئارادا بوون لەلایەن هێزە دوژمنکارەکانی ئیسلام بۆ جیاوازی کردن لەنێوان ئامانج و ڕێگاکانیداو هەمەچەشنە کردن و زێدەناویی بۆ ئەم ئیسلامە ، بۆ ڕێگە گریی کردن و دواخستنی لەکاروانی بانگخوازییدا ، ئەمەو سەرباری دەست کردنی پڕوپاگەندەو هەڵبەستراوە ناڕاستییەکان ، و ناشرین کردنی عەقیدەو شەریعەت و ژیارو مێژووی ئەم ئیسلامە مەزنە ، ئەخوازن کە گەلانی موسڵمان لە ئاینەکەیان هەڵبگەڕێنەوە. هەروەك چۆن هەندێ لە بەناو فەرمانڕەوایانی ئیسلام قورئانیان پەراوێز ناوەو ، جگە لەئیسلام بە پرۆگرام و جگە لە (محمد)یش ﷺ بە پێشەنگ.

بەم جۆرە ئەگەر ئەم هەوڵە نەخشە بۆ کێشراوانە پووچەڵکرانەوە کە ریزبەندیاندا کافرکردنی گەلانی موسڵمانە ، لەگەڵ هەموو ئەمانەدا ، کتێبە ئیسلامییەکان زیاتر ڕەواجی پەیداکرد ، بەجۆرێك ئەبێتە یەکەم کتێبێك لە بازاڕی بلاوکردنەوەو دابەشکردندا ، هەروەك ژمارەی ئامارەکان بەڵگەن بەسەر ئەو حاڵەتەی لەچەندین کتێبدا دەرکەوتوون، کە دەوڵەتان و دامەزراوە گەورەکان

دەیان هەزارو سەدانیان بۆ سەرف کراوە کەبازاڕێك هەڵنەساوە بەپارەدار کردنی ، بەڕاستی ئەمەش خۆی بۆ خۆی خاڵێکە کەئەبێت لەئاستیدا سوپاسگوزار بین لەبەردەم بارەگای پەروەردگارا.

بەڵێ ، بەڕاستی ئەمە بەخششێکی خواییەو پێویستی بەستایش و سوپاسگوزاریی خوای گەورە هەیە ، ئەمەش مانای وایە گەلانی موسڵمان بە گشتی بەردەوام لەحاڵەتێکی باشدایە، بەجۆرێك ئەو لادان و خراپەکارییانەی لەو سەرکردایەتی‌یە کاراو بەزۆر سەپێنراوانەدا بەدەرکەوتوون لەموسڵمانانندا، چارەنووسیان بەمسۆگەریی تیاچوونە.

ئەوەی زیاتر خۆشحاڵم ئەکات ئەوەیە کە کۆمەڵێك لە برایانی پاکستانی و تورکمانمان داوای مۆڵەتیان لێکردووم تاوەکو ئەم کتێبە وەربگێڕن بۆ سەر (ئاوردی) و (تورکی) منیش بەخۆشحاڵیەوە ڕێگەم پێدان.

بێگومان جیاوازی شێوەزار ناگونجێ ببێتە ئاستەنگ بەبێ گۆڕینەوەی فیکریی لەنێوان موسوڵمانانندا، کە ئەمە یەکێکە لەو هەنگاوانەی بەپێویستی زانراون لە ڕێگەی ئیسلامییدا.

وەخاڵی جیاکردنەوەی ئەم چاپە لەچاپەکانی تری کتێبەکە ئەوەیە کە نووسینگە ئیسلامییەکە هەستاوە بەدیاریکردنی ژمارەی ئەو فەرموودەو ئاپارانەی کە لەدەرهێنانیاندا (شێخ ناصرەدین ئەلبانی) گرنگی پێداون لە پەراوێزەکاندا بەمەبەستی ئاسانکاری لەکاتی گەڕانەوە بۆیاندا لەدوای چاپ کردنیان.

خوای گەورە پاداشتی شێخی ئەلبانی وخاوەنی نووسینگەی ئیسلامی بداتەوە.

﴿ فالْحَمْدُ للّه الّذي هَدَانَا لهَذَا وَمَا كُنّا لنَهْتَديَ لَوْلا أَنْ هَدَانَا اللّهُ ﴾

﴿ رَبَّنَا لاتُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً إِنّكَ أَنْتَ الْوَهَّابُ ﴾

**يوسف القرضاوي**

# پێشەکی چاپی یەکەم

ویستو ئیرادەیەکی گشتی پێدام بۆ رۆشنبیریی ئیسلامی لە ئەزهەری شەریف ، کە بە ئارەزووی شێخی مزگەوتی ئەزهەر ، کە بەشداری پرۆسەیەکی زانستی بکەم کە خۆی لەدانانی چەند کتێبێکدا ئەبینێتەوە ، وەربگێڕێت بۆ سەر زمانی ئینگلیزی ، تاوەکو ئیسلام و تەعالمیی ، لە ئەورووپاو ئەمریکا وەکو بەرچاوو رۆشنیەك بۆ موسوڵمانان لەو دەڤەرانەو بانگخوازیی بۆ غەیری موسوڵمانان روون بکرێتەوە.

بێگومان ئەم پرۆژەی کتێبانە پرۆژەیەکی ئامانجدارەو کارێکی پیرۆزە، کەوا پێویستی ئەکرد لەکاتێکی بەر لەئێستاد بەئەنجام بگەیشتایە. موسوڵمانان لە ئەورووپاو ئەمریکا دەربارەی ئیسلام شتێکی کەم نەبێت ، زانیارییان نییە ، وە ئەم کەمەیش دادی ئەو گومان و پڕوپاگەندانە نادات کە بۆ ئیسلام هەڵئەبەسترێت وە لەم نزیکانەدا هاورێیەکی ئەزهەریمان نووسراوێکی نارد بۆ ولایەتێك لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ، ئەڵێت: ﴿ بێگومان زۆرینەی موسوڵمانان لەم ویلایەتە سەرچاوەی ماددی ژیانیان لە باڕو بازرگانی کردنی بە مادده بێهۆشکارەکانەوە دابین ئەکەنو، هەست ناکەن کە ئەمانە لە گەورەترین قەدەغەکراوەکانی خوای گەورەن لە ئیسلامدا ﴾ .

وە ئەڵێن: پیاوانی موسوڵمان ئافرەتانی مەسیحی و جوولەکە ئەکەنە هاوسەری ژیانیان ، وە لەوانەیە ئافرەتانی بت پەرستیش . بەم جۆرە ئافرەتانی موسوڵمان بەجێ ئەهێڵن و لێیان ناپرسنەوە. ئەمانەو ئەنجامدانی چەندینی تر لەم چەشنە کردارانە ...

گەر ئەمە دۆسیەی کاری موسوڵمانان بێت ، ئەی ئاخۆ ئەبێ بارودۆخی ناموسوڵمانان چۆن بێت ، لە کاتێکدا بچووکترین زانیارییان نییە دەربارەی ئیسلام ، جگە لە دروستکردنی سکێچێکی ناشرین بۆ ئیسلام ، بەڵێ فۆرم و سکێچێکی وەها کە زیاتر یارمەتیدەر ئەبێت بۆ پراکتیزەکردنی پلانی کۆلۆنیالیستەکان و قێزەون کردنی رووخساری ئیسلام ، کە لەم پێناوەدا هەموو توانایەکی خۆیانیان خستووەتە گەڕو هەموو رێگەیەکیان گرتووەتە بەر.

بەڵام هەنووکە کاتی ئەوە هاتووە کە دەست بکەین بەم پرۆژەیەو بەدی هێنانی ئەو خەونو هیواو ئاواتانەی کە بانگەوازی ئیسلامی پێویستی کردوون و ئەبێت هەوڵی بەرجەستەکردنیان بدەین ، ئەمە بێگومان هەنگاوێکی پیرۆزە بۆ

زیندووکردنەوەی توانای ئەوانەی کە عەلەمداری ئەم پەیامەن چ لە ئەزهەرو چ لە دەرەوەیدا ، داوای زیاتر گرنگی پێدان و کۆششیان لێ ئەکەین و ، ئومێدی بەردەوامی و سەرکەوتنی زیاترمان پێیانە.

ئەم بابەتەی کە بەڕێوەبەری رۆشنبیریی بڕیاریدا لەسەری بنووسم ، (الحلال والحرام في الاسلام) واتە (حەڵاڵ و حەرام لە ئیسلامدا) پێم ڕاگەیەنراوە بۆ ئەوەی لەکاتی نووسیندا ڕەچاوی ئاسانکاریی و ئیقناع بکەم ، سەرباری بەراورد کردن لەگەڵ ئاینی و رۆشنبیرییەکانی تردا.

وە لەوانەیە بابەتی (الحلال والحرام) سەرەتا بەئاسانی دەست پێ بکات ، بەڵام ئاشکرایە کە بابەتێکی گرانە ، وە دانەر پێشتر بەهیچ شێوەیەك نە لەکۆن و نە لەنوێدا هەڵنەساوە بەکۆکرنەوەی ئەو باسانەی تایبەتن بەم بابەتەوەو بە جۆرێك لەکتێبێکی تایبەتدا ریزبەندیان بکات . بەڵام توێژەر چەند بەشێکی دابەشکراوی لە دەروازەکانی فیقهی ئیسلامیدا دۆزیووەتەوەو سەنای کتێبەکانی تەفسیرو فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ روونکردووەتەوە.

پاشان بابەتێکی لەم چەشنە ، واپێویست ئەکات کە نووسەر هەڵوێستی خۆی دیاری بکات لەمەڕ کردارەکاندا کە لە بڕیار (حوکم)ی‌دا ڕاجیاواز بێت لەگەڵ زانایانی پێشوودا ، کە بەهۆی ئەو حوکمو تەعلیل کردنانەیانەوە ڕای زانایانی فەرموودەناسی دەربارەی وروژاوە.

هەروەك بێگومان پەسەندکردنی رای (ترجیح) لەنێوان چەند ڕایەکی تردا پێویستی زۆری بە لێوردبوونەوەو چاوپێداخشاندن هەیە لە مەسەلەکانی حەڵاڵ و حەرامدا ، لەدوای ئەوەی توێژەر تەنها بۆ خوای گەورە خۆی یەکلایی ئەکاتەوە لە داواکردنی ڕاستیداو لەمیانەی تێکۆشانی مرۆڤدا.

بێگومان هەروەك ئەبینرێ زۆرینەی توێژەرەوانی هاوچەرخ لەئیسلام و نوێخوازاندا ئەتوانین بڵێین" نزیکە دابەش ببنە دوو گروپ"

**گروپێکیان** : فۆرمی دەرەوەی وڵاتانی رۆژئاوا بەرچاوی گرتوون و هەمیشە لە دڵنەوایی ئەم بتە گەورەیەدان و ئەیپەرستن و هەرشتێك کە بەهۆیەوە لەو بتانە نزیکیان بکاتەوە پێشکەشیان ئەکرد، وە لە بەردەمیاندا چاو بەترس و ملکەچ وەستاون ، ئەوانەی کە پرەنسیپەکانی رۆژئاوایان کردووەتە چاولێکەری یەکی نابینابیانەی بێ گفتوگۆو مسۆگەر خۆ ئەگەر شتێك لەوانە تەبابێت لەگەڵ ئیسلامدا ئەوا ئەکەونە (تکبیره) واتە : الله اكبر ، و(تهلیله) واتە : لا إلــهَ إلاّ الله، وە

ئەگەر بەرامبەر وەستان ئەوا هەڵوێستەیەك ئەكەن و بۆ بهێننەوە ، یاخود خۆیان (تأویل) ی ئەكەن وەیان تووشی لادان ئەبن، هەروەك بڵێی ئیسلام لەسەری پێویست بێت سەر بۆ شارستانێتی و فەلسەفەی ڕۆژئاوا دابنەوێنێ ، ئەمەش ئەتوانین لەكاتی گفتوگۆیان دەربارەی حەرامكردنی پەیكەرتاشی و یانسیب و سوو خەڵوەتی ئافرەت و پیاوی بێگانە، دەرك پێ بكەین ... هەروەها لەكاتی قسە لەسەركرنیان بۆ هەندێ مەسەلە كە ئیسلام حەڵاڵی كردووە ، وەك تەڵاق و فرەژنی و... هەروەك بڵێی "حەڵاڵ ئەوەبێت كە ڕۆژئاوا حەڵاڵی كردووەو، حەرامیش ئەوەبێت كە ڕۆژئاوا حەرامی كردووە .

لەیادیان چووە كە ئیسلام پەیڤی خوایەو پەیڤی (خوا)ش هەمیشە مەزنەو هەرئەبێت شوێنی ئەو بكەوین ، نەك ئیسلام شوێنی شارستانیو ئایدۆلۆژیی تر بكەوێت ، ئیسلام بەرز ئەكاتەوە نەك بەرز بكرێتەوە ، كەواتە چۆن پەروەردگار شوێن بەندە بكەوێت ، یان چۆن بەدیهێنەر سەر بنەوێنێت بۆ بەدیهێنراو ؟!!

﴿ وَلَوِ اتَّبَعَ الْحَقُّ أَهْوَاءَهُمْ لَفَسَدَتِ السَّمَاوَاتُ وَالْأَرْضُ وَمَنْ فِيهِنَّ ﴾ المؤمنون: ٧١.

﴿ قُلْ هَلْ مِنْ شُرَكَائِكُمْ مَنْ يَهْدِي إِلَى الْحَقِّ قُلِ اللَّهُ يَهْدِي لِلْحَقِّ أَفَمَنْ يَهْدِي إِلَى الْحَقِّ أَحَقُّ أَنْ يُتَّبَعَ أَمَّنْ لَا يَهِدِّي إِلَّا أَنْ يُهْدَى فَمَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴾ يونس: ٣٥.

**وە گروپی دووەم :** ئەو جۆرە كەسانەن كە لەسەر چەند رایەك بۆ حەڵاڵ و حەرام تووشی دوگمابوون هاتوون بەتێڕوانینێكی سادە بۆ تێكستێكی قورئانیی ، وەیان دەربڕینێك ، وائەزانێت ئەمە ئیسلامە ، هەرگیز ڕێگە نادات (ڕا)كان ببزوێن ، وە هەوڵی ئەوەی نەداوە كە بەڵگەی ڕێبازەكەی وەیان راكەی تاقی بكاتەوەو ، بەڵگەی خۆی بەڵگەی كەسانی دی ئەوانە تەرازوو ئیتر تەنها راستی لەلای ئەمە ، لەدوای پێوانە كردن و لێوردبوونەوە.

وەگەر پرسیار لەم گروپە كەسانە بكرێ دەربارەی مۆسیقاو گۆرانی ، وەیان شەترەنج و فێربوونی ئافرەت ، وەیان ئاشكرا كردنی رووخساری ئافرەت و ئەمانەو چەندینی تر لەم بابەتانە ئەوا نزیكترین شتێك لەزمانیانەوە یان قەڵەمیانەوە ، راستەوخۆ وشەی (حەرام)ە ، وە لەیادیان چووە كە سەلەفی صالح ئەدەبیان لەم بارەیەوە چۆن بووە، بەچەشنێك هەرگیز كردارێك یان هەڵوێستێك یان گوفتارێكیان حەرام نەكردووە هەتاوەكو بە قطعي . حەرام نەبوو بێت ، وە جگە لەم وشەو دەربڕینانەو لەم بارەیەوە . شتێكی تریان بەكار نەهێناوە لەوانەش (باش نییە) ، (من پێم باش نییە)، ئەمانە ئەو چەندینیتر لەم دەستەواژانە.

وە من هەوڵی ئەوەم داوە کە ئەندامێك نەبم لە هەرکام لەم دووگروپە رازی بووم بەوەی (الله) پەروەردگارم بێت و ئیسلام ئاینم بێت و محمدیش پێغەمبەرم بێت کە لەلایەن خواوە رەوانە کراوە.

وەهەرگیز رەزامەندنیم بەرامبەر هزرو ژیریم لەشوێن پێکەوتنی نابینایانەی هەر رێبازو ئایدۆلۆژیایەکی دیاریکراو ، ئیتر ئایا رای ئەو رێبازو مەزهەبە بەهەڵەدا چووبێت یاخود پێکابێتی، بۆیە کەسی (مقلد) واتە: ئەو کەسەی شوێن مەزهەبێکی دیاریکراو ئەکەوێت ، هەروەك (ابن الجوزی) ئەڵێن: (بەبێ دڵنیایی لەوەی کە تەقلیدی کردووەتەوە ، لە تەقلیدا سڕینەوەی کارایی عەقڵ و ژیریی بەدی ئەکرێن، چونکە عەقڵ بۆ قوڵبوونەو رۆچوون بەدیهێنراوەو بەڕاستی جوان نییە بۆکەسێك کە مۆمی بەرچاو رۆشنی دراوەتی کەچی ئەیکوژێنێتەوەو بە تاریکاییدا گوزەر ئەکات) [1].

بەڵێ ، بەندە هەوڵی ئەوە نادات کە لەنێوەند ئەو ژمارە مەزهەبانەی لە سەرانسەری جیهانی ئیسلامیدا هەن، پەیوەست ببێ بەتاکە مەزهەبێکی فقهیەوە بەتەنها، هەروەك تاکە مەزهەبێکیش نەیتوانیووە هەموو ڕاستییەکان لە رەئییەکانیدا رەنگ بدەنەوە. لەگەڵ ئەوەدا پێشەوایانی هەر چوار مەزهەبە سەرەکییە ئیسلامییەکە پروپاگەندەی بوونی مەلەکە (توانا) یان نەکردووە بۆ وەستان بەرامبەر هەر هەڵەو نەپێکاندنێك ، بەڵکو ئەو کەسایەتییە مەزنانە موجتەهید بوون لەناساندنی راستیدا ، گەر هەڵە بووبن ئەوا پاداشتێکیان هەیە ، وەگەر پێکابێتیشیان ئەوا دووپاداشتییان هەیە.

پێشەوا مالیك (رەزایی خوای لەسەر) ئەفەرموێت: هەموو کەسێك وتەی وەرئەگیرێت ، هەروەك هەندێك جاریش بەگوێی ناکرێت تەنها پێغەمبەر ﷺ نەبێت .
هەروەها پێشەوا شافیعی (رەحمەتی خوای لەسەر) ئەفەرموێت: (لەو بۆچوون و رەئییەمدا کە پێکاومە ، هەڵە هەڵدەگرێت ، وە رەئی و بۆچوونەکانی جگە لەخۆم گەر بەهەڵە دابنرێن ، ئەوا ڕاستی و دروستیی هەڵئەگرن).

وەبەڕاستی زانای موسوڵمان پێی رەوانابینرێ کەمیکانیزمی هاوسەنگی کردن و پەسەندکردنی رای پێبەخشراوە ، لەم کاتەدا ئەم (زاناکە) پێوەندو پاوانکراوی تاکە مەزهەبێك بێت ، یاخود هەمیشە رەئییەکانی سەرنەوی بێ رەئی فەقیهێکی دیاریکراو ... بەڵکو واپێویستە زانای ئیسلام پێوەندی بەڵگەو دەلیلەکان بێت ، هەرچۆنێك بێت خودی رەئی خۆی لەپێشترە بۆ شوێنکەوتن ، گەر

---

(1) تلبیس ابلیس ص: ٨١.

سەنەدەکەی لاواز بوو ، یاخود بەڵگەکەی بەهێز نەبوو ، ئەوا رەت ئەکرێتەوە ، ئیتر هەرچۆنێك بێتو رەئی هەرکەسیٚ بێت ، لەمێژەوە پێشەوا عەلی ﷺ فەرموویەتی: (راستییەکان بەهۆی پیاوانەوە (واتە خاوەنیانەوە) مەناسن، بەڵکو پێویستە راستی بناسی ، ئەو کات خاوەنیشی ئەناسی).



وەهەمیشە هەوڵی ئەوەم داوە بەپێی توانام ئەوەی بەڕێوەبەری رۆشنبیریی داوای کردووە، لەبەرچاوی بگرم وەگرنگیمداوە بە بەڵگەهێنانەوەو روونکردنەوەی هۆکاروهاوسەنگی، بەپاڵپشتی مۆدێرنترین بیری زانستی و ئەبستمۆلۆژییە هاوچەرخەکان، بێگومان ئیسلامیش سوپاس بۆ خوا هەڵگری بەڵگەی بیٚخەوشو بێگەردە، بینا لەسەرئەوەی کە ئاینێکی مرۆیی گشتی نەمرە ﴿ صِبْغَةَ اللَّهِ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ صِبْغَةً وَنَحْنُ لَهُ عَابِدُونَ ﴾ البقرة:١٣٨.

حەڵاڵو حەرام لە مێژەوە لەلای هەموو میللەتان ناسراون، هەرچەندە لە قەوارەی حەرامکراوەکاندا نەوعییەتو فاکتەرەکان جیاوازییان ببیٚ . وە زۆرینەیان پەیوەستن بە بیروباوەڕە بەرایی و ئەندێشەو داستانەکانەوە.

پاشان ئایینە ئاسمانییە گەورەکان هەستان بەدانانی شەریعەت و ئامۆژگاری دەربارەی حەڵاڵو حەرام ، کە بەهۆیانەوە مرۆۋ لەئاستی ئەندێشەو خەیاڵو ژیانی هۆزەکی بەرزبووەوە بۆ ئاستێکی مرۆڤی رێزلێنراو، بەڵام هەندێك لەوانەی حەڵاڵ وەیان حەرامکراون بەنیسبەت سەردەمو ژینگەوەو بەرەوە، ئاستێکی پێشکەوتوو بەپێشکەوتنی مرۆڤایەتیو گۆرانی بارودۆخو زەمەنەکان بەخۆوە ئەبینێت. بۆ نموونە لەناو جوولەکەدا هەندێك حەرامکردنی کاتی هەبوون، خوای گەورە لەشێوەی سزادا بەسەر نەوەکانی ئیسرائیلیەوە سەپاند بوونی، لەبەر ئەو پشتهەڵکردنی بەرامبەر بەرنامەکەی خوای گەورە ئەنجامیان دابوو. هەروەك مەبەست لەو یاسادانانەی بۆ جوولەکە نەمریی نەبوو، هەروەك خوای گەورە لە قورئاندا وتەی مەسیح بۆ نەوەکانی ئیسرائیل تۆمار ئەکات ﴿وَمُصَدِّقاً لِمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ وَلِأُحِلَّ لَكُمْ بَعْضَ الَّذِي حُرِّمَ عَلَيْكُمْ﴾ آل عمران :٥٠.

کاتێك پرشنگی ئیسلام لەئاسۆوە گزنگیدا مرۆڤایەتی گەیشتبووە ئەو حاڵەتەی کەخوای گەورە پەیامی کۆتایی بۆ بنێریٚ ، و بە ئیسلامێکی نەمر، مۆری کۆتایی بدات لە تەشریعاتەکەی بۆ مرۆڤایەتی. لەمەدا خوای گەورە دوای ناوبردنی ئەو خواردنە حەرامکراوانەدا لە سوورەتی (المائدة)دا ئەفەرمویٚ : ﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الْأِسْلامَ دِيناً )﴾ المائدة:٣.

بۆچوونی ئیسلام لەحەلاڵ و حەرامدا ، بۆچوونێکی ساناو ئاشکرایە ، بۆچوونی ئیسلام بەشێکە لەو سپاردە گەورەیەی کە ئاسمانەکان و زەوی و چیاکان پشتیان هەڵکرد لە هەڵگرتنیدا کە زۆر لەسەریان گران بوو، لەدواییدا مرۆڤ ئەرکی هەڵگرتنی گرتە ئەستۆ، سپاردەی داواکارییە خواییەکان و، شاندان بە لێپرسراوێتییەکانی جێنیشی لەسەر زەویدا ، ئەو لێپرسراوێتیەی کە لەسەر بناغەکەی ، مرۆڤ پاداشت یان سزا ئەدرێ ، و لەپێناویدا ژیریی و ئیرادەی پێ بەخشیووەو، پەیامبەرانی بۆ ناردووەو چەند پەیامێکیشی بۆ ناردووە ، بۆی نییە بپرسێ ، حەلاڵو حەرام بۆ ؟

چونکە ئەمانە لە تەواوکاری ئەو تاقیکردنەوە خواییانەن کە بەرپرسیارانی پێ تاقی ئەکرێتەوەو ، خاڵی جیاکردنەوەی ئەم چەشنە بەدیهێنراوەی خوای گەورەیە ، کە تەنها لە رۆح وەك فریشتە پێك نەهاتووە ، یان تەنها لە جەستە وەك ئاژەڵ پێك نەهاتووە ، بەڵکو مرۆڤ ئاوێتەیەکە لە دووانەی رۆح و ئارەزوو.

بۆیە ئەتوانی وەك فریشتە یان با باشتریش بیت ، یاخود وەك ئاژەڵ یان خراپتریش بیت . وە لەلایەکی ترەوە حەلاڵوحەرام لەخولگەی گشتی تەشریعی ئیسلامیدا ئەسوڕێتەوە، ئەویش تەشریعێکی بونیادنراوە لەسەر بنەمای دەستخستنی خۆشگوزەرانی بۆ گرۆهی ئادەمیزادو هەموو ناڕەحەتییەکی لەسەر لابردوو ویستی ئاسانکاری بۆیان هەیە.

کە ئەمەش پابەند ئەبێت لەسەر دوورخستنەوەی هەموو ناجۆرییەكو فەراهەمکردنی سەرجەم بەرژەوەندییەکانی مرۆڤ، بەجەستەو رۆحو ژیریشەوە، وە بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵ تێکڕا بەدەوڵەمەندو گەداو فەرمانڕەواو بەردەستە ، بەنێرو مێوەو بەرژەوەندانی هەموو مرۆڤایەتی لەبەرچاو گیرابێت، بەبێ گرنگیدان بەجیاوازی رەگەزو رەنگ و هەرێم و وڵات و سەردەم و نەوەکان.

بێگومان ئەم پەیامە پیرۆزەی ئیسلام رەحمەتێکی هەمەلایەنەی خواییە بۆ بەندەکانی ، لەدوا پۆلێن لەپۆلێنەکانی مرۆڤایەتی خوای گەورەش ئەمەی بە پەیامبەرەکەی ڕاگەیاندووە : ﴿ وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ ﴾ الانبياء:١٠٧ وە پێغەمبەریش ﷺ ئەفەرموێ: ﴿ إنَّما أنا رَحْمَةٌ مُهداة ﴾[1].

وە لەشوێنەوارەکانی ئەم رەحمەتە" خوای گەورە بۆ ئەم ئوممەتی

---

[1] / الحاكم ابوهريرە گێڕاویەتیەوە، وە زەهەبی بە (صحيح)ی داناوە، بڕوانە (غاية المرام في تخريج احاديث الحلال والحرام) نوێخوازی گەورە شێخ محمد ناصرالدین ئەلبانی، ت :١.

موحەممەدە، خوای گەورە هەموو نارەحەتیو گرانکاریو تاوانی ڕێپێدراوی لەسەر لابردووە کەپێشتریت خواپەرستان وخاوەن پەڕاوەکان لەژیاندا گوزەریان پێدا دەکرد، کە هەموو باشو چاکێك حەرامو، هەموو ناپاکییەکیش حەڵاڵ بوو ﴿وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ فَسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَـاةَ وَالَّذِينَ هُم بِآيَاتِنَا يُؤْمِنُونَ {١٥٦} الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالإِنْجِيلِ يَأْمُرُهُم بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَآئِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالأَغْلاَلَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ﴾ الاعراف.

دەستووری ئیسلام لەحەلاڵو حەرامیدا لەم دووئایەتەدا خۆی ئەبینێتەوە ، وائەکات کەئەم کتێبە لەکتێبخانەی نوێی موسوڵماناندا پڕ بکاتەوە و چارەسەری چەندین گرفت بکات کە ڕووبەڕووی موسڵمان ئەبنەوە لە ژیانی خودیی و خێزانداریو گشتیدا، وەلامی ئەو هێندە پرسیارانە ئەداتەوە: ئاخۆ چی بۆ من حەلاڵ بێت و چیم لێ حەرام بێت و هۆی حەرامکردنی ئەمە ، یان حەلاڵ کردنی ئەوە چییە؟

وە لەکۆتایی پێشەکییەکەمدا زۆر سوپاسی مەشیخەی ئەزهەرو بەڕێوەبەری ڕۆشنبیریی ئیسلامی ئەکەم ، کە بەندەیان کردە یەکەم کەسێك متمانەی تەواویان پێ کردووم لە هەڵبژاردنی ئەم بابەتەو دانانی کتێبێك لەو بارەیەوە. خوازیارم بەوەی نووسیومە باجی ئەو گومانباشییەی بەڕێزیانم دابێ و مەبەستی تەواوەتیم پێکا بێت.

داواکاریشم لەخوای گەورە کەکتێبەکەم سوودی هەبێتو ژیواری مەبەستداریمان بەڕاستی پێ ببەخشێ لە گوفتارو کردارەکانماندا و، لە ئالۆزیی بیرو قەڵەم وەدەرمان بنێت ، بەجۆرێ کەشوهەوای جێگریی و بەردەوامیمان لە کردارەکانماندا بۆ فەراهەم بکات ...

وە بێگومان لە خوای گەورەش زاناتر نیەو هەر ئەو زاتەیە وەلامداری هەموو داواکارییەك.

صفر الخیر/١٣٨٠ کۆچی

اب/ ١٩٦٠ زایینی

یوسف القرضاوي

# چەند پێناسەیەک

- **حــەلاڵ :**

یاخود دروست ، یان ڕێگە پێـدراو: ئەوەیـە کـە گرێـی مەترسـیەکەی کراوەتەوەو ، پەروەردگار مۆڵەتی ئەنجامدانی داوە.

- **حــەرام :**

یــاخود نادروســت ، یــان ڕێگە پێنــەدراو: هــەر کردەوەیــەك یــاخود گوفتارێکە کـە پـەروەردگار لەئەنجامدانیـدا ڕێگریـی کـردووە ، بـە جۆرێك هەرکەسێك بە پێچەوانەی ئـەو نـەریٚ کردنـەی پـەروەردگارەوە ڕەفتاری کـرد ، ئـەو لـەڕۆژی دواییـدا دووچـاری سـزای خـوای گـەورە ئەبێتـەوە، هـەروەك لـە ژیـانی دونیاشـدا دووچـاری سـزای شـەرعی ئەبێتەوە.

- **مــەکــروه :**

ئەوەیە کە خوای گەورە نەریٚی لیٚ ئەکات ، بەلاّم زۆر جەخت لەسەر ئـەو نەریٚکردنە ناکاتەوە ، وە پلەکەی لە چاو پلەی حەرامدا نزمترە وەئـەو کەسـەی مـەکروهێك ئـە نجام نـەدات وەك کەسـێك سـزا نادرێـت کـە حەرامێکی ئە نجام دابێت ، لەگەڵ ئەوەشدا گەر بەردەوامی پیٚ بدرێت و بەبیٚ نرخ بۆی بڕوانرێـت ، ئـەوا ئە نجامدەرەکـەی سـەرکێش ئـەکات بەرەو ئە نجامدانی حەرام.

## دەروازەی یەکەم

# پرەنسیپەکــانی ئیسلام دەربــارەی حەڵاڵ و حەرام

- ❖ ئەصلْ یاخود ڕەسەنایەتی لە شتەکاندا رێگە پێدانە .
- ❖ حەڵاڵ کردن و حەرامکردنی تەنها مافی خوای گەورەیە .
- ❖ حەرامکردنی حەڵاڵ و حەرام هاوڕێی هاوبەشی بڕیاردانە بۆ خوای گەورە
  حەرامکردن ڕووبەڕووی شتانی پیس و زیانبەخش ئەبنەوە .
- ❖ لە حەڵاڵکردندا پێویست بە حەرام کردن ناکات .
- ❖ هەرشتێك سەربەرەو حەرام بکێشێ ئەوا حەرامە .
- ❖ بەهانە دۆزینەوە ( حیلە ) بۆ حەرام ، حەرامە .
- ❖ نییەتی پاك و دروست پاساو نییە بۆ حەرام ئەنجامدان .
- ❖ سڵەمینەوە لە گومان لێکراوان ( الشبهات ) .
- ❖ چاوپۆشی و جیاوازی لەحەرامەکاندا نییە .
- ❖ ناچاری ، رێگە ئەدات بەحەرامکراوەکان .

هەر لە سەردەمانێکی دێرینەوە حەڵاڵ و حەرام وەکو گەلێ شتی‌تر لەوانە بوون کەخەڵکانی چەرخی نەفامی نگرۆی دەریای گومڕایی کردووە ، بەهۆیانەوە دووچاری لادان بوون و حەرامی ناپاکیان حەڵاڵ کردووە ، و حەلاڵی پاکیشیان حەرام کردووە ، وە لەم بارەیەشەوە بت پەرستان و میللەتانی خاوەن پەیامە ئاسمانییەکان یەکسان بوون و یەکسانن.

وە ئەم گومڕاییە خۆی لە لادان و توندگیریدا ئەنواند لەوپەڕی راستەوە یان ئەوپەڕی چەپ.

بۆیە لەوپەڕی راستدا بەرهەمی هندیە دڵڕەقەکان ئەبینرێتەوە لەگەڵ مەسیحییە گۆشەگیرەکان و ئەو ڕێبازانەی لەسەر سزای جەستەیی بناغە بەند کراوە لەگەڵ حەرامکردنی ڕۆزی پاك وجوانی خوایە کەبەخشراوە بەبەندەکانی.

بێگومان مەسیحییە گۆشەگیرەکان لەسەدەکانی ناوەڕاستدا لەم بارەیەوە گەیشتنە چڵەپۆپە، ئەوانەی خوای گەورە حەلاڵی کردوون، ئەوان زۆر بەتووندی حەرامیان کردووە کە بە هەزاران مەزەندە ئەکران، تائەو رادەیەی کەهەندێکیان تەنانەت شتنی پیتەکانیشیان بەتاوان لەقەڵەم ئەدا، بەهەمان شێوەش چوونە گەرماوو خۆشتن کارێکە ئاخ و پەشیمانی بەشوێن خۆدا رائەکێشێ!

هەروەها لەوپەڕی چەپدا ڕێبازی (مزدك) ئەبینرێتەوە کە لە ولاتی فارسەوە سەری هەڵداوە، کە بانگەوازی ڕێپێدانێکی رەها ئەکات بۆ ئەوەی مرۆڤ هەرشتێکی ویست ئەنجامی بدات، تەنانەت دەست تێوەردانی ئەوانەی بە سروشتی مرۆڤ پیرۆزن.

هەروەها عەرەبیش لە سەردەمی نەفامیاندا ، نموونەیەکی بەرچاوو ئاشکران پەی نەبردن بە ڕەواو ناڕەواکان دەربارەی شتەکان و کردارەکان، هەر بۆیە هەستا بوون بە ڕێگەدانێکی تەواو بە خواردنەوەی مەی و خواردنی (سو) و ڕێگە بە ئازاردانی ئافرەتان و پەراوێزخستنیان و ڕێگەگرتنیان بۆ پێکەوەنانی شکی هاوسەرداری ... وە زۆر زیاتریش لەمانە شەیتانی پەری و ئادەمی کوشتنی جگەرگۆشەکانی خۆیانیان لەلا جوان کردبوون ، وەپێچەوانەی خۆشەویستی و سۆزی باوکێتی مامەڵەیان ئەکرد ، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَكَذَلِكَ زَيَّنَ لِكَثِيرٍ مِنَ الْمُشْرِكِينَ قَتْلَ أَوْلَادِهِمْ شُرَكَاؤُهُمْ لِيُرْدُوهُمْ وَلِيَلْبِسُوا عَلَيْهِمْ دِينَهُمْ﴾ الأنعام: ١٣٧.

بەو جۆرە ئەو هاوبەش بڕیاردەرانە جۆرەها ڕێگەیان پیشانی زێوانی جوتەکان ئەدا بۆ رازاندنەوەی ئەو کوشتنە، لەوپاساوانەی بۆ ئەو جۆرە کوشتنا

نەیان ئەهێنایەوە بریتی بوو لەمەترسی هەژاری ، و پێویست ئەکات منداڵەکانیان بکوژن تاوەکو ژیانی خۆیان مسۆگەر بێت، وەهەندێکی تریان بەوە لەخشتە بردبوو، گوایا ئافرەتان مایەی ئابڕووچوونن ، سەرباری ئەمانەش هەندێکی تریان ئەکرد بەقوربانی بۆ بت و بەناو خواکانیان.

ئەوەی جێگەی سەرسووڕمانە ئەوەیە کە ئەو کەسانەی کوشتنی رۆڵەکانیان بەڕەوا ئەبینی، ئیتر بەسەربڕین یاخود زیندەبەچاڵ کردن ، زۆر لە بەهرەو بەخششە پاکیزەکانی خوای گەورەیان لەخۆیان حەرام کردبوو لە بەرو بوومی کێڵگەیی و ئاژەڵی، لەمانەش سەرسوڕهێنەرتر ئەوەبوو کە ئەمانەیان ئەگێڕایەوە بۆ بڕیارەکانی قورئان بەرپەرچییان ئەداتەوەو ئەفەرموێت: ﴿ وَقَالُوا هَذِهِ أَنْعَامٌ وَحَرْثٌ حِجْرٌ لا يَطْعَمُهَا إِلَّا مَنْ نَشَاءُ بِزَعْمِهِمْ وَأَنْعَامٌ حُرِّمَتْ ظُهُورُهَا وَأَنْعَامٌ لا يَذْكُرُونَ اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهَا افْتِرَاءً عَلَيْهِ سَيَجْزِيهِمْ بِمَا كَانُوا يَفْتَرُونَ ﴾ الأنعام:١٣٨.

قورئانی پیرۆز گومڕابوونی ئەو کەسانەی روونکردووەتەوە کە حەڵاڵ حەرام و حەرام حەڵاڵ نەکەن، ئەوەتا ئەفەرموێ: ﴿ قَدْ خَسِرَ الَّذِينَ قَتَلُوا أَوْلادَهُمْ سَفَهاً بِغَيْرِ عِلْمٍ وَحَرَّمُوا مَا رَزَقَهُمُ اللَّهُ افْتِرَاءً عَلَى اللَّهِ قَدْ ضَلُّوا وَمَا كَانُوا مُهْتَدِينَ ﴾ الأنعام:١٤٠.

خۆری ئیسلام لەدەم کەلی ئاسۆی ژیانەوە دەرکەوت و ئەم گومڕایی و لادانەی ، بۆیە ئەوەی پێویست بوو بۆ یەکەمجار ئەنجامی بدات بەمەبەستی چاکسازی لەو ڕووەوە، دانانی ڕیزبەندێك لەپرەنسیپی یاسادانانی ئیسلامی بوو، کەکردنیە بنەچەی حەڵاڵو حەرام ، بەوجۆرە کاروباری گێڕایەوە بۆ جێگەی خۆیی و تەرازووی دادپەروەری دانا بۆ حەڵاڵو حەرام کردن . بەم جۆرە گەلی موسڵمان لەنێوەند گومڕایان و لادەراندا – لە ڕۆژهەلات یاخود ڕۆژئاوا – بووە گەلێکی میانەڕەوی ناوەندگیر بەوجۆرەی خوای گەورە باسی دەکات ، کە کردوویەتیە باشترین گەلێ و وەصفی پێکردووە.

## ١ـ ڕەسەنیی لە شتەکاندا ڕێگە پێدانیانە

یەکەم پرەنسیپێك بڕیاری لەسەردراوە" ئەوەیە کە ڕەسەنایەتی لە شتەکاندا ڕێگەپێدانو ڕەوابوونیانە، و حەرام نابێ مەگەر دەقێکی قورئان یان سوننەتی لەسەر هاتبێ دەربارەی حەرام بوونەکەی، وەگەر دەقەکە لەرووی ڕاستیەوە کەمێك لاوازبوو – وەك فەرمووده لاوازەکان – یاخود بەراشکاوانە حەرام بوونی نەئەگەیاند، ئەوا لەسەر بنچینەی ڕەوابوونی ئەمێنێتەوە.

وەزانایـانی ئیسـلام سـەبارەت لـەم یاسـا ئیسـلامییە بەئایـەتی قورئـانی ئاشکرا بەڵگە ئەهێننەوە:

﴿ هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُمْ مَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعاً ﴾ البقرة:٢٩

﴿ وَسَخَّرَ لَكُمْ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعاً مِنْهُ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ الجاثـية :١٣...

﴿ أَلَمْ تَرَوْا أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُمْ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَـهُ ظَاهِرَةً وَبَاطِنَةً ﴾ لقمان :٢٠.

وەژیـریش واپـەی نابـات کـەخوای گـەورە هـەموو ئەمانـەی ئافرانـدبێت و لەبەردەست مرۆڤدا رامی کردبێت و بەهۆیانەوە منـەت بەسـەر بەندەکانیـدا بکات و بـەلاّم دوایـی بێـت و بڕیـاری حـەرامکردنیان بـدات ، وەچـۆن ئـەبێت گـەر بـۆی ڕام کردبێتو، پێی ببەخشێت؟!

بەڵکو چەند (جزئیات)ێکی حـەرام کـردووە دیارە ئـەوەش لەبەر فەلسـەفەو هۆکاری تایبەتی خۆیەتی، کە پاشتر دێنیە سەر باس لێوەکردنیان.

لێرەدا بازنەی حەرامکراوو قەدەغەکراوەکانی لەپرۆگرامی ئیسلامدا تەسك بووەتەوە زۆر بەتوندی ، و شان بە شانی ئەمەش بازنەی حەلاڵ و ڕێگـە پێدان زۆر بـەرفراوان بـووە ، دیـارە ئەمـەش لەبەرئەوەیـە کەدەقـە شـەرعییە راسـتەکان کەدەربارەی حەرام کردن هاتوون زۆر کەمن ، وە ئەوانەشی کە دەقێکی راستەوخۆ دەربارەی و ئەچێتە بازنەی لێبوورانی خواییەوە.

لەم بارەیەوە فەرموودەیەك هـاتووە (ما أحل الله في كتابه فهو حلال، وما حـرم فهو حرام ، وما سكت عنه فهو عفو ، فاقبلوا من الله عافيته ، فاءك الله لم يكن لينسي شيئاً ، وتلا: ﴿ وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيّاً ﴾ مريم : ٦٤.

وە لـە سـەلمانی فارسییەوە: پرسیارکرا لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەربـارەی ڕۆكو پەنیرو فرۆ ئایا دروستن یـان نـا؟ فـەرمووی: ﴿ الحلال ما احـل الله في كتابـه ، والحرام ما حرم الله في كتابه، وماسكت عنه فهو مما عفا لكم ﴾[1].

واتە: حەلاّڵکراوەکان ئەوانەن کەخوای گـەورە لەقورئانـدا حـەلاّلی کـردوون و ، حـەرامکراوەکانیش ئەوانـەن کـە خـوای گـەورە لەقورئانـدا حـەرامی کـردوون، وە ئەوانەشـی لێیـان بێـدەنگ بـووە، لەوانـەن کەرێگـەی پێـداون، پێغەمبـەر ﷺ ئـارەزووی

[1] / الترمذي وإبن ماجه ، ت ٣ (٥) .

نەكردووە كەراستەوخۆ وەڵامی پرسیارەكەیان بداتەوە، بەڵكو رەوانەی یاسایەكی كردوون كەبەهۆیەوە حەڵاڵو حەرامی پێبناسنەوە، ئەوەی بەس بێت بۆمان ناسینی حەرامكراوەكانە، وەبەدەر لەوانە خوای گەورە بە (حلالاً طيباً ) ئەیانژمێرێ.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ( ان الله فرض فرائض فلا تضيعوها، وحدّ حدوداً فلا تعتدوها، وحرم اشياء فلا تنتهكوها، وسكت عن اشياء رحمة بكم غير نسيان فلا تبحثوا عنها )[1].

جێگەی خۆیەتی ئەوە بڵێن كە لەبنەڕەتدا رێگەپێدانو رەوابوونەو تایبەت ناكرێ بەشتانو كەسانێكی تایبەتەوە، بەڵكو هەموو كردارو جمو جوڵێك ئەگرێتەوە كە لەكارە بەندەگیو پەرستشەكان نییە، كە بە (العادات) یاخود (المعاملات) ناوزەد ئەكرێن، ئەصڵ لەمانەدا سنووردار نەكردنیانە، تەنها ئەوانەیان نەبێت كە پەروەردگار بەندەكانی پێ وابەستە كردووە بەحەرامبوونیان ﴿ وَقَدْ فَصَّلَ لَكُمْ مَا حَرَّمَ عَلَيْكُم ﴾ الأنعام : ١١٩.

ئەمە بەپێچەوانەی بەندەگیو پەرستشەوە كەكارێكی ئایینییە ،سۆنگەو سەرچاوە بۆی تەنها (نیگا ـ الوحی)ە لەم بارەیەوە لەفەرموودەیەكی راستدا پێغەمبەر ﷺ ە. ئەفەرمووێ: (من احدث في امرنا ما ليس منه فهو رد )[2]، لەبەرئەوەی حەقیقەتی ئایین لە دووخاڵدا ئەنوێنرێ:

**یەكەمیان**: جگە لە زاتی (الله) پەرستراوێكی تری بریار نەدابێ .

وە **دووەمیان** ئەوەیە: پێویستە بەوە بپەرستێ كە خوای گەورە بۆی داناوە ، وەئەوەی لەلایەك خۆیەوە جۆرە پەرستنێك دابهێنێ ـ ئیتر هەرجۆرێك بێت ـ ئەوە گومڕاییەو ئەگەرێنرێتەوە.

چونكە بە تەنها خوای گەورە خاوەن مافە لە داڕشتنی ئەو بەندەگییانەی كە بە هۆیانەوە مرۆڤ لە خوای گەورە نزیك ئەبێتەوە.

بەڵام (دابو نەریت – العادات – المعاملات) خوای گەورە سەرچاوەی نییە ، بەڵكو خودی مرۆڤ خۆی سەربەنو سەرچاوەیە بۆیانو مامەڵەیان پێ دەكات، وەخوای گەورە هەڵدەستێ بەراستو رێك كردنەوەی ئەو مامەڵەو دابو نەریتانە ، و جێگیركردنیان بەجۆرێك بچوكترین زیانو لادان دروست نەكات.

شێخی ئیسلام (ابن تیمیە) ئەفەرموێ: (بێگومان كردەوەكانی بەندەكانی

[1]/ رواه الدار قطني وحسنه النووي ، ت :٤.
[2]/ متفق عليه ، ت:٥.

خوا له كردارو گوفتار دوو جۆرن:

(پەرستشەكان ـ العبادات) كه چاكسازى ئاينەكەيانى پىٚ‌ئەنجام ئەدەن‌و، (داب و نەريت . العادات) هەموو ئەوانەن كه مرۆڤ بۆ راپەڕاندنى كاروبارى دونيا پێويستيان پىٚ‌دەبىٚ، بۆيە بەخوێندنەوەيەك بۆ پرنسيپ‌و بنچينەكانى شەريعەت بۆمان روون ئەبێتەوە، كەئەو پەرستشانەى خواى گەورە پێويستى كردوون يا خود پێيان خۆشحاڵ ئەبێت ئامانجدار نابێت تەنها بەشەرعى خواى گەورە نەبێت).

بەلاّم (نەريتەكان ـ العادات) ئەوانەن كه مرۆڤەكان لە ژيانى دونيايانىدا كردوويانەتە نەريت‌و پێويستيان پێيان دەبێت، وە ئەصڵيش بۆيان حەرام نەبوونيانەو، ناتوانين بڕيارى حەراميان بەسەردا بدەين، مەگەر خواى گەورە خۆى حەرامى كردبێتن.

ئەمەش لەبەرئەوەيە كەئەرىٚ و نەرىٚ كردن لەكردارەكان و هەڵوێستەكان، تەنها مافى خواى گەورەيە، وەبەندايەتيش پێويستە فەرمان پێكراوبىٚ، مادام ئەو راستييە نەچەسپابىٚ كە ئەمە جۆرێكە لە بەندايەتى‌و پێويستە، كەواتە چۆن بڕيارى حەراميى بەسەردا ئەدرىٚ ؟!

هەربۆيە پێشەوا (احمد) و فەقيهەكانى فەرمووده ئەڵێن: بێگومان بنچينە لەپەرستشەكاندا (التوقيف)ە، وەجگە لەپرۆگرامى خواى‌گەورە پرۆگرامێكى دى لىٚ‌داڕشتە ناكرىٚ، وەگەرنا ئەچينە بازنەى ئەوكەسانەى كەخواى گەورە دەربارەيان دەفەرموىٚ: ﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُمْ مِنَ الدِّينِ مَالَمْ يَأْذَنْ بِهِ اللَّهُ﴾ الشورى: ٢١.

وەسەبارەت بە نەريتەكان (العادات) بنچينەو ئەصڵ تياياندا لێبووردن‌و ڕێگەپێدانيانە، وە حەرامێكيان تێدانييە مەگەر ئەوەيان نەبێت كەخواى گەورە حەرامى كردووە، وەگەرنا ئەوا ئەچينە ماناى ئەو ئايەتە پيرۆزەى كە ئەفەرموێت: ﴿ قُلْ أَرَأَيْتُمْ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ لَكُمْ مِنْ رِزْقٍ فَجَعَلْتُمْ مِنْهُ حَرَاماً وَحَلالاً قُلْ آللَّهُ أَذِنَ لَكُمْ أَمْ عَلَى اللَّهِ تَفْتَرُونَ ﴾ يونس: ٥٩.

ئەمە ياسايەكى مەزنى سوودمەندە ، گەر وابێت ئەڵێين:

١. فرۆشتن‌و بەخشين‌و بەكرێدان‌و ئەم جۆرە نەريت‌و باوانەى كە مرۆڤ لە ژيانيدا پێويستى پێيانە وەك خواردن‌و خواردنەوەو پۆشاك، دائەنرێت بە داب‌و نەريتە باشەكان، وەئەوەيان كە لادانى رووى تىٚ بكات حەرام كراوە، وە ئەوەى كەگرفتێكى تێدانييە پێويست كراوە، وەپێى باش نەبووە ئەو نەريتانەى بۆنى

ناباشییان لێهاتووەو ، لەپاڵ ئەمەشدا ئەوانەی ئومێدی چاکەی لێکرابێ بە باش دانراوە کە ئەنجام بدرێ ئیتر ئایا ئەو ئومێدی باش لێکردنە لە بڕ یاخود خەصڵەت و سیفەتیاندا بووبێت.

گەر وابێت، خەڵکی لەنێوەندە خۆیاندا ئەفرۆشنو بە کرێ ئەدەن بەو جۆرەی ئارەزووی ئەکەن ، مادام شەریعەت بڕیاری حەرامیی بەسەردا نەدابێ، وە گەر هەندێکیان (مستحب) بن، یاخود (مکروه) بن ، و ئەوەی کە شەریعەت سنوورێکی بۆ دانەناوە، بەو جۆرە لەسەر رەهاییە بنەڕەتییو ئەصڵییەکەی خۆی ئەمێنێتەوە)[1].

وەلەوانەی بەڵگەن لەسەر ئەم ئەصڵە ناوبراوەوە ئەوەیە کە لە (الصحیح) دا لە جابر بن عبدالله وە هاتووە ئەفەرموێ: ( كنا نعزل : والقرآن يترل ، فلو كان شيء ينهى عنه لنهي عنه القرآن ).

ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە" ئەوەی (نیگا – الوحی) لێوەی بێدەنگە حەرام نییەو نەرێی نەکراوە، وە بەحەلاڵی ئەمێنێتەوە ، هەتا دەقێك دێتو بڕیاری قەدەغە یاخود نەرێ کردنی بەسەردا ئەدات، ئەمە لەتەواوی تێگەیشتنی هاوەڵانە ﷺ بەم جۆرە ئەم یاسا بەرزە جێگرئەبێت کە ئەفەرموێت: پێویستە جۆرێك لە بەندایەتی دانەنرێت تەنها بە شەرعی خوای گەورە نەبێت، وە دابو نەریتێکیش حەرام نەکرێت تەنها بە حەرامکردنی لەلایەن خوای گەورەوە نەبێت.

## ٢ـ حەلاڵکردنو حەرامکردن تەنها مافی خوای گەورەیە

**پرەنسیپی دووەم:** لەڕاستیدا ئیسلام ئەو سوڵتەو دەستەلاتەی خاوەنی حەلاڵ کردنو حەرامکردنە، دیاری کردووەو لە ژێر دەستەلاتی بەدیهێنراوان دەریهێناوە، ئیتر پلەیان لەئاییني خواو دونیای خەڵکیدا هەرچۆنێك بێت ، و گێڕاویەتی بەتەنیا مافی خوای گەورە، نەك پیاوانی ئایینیو گۆشەگیرانو پاشاو دەستەلاتداران، کە ناتوانن ببنە ئەو دەستەلاتەی هەرگیز کارێك بکەن لەسەر حەرام کردنێك لەسەر بەندەکانی خوا. ئەوەی ئەم کارە ئەنجام بدات، ئەوا بێگومان سنووری بەزاندووەو دەستدرێژیی کردووەتە سەر مافی پەروەردگار لە یاسادانانـدا بۆ ئافرەیینەکانی، وە ئەوەشی رەزامەندیی بەم کارەیان پشان بدات و شوێنیان

[1]/ القواعد النورانیه الفقهیه تالیف ابن تیمیه، ص١١٢،١١٣ وە لەسەر بنچینەی ئەم یاسایە ابن تیمیە بڕیاریداوە لەگەڵ قوتابیەکەیدا (ابن القیم)و زۆرینەی فەقیهەکانی حنابلە: ئەصڵ عقدومەرجدا رەوابوونیەتی، وەهەر عقدو بەندێك دەقێك سەبارەت بەحەرامکردنی نەهاتو تایبەتی نەکرد، وەحەرامی نەگرتەوە، ئەوا حەلاڵ و رەوایە.

بکـەوێت، ئـەوا کردویاننـە هاوبەشـی خـوای گـەورە، و ئـەم شـوێن کەوتنـەیان بەهاوبەش بڕیاردان – شرك – ناوزەد ئەکرێ ﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُمْ مِنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنْ بِهِ اللَّهُ ﴾ الشورى: ٢١ .

ئەوەتا خـوای گـەورە دێتـە سەرباسـی جولەکـەو دیانـەکان کـە دەسـتـەڵاتی حـەڵاڵ کـردن و حـەرامکردنیان داوەتـە دەسـت پیـاوانی ئـاییني و راهیبـەکانیان ﴿اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَاباً مِنْ دُونِ اللَّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا إِلَهاً وَاحِداً لا إِلَهَ إِلَّا هُوَ سُبْحَانَهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾ التوبة :٣١.

عدی کوری حاتم هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، کـەپێش موسڵمان بـوونی مەسیحی بـوو ، کاتێك گوێبیستی ئەوئایەتـە بـوو کـە پێغەمبـەر ﷺ ئەیخوێنـدەوە پێشـتر ئامـاژەمـان پێکـرد ، بۆیـە وتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا! ئـەوان نـەیان پەرستوون، فەرمووی: (بەڵێ " ئەوان حەڵاڵیان بۆ حەرام کردوون و حەرامیان بۆ حەڵاڵ کردوون، و ئەوانیش شوێنیان کەوتوون ، ئەوەش پەرستنە بۆیان)[1].

وە لەگێڕانەوەیەکـدا سـەبارەت بـە راڤـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـۆ ئایـەتی ئاماژە پێکراو فەرموویەتی: (ئەوان بەپەرستن نەیانئەپەرستن ، بەڵکو گەر شتێکیان بۆ حەڵاڵ بکردنایە بە حەڵاڵیان دائەنا، وەگـەر شتێکیان بـۆ حـەرام بکردنایـە، ئـەوا بەحەرامیان دائەنا.

هـەتا هەنووکـەش دیانـەکان (مەسیحیەکان) وائـەزانن کـە کاتێـك حـەزرەتی مەسیح ﷺ بەرز کرایەوە بەرەو ئاسمان، قوتابیەکانی بەردەستی سەرپشك کرد کە بەئارەزووی خۆیان حەڵاڵو حەرامیان بۆ دیاری بکـەن، هـەروەك لـە ئینجیلـی (متـا) دا هـاتووە ١٨:١٨(راسـتییان پـێ رائەگەیـەنم، ئـەوەی لەسـەر زەویـدا بـە هـەمان شێوەشە لەئاسماندا).

هەروەك تانەو تەشەر لە بێ بڕوایان ئەدات، ئەوانـەی بـەبێ مۆڵـەتی خـوای گەورە حەرامو حەڵاڵ دیاری ئەکەن.

خوای گەورە ئەفەرموێت : ﴿ قُلْ أَرَأَيْتُمْ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ لَكُمْ مِنْ رِزْقٍ فَجَعَلْتُمْ مِنْـهُ حَرَاماً وَحَلالاً قُلْ آللَّهُ أَذِنَ لَكُمْ أَمْ عَلَى اللَّهِ تَفْتَرُونَ ﴾ يونس:٥٩.

هەروەها ئەفەرموێت: ﴿وَلا تَقُولُوا لِمَا تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمُ الْكَذِبَ هَذَا حَلالٌ وَهَـذَا حَرَامٌ لِتَفْتَرُوا عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ إِنَّ الَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ لا يُفْلِحُونَ ﴾ النحل: ١١٦.

[1]/ الترمذي وغيره وحسنه، ت:٦.

لـەم ئایەتـە پـیرۆزو فـەرمووده ئاشـكرایانەوە زانایـانی فـەقیهی ئیسـلامی بۆیان روونبووەتەوە كەهەر تەنها خوای گەورە مافی حەلاڵ كردنو حەرام كردنـی هەیـە وە لـەقورئانی پـیرۆزدا یـاخود لەسـەر زاری پێغەمبەرەكەیـەوە ﷺ و ئـەركی سەرشانی مرۆڤ لە روونكردنەوەی بریارەكانی خوای گەورە لەوانەی كە حـەرام یـان حەلاڵن لەوە بەدەر نییە ﴿ وَقَدْ فَصَّلَ لَكُمْ مَا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ ﴾ الأنعام:١١٩.

هـەروەك ئاشـكرایە ئـەركی سەرشـانی مـرۆڤ بریتیـی نییـە لـە تەشـریعو یاسادانان لەوانەدا كە دروست یاخود نادروستن. وەزانایانی ئایینی ئیسلام لەگەڵ ئیجتهادو پێشەوا بوونیان هەمیشە لە دەست فەتواو بریاردان هەڵهاتوون و هەندێك جار ئەم ئەركە گرانەیان ئاراستەی یەكتری كردووە، دیارە ئەمەش لە ترسی ئەوەی نەوەكو بە هەڵە حەلاڵێك حەرامو حەرامێك حەلاڵ بكەن.

پێشـەوا شـافیعی لە كتێبەكەیـدا (الأم) (القاضي ابي يوسف) هـاوەڵی پێشـەوا (حەنیفـە) ئەگێرێتـەوە: دەركـم بـەوەكرد كـە زانایانمـان فتوادانیـان زۆر بـەلاوە ناڕەحەتو گران بووە كە بڵێن: ئەمە حەلاڵەو ئەوە حەرامە، تەنها ئەوە نەبێت كە لە قورئاندا بە روونو ئاشكرایی هاتووە بەبێ راڤەكردن.

(ابن السائب) لـە (الربيــع ابــن خثــيم) كەیەكێكە لـە هـەرە باشترین شـوێن كەوتووەكان (التابعين) كە وتوویەتی : ( هەرگیز نەكەن بڵێن: خـوای گـەورە ئەمـەی حەلاڵ كردووە پێشی رەزامەندم! یاخود بڵێت: خوای گەورە ئەمەی حەرام كردووە، خوای گەورەش ئەفەرموێ: راست ناكات" حەرامم نەكردووەو نەرێم لێ نەكردووە).

وەهەندێك لە هاوەڵانمان لە ئیبراهیمی نەخەعییەوە ئەدوێن - كە لـە گـەورە فەقیهەكانی كوفە بووە - كە دەربارەی هاوەڵەكانی دواوە، كاتێك فەتوایان بەشتێك بدایە، یان نـەرێیان لێ بكردایـە، ئـەیانوت: ئەمـە مەكروهـە، وە ئەمـە دروسـتە، بـەڵام زۆر گەورە مەگەر راستەوخۆ بوترێ ئەمە حەلاڵەو ئەوە حەرامە!

ئەمـە ئـەبو یوسـف لـە پێشـینەكانەوە وەریگرتـووە، وەپێشـەوا شـافیعیش لێوەی وەرگرتووەو ئیقراری لەسەر كردووە، هەروەك (ابن مفلح) لە (ابــن تيميــة)وە وەریگرتـووە: لـە راسـتیدا پێشـینەكان نـاوی حـەرامیان لە شـتێك نـەناوە مەگـەر بـە قەطعي بەڵگە لەسەر حەرام بوونی هاتبێ.

هەروەها ئەبینین كەپێشەوا ئەحمـەدی كوڕی حەنبـەل پرسـیاری لێ ئـەكرێ دەربارەی شتێكو ئەفەرموێت: پـێم باش نییـە، یـاخود سـەرنجم راناكێشـێ، و ئـەم جۆرە دەربڕینانە.

لە نموونـەی ئەمانـەدا لـە مالیكو (ئـەبو حەنیفە) و هـەموو پێشـەوایانەوە گێڕدراوەتەوە.

## ٣ـ حەرام كردنی حـەلاڵو حـەلاڵكردنی حـەرام نزیكـە لـە هاوبـەش بڕیاردانەوە:

كاتێ ئیسلام تانەو تەشەر لەوانە ئەدات كە حەلاڵو حەرام بە ئارەزووی خۆیان دائەنێن، زیاتر رووی هەڕەشەكان تایبەت ئەكات بەوانـەی كە حەلاڵ حەرام ئەكەن، بە لەبەرچاو گرتنـی ئەوەی كە ئەم جۆرە حەرام كردنە زۆر ئەكاتە سـەر ئـادەمیزادو بـوار بـۆ مـرۆڤ زۆر تەسـك ئەكاتـەوە، لەكاتێكـدا خـوای گـەورە بـواری بەرفراوانی پێبەخشیووە، و لەگـەڵ بـاری سـەرنجی هەندێكیانـدا ئـەگونجێو وێـڵ ئەكەوێتەوە، دیارە ئەمەش بۆ ئەوانەیە كە زۆر توندو تیـژنو رۆچوونی زیادیـان هەیە لە پراكتیزەكردنـی ئاینیـدا، لەراستیدا پێغەمبـەر ﷺ بەهـەموو جۆرە چەكێك لەگـەڵ ئـەم جۆرەكەسـە توندو تیژانـەدا جـەنگاوە،و بـەخراپ ناوزەدیـان ئـەكاتو هەواڵی تیاچوونیان ئەدات، كە ئەفەرموێ: ( ألا هلك المتنطعون ألا هلك المتنطعـون ألا هلك المتنطعون )[1] واتـە: ئاگادار بـن، ئەوانـەی كـە زۆر تونـدگیرو رۆچوون لەئاییندا تیاچوون، ئەمەی سێجار فەرموو.

هەروەها فەرموویەتی: ( بعثت بالحنفيـة السـمحة )[2] واتە: مـن نێردراوم بە ئـاینێكی پـاكیزەو چاوپۆشـیكار. بێگومـان ئـاینێكی بێگـەردە لـە بیروبـاوەڕو یەكتاناسیدا، لێوردەیە لـە بـواری پراكتیكی و یاسا داناندا. وە دژی فەرماندەرانە بە بێ بڕوایی‌و ئەوانـەی حـەلاڵ حەرام ئەكەن، ئەمانـە ئەو دوو جـۆرە كەسـەن كە پێغەمبەری خوا ﷺ لە خـوای گـەورە ئەگێڕنەوە: ( إني خلقت عبادي حنفاء واهم الهـم الشياطين، فاجتالتهم عن دينهم، وحرمت عليهم ما الت لهم، وامرتهم الا يشركوا بي مالم يترل به سـلطانا )[3] واتـە: مـن بەنـدەكانم وەهـا دروسـت كـردووە كە ئارەزووی پـاكیزەیی نەكـەن، بـەلاّم شـەیتانەكان هـاتنو لـە ئایینەكەیانـدا دووچـاری لادانیـان كـردنو حەلاّلیان لێ حەرام كردن ، و فـەرمانیان بەسـەردان بە هاوبـەش بڕیاردان لـەوەدا كە دەستەلاّتداری بەسەردا نەهێنا.

بۆیە حەرامكردنی حـەلاڵ لـە شێوەی هاوبـەش بڕیارداندایە، بۆیـە قورئـان

---

[1]/ رواه مسلم وأحمد و أبو داود ، ت:٧.
[2]/ رواه أحمد ، ت:٨.
[3]/ رواه مسلم ، ت:٩.

زۆر بەتوندی دەربارەی هاوبەش بڕیاردەرانی عەرەب ئەدوێت کە چۆن هاوبەش بڕیار ئەدەن‌و بت ئەپەرستن‌و حەڵاڵە جوان‌و پاکەکانی خوای گەورە لە کشت‌و کاڵ و ئاژەڵ لە خۆیان حەرام ئەکەن، لەکاتێکدا خوای گەورە خۆی ڕێگەی پێ داون، لەوانە حەرام کردنی ( البحيرة - السائبة - الوصيلة - الحام )چونکە ئەوان لە سەردەمی نەفامیدا گەر وشترێك سێ سکی بکردایەو دوایەمینیان نێرە بوایە، ئیتر گوێیەکانیان هەڵئەدڕی‌و، نەیانئەهێشت کەس بچێتە سەرپشتی، و بەجێیان ئەهێشت بۆ خواکانیان، ئیدی نەسەر ئەبڕا، وەنەباری لێ‌ئەنرا، وە بەرەڵایان نەئەکرد بۆ ئاوخواردنەوەو لەوەڕاندن و پێیان ئەوت ( البحيرة ) واتە: گوێ لەت بوو: وە ئەگەر یەکێك لەگەشت بهاتایەتەوە، یاخود لە نەخۆشیەك رزگاری ببوایە، یان هەرشتێکی تری لەم جۆرانە، ئەوان حوشترەکەی بەرەڵا ئەکردو، وەك (البحيرة)ی لێ ئەکرد، بەمەیان ئەوت (السائبة)، وە ئەگەر بەچکەوشترێك بەمێ لەدایك بوایە ئەوا دایان ئەنا بۆ خۆیان، وەئەگەر نێرە بوایە، ئەوا دایان ئەنا بۆ خواکانیان، وە ئەگەر نێرەو مێیەك بوونایە، ئەوا ئەیانووت، وشترە مێیەکە بە براکەی گەیشت، ئیتر نێرەکەیان سەر ئەبڕی بۆ خواکانیان، بەمەیان ئەوت (الوصیله) وە ئەگەر نێرەکەیان بیپەڕیایە لە بەچکەی بەچکەکەی، ئەوا پشتی قەدەغە دەکرا لە سەرکەوتن‌و بار لێنان، بەمەیان ئەوت (الحامی) ، وە لە راڤەی ئەم چوارەدا، رای زۆرهەن دەربارەی ئەم تەوەرەیە.

قورئانی پیرۆز نکوڵی لەم جۆرە حەرامکردنە ئەکات، وەهیچ جۆرە پاساوێکیان لێوەرناگرێ لە لاسایی کردنەوەی باووباپیرانیاندا لەم گومراییەدا ﴿مَا جَعَلَ اللَّهُ مِنْ بَحِيرَةٍ وَلَا سَائِبَةٍ وَلَا وَصِيلَةٍ وَلَا حَامٍ وَلَكِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا يَفْتَرُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ وَأَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ، وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا إِلَى مَا أَنْزَلَ اللَّهُ وَإِلَى الرَّسُولِ قَالُوا حَسْبُنَا مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا أَوَلَوْ كَانَ آبَاؤُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ شَيْئًا وَلَا يَهْتَدُونَ﴾ المائدة : ١٠٣.

وە لە سوورەتی (الأنعام)دا گفتوگۆیەکی تێرو تەسەل هەیە لەسەر ئەو وشترو رەشەوڵاخ‌و مەڕو بزنانەی کە بێباوەڕان حەرامیان داناون، ئەوەتا قورئان لە شێوەی گاڵتەجاریدا دەربارەیان ئەدوێت: ﴿ثَمَانِيَةَ أَزْوَاجٍ مِنَ الضَّأْنِ اثْنَيْنِ وَمِنَ الْمَعْزِ اثْنَيْنِ قُلْ آلذَّكَرَيْنِ حَرَّمَ أَمِ الْأُنْثَيَيْنِ أَمَّا اشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ أَرْحَامُ الْأُنْثَيَيْنِ نَبِّئُونِي بِعِلْمٍ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ﴾ الأنعام : ١٤٣.

وە لە سوورەتی (الأعراف) یشدا گفتوگۆیەکی تر هەیە کە خوای گەورە نکوڵی دەکات لەوانەی کە حەرامەکارن واتە شت حەرام دەکەن، وەبنچینەکانی

حەرامکردنی هەمیشەیی روون ئەکاتەوە: ﴿ قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللَّهِ الَّتِي أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ وَالطَّيِّبَاتِ مِنَ الرِّزْقِ قُلْ هِيَ لِلَّذِينَ آمَنُوا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا خَالِصَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَذَلِكَ نُفَصِّلُ الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴾ الأعراف : ٣٢.

وەبوونی ئەم جۆرە گفتوگۆیانە لە سوورەتە مەکییەکاندا مانای هەمیشەیی لە جێگیرکردن و بەردەوام بوونی بیروباوەڕو یەکتاپەرستی و رۆژی دوایی هەیە، وە ئاشنامان ئەکات بەوەی کە ئەم جۆرە کارانە لە قورئاندا لە شتە بچووکەکان ناژمێردرێت، بەڵکو ئەبنە بنچینەو بابەتی زۆر گرنگ.

وە لە (المدينـــة) داو لەناو موسوڵماناندا و لەنێوان تاکەکاندا کەسانێك دەرکەوتن کە ئارەزووی توندگیرییان ئەکردو پابەندی حەرام کردنی بەخششەکانی خوای گەورە بوون لە خۆیان، هەر بۆیە خوای گەورە لە ئایاتە محکمەکان ئایەتێکی نارد کە لە سنووری خوای گەورەدا نەیوەستاندن: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاتُحَرِّمُوا طَيِّبَاتِ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكُمْ وَلا تَعْتَدُوا إِنَّ اللَّهَ لا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ وَكُلُوا مِمَّا رَزَقَكُمُ اللَّهُ حَلالاً طَيِّباً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي أَنْتُمْ بِهِ مُؤْمِنُونَ ﴾ المائدة:٨٧ ــ ٨٨.

## ٤ ـ حەرام کردن

لە مافی خوای گەورەو بەو هۆیەی کە ئافەریدەی مەردوومە و بەخششەکانی خۆی بەسەردا باراندووە کە لە ژمارە نایەن، ئەوەیە کە حەڵاڵ و حەرام دیاری بکات بەو جۆرەی ئارەزووی ئەکات ، هەروەك مافی خۆیەتی کە بە ئارەزووی خۆی ئەرك و خواپەرستنیان بەسەردا بدات، لەگەڵ ئەوەشدا بەندەکانی بۆیان نییە کە بەبەرەنگار یاخود سەرپێچی بکەن، ئەمەش مافی خواییەتی بەسەر بەندەکانیەوە.

بەڵام ئەوەتا خوای گەورە لەبەر ئەو سۆزو میهرەبانییەی بەرامبەر بەندەکانی ئەینوێنێ، حەرام و حەڵاڵ کردنی گێڕاوە بەهۆکارێکی دروستەوە، بەجۆرێك بگەڕێتەوە بۆ لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندییەکانی مرۆڤەکان خۆیان، بۆیە خوای گەورە ئەوەی چاك و باش نەبێت حەڵاڵی نەکردووە، وە ئەوەشی کە ناپاك و نەرەوا نەبێت حەرامی نەکردووە.

راستە خوای گەورە هەندێك بەشی لە چاك و پاکەکانی لەسەر گەلی جوولەکە حەرامکردووە، دیارە ئەمەش لەسەر شێوەی سزادایە دەرەنجامی ئەولادان و سەرپێچیانەی ئەنجامیانداوەو سنوورەکانی حەرامیان شکاندوە هەروەك خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿ وَعَلَى الَّذِينَ هَادُوا حَرَّمْنَا كُلَّ ذِي ظُفُرٍ وَمِنَ الْبَقَرِ وَالْغَنَمِ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ

شُحُومَهُمَا إِلَّا مَا حَمَلَتْ ظُهُورُهُمَا أَوِ الْحَوَايَا أَوْ مَا اخْتَلَطَ بِعَظْمٍ ذَلِكَ جَزَيْنَاهُمْ بِبَغْيِهِمْ وَإِنَّا لَصَادِقُونَ ﴾ الأنعام:١٤٦.

وەبێگومان خوای گەورە وێنەیەکی لەپشت هەڵکردن و یاخی بوون لە سوورەتێکی تردا ئاشکرا کردووە، ئەوەتا ئەفەرمووێ: ﴿ فَبِظُلْمٍ مِنَ الَّذِينَ هَادُوا حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَاتٍ أُحِلَّتْ لَهُمْ وَبِصَدِّهِمْ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ كَثِيراً وَأَخْذِهِمُ الرِّبَا وَقَدْ نُهُوا عَنْهُ وَأَكْلِهِمْ أَمْوَالَ النَّاسِ بِالْبَاطِلِ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ مِنْهُمْ عَذَاباً أَلِيماً ﴾ النساء ١٦٠-١٦١.

بۆیە کاتێک خوای گەورە پایانی پێغەمبەرانی نارد بەئایینێکی گشتی نەمر، وە بەسۆزو میهری خۆی لەدوای پێگەیشتن، ئەو نارەحەتییەی بەسەر گەلێکی لەخوا یاخیدا هێنابووی هەروەک تەورات باسی ئەکات، ئەو سزایەی هەڵگرت کە وەک پەندێکی کاتی وابوو بۆیان، هەروەها ئەدرەسی پەیامە محمدییەکە لەلای خاوەن کتێبەکان . هەروەک قورئان باسی لێوە ئەکات . کە ئەوان: ﴿ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الْأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوباً عِنْدَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالْأِنْجِيلِ يَأْمُرُهُمْ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنْكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالْأَغْلالَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ ﴾ الأعراف:١٥٧.

خوای گەورە لەئیسلامداو بۆ کەفارەتی گوناهەکان، جگە لەحەرامکردنی شتە دروست و باشەکان میکانیزمی تری بۆ مرۆڤی موسڵمانانی گوناهبار داناوە " ئەویش گەڕانەوەو پەشیمان بوونەوەیەکی راست و دروستە (التوبة النصوح) ، کە چەشنی ئاوێکی پاکیزە وەهایە لەپاککردنەوەی ناپاکییەکدا، هەروەها چاکە کاریش میکانیزمێکی ترە بۆ سڕینەوەی هێڵی تاوانەکان، سەرباری ئەمانەش بەخشین و (صدقە) بە وێنەی ئاوە لەکاتی کوژانەوەی ئاگردا، هەروەها چەشنی ئاستەنگ و کۆستەکانی سەرەڕێی ژیان کە بەهۆیانەوە وەک گەڵاڕێزان گوناهو ئەوەرێنن.

بەمە بۆمان روون بووەوە کە حەرام کردن لەئیسلامدا تەنها تایبەتە بە شتە ناپاک و زیان بەخشەکان، بۆیە هەرشتێک بەتەواوی زیانمەند نەبێت حەرام زیانەکەی لەسوودەکەی زۆرتر بێت ئەوا حەرامە، بەڵام گەر سوودەکەی زیاتربێت لە زیان ، ئەوا حەڵاڵ کراوە، وەئەوەی زیانەکەی لە سوودەکەی زۆرتربێت ئەوا حەرامە ، بەڵام گەر سوودەکەی زیاتر بێت لە زیان ، ئەوا حەڵاڵە، ئەمەیە کە گوتاری قورئانی لەبارەیەوەو لەبارەی بیرەو مادده سڕکەرەکان ئەفەرموێ: ﴿يَسْأَلونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَا أَكْبَرُ مِنْ نَفْعِهِمَا﴾ البقرة : ٢١٩.

هەروەك بووە بەیەكێك لەوەڵامە راشكاوو راستەوخۆكان بۆ پرسیاركردن دەربارەی حەڵاڵ لە ئیسلامدا كە بریتییە لە (الطیبات) واتە ئەو شتانەی كە دەروونی پاكیزە بەخاوێنیان دائەنێو ، خەڵكیش بەگشتی پێیان باشە، بەڵام جۆرە پێ باش بوونێك كە لە داب و نەریتەوە سەرچاوەی نەگرتبێ، خوای گەورە ئەفەرموێ : ﴿ يَسْأَلُونَكَ مَاذَا أُحِلَّ لَهُمْ قُلْ أُحِلَّ لَكُمُ الطَّيِّبَاتُ ﴾ المائدة: ٤.

پێویست ناكات مرۆڤ هەمیشەو هەردەم بە فەلسەفەی هەموو جۆرە حەرامكردنێك بزانێت، گەرنا ئەوا شتانێكی لێ ون ئەبن كە لای جگە خۆی روون و ئاشكران، وە هەندێكجار وارێك ئەكەوێ لە سەردەمێكدا نەتوانرێ پەی بە رازی حەرامكردنێك ببرێو بەو جۆرە بمێنێتەوە هەتا سەردەمێكی دی، ئەوەی لەسەر مرۆڤی موسوڵمان پێویستە بیڵێت: بیستمان و گوێڕایەڵیمان كرد.

ئەوەتا خوای گەورە خواردنی گۆشتی بەرازی حەرام و قەدەغە كردووە، وە موسوڵمان لەسەرەتاوە هۆكارێكی ئەوتۆیان نەدەزانی دەربارەی ئەم حەرام كردنە ، بەڵام بە تێپەڕبوونی رۆژگار زانست و تەكنەلۆژیای نوێ توانی دەری بخات كە گۆشتی بەراز جۆرە كرمێكی كوشندەی هەیە، وەگەر زانستی نوێ ئەم هۆكارەی دەرنەخستایە، موسوڵمان هەر ئەیزانی كە گۆشتێكی پیسە.

لەم بارەیەوە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ( إتَّقوا ملاعن الثلاث - أي التي تجلب على فاعلها اللعنة من الله والناس - : البزار في الموارد، وقارعة الطريق ، والظل)[1].

واتە: خۆتان بپارێزن لە سێ نەفرەت لێكراوەكە كە بكەرەكانیان نەفرەینی خوای گەورەو خەڵكی بۆخۆی مسۆگەر ئەكات . پاشەڕۆ دانان لە ئاودا و لە رێگەو لە سێبەردا.

ئەمانە ئەوەی دەربارەیان زانرابێ لە چەرخەكانی سەرەتادا تەنها ئەوە بووە كە شتانێكن پیس و سروشتی مرۆڤی بێزیان لێ ئەكاتەوە، بەڵام كاتێ زانست پێشكەوت، بۆمان دەركەوت كە ئەم سێ نەفرەت لێكراوە لە هەرە هۆكارە مەترسیدارەكانن بەسەر تەندروستی گشتییەوە، وەیەكەم سەرچاوەی بڵاو بوونەوەی نەخۆشییە ترسناكەكانن، وەك ئەنكلۆستوماو بەلهارزیا.

بەم جۆرە هەرچەندێك تیشكی زانست زیاتر بەخشان بێت، و بازنەی دۆزینەوەی زانیینەكان بەرفراوان بێت، زیاتر سوودو كەڵكی ئایینی ئیسلامیمان

---

[1]/ رواه مسلم واحمد وابوداود ، ت:٧.

بۆ بەرجەستە ئەبێت لە هەموو روویەکەوە، ئەی بۆ نا؟

لەکاتێکدا ئیسلام یاساودەستوری خوای زاناومیهرەبانی بەندەکانیەتی: ﴿ وَاللَّهُ يَعْلَمُ الْمُفْسِدَ مِنَ الْمُصْلِحِ وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَأَعْنَتَكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾ البقرة: ٢٢٠.

## ٥ ـ في الحلال ما يغني عن الحرام

لەخاڵە پۆزەتیڤەکانی ئیسلام ئەوەیە کە بەشێوازێکی ئاسانکاریی هاتووە ، وە حەرامێکیشی دانەناوە بە بێ‌ئەوەی قەرەبووی بەباشتر نەکاتەوە، بە جۆرێ کە جێگەی ئەگرێتەوە بەباشترین شێوە، هەروەك (ابن القيم) رەزای خوای لێ بێ روونی ئەکاتەوە[1].

ئەوەتا خوای گەورە (الأزلام)ی حەرام کردووە، وە لەجیاتی‌دا نوێژی ئیستخارەی داناوە. هەروەك سووخواردنی حەرام کردووە، لەبەرامبەریدا بازرگانی بەقازانجی حەڵاڵ کردووە. وە قوماری حەرام کردووەو لەبەرامبەردا بەدەستهێنانی پارەی بۆ حەڵاڵ کردوون لەئەنجامی پێشبڕکێ‌ی سوارچاکی و تیر ئەندازەییدا.

سەرباری ئەمانەش ئاوریشمی بۆ پیاوان حەرامکردوەو، لە بەرامبەردا چەندین جۆر پۆشاکی ناسكو رازاوەی خوریو کەتانو لۆکەی بۆ حەڵاڵو رەوا بینیون. هەروەك کار سێکسی ناردوستی حەرام کردووە، بەڵام لە بەرامبەریدا ژن هێنانی رەواو دروستی حەڵاڵ کردووە. بەو جۆرە خواردنەوەی ماددە بێ‌هۆش کارەکانی حەرام کردووە، لەبەرامبەردا خواردنەوەی شلەمەنیە بەچێژەکانی حەڵاڵ کردووە، هەروەها خواردنەوەی قێزەون و ناباشەکانی بۆ حەرام کردوونو لە بەرامبەردا خواردنەوە چاكو پاکەکانی بۆ حەڵاڵ کردوون.

بەم جۆرە گەر بەدواداچوونێك بۆ هەموو بڕیارە ئیسلامییەکان ئەنجام بدەین، بۆمان دەردەکەوێت کەخوای گەورە بوارێکی بۆ بەندەکانی تەسك نەکردووەتەوە، هەتا لەروویەکی ترەوە ئەو بوارەیان بۆ بەرفراوان نەکات لە هەمان رەگەز، چونکە بەڕاستی خوای گەورە ناخوازێت بەندەکانی دووچاری ناڕەحەتی و ماندووبوون ببن، بەڵکو خوازیاری ئاسانکارییو چاکەو رێنموییو سۆزو میهرەبانییە، هەروەك ئەفەرموێ ﴿ يُرِيدُ اللَّهُ لِيُبَيِّنَ لَكُمْ وَيَهْدِيَكُمْ سُنَنَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ وَيَتُوبَ عَلَيْكُمْ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ، وَاللَّهُ يُرِيدُ أَنْ يَتُوبَ عَلَيْكُمْ وَيُرِيدُ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الشَّهَوَاتِ أَنْ تَمِيلُوا مَيْلاً عَظِيماً يُرِيدُ اللَّهُ أَنْ يُخَفِّفَ عَنْكُمْ وَخُلِقَ الْإِنْسَانُ ضَعِيفاً ﴾ النساء: ٢٧.

[1] روضة المحبين ، لا ١٠ ، اعلام الموقعين ، ج٢ ،لا ١١١ .

### ٦ـ هەرچییەك بەرەو حەرام ئاڕاستە ببێ ئەوا حەرامە

لەو پرەنسیپانەی کە ئیسلام بڕیاری لەسەر داوە، ئەوەیەکە هەرشتێکی حەرام کرد، هەموو ئەو دەروازەو ڕێگایانەش ئەگرێت کە بەرەو ئەو حەرامە ئەچێت . بۆ نموونە : لەحەرامکردنی زینادا، هەموو سەرەتاکانی ئەم تاوانەیشی حەرام کردووە لە خۆدەرخستنی ئافرەتو، تەنیابوونی ئافرەتو پیاو پێکەوەو ، تێکەڵاوی کاریگەرو، وێنەی نادروستو ، گۆرانی نادروستو ئەم جۆرە هۆکارانە. لەم خاڵەوە، زانایانی فیقهی ئیسلامی بڕیاری ئەم یاسایەیاندا: ( ما أدى الى حرام فهو حرام).

ئەم یاسایە لەو یاسا ئیسلامییە ئەچێت کە ئەڵێت کارێکی خراپ تەنها لەسەر ئەو کەسە نییە کە ئەنجامی ئەدات، بەڵکو بازنەکە بەرفراوانتر ئەبێت، بەوجۆرە هەرکەسێ بەکۆشانێکی مادی یان کرداری هاوبەشی تیادا کردبێت، ئەیگرێتەوە، وەهەریەکە بەگوێرەی ئەو بەشدارییەی تاوانی بۆ ئەنوسرێ. بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی بیرەو عارەق، هاوبەشی نێوان ئەو کەسەی ئەیخواتەوەو ئەوەی دروستی ئەکاتو ئەوەی هەڵیئەگرێتو ئەوەی بۆی ئەبرێو ئەوەی نرخەکەی ئەخوات، هەروەك باشتر باسیان لێوە ئەکەین.

### ٧ـ فێڵ کردن لەسەر حەرام ، حەرامە :

ئیسلام هەموو هۆکارو دیاردەکانی بەرەو حەرامکردن حەرامکردووە، فێڵ دۆزینەوەش بۆ ئەنجامدانی حەرام بەهۆکاری شاراوەی حەرام کردووە، وە حەرام کردنی فێڵە شەیتانییەکان. ئەوەتا ئیسلام ڕەخنە لەجوولەکە ئەگرێ کە بە هۆی فێڵەوە حەرام حەلاڵ ئەکەن، بۆیە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ( لا ترتكبوا ما إرتكب اليهود وتستحلوا محارم الله بأدنى الحيل)[1]. واتە: ئەوەی جوولەکە ئەنجامیدا ، ئێوە ئەنجامی مەدەن، و هەستن بە حەڵاڵکردنی حەرام کراوەکانی خوا بە بچوکترین فێڵێك.

جوولەکەکان خوای گەورە ڕاوی ڕۆژانی شەممەی لێحەرام کردوون، وە ئەوانیش سنووری ئەم حەرامکردنەیان بەزاندووە، بەوەی لە ڕۆژی هەینیدا چاڵ هەڵئەکەنن تاکو لە ڕۆژی شەممەدا ماسی تێبچێ، و لە ڕۆژی یەك شەممەدا

[1] / ابن القيم لە (اغاثة الهفان) داهێناویەتی، ج١ ، لا ٣٤٨و ئەڵێت: ابو عبدالله ی کوڕی بطه بە سەنەدێکی باش گێڕاویەتیەوە کە ترمذي لەو جۆرەی بە (صحیح) داناوە ، ت :١١.

بیانبەن. دیارە ئەم جۆرە فێڵ کردنە لەلای ئەو لادەرانە دروستە، بەلاّم لای زانایانی ئیسلام حەرامە" چونکە مەبەست نەریّ کردنی راوە بەهەموو جۆرێك ئیتر ئایا ئەو راوە راستەوخۆ بێت، یاخود بە هۆکارێکەوە بێت.

وە لەو فێڵە نادروستانەی ئەنجام ئەدریّ ناوهێنانی شتەکانە بە بیّئاوی راستەقینەی خۆیو، گۆڕینی وێنەکەییو هێشتنەوەی ناوەڕۆکەکەی وەکو خۆی، گومانیش لەوەدا نییە کە بە تەنها گۆڕانی ناوو مانەوەی هەرگیز ئاماژەنین بۆ گۆڕانێکی جەوهەرییو راستەقینە.

بۆیە گەرخەڵکی هەستێت بەداهێنانی جۆرێك لە فێڵو حەلاّڵکردنی خواردنی سوو ، یاخود جۆرە ناوێکی تریان بۆ (خمر) بەکارهێناو خواردنەوەیان حەلاّڵ کرد، بەو جۆرە گوناهو تاوانەکە ئەمێنێتەوەو لەگەڵیدا ئەبێت . لە فەرموودەیەکدا: ( ليستحلّن طائفة من أمتي الخمر يسمونها بغير إسمها )[1]. واتە: کۆمەڵێك لە ئوممەتی من هەڵئەستن بەحەلاّڵکردنی خواردنەوەی شەراب لە رێگەی بەکار هێنانی ناوێکی جگە لەناوە راستەقینەکەی خۆی. (يأتي على الناس زمان يستحلون الربا بإسم البيع)[2]. واتە: سەردەمێك بەسەر خەڵکیدا دێت کە سووخواردن حەلاّڵ دەکەن بەناوی فرۆشتنەوە.

بەڕاستی سەیرە! لە سەردەمی ئەمرۆماندا بەسەماکردنی ئارەزوو بزوێن ئەوتریّ هونەر!! وە بە شەراب ئەوتریّ مەشروباتی روحی!! و بەسوو ئەوتریّ قازانج !!.

## ٨ ـ نییەتی پاك پاساو نییە بۆ حەرام:

بێگومان ئیسلام پاڵنەرە بەرێزەکان ئەنرخێنێتو، مەبەست و نییەتە پاكو جوانەکانیش لەبەرچاو گیراون لە یاساو رێنموییەکاندا، ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێت: (إنّما الأعمال بالنيّات، وإنّما لكُلّ إمريءٍ مَا نَوَى)[3]، واتە: بێگومان کردارەکان بەگوێرەی نییەتەکانن، وەبێگومان هەموو مرۆڤێك بەگوێرەی نیەتەکەی پاداشتی ئەدرێتەوە، بەنییەتی پاك کردارە رێپێدراو دابو نەریتەکان ئەگۆڕێن بۆ فەرمانبەرداری خوای گەورە، بۆیە هەرکەسیّ نان بخوات بەنییەتی پاراستنی ژیانو بەهێزکردنی جەستەو ، بۆئەوەی بتوانێت هەستێت بە ئەرکەکانی سەرشانی

---

[1] / رواه أحمد ، ت:١٢.
[2] / له ( اغاثة اللهفان) دا هاتووه ج١ ، لا ٣٥٢ ، ت: ١٣ .
[3] / البخاري : ١٤.

بەرامبەر خوای گەورەو میللەتەکەی ئەوا ئەو نانخواردن و ئەوانەی کە ئەیخواتەوە لە شلەمەنی ئەبێتە پەرستش‌و لەخوای گەورەی نزیک ئەکاتەوە.

هەروەها سەبارەت بەمامەڵەی سێکسی نێوەند ئافرەت‌و، گەر بە مەبەستی خستنەوەی نەوەو داوێن پاکی هەردوولابێت، ئەوا پاداشتی گەورەیان بۆ هەیە لەلای خوای گەورە، لەم بارەیەوە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێت: (وفي بضع أحدكم صدقة . قالوا أيأتي أحدنا شهوته يا رسول الله ويكون له فيها أجر؟ قال: أليس إن وضعها في حرام كان عليه وزر؟ فكذلك إذا وضعها في حلال كان له أجر)[1] ( ومن طلب الدنيا حلالاً تعففها عن المسالة ، وسعياً على عياله، وتعطفاً على جاره لقي الله ووجهه كالقمر ليلة البدر)[2] ، واتە: هەرکەسێ بەشێوەیەکی دروست داوای دونیا بکات، بە جۆرێ لە درۆکردن بپارێزێت بۆ دابینکردنی گوزەرانی خۆیی‌و خێزانەکەی‌و سۆز نواندن بەرامبەر دراوسێکەی، ئەوا لەکاتێکدا بەخوای گەورە ئەگات، رووخساری هەروەك مانگی چواردە وەهایە.

بەهەمان شێوەو هەرکارێکی رێگەپێدراو کە مرۆڤی موسوڵمان هەڵئەسێت بەئەنجامدانی، و بەنیازو مەبەستێکی پاکەوە، ئەوا ئەبێتە پەرستن‌و بەندایەتی خوای گەورە بەڵام حەرام هەر حەرامە، هەرچەندە بکەرەکەشی نیازپاك بێت‌و ئامانجێکی پۆزەتیڤانەشی لەئەنجامدانیدا هەبێ، بەوجۆرە ئیسلام هەرگیز خۆشنوود نییە بەکارێکی حەرام کەوەك میکانیزمێك بەکاربێت بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی پاك‌و پەسەند، چونکە ئیسلام زۆر داکۆکی ئەکات لەسەر پیرۆزیی ئامانج‌و پاکیزەیی میکانیزمەکان پێکەوە. چونکە شەریعەتی ئیسلام هەرگیز لە ژێر یاسای (الغاية تبرر الوسيلة)دا کارتێکراو نابێت، یاخود پرەنسیپی (گەیشتن بە راستی بەحەڵاڵ کردنی حەرامێکی زۆر)، بەڵکو لەئیسلامدا وا پێویست ئەکات کە بۆ گەیشتن بەراستی تەنها ئەبێ خودی راستی میکانیزم بێت.

بۆیە گەر کەسێك سامان‌و داراییەکی کۆکردەوە لە رێگەی سووخواردن، یاخود کاری ناپەسەندو ناڕەواو قومار یان هەر کارێکی حەرام، بۆ ئەوەی مزگەوتێك یاخود پرۆژەیەکی خێرخوازی پێ‌ئەنجام بدات یان هەرکارێکی باشی تر، ئەوا نییەتەکەی هەرگیز نابێتە تکاکارێك بۆی‌و گوناهەکەی لەسەر لا ناچێت،

---

[1]/ رواه الشيخان ، ت: ١٥.

[2]/ دەقی فەرموودەیەکە الطبراني گێڕاویەتیەوە، ت:١٦.

**چونکە لەئیسلامدا حەرامەکان مەبەستو نییەتی پاك کاریان تێناکات.**

**ئەمەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فێری کردووین، کاتێ ئەفەرموێت:** ( إنَّ الله طيب لا يُحب إلا طيباً، وإنَّ الله أمر المؤمنين بما أمر به المرسلين ) **بۆیە فەرموی:** ﴿ يَا أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُوا مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَاعْمَلُوا صَالِحاً إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴾ المؤمنون:٥١. **هەروەها فەرمووی:** ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُلُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ وَاشْكُرُوا لِلَّهِ إِنْ كُنْتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴾ البقرة:١٧٢. **پاشان فەرمووی:** ( الرجل يطيل السفر أشعث أغبر ساعياً للحج والعمرة ونحوهما ) **دەستی بەرز ئەکاتەوە بۆ ئاسمان** (يارب يارب) و مطعمه حرام، ومشربه حرام، وملبسه حرام، وغذي بالحرام فاني يستجاب لذلك)[1] .

**واتە: کەسێك کەبەرەو گەشتێکی درێژخایەن ئەچێتو لاشەی تۆزاوییە، وەك حەجو عەمرە کردن دەستەکانی بەرز ئەکاتەوە بۆ ئاسمانو ئەڵێت: خوایە خوایە، لەکاتێکدا خواردنو خواردنەوەو جلەکانی حەرامنو بە حەرامیش گۆشکراوە، کەواتە چۆن وەڵامی نزای ئەمە ئەدرێتەوە؟!**

**هەروەها ﷺ ئەفەرموێت:** (من جمع مالاً من حرام، ثم تصدق به، لم يكن له فيه اجر، وكان اجره عليه)[2] . **واتە: هەرکەسێ لە حەرام دارایییەك کۆبکاتەوە، و پاشان چاکەخوازیی پێوە بکات، ئەوا هیچ خێرێکی بۆ نانوسرێ وەتاوانەکەشی هەر بە سەرەوە ئەمێنێتەوە. هەروەها ئەفەرموێ:** (لايكسب عبد مالاً حراماً، فيتصدق به فيقبل منه، ولا ينفق منه، فيبارك فيه، ولايتركه خلف ظهره الاّ كان زاده الى النار ، إنَّ الله تعالى لايمحو السيء، ولكن يمحو السيء بالحسن، إنَّ الخَبيثَ لايمحو الخبيث)[3]. **واتە: بەندەیەك نییە کەدارایییەکی حەرام بەدەست بهێنێتو ، پاشان چاکەی پێ بکاتو خوای گەورە لێی وەربگرێت، وەکاریێ بکات بۆ خێزانەکەیو خوای گەورە بەپیتی بکات، وە هەڵیبگرێت ئەوا زیاتر بەرەو دۆزەخ راپێچی ئەکات. بێگومان خوای گەورە خراپە بەخراپە لانابات، بەڵام خراپە بە چاکە لائەبات، هەروەك ناپاکیش ناپاکی لانابات.**

## ٩ ـ پارێزکاری لەگومان لێکراوەکان لەترسی کەوتنە حەرامەوە:

**لەسۆزو میهرەبانی خوای گەورە بەسەر مرۆڤەوە ئەوەیە کەحەڵاڵ و حەرامی بە نائاشکرایی نەهێشتووەتەوە، بەڵکو روونی کردوونەتەوەو لەیەکتری جیای کردوونەتەوە، هەروەك ئەفەرموێ:** ﴿وَقَدْ فَصَّلَ لَكُمْ مَاحَرَّمَ عَلَيْكُمْ﴾ الأنعام:١١٩.

[1]/رواه مسلم والترمذي عن ابي هريرة، ت:١٧.
[2]/ رواه ابن خزيمة وابن حبان والحاكم عن بي هريرة، ت:١٨.
[3]/ احمد وغيره عن ابن مسعود، ت: ١٩.

پاشان حەلاڵی ئاشکرا جۆرە گرفتێك لەئەنجامدانیدا نییە، بەڵام حەرامی ئاشکرا بەهیچ جۆرێك مۆڵەت نییە بۆ ئەنجامدانی لەباری هەڵبژاردنیدا لەلایەن ئەنجامدەرەکەیەوە. بەڵام مەودایەك هەیە لەنێوان حەلاڵی ئاشکراو حەرامی ئاشکرادا ، کە ئەویش جێی ئەو گومانانەیە کەتێیاندا ڕەنگە بڕیاری حەلاڵ و حەرامی تیادا ئاوێتە ببێ لەلای هەندێك کەس، یاخود بەهۆی تێنەگەیشتن لە بەڵگەکان، یان بەهۆی تێنەگەیتشتن لە پەیکەڵ کردنی تێکستەکاندا لەسەر ئەو واقیعە یاخود خودی ئەوشتە.

بۆیە ئیسلام (وەرع)ی گێڕاوە بەدوورکەوتنەوەی موسڵمان لەم گومان لێ کراوانە ، هەتا وەکو مرۆڤ هەڵنەگرێ بەرەو حەرامێکی ئاشکرا. ئەمەش جۆرێکە لەبەرگری ئەو میکانیزیانەی کەبەرەو حەرام سەرئەکێشن . پاشان ئەمە جۆرێکە لە پەروەردەی دووربینیو، شارەزابوون بەڕاستی ژیانی مرۆڤ.

دیارە بنچینەی ئەم پرەنسیپەش فەرموودەی خۆشەویستە ﷺ کاتێك ئەفەرموێت: ( الحلال والحرام بين، وبين ذلك أُمُور مشبهات، لايدري كثير من الناس: أَمِنَ الحلال هي أم الحرام، فمنْ تركها تبرأ لدينه وَعِرْضه فَقَدْ سَلِم. وَمَنْ واقع شَيْئاً مِنْها يُوشَكُ أن يواقع الحَرام، كَما أنَّ مَنْ يَرعَى حَولَ الحمَى ( وَهُوَ مَا كَانَ محدود يجزه سُلطان لترعَى فيه أنعامَهُ وَخَدَها ويجر على أن يَنال مِنْهُ شَيئاً، أوشَكَ أن يوُاقِعهُ، ألا وَإنَّ لِكُلِ مَلِك حِمَى، ألا وَإنَّ حِمَى الله مَحَارِمُهُ ) . واتە: حەلاڵ ئاشکرایەو ، حەرامیش ئاشکرایە ، وە لەو نێوەندەدا چەند گومانلێکراوێك هەن، خەڵکانێکی زۆر نازانن کە حەرامن یان حەلاڵ، وە هەرکەسێ خۆیان لێ بپارێزێ بۆ پارێزگاری کردنی ئایین داوێنی، ئەوا پارێزراو ئەبێت ، وەگەر کەسێك لەوانە ئەنجام بدات و گومانی کەوتنە ناو حەرامی هەبێ ، هەروەك ئەوەی کە لەنزیکی پاوەند شوانی ئەنجام ئەدات (پاوەند لەوەڕگایەکە کە دەستەڵاتداران قەدەغەی ئەکەن بۆ خۆیان تاوەکو ئاژەڵەکانیان تێدا بلەوەڕێت بەتەنها وەقەدەغەی بەدەستهێنانی هەرشتێکی لێوە ئەکەن ، مەترسی کەوتنە ناو پاوانەکەی هەیە، بزانن هەموو پادشایەك پاوەندێکی و پاوەندی خوای گەورەش هەموو ئەوانەن کە حەرامی کردوون).

### ١٠ـ حەرام لەسەر هەمووان حەرامە

بازنەی حەرام لەشەریعەتی ئیسلامیدا بازنەیەکی هەرلایەنە" بەبێ لەبەرچاو گرتنی جیاوازی نەتەوەو ڕەنگ و ڕەگەزو جیاوازی چینایەتی، بەڵکو موسوڵمان تایبەتمەندییەکی نییە کەوای لێبکات شتێکی بۆ حەلاڵ بێت و بۆ

یەکێکی‌تر حەرام بێت، نەخێر، خوای گەورە پەروەردگاری هەمووانەو، یاساکانی ئیسلامیش سەروەرە بەسەر هەمووندا، ئەوەی کە خوای گەورە بەرنامەیەکی خۆی حەلاڵی کردبێ، ئەوا بۆ سەرجەم گرۆهی ئادەمی حەلاڵە، وە ئەوەشی کە حەرامە ، لەسەر هەموولایەك حەرامە تا رۆژی دوایی.

بۆ نموونە (دزیی) حەرامە، ئیتر ئایا ئەوکەسەی کەدزی ئەکات موسوڵمان بێت یان ناموسڵمان، یان ئەوەی دزییەکەی لێکراوە موسڵمان بێت یان نا، وەدزەکەش پێویستە پاداشتی خۆی وەربگرێ ئیتر ئایا رەچەڵەك‌و پێگەی هەرچۆنێك بێت ئەمەیە کە پێغەمبەر ﷺ بونیادی ناوەو رایگەیاندووە ( وَ أَيم الله لَو سَرَقَت فَاطِمَة بِنت مُحَمَّدٍ لَقَطَعْتُ يَدَهَا)[1] واتە: سوێند بەخوا، گەر فاطمەی کچی محمد دزی بکات دەستی ئەبڕم ).

لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ رووداوی دزییەك ئەنجامدراو، گومانکرا لە جولەکەیەك‌و موسوڵمانێك، وە زۆرێك لە کەسە نزیکەکانی موسوڵمانەکە توانیان گەردی سەر ئەم کێشەیە لەسەر موسوڵمانەکە لاببەن‌و بەسەر جوولەکەیدا بسەپێنن دیارە ئەمەش بەچەند بەڵگەو نیشانەیەك بوو - کە لەراستیدا موسوڵمانە کە دزییەکەی کردبوو - بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ.

لەوەدا بوو بەرەنگاریی جولەکەکە ببێتەوە، بۆیە سروشی خوایی زوو لەسەر ئەم کێشەیە دابەزی و فەرمووی: ﴿ إِنَّا أَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ بِمَا أَرَاكَ اللَّهُ وَلَا تَكُنْ لِلْخَائِنِينَ خَصِيماً وَاسْتَغْفِرِ اللَّه إِنَّ اللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا {١٠٦} وَلاَ تُجَادِلْ عَنِ الَّذِينَ يَخْتَانُونَ أَنفُسَهُمْ إِنَّ اللَّهَ لاَيُحِبُّ مَن كَانَ خَوَّانًا أَثِيمًا {١٠٧} يَسْتَخْفُونَ مِنَ النَّاسِ وَلاَ يَسْتَخْفُونَ مِنَ اللّهِ وَهُوَ مَعَهُمْ إِذْ يُبَيِّتُونَ مَالاَ يَرْضَى مِنَ الْقَوْلِ وَكَانَ اللّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطًا {١٠٨} هَاأَنتُمْ هَـؤُلاء جَادَلْتُمْ عَنْهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا فَمَن يُجَادِلُ اللّهَ عَنْهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَم مَّن يَكُونُ عَلَيْهِمْ وَكِيلاً {١٠٩} ﴾ النساء: ١٠٥ ـ ١٠٩.

جولەکە لادەرەکان پێیان وایە سووخواردن کاتێ حەرام ئەبێت کە لە نێوان دوو جولەکەدا مامەڵەکە بکرێت، بەڵام ئەگەر قەرزارەکە جولەکە نەبوو ئەوا سوو خواردن لێی دروستە ئەمەش لە (سفر تثنية الاشتراع)دا لە -٢٣ دا هاتووە (١٩: لا تُقرِض أخَاك رِبَاً فضَّة أو رِبَا طَعامٍ أو رِبَا شَيء مِمَّا يُقْرَضُ بِرِبَا ، ٢٠: لِلأَجْنَبِيّ تُقْرِضُ بِرِبَا ، وَلَكِنْ لأخيك لا تُقرِضْ بِرِبَا ) . واتە: قەرز مەدە بەبرای خۆت - واتە جوولەکە - بەسوو زیادە، بەڵام ئەتوانیت بەرامبەر ناجولەکەیەك ئەم کارەبکەیت.

[1] / رواه البخاري ، ت: ٢١.

قورئانی پیرۆز ئەم نارەزاییەی باس کردوون، لەکاتێك ناپاکیو ساختە کارییان لەگەڵ جگە جوولەکەدا حەلاڵ کردووە، ئەوەتا قورئان لەم بارەیەوە ئەفەرموێت: ﴿ وَمِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ مَنْ إِنْ تَأْمَنْهُ بِقِنْطَارٍ يُؤَدِّهِ إِلَيْكَ وَمِنْهُمْ مَنْ إِنْ تَأْمَنْهُ بِدِينَارٍ لَا يُؤَدِّهِ إِلَيْكَ إِلَّا مَا دُمْتَ عَلَيْهِ قَائِماً ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا لَيْسَ عَلَيْنَا فِي الْأُمِّيِّينَ سَبِيلٌ وَيَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴾ آل عمران: ٧٥ . بەڵێ ناڕاستی بەدەم خواوە ئەڵێت ، چونکە بەرنامەکەی جیاوازی ناکات لەنێوەند گەلێکدا، لەکاتێکدا ناپاکی حەرام کردووە لەسەر زمانی پەیامبەرانییەوە.

بەداخەوە ئەم بۆچوونە نارەوایەی جوولەکە باوەڕێکی بێئامانجی سەرتاییە، و شیاوی ئەوەنییە کە بیدەنیە پاڵ ئایینێکی ئاسمانی، چونکە بەو شتە راستو جوانەکان بەتەنها مایەی ئەوەن کە بەرەهاییو هەمەلایەنی ناوزەد بکرێن و تایبەت نەکردنی حەلاڵو حەرام بۆ کەسانی دیاریکراو جیاوازی نێوان ئێمەو ئەو کەسە سەرەتاییانە، بێگومان بەرفراوان بوونی بازنەی رەوشتەکانە نەك لە بوونو بوونیدا، بۆ نموونە ئەمانەت لەلایان سیفەتێکی باشە، بەلاّم تەنها تایبەتە بە نەوەکانی هۆزوخێڵێکەوە کە لەنێوەند خوایاندا پراکتیزەی بکەن ، وەگەر مەسەلەی ئەمانەت لە چوارچێوەی هۆز چووە دەرەوە، ئەوا ناپاکی کردن بەرامبەر ئەمانەن دروستەو بگرە پێویستیشە.

خاوەنی (قصة الحضارة) (١)ئەفەرموێ: ( لەڕاستییدا هەموو گرۆهی ئادەمی خەریکە) هاوڕابن لەسەر ئەو بیروباوەڕەی کە خەڵکانیتر لەخۆیان بە خوارتر ئەزانن، بۆیە هندییە ئەمریکییەکان خۆیان بەگەلی هەڵبژێردراوی خوا ئەژمێرین“ کە رۆحی هەرەگەورە دروستی کردوون، تاکو ئەوان ببنە نموونەیەكو مرۆڤایەتی بەرەو لایان سەربکەوێت. وە هۆزێك لەهۆزە هیندییەکان ناوی خۆیان ناوە“ ئەو خەڵکانەی کەجگە لەوان خەڵکانیتر نین، وە هەندێکی تریان ئەڵێن گوایا لەناو مرۆڤدا هەر ئەوان مرۆڤن، هەروەها کاریبییەکانیش ئەڵێن: بەتەنها ئێمە مرۆڤین ... وە دەرەنجامی هەموو ئەمانەش ، بۆمان دەرئەکەوێ کە مرۆڤە سەرەتاییەکان هەرگیز ئامادە نەبوون کە رەوشتو مامەڵەی باش لەگەڵ جگە لە هۆزو تیرەی خۆیاندا بنوێنین، ئەوا بەراشکاوی پێیان وایە کەکاری رەوشت بەهێز کردنی کۆمەڵەکەی خۆیەتی، وەپێچەوانە ئەبوونەوە لەکاتی مامەڵە کردنیاندا لەگەڵ کەسانی کۆمەڵو هۆزی جگە لەخۆیان، چونکە فەرمانە رەوشتییە بەرزەکان تەنها

بەسەر کەسانی هۆزو تیرەکەی خۆیاندا ئەچەسپێ، بەڵام جگە لەخۆیانەو تەنها میوانیان نەبێت، پێیان وایە کە هەتا ئەتوانرێ دژایەتییان بکرێت).

## ١١ـ ناچاریی یاخود پێویستی رێگە بەحەرام کراوەکان ئەدات:

لەئیسلامدا ئەوەی مەودا تەسک بێت بوارە حەرامکراوەکانە، بەڵام لە دوای ئەمانەشەوە لەحەرامەکاندا توندی نواندووە، و هەموو رێگایەکی بەرەو حەرام گرتووە، ئیتر ئاشکرابێت یاخو پەنها، هەرچی بەرەو حەرام سەربکێشێ ئەوا حەرامە، لەکۆتایی ئەوانەی باسمان کرد لەو پرەنسیپ و ئاراستەکردنانە، ئیسلام چاوداخراو نەبووەو نابێ لەو پێویستیانەی لەژیاندا رووئەدەن و، مرۆڤ لەبەردەمیاندا لاواز ئەبێتەوە، پێویستی ناچاریی دیاری کردووەو لاوازی مرۆڤیشی دیاری کردووە، وە رێگەی بە موسوڵمان داوە لەکاتی بوونی فشاری پێویستدا لە خواردنە حەرامەکان بخوات بەو هێندەی پێویستیەتی و لە لەناو چوون ئەیپارێزێت.

بۆیە خوای گەورە - لەدوای باسکردنی خواردنە حەرامەکان لەگۆشتی مردارەوە بوو خوێن و گۆشتی بەراز - ئەفەرموێت: ﴿ فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ ﴾ البقرة:١٧٣ وەهەمان مانای لە چوار سوورەتی قورئانی تردا ئاماژە پێ فەرمووە لەدوای هەموو باسکردنێکی خواردنە حەرامەکانەوە ، لەم ئایەتانەو هاوشێوەکانیانەوە زانایانی فیقهی ئیسلامی بڕیاری بنەمایەکی گرنگیاندا: (ان الضرورات تبیح المحظورات) واتە: پێویستیەکان حەرامەکان رێگە پێ ئەدەن.

بەڵام گەر تێبینی بکرێت ئەو ئایەتە پیرۆزانە ئەو کەسە ناچارو زۆرلێکراوانە پاک بەرەوە وابەستە کردووە بەمەرجی بۆ خۆشی نەبێت و جارێکی تر ئەگەرێتەوە سەری واتە: بۆ چێژ وەرگرتن نەبێت و لە سنووری تێربوونیش تێپەڕ نەکات . هەر لێرەوە زانایان بنەمایەکی تریان دانا (الضرورة تقدر بقدرها) واتە: ناچاری بەئەندازەی خۆی پێوانە ئەکرێ، بۆیە مرۆڤ هەرچەند ملکەچ بکات بۆ پێویستی و ناچارییەکان، نابێت، بەتەواوی خۆی بدات بەدەستیانەوەو جڵەوی خۆی بۆ شل بکات، بەڵکو هەتا ئەتوانێ خۆی بگرێت و هەوڵی دەردەست خستنی حەڵاڵ بدات، نەوەک بەناوی ناچارییەوە خواردنی حەرامی لا ئاسان ببێ ئیسلام بەم رێگەپێدانی حەرامکراوانەی کاتی پێویستی، بەردەوامی ئەبەخشێ بە گیانی

گشـتی‌و یاسـا کوللیەکانـەوە، ئـەو گیانـەی گیـانی ئاسـانکارییەو، دوورە لـەو سەرسەختگیریی‌و زیاد لەئاسانییەی کە بەسـەر میللـەتانی ترەوە بوون لـە شـێوەی کـۆت‌و پێوەنـددا، بـەڵام لەسـەر موسـوڵمانی لابـردووە، ئـەوەتا خـوای گـەورە ئەفەرموێت:

﴿ يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلا يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ﴾ البقرة:١٨٥.

﴿ مَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُمْ مِنْ حَرَجٍ وَلَكِنْ يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمْ وَلِيُتِمَّ نِعْمَتَـهُ عَلَـيْكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ المائدة:٦

﴿ يُرِيدُ اللَّهُ أَنْ يُخَفِّفَ عَنْكُمْ وَخُلِقَ الْإِنْسَانُ ضَعِيفاً ﴾ النساء:٢٨.

## دەروازەی دووەم

# حەلاڵ و حەرام
# لە ژیانی کەسایەتی موسوڵماندا

- لە خواردن و خواردنەوەدا
- لە پۆشاك و جوانكارییدا
- لە ماڵدا
- لە پیشەگەریدا
- لە خواردن و خواردنەوەدا

هـەر لـەدێر زەمانـەوە گـەلان و میللـەتان جیـاوازبوون لەسـەر ئـەوەی کـە ئەیخۆن و ئەیخۆنەوە، و ئەوەی دروستە بۆیان و ئەوەی دروست نییە بۆیان ، وە بە تایبەتی لە خواردنە ئاژەڵییەکاندا.

بەڵام خواردن و خواردنـەوە رووەکییـەکان جیـاوازن زۆر لەسـەریان دروست نـەبووە. وە ئیسـلامیش بڕیـاری حـەرامی بەسـەردا نـەداون، مەگـەر ئـەو جۆرەیـان نـەبێت کـە ئەبێتـە شـەراب ئـیتر ئایـا لـە تـرێ یـاخود خورمـا یـان جـۆ یـان هـەر رووەکێکی ترەوە وەربگیرێ.

هـەروەها هەرشـتێك ببێتـە هـۆی مەسـت بـوون و سەرخۆشـی و هەرشـتێك زیانی بۆ جەستەی مرۆڤ ببێت، ئەوا حەرامە، هەروەك لەمەولا باسیان لێوە ئەکەین. بەڵام خواردنە ئاژەڵییەکان ، گەلان و میللەتان زۆریان دەربارەیان هەین.

## سەربڕینی ئاژەڵ و خواردنی لەلای ( بەراهیمە )

هەنـــدێك گـــروپ و دەســـتە هـــەن وەك بەراهیمـــە و هەنـــدێك لەبـــەناو فەیلەسـوفەکان ، کـە سـەربڕینی ئـاژەڵ و خواردنیـان حـەرام کـردووە، وەلەسـەر خواردنـە رووەکییـەکان ژیـاون، وە وتویانـە: گوایـا سـەربڕینی ئاژەڵ جۆرێـك لـە دڵ رەقی تیادایە بەرامبەر ئاژەڵ، چونکە ئاژەڵیش وەك مرۆڤ بوونـەوەرێکی زینـدووە و مافی ژیانی هەیە.

بەڵام ئێمە زانیاری سەبارەت بەوەی کە ئافراندنی ئاژەڵان لەخودی خۆیدا ئامانج نییە، چونکە ژیـری (العقل) و لیسـت (الادارە)ی پێنەبەخشیوون، وە خـوای گەورە سروشتی بوونیانی وەهـا کـردووە کـە رامکردنـی بەردەسـتی مـرۆڤ بن، بۆیە بەلامانەوە نامۆ نەبێت کە مرۆڤ لە رێگەی سەربڕینەوە سوود لە گۆشـتیان ببینێـت، هـەروەك دروسـتە کـە بەشـێوەیەکی راسـت و دروسـت سـوود لـە رام کردنیشـیان ببینێت.

هەروەها زانیمان کە سوننەتی خوای گەورە لە ئافەریدەکانیدا بەجۆرێکە کەجۆرە نزمەکە ئەبێتە قوربانی بۆ جۆرە بـەرزو بەنرخەکە، بۆیە رووەکـی سـەوزی پێگەیتشــوو ئــەبڕدرێت لــەپێناوی دەرخواردەکرنیــدا بــۆ ئــاژەڵ، وە ئــاژەڵیش لەپێناوی دەرخواردکردنی مرۆڤدا سەرئەبڕێت، بەڵام مرۆڤ خـودی خـۆی ئەجـەنگێ لەپێناوی بەرژەوەندیی کۆمەڵدا، و بەم جۆرە ...

لەڕاسـتیدا رێگـەگریی لـە سـەرنەبڕینی ئـاژەڵ لەلایـەن مرۆڤـەوە، مـرۆڤ

ناپارێزێت لە مردن و تیاچوون، چونکە گەر ئاژەڵان لەنێوەند خۆیاندا بۆ یەکتر نەبنە دڕندە، ئەوا چارەنووسیان هەر لەناوچوونە، بۆیە هەندێك جار ئەگونجێ مردنەکەی خۆی زۆر بە ئازارتر بێت لە ئازاری ئەو تیغە تیژەی ئەنرێتە سەر گەردنی.

## گیاندارە حەرام کراوەکان لەلای جوولەکەو مەسیحی

لەئایینە ئاسمانییەکانداو لەسەر جوولەکە، خوای گەورە زۆرێك لە ئاژەڵانی ئاویی و وشکانی حەرام کردووە. روونکردنەوەی ئەمانەش لە بەشی یانزە هەم لە سفری لاوین لە تەوراتدا هاتوون.

ئەوەتا لە قورئانی پیرۆزدا هەندێك لەو حەرامکراوانەی سەرجوولەکە هاتوون، لەگەڵ هۆکاری حەرام کردنەکەی، وە هەروەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد، ئەوە لەشێوەی سزادان بۆ سەریان دابەزیوە، ئەمەش دەرەنجامی ئەوستەم و هەلأنەی ئەنجامیان داوە: ﴿ وَعَلَى الَّذِينَ هَادُوا حَرَّمْنَا كُلَّ ذِي ظُفُرٍ وَمِنَ الْبَقَرِ وَالْغَنَمِ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ شُحُومَهُمَا إِلَّا مَا حَمَلَتْ ظُهُورُهُمَا أَوِ الْحَوَايَا أَوْ مَا اخْتَلَطَ بِعَظْمٍ ذَٰلِكَ جَزَيْنَاهُمْ بِبَغْيِهِمْ وَإِنَّا لَصَادِقُونَ ﴾ الأنعام:١٤٦.

ئەمە ئەو دۆخەیە کە جوولەکەی تیادایە، وە واپێویستی ئەکرد کە مەسیحییەکانیش لەم روەوە پاشکۆیان بن، ئەوەتا ئینجیل رایگەیاندووە کە مەسیح ﷺ بۆ ئەوە نەهاتووە بەها بالأکان کەم پێ بکات ، بەڵکو هاتووە بۆ تەواوکردنی ئەو بەها بالأیانە.

بەلأم لەم ڕووەوە کەم و کورتیان نواندو، ڕێگەیان دابەوانەی لە تەوراتدا لێیان حەرام کرابوو- لەوانەی کە ئینجیل نەیسڕیبوونەوە ـ وەشوێن پۆڵسی پیرۆزیان کەوتن لە ڕێگەپێدانی هەموو خواردن و خواردنەوەیەکدا، تەنها ئەوانە نەبێت کە بۆ بتەکان بوون، بەجۆرێ گەرپێیان بوترایە ئەمە سەربڕاوە بۆ بتێك.

ئەوەتا (بۆڵس) دەستنیشانی هۆیەکەی ئەکات بەوەی کە هەمووشتێك پاکە بۆ پاکان، وە ئەوەی ئەچێتە ناودەمەوە دەم پیس ناکات، بەڵکو ئەوەی لەدەمەوە بێتە دەرەوە پیسی ئەکات.

هەر بەم پاساوە خواردنی گۆشتی بەرازیان حەلأڵ کردووە، لەگەڵ ئەوەی بەدەقی تەورات هەتا هەنووکەش حەرامە.

## لەلای عەرەبەکانی سەردەمی نەفامی

بەلاّم عەرەب لەسەردەمی نەفامیدا، هەندێك ئاژەڵییان لەبەر بێز لێکردنەوە حەرام کردووە، وەهەندێکی تریان لەبەر پەرستش و بەندایەتی حەرام کردووەو تاوەکو لە بتەکانیان نزیکیان بکاتەوە، یاخود هەندێکیتر لەبەر خەیاڵ و ئەفسانە حەرام کرابوو لەلایان وەك (البحيرة - السائبة - الوصيلة - الحام) کە پێشتر ئاماژەمان پێکردن، وە لە بەرامبەر ئەمانەدا چەندین شتی ناپاکیان حەلاّڵ کردبوو، وەك " گۆشتی مردوو خوێنی تێزاو.

## ئیسلام ڕێگە بە پاكو باشەکان ئەدات

خۆری ئیسلام پرشنگیداو خەڵکیش لەم بارودۆخەدا بوون لەبارەی خواردنی ئاژەڵییەوە، لەنێوەند زیادەڕەوی کردن لە خواردنیانداو زۆر جەمسەر گیری و توندی نواند لە نەخواردنیاندا، بۆیە خوای گەورە بانگەوازی خۆی لەم ڕووەوە ئاڕاستەی خەڵکی کردوو فەرمووی: ﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ كُلُوا مِمَّا فِي الْأَرْضِ حَلالاً طَيِّباً وَلا تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ ﴾ البقرة:١٦٨.

بانگی بەوەصفی گشتی بوونیان کە لەخواردنە پاکەکانی ئەو خوانە گەورەیەی بۆی ئامادەکردوون، بخۆن ، کە بریتییە لەو زەوییەی بۆی فەراهەم کردوون لەوەی کە تیایدایە بەگشتی- وەشوێن هەنگاوەکانی شەیتانو ڕێگەکانی نەکەون کە بۆ هەندێکی ڕازاندووەتەوە بەهۆی حەرامکردنی حەلاّڵکراوەکان، بۆیە لەو پاکانەی بێبەش کردوونو بەرەو گومڕایی ڕاپێچی کردوون.

پاشان بانگەواز ئاڕاستەی باوەڕداران ئەکات بەتایبەتیو ئەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُلُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ وَاشْكُرُوا لِلَّهِ إِنْ كُنْتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةَ وَالدَّمَ وَلَحْمَ الْخِنْزِيرِ وَمَا أُهِلَّ بِهِ لِغَيْرِ اللَّهِ فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلا عَادٍ فَلا إِثْمَ عَلَيْهِ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ ﴾ البقرة:١٧٢.

وەلەم بانگەوازە خواییە تایبەت بە باوەڕدارانەدا ، خوای گەورە فەرمانی پێکردووین کە لەو خواردنە پاکانە کە لەشێوەی ڕۆزیدا پێی بەخشیووین، وە مافی ئەو بەهرەو بەخششە خواییانە بە سوپاسگوزاری پەروەردگار بدەن، پاشان بۆی ڕوون کردووینەتەوە کە جگە لەم چوار جۆرە خواردنە ، کە لەئایەتە پیرۆزەکەدا ناویان هاتووە -جۆرە خواردنێکیتر حەرام نەکراوە، ئەوەتا بە ڕاشکاوی لەم ئایەتەدا باس لەو چوار خواردنە حەرامکراوە ئەکات: ﴿ قُلْ لاأَجِدُ فِي مَا أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّماً عَلَى طَاعِمٍ

يَطْعَمُهُ إِلَّا أَنْ يَكُونَ مَيْتَةً أَوْ دَماً مَسْفُوحاً أَوْ لَحْمَ خِنْزِيرٍ فَإِنَّهُ رِجْسٌ أَوْ فِسْقاً أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلا عَادٍ فَإِنَّ رَبَّكَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ الأنعام:١٤٥.

وه لەسوورەتی (المائدة)دا قورئانی پیرۆز ئەم حەرامكراوانەی ناو بردووەو ئەفەرمویٚ: ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنْزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ وَالْمُنْخَنِقَةُ وَالْمَوْقُوذَةُ وَالْمُتَرَدِّيَةُ وَالنَّطِيحَةُ وَمَا أَكَلَ السَّبُعُ إِلَّا مَاذَكَّيْتُمْ وَمَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ﴾ المائدة:٣.

وەجۆرە نەگونجاندنێك لەنێوەند ئەم دوو ئایەتەدا نییە، لەكاتێكدا لە ئایەتی یەكەمیاندا حەرامكراوەكان لەچوار جۆر پێكهاتوون، بەلاّم لەئایەتەكەی تردا خواردنە حەرامكراوەكانی لە (١٠) جۆردا ریز بەندكردووە، چونكە (الْمُنْخَنِقَةُ ، الْمَوْقُوذَةُ ، الْمُتَرَدِّيَةُ، النَّطِيحَةُ، وَمَا أَكَلَ السَّبُعُ) هەموویان بە مانای مردوو هاتوون، وە روونكردنەوەیەكە بۆ جۆری مردووەكان، وەحوكمی (مَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ) وەك حوكمی (مَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ) وایە ، بۆیە حەرام كراوەكان بەكورتی چوار جۆرن ، وە بەدرێژی دەجۆرن.

## هۆی حەرام كردنی گۆشتی مردارەوەبوو

١ـ یەكەم جۆرە لەخواردنە حەرامكراوەكان لەئایەتەكاندا گۆشتی مردارەوە بووە، كە ئەوانەن بەهۆكارێكی خودیی مردوبیٚ، لە ئاژەڵ و باڵدار، بەمانایەكی تر، ئەوانەی مردوون بەبیٚ ئەوەی مرۆڤ دەستی هەبیٚ لەمردنیاندا بەمەبەستی راو كردن.

ڕەنگە ژیریی سەردەم لەهۆی حەرامكردنی گۆشتی مردارەوەبوو لەسەر مرۆڤ و ، فرێدانی بەبیٚ ئەوەی سوودی لیٚ ببینریٚ، ئێمەش لە وەلاّمدا ئەڵێین كە لە حەرامكردنیدا داناییەكی زیاد بەدی ئەكرێت، ئەویش:

ا . سروشتی ساغ و خاوێن خۆی لیٚ بەدوور ئەگرێت و بێزی لیٚئەكاتەوە، وخاوەن ژیرییەكان بەگشتی نكوڵی لەخواردنیدا ئەكەن چونكە لەگەڵ ریٚزی مرۆڤدا وێك ناكەوێتەوە، بۆیە هەموو گەلە خاوەن پەیامە ئاسمانییەكان لەلایان حەرامە، وە نایخۆن مەگەر ئەوەی سەر برابێت، هەرچەندە شێوازی سەر برینەكەشیان جیاوازە.

ب ـ وا لە موسوڵمان ئەكات كە ڕابێت لەسەر مەبەست و ویستداری لە هەمووكارێكدا، بۆ ئەوەی بەرهەمێك بەدەست نەهێنێت گەر مەبەست و نیازێكی نەبێت ، چونكە مانای سەربڕین ـ كە ئاژەڵ لە بازنەی مردارەوە بوون دەرئەكات .

بێگومان بریتییە لەنییەتی یاخود مەبەستی دەرکردنی گیان -روح- لەو گیاندارە بەمەبەستی خواردنی. هەروەك ئەوەی خوای گەورە خۆشنوود نەبێت بەوەی کە مرۆڤ لە شتێك بخوات مادام بە مەبەستو بیرکردنەوە لێی بەدەستی نەهێنابێ، بەلاّم سەربڕاو راوکراو لێیان وەرناگیرێ مەگەر بەم مەبەستو کۆشان و کارە نەبێت.

ج ـ ئەوەی کە لەخۆیەوە بمرێت، زۆرجار یان بەهۆیەکەوە ئەمرێت کە درێژخایەن بووە، یاخود بەهۆیەکی کتوپڕ یان خواردنی شتێکی ژەهراوی یان هەرشتێکی تری لەوجۆرە. وەهەموو ئەمانەش مرۆڤ لە زیانیان پارێزراو نییە، هەروەك ئەوانەشی لەبەر لاوازییو شی بوونەوەی سروشتیان ئەمرن هەر زیانمەندن.

د ـ هەروەها خوای گەورە بەحەرامکردنی گۆشتی مردارەوەبوو لەسەر ئادەمیزاد، هەلی رەخساندووە بۆ ئاژەڵو باڵندە کە لەو گۆشتانە بخۆنو لێیان تێر بن، ئەمەش سۆزو میهرەبانییەکە لەخوای گەورە بۆ ئەوان، چونکە ئەوانیش ـ هەروەك قورئان ئاماژەی پێئەکات ـ بریتین لەچەندین گەلو میللەت وەك مرۆڤ. ئەمەش زۆر ئاشکرا لەو شوێنانەدا دەرئەکەوێت کە ئاژەڵی مردارەوەبووی تیادا ناپۆشن.

ه ـ هەتاوەکو مرۆڤ زۆر داکۆکی لەسەرئەوە بکات کە موڵکیەتی لە ئاژەڵ و ، پشتگوێی نەخات تاوەکو لاوازی و نەخۆشی زەفەریان پێ‌ببات‌و ببێتە نێچیریان، بەڵکو پەلە بکات لە چارەسەرکردنیدا گەر دووچاری نەخۆییەك هات ، یاخود سەری ببڕێ.

## حەرامکردنی خوێنی رێژراو

٢ ـ حەرامکردنی خوێنی رێژراو، پرسیار کرا لە (ابن عباس) ﷺ سپڵ، فەرمووی : بیخۆن ، پاشان وتیان: ئاخر سپڵ خوێنە، فەرمووی: خوای گەورە خوێنی رێژراوی لێ حەرام کردوون، و رازی حرام کردنەکەشی بێز لێ کردنەوەیەتی لەلایەن دەروونو سروشتی مرۆڤەوە، هەروەها مەترسی زیانیشی لێ ئەکرێ.

مرۆڤی سەردەمی نەفامی گەر برسییان ببوایە بەئێسقان یاخود شتێکی تیژ وشترەکەی بریندار ئەکرد، بەو مەبەستەی خوێنەکەی بخواتەوەو پێی تێر ببێ.

لەم رووەوە (الأعشی) ئەڵێت:

وإيَّاك والميتات لا تَقربَنَّهـا  وَلا تَأخُذَنَّ عَظمَاً حَديداً فَتفصَدا

**واتــه:** دووربه لـه‌مرداره‌وه بووه‌كـان‌و به‌ئێسقانی تیژ خوێنیـان مـه‌گره، چونكه حه‌رامه‌و ئازاری بۆ ئاژه‌ڵه‌كه تیادایه.

## گۆشتی به‌راز

٣ـ بریتیه لـه **گۆشـتی بـه‌راز**، چونكه سروشتی مرۆڤی خاوێن بێزی لێ ئه‌كاته‌وه‌و پشتی لێ هه‌ڵئه‌كات، چونكه خۆشترین خۆراكی به‌راز شته بێز لێكراوو پیسه‌كانه، ئه‌وه‌تا زانستی پزیشكی نوێ ده‌ریخستووه كه خواردنی گۆشتی به‌راز زیانبه‌خشه لـه هـه‌موو هه‌رێمـه‌كانی جیهانـدا، وه به‌تایبـه‌ت ناوچـه گه‌رمـه‌كان. هه‌روه‌ك به ئه‌زموونه زانستییه‌كان ده‌ركه‌وتووه كه خواردنی گۆشتی به‌راز هۆكـاری تـووش بوونـه بـه‌كرمی كوشـنده‌و جۆره‌هـا كرمـی تـری زیانبـه‌خش بـه‌مرۆڤ. كـێ ئـه‌زانێ؟! ره‌نگـه لـه داهـاتوودا زانسـت چـه‌ندین رازونهێنـی تـری حـه‌رام كردنـی گۆشـتی بـه‌رازمان بـۆ بدۆزێتـه‌وه زیـاد لـه‌وه‌ی كـه ئه‌مرۆكـه زانیوومانـه، خـوای گه‌وره‌ش پێغه‌مبه‌ر ﷺ به‌م ئایه‌ته وه‌صف ئـه‌كات: ﴿ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ﴾ الأعراف: ١٥٧ وه لـه لێكۆڵـه‌ران هه‌یـه كـه ئـه‌ڵێت: بـه‌رده‌وامی به‌خشین بـه خـواردنی گۆشـتی به‌راز ئه‌بێته هۆی لاوازی غیره‌ت له پاراستنی ره‌وشتدا.

## ئه‌وه‌ی بۆ جگه له خوا سه‌ربڕێت

٤ـ چواره‌م جۆر له‌خواردنـه حـه‌رامكراوه‌كان، **گۆشتی ئه‌و ئاژه‌ڵانه‌یـه كـه بـۆ جگه له خوای گه‌وره سه‌ر نـه‌بڕێت**، وه‌ك ئه‌وانـه‌ی بـت پـه‌رسته‌كان ئـه‌نجامیان ئـه‌دا لـه سه‌ربڕینی ئاژه‌ڵدا به‌ناوی بته‌كانیانه‌وه وه‌ك لات‌و عوزا، ئه‌مه نزیـك بوونه‌وه‌یـه لـه جگه له‌خوای گه‌وره‌و، په‌رستش به‌جگه ناوی گه‌وره‌یه‌وه.

بۆیـه هـۆی حه‌رامكردنه‌كـه‌ی لێـره‌دا سـه‌راپا فاكتـه‌رێكی ئایینـه، بـۆ پارێزگاری كردنـی یه‌كتاناسـی‌و، خـاوێن كردنه‌وه‌ی بیروباوه‌ڕه‌كـان، وه‌جه‌نگانـدنی هاوبه‌شی بڕیاردان‌و، دیارده‌كانی بتپه‌رستی له هه‌موو بوارێكی بت په‌رستندا.

ئه‌و خوایه‌ی كه مرۆڤی ئافراندووه‌و ، هه‌رچی له‌زه‌ویدایه بۆی رام كردووه، وه‌ئاژه‌ڵی بۆ ملكه‌چ كردووه، وه‌بواری پێداوه كه رۆحـی له‌جه‌سته‌ی جیـا بكاتـه‌وه به‌مه‌به‌ستی حـه‌ڵاڵكردنی گۆشته‌كه‌ی بـۆ خـواردن ئـه‌ویش بـه‌و مه‌رجـه‌ی لـه كـاتی سـه‌ربڕینیدا نـاوی خـوا بهێنـێ، دیـاره ناوهێنـانی خـوای گـه‌وره لێـره‌دا راگه‌یانـدنی ره‌زامه‌ندی خوای گه‌وره‌یه به‌م سه‌ربڕینه، بۆیه گه‌ر له‌كاتی سه‌ر بڕینـدا نـاوی جگـه

لەخوای گەورە هات، بێگومان ئەم ڕێگە پێدانەی خوای گەورە پێك نایەتو، شایانی ئەوەیە کە گۆشتی ئەو ئاژەڵە سەربڕاوەی لێ حەرام بکرێ.

## جۆرەکانی گۆشتی مردارەوە بوو

ئەو چوار جۆرە حەرامکراوە بەشێوەیەکی کورتن. بەڵام بەووردو درێژی هەروەك لە سوورەتی (المائدة) دا هاتووە دە جۆرن:

٥ـ الْمُنْخَنِقَةُ : ئەو ئاژەڵیە کە بەهۆی خنکانەوە ئەمرێت، ئیتر ئایا بەهۆی ئاڵاندنی شتێك بێت لەملیەوە، یاخود سەری ئاژەڵەکە بکرێتە جێگەیەکی تەسکەوە یان هەر جۆرە هۆکارێکی تری ئەم چەشنانە بێت.

٦ـ الْمَوْقُوذَةُ : ئەو ئاژەڵەیە کە بە هۆی لێدان بە دارەوە ئەمرێت.

٧ـ الْمُتَرَدِّيَةُ : ئەوەیە کە بەهۆی کەوتنە خوارەوەی لە شوێنێکی بەرزەوە یاخود کەوتنە ناو بیرێکەوە مردبێت.

٨ ـ النَّطِيحَةُ : ئەوەیە کە ئاژەڵێکی تر بەهۆی لێدانییەوە کوشتبێتی.

٩ـ مَا أَكَلَ السَّبُعُ : ئەو ئاژەڵەیە کە ئاژەڵێکی دڕندەی تر لێی خواردبێتو بە خواردنی ئەو بەشەی ، مردار بووبێتەوە.

ئەوەتا خوای گەورە لەدوای ناوهێنانی ئەم پێنج جۆرە ئەفەرموێت: ﴿ إِلَّا مَا ذَكَّيْتُمْ ﴾ واتە: مەگەر ئەو ئاژەڵەی گیانی تێدا مابێتو ئێوە فریای سەربڕینی بکەون و بەو جۆرە گۆشتەکەی حەلاڵ بکەن، هەروەك لەپاشاندا دێینە سەر باسکردنی.

وەبۆ زیاتر بەهێزکردنی ئەو ڕاستییەی باسمان کرد دەربارەی بوونی کەمێك گیانیش بێت بۆ سەربڕینی ئاژەڵەکە، لەپێشەوا عەلی کوڕی ئەبو تاڵیبەوە ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر گەیشتیت بە سەربڕینی ( الْمَوْقُوذَةُ – الْمُتَرَدِّيَةُ – النَّطِيحَةُ ) وەدەستی یان قاچی ئەجووڵاند ، ئەوا بیخۆ ، وە لە (الضحاك)ە وە: مرۆڤەکانی سەردەمی نەفامی ئەمەیان ئەخوارد، بۆیە خوای گەورە لەئیسلامدا حەرامی کرد، مەگەر ئەوانەیان کە بگەن بە سەربڕینیان ئەوەی گەیشتن بە سەربڕینیان و دەستی یان قاچی یان کلکی یان چاوێکی تروکاندو سەربڕابوو ئەوا حەلاڵە [1].

## دانایی لە حەرام کردنی ئەم جۆرە گۆشتانەدا

دانایی‌و حیکمەت لەحەرام کردنی ئەم جۆرە گۆشتانەدا هەمان هۆیە کە لە

---

[1] / هەندێك لەفەقیهەکان ئەفەرموون: ئەبێ ژیانی تەواوی تیادابێ ونیشانەکەشی خوێن بەربوونیەتی یاخود جوولەی توند.

حەرام کردنی گۆشتی ئەو ئاژەڵەی لەخۆیەوە مردبێت، ڕەچاوکراوە جگە لە زیانەکەی کە بەئاشکرا لێرەدا دەرناکەوێ . وە دواهۆی حەرام کردنی جەخت ئەکاتەوە کەخوای گەورە مرۆڤ فێر ئەکات کەگرنگی بدەن بەئاژەڵو بەزەییان پیایاندا بێتەوەو پارێزگارییان بکەن ، نابێت پشتگوێ بخرێن هەتاوەکو ئەخنکێن ، یان لەشوێنێکی بەرزەوە ئەکەونە خوارەوە، یان وازیان لێ بهێنن لە یەکتری بدەن هەتاوەکو یەکتر ئەکوژن، یان نابێت ئاژەڵ بەپیاکێشان بکوژرێ، هەروەك هەندێك لە شوانە دڵرەقەکان ئەنجامی ئەدەن ، بەتایبەت ئەوانەیان کە بە کرێ شوانی ئەنجام ئەدەن ، یاخود دوو ئاژەڵیان لەیەکتر بەرئەدەن هەتاوەکو یەکتر ئەکوژن یاخود لە مردن نزیك ئەبنەوە.

زانایان دەقیان لەسەرئەوە هاودەنگە کەگۆشتی ئەو ئاژەڵەی بەهۆی ئاژەڵێکی ترەوە بریندار ئەبێتو پاشان ئەمرێت ، حەرامە ، هەرچەندە خوێنی لێ هاتبێ یاخود لە نزیکی سەربڕینەکەیەوە بێت . چونکە مەبەست لێرەدا . هەروەك بۆ دەرئەکەوێ. سزادانی ئەو جۆرە کەسانەیە کە ئاژەڵەکان لە یەکتری بەرئەدات هەتاوەکو یەکێکیان ئەوی تریان ئەکوژێ . جا لەبەرئەوە ئەو گۆشتەی لێ حەرام کراوە لەپاداشتی ئەو دڵرەقیەی بەرامبەریان ئەنجامی داوە.

بەلاّم خواردنی ئەوەی ئاژەڵی دڕندە خواردوویەتی بەپلەی یەکەم جۆرە ڕێزلێنانێکە لەمرۆڤو بەرزگرتنی لەوەی لەزیادەی دڕندە بخوات .

مرۆڤی سەردەمی نەفامی ئەوجۆرە گۆشتەیان ئەخوارد ، واتە ئەو زیادەیەی لە پاشماوەی دڕندەی ئەمایەوە لە گۆشتی وشترو مانگاو ئەو جۆرانە ، بۆیە خوای گەورە ئەمەی لەسەر موسوڵمانان حەرام کرد.

## ئەوەی لەسەر تەخت سەر ئەبڕدرێت ( وَمَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ )

١٠ـ دەهەم جۆر لە حەرامەکان ئەوەیە کە لەسەر (النُّصُب) سەر بڕدرێت، (النُّصُب) واتە: بتێکە یاخود بەردێکە دیاری ئەکرا بۆ لادەرێك – الطاغوت – واتە: ئەوەی لەجێگەی خوای گەورە ئەپەرسترێ، ئەوانەی لە دەوری کەعبە بوونو چەند بتێك بوون کەسانی سەردەمی نەفامی ئاژەڵیان بۆ سەرئەبڕین بەمەبەستی نزیکبوونەوەیان لە خواوەندو بتەکانیان.

ئەمەش لەتوخمی ئەوەیە کەبۆ جگە لەخوای گەورە سەر ئەبڕێدرێت، چونکە لە هەردووکیاندا بە مەزن ڕوانینە بۆ لادەرو ستەمکاران ، وەجیاوازیش لە

نێوەندیاندا ئەوەیە" ئەوەی بۆ جگە لەخوای گەورە سەر ئەبڕێت ئەگونجێ سەر بڕینێك بێت بۆ بتێك لە بتەکان، وەناوی لادەرەکەی لەسەر هاتبێ، وە ئەوەشی بەو جۆرە سەر ئەبڕێت ، پێویست ناکات ناوی جگە لە خوای لەسەر ببرێ .

بەتایبەت ئەگەر ئەوەی ئاژەڵەکەی بۆ سەر ئەبڕێت لە دەوری کەعبەدا بێت ، ڕەنگە بوترێ لەبەر ئەوەی سەربڕینەکە لە دەوری کەعبەدایە، ئەوا جۆرە مەزنییەکی بۆ کەعبە تیادایە، ئەم بۆچوونە هەڵەیە، مادام ئەو ئاژەڵە سەربڕاوە بە ناوی جگە لەخوای گەورە سەربڕابێت، ئەمەش دەقی قورئان وەڵامی داوەتەوە

## سوود وەرگرتن لە پێست و ئێسقان و مووی مردارەوە بوو

حەرامکردنی مردارەوەبوو بەمانای حەرامکردنی خواردنیەتی، بەڵام سوود وەرگرتان لەپێستو شاخەکانی و ئێسقانو موو ئەو جۆرە ئەندامە پێویستانە ڕێگە پێدراوە، بەڵکو کارێکی فەرمان پێکراویشە، چونکە ئەو توانای سوود لێوەرگرتنی هەیە، دروست نییە بەفیڕۆ بدرێت.

لە (ابن عباس)ە وە ﷺ ئەفەرموێ: مەڕێکیان دا بە (میمونە)ی دایکی موسڵمانان کەنیزەکێکی ئازادکراوی بوو، پاشان مردارەوە بووەوە،

پاشان پێغەمبەر ﷺ بەلایدا ڕۆیشت و فەرمووی : ( هلا أخذتم إهابَها ـجلدها ـ فَدَبَغتمُوها فَأنتَفَعتُم به ) ؟ واتە: بۆچی پێستەکەیتان لێ نەکردەوەو پاکی بکەن و سوودی لێ وەربگرن ؟ وتیان : مرداربووەتەوە! فەرمووی : ( إنَّما حُرِمَ أَكْلُها )[1] واتە : تەنها خواردنی حەرامکراوە .

پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی پاککردنەوەی پێستی مردارەوەبووی بۆ روون کردووینەتەوە کە (دەباغ) کردنە، وە لە فەرموودەیەکدا ئەفەرموێ: (دباغ الأديم ـ الجلد ـ ذكاته)[2]. واتە : دەباغکردنی پێستی مردارەوەبوو وەك سەربڕین وایە.

وە لە گێڕانەوەیەکی تردا: ( دِبَاغُهُ يَذهَبُ بَخُبْثِه )[3].

واتە: دەباغکردنی پیسیەکانی لائەبات .

وە لە(صحيح مسلم) و جگە لەوەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی: ( أيما أهابُ دُبِغَ فَقَد طَهُر)[4].

---

[1]/ رواه الجماعة إلا إبن ماجة ، ت: ٢٥.
[2]/ أبوداود و النسائي ، ت:٢٦.
[3]/ الحاكم ، ت : ٢٧.
[4]/ ت : ٢٨.

واتە: هەر پێستەیەك دەباغ بکرێ ئەوا پاك بووەتەوە.

ئەمە گشتییەو هەموو پێستێك ئەگرێتەوە ئیتر ئەگەر پێستەی سەگ یاخود بەراز بێت وە ( أهل الظاهر ) رایان لەسەر ئەمەیەو ئە (أبي يوسف) هاوەڵی (أبي حنيفة) ئەگێڕنەوەو (الشوكاني) یش ئەم رایەی پەسەندتر کردووە.

وە لە (سەودە)ی دایکی باوەڕدارانەوە فەرموویەتی: بەرخێك مردار بووەوە ، و ئێمەش پێستەکەیمان دەباغ کرد، پاشان بۆخۆشکردنی ئاوەکەی خورمامان تێدەکرد هەتاوەکو کۆن بووو پاشان دڕا [1].

## حاڵەتی ناچاریی و پێویستی

هەموو ئەو حەرامکراوانەی باسمان لێوەکردن بۆ حاڵەتی ئاساییە .. بەڵام حاڵەتی پێویستی حوکمی خۆی هەیە هەروەك پێشتر ئاماژەکان پێکرد ـ ئەوەتا خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَقَدْ فَصَّلَ لَكُمْ مَاحَرَّمَ عَلَيْكُمْ إِلَّا مَااضْطُرِرْتُمْ إِلَيْهِ ﴾ الأنعام:١١٩ ، هەروەها خوای گەورە لەدوای ئەوەی باسی حەرامکردنی مردارەوەبوو خوێن ئەکات ، ئەفەرموێ : ﴿ فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلا عَادٍ فَلا إِثْمَ عَلَيْهِ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ ﴾ البقـرة:١٧٣. وەحاڵەتی پێویستیش هەروەك ئەوەی هاودەنگی لەسەرە حاڵەتی برسێتی‌یە، واتە" بۆ خواردن هەروەك هەندێك لە زانایان بەتێپەراندنی شەوو رۆژێك دیاریی ئەکەن، وەشتێکی دەست ناکەوێت گەر بیخوات، جگە لەو خواردنە حەرامە نەبێت، ئەبێت ئەوەندەی لێ بخوات کە پێویستییەکەی پێ دابین بکات و لە تیاچوون خۆی بپارێزێت . پێشەوا مالیك ﷺ ئەفەرموێت: سنوورەکەی بریتییە لەوەی گەر پێی تێرببێ و توێشووی لێ هەڵبگرێ هەتاوەکو خواردنێکی تری دەست نەکەوێت، وەجگە لەوەش ئەفەرموون: ئەبێ هێندەی لێ بخورێت کە لەمردن بیپارێزێت . وەرەنگە ئەمە لە فەرموودەکەی خوای گەورەوە بەدەربکەوێت ﴿ غَيْرَ بَاغٍ وَلا عَادٍ ﴾ واتە : بەبێ ئەوەی ئارەزووی داوای بکات . و(لا عَادٍ) واتە: بەبێ تێپەراندنی سنووری پێویستی و پێویستیش برسێتییە، هەروەك خوای گەورە بە دەقێکی راستەوخۆ ناوی ئەبات: ﴿ فَمَنِ اضْطُرَّ فِي مَخْمَصَةٍ غَيْرَ مُتَجَانِفٍ لِإِثْمٍ فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ ﴾ المائدة :٣. وشەی (المخمصة) واتە : برسێتی.

---

1/ البخاری گێراویەتیەوەو جگە لەویش ، ت:٢٩.

## پێویستی دەرمـان

لـە رووی پێویسـتی دەرمانـەوە، بـەجۆرێ گـەر بـۆ چـاك بوونـەوەی نەخۆشییەکەی پێویسـتی بـەخواردنی حـەرامێك بـوو ئـەوا زانایـانی ئیسـلام لـەو رووەوە رایـان جیایـە، هەنـدێکیان پێیـان وایـە کـەدەرمان بـەکارهێنان وەك برسـێتییەکە ناچـاریی تیـادا نیـیە، وەبەڵگـە بـەم فەرموودەیـە ئەهێننـەوە کـە ئەفەرموێت : ( إنَّ اللهَ لَمْ يَجْعَل شِفائَكُم فِيما حُرِّمَ عَلَيكُم )[1]. واتە: خوای گەورە شیفای نەخۆش لەوانەدا نەگێراوە کەلێی حەرام کردوون.

هەندێکیتر لە زانایان پێویستی دەرمـان وەك پێویستی خـواردن لـە قەڵەم ئەدەن، چونکە هـەردووکیان پێویستی ژیـانن لـە بنچینەو بەردەوامی پێدانیدا، وە ئەم گروپە لە زانایان بۆ رەوابـوونی بـەکارهێنانی حـەرامکراوەکان لـە دەرمانکردنـدا بەڵگە بەوە ئەهێننەوە کە پێغەمبەر ﷺ رێگەی دا بە عەبدول رەحمانی کوڕی عـەوف کە (الزبير) کە ئاوریشم بپۆشن بەهۆی نەخۆشییەکی پێستیانەوە، لەگەڵ ئەوەی کە لەبەرکردنی ئاوریشم بۆ پیاوان دروست نییـەو هەڕەشـەی تونـدی لەسـەرە[2]، رەنگە رای ئـەم گروپـە لـەزانایان نـزیکتر بێـت لـەگیانی ئیسـلامەوە، ئـەو ئیسـلامەی کـە پارێزگاری لەژیانی مرۆڤایەتی ئەکات لەهەموو یاساو ئامۆژگارییەکیدا.

بەڵام بـواردان بـەخواردنی دەرمانێك کـە خواردنـە حەرامـەکانی تیـادا بێـت، مەرجدارە بەم مەرجانەوە:

١. ئەبێت مەترسییەکی راستەقینە هەبێت لەسەر تەندروستی مـرۆڤ، ئەگـەر ئەم دەرمانە بەکارنەهێنێ.

٢. ئەبێت دەرمـانێکی حـەڵاڵی تـر نـەبێت کە وەك ئەڵتـەرناتیڤێك لـەجیاتی ئەو حەرامە بەکاربێت بۆ چارەسەر کردنی نەخۆشییەکە.

٣ـ ئەبێت پزیشکێکی موسوڵمانی باوەڕپێکراو ئاڕاستەی بەکارهێنانی ئەم جۆرە دەرمانە حەرامەی بکات.

ئێمە بەحوکمی زانیاربوونمان بەو واقیعە پراکتیکیـەی کە تێیـدا ئـەژین، و راپۆرتی پزیشکانی باوەڕ پێکراوەوە، پێویستیەکی پزیشکی نییە کە پێویسـت بە

---

[1]/ رواه البخاري عن إبن مسعود ، ت:٣.

[2]/ بروانە ئەو دەقانەی کە لە دوای (پۆشاك و رازاندنەوە) ئەینووسین.

خـواردنی ئـەم حەرامانـە بكـات ، بـەڵام پرەنسـیپێكی (احتیـاط) هـەر دائـەنێین بـۆ موسـوڵمان ، چـونكە ئـەگونجیٚ موسـوڵمان لەشـوێنێك بێـت جگـە لـەم حەرامانـە شتێكی تری دەست نەكەوێت.

## تـاك ناچار نییە ئەگەر لە كۆمەڵگەكەیدا چاری هەبوو

تـەنها مـەرج بـۆ خـواردنی حەرامـەكان ئەوەنییـە كـە مـرۆڤ جگـە لەوانـە ، خواردنێكی تری نەبێت، بەڵكو مەرج ئەوەیە كە ئەبێت ناچاربێت لـەخواردنی ئەو خواردەمەنییە حەرامەدا، ئەگەر لەتاكەكانی كۆمەڵگەكەیدا موسوڵمان هەبوو یان نـا موسـوڵمان هـەبوو خـواردنی زیـادەی هـەبوو و پێویسـتی ئـەم موسـوڵمانەی پـیٚ جیٚبەجیٚ ئەبوو، ئەوا لێرەدا ناچار نییە بەخواردنیان ، واتە خواردنی حەرامەكان ـ بۆیە كۆمەڵگەی ئیسلامی پێگەیشتووە و پێك هـاتووە لەچەند بەشێكی جەستەو هەموویان پێكەوە وەك مستی بینا یەكتری پتەوو مەحكەم ئەكەن.

لەو لەبەرچاوگیرییانەی كە زانایانی ئیسلام بۆ پێگكەیشتنی كۆمەڵایـەتی پێویستیان كردووە، ئەوەیە كە پێشەوا (إبن حزم) بڕیاری لەسەرداوەو فەرموویـەتی ( ڕەوا نییـە بـۆ موسـڵمانی ناچار، كەگۆشـتی مردارەوەبوو یـاخود بـەراز بخـواتو هاوەڵەكەشـی خـواردنی زیـادەی پیٚبـیٚ ـ موسوڵمان بیٚ یـان ناموسوڵمان، چـونكە پێویسـتە لەسـەر خـاوەن خـۆراك كـە برسـی تێـر بكـات، گـەر بـەم جـۆرە بـوو، ئـەوا پێویستی بەگۆشتی مردارەوەبووو بەراز نامێنێت، وە ئەبێت لەسەر ئەمە بجەنگیٚ، وەگەر كوژرا، ئەوا بكوژەكەی قیصاصی لەسەرە ، وەگەر ئەوەی تر كوژرا، ئەوا بەر نەفرەتی خوا ئەكەوێت ، چونكە مافێكی یاساغ كردووەو كەسێكی لادەرە لە ئایین، خوای گـەورە ئەفـەرمویٚ : ﴿ فَإِنْ بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الْأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّهِ ﴾ الحجرات: ٩.

وە یاساغكاری مافیش ستەمكارە بەرامبەر براكەی كە مـافی لەسـەریەتی هـەر لەبەرئەمـەش ابـوبكری صـدیق زەكـات نـەدەرانی ئەجەنگانـدو شـەڕی لەگـەڵ ئەكردن).

## سەربڕینی شەرعی گیانەوەرە دەریاییەکان سەرجەمیان حەڵاڵن

گیانلەبەرانی بەگوێرەی جێگەی نیشتەجێ بوونیان دووجۆرن :

١- دەریایی ٢- وشکانی .

گیانەوەرە ئاوییەکان : ئەوانەن کە لەناخی دەریادا ئەژین و بەبێ ئاو ناتوانن بژین، ئەم جۆرانە سەرجەمیان حەڵاڵن ، ئیتر هەرچۆنێك دەست بکەوێ، ئیتر ئایا لەدەریاکەدا بەزیندوویی یاخود مردوویی دەستگیر بکرێ، وەك ماسی، وە ئەوەی پێی ئەوترێ سەگی دەریا یان بەرازی دەریاو لەم جۆرانە، ئیتر ئایا راوچییەکەی هەرچۆنێك بێت موسوڵمان بێت و یان ناموسوڵمان، بۆیە خوای گەورە بازنەی رێگە پێدراوەکانی فراوان کردووە بەرەوابوونی هەموو ئەوانەی لە دەریادان . بەبێ ئەوەی جۆرێکی دیاریکراویان یاساغ بکات، یاخود مەرجی سەربڕینیان بۆ دابنێت، بەڵکو رێگەی داوە کە مرۆڤ لەو گیانەوەرە دەریاییانە پێویستی خۆی دابین بکات بەوەی کە ئەتوانێ ، بەڵام بەمەرجێ هەتا ئەتوانێ لە ئازاردانیان بەدوور بێت.

خوای گەورە منەت بەسەر بەندەکانیدا ئەکات و ئەفەرمووێ: ﴿ وَهُوَ الَّذِي سَخَّرَ الْبَحْرَ لِتَأْكُلُوا مِنْهُ لَحْماً طَرِيّاً ﴾ النحل : ١٤هەروەها ئەفەرموێ: ﴿ أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ الْبَحْرِ وَطَعَامُهُ مَتَاعاً لَكُمْ وَلِلسَّيَّارَةِ ﴾ المائدة : ٩٦ السيارە: واتە: گەشتیاران.

بەم جۆرە خوای گەورە لەم رووەوە بە گشتگیریی ئەدوێ و بەبێ تایبەت کردن : ﴿ وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيّاً ﴾ مريم : ٦٤.

## حەرام کراوەکان لە ئاژەڵە وشکانییەکاندا

بەڵام ئاژەڵە وشکانییەکان لە قورئاندا بە راشکاوانە دەق لەبارەی حەرام بوونیانەوە نییە، تەنها گۆشتی بەراز بەتایبەتی و گۆشتی مردوو و خوێن و ئەوەی بۆ جگە لەخوای گەورە سەر ئەبڕدرێت.

بەڵام قورئانی پیرۆز لەبارەی پێغمبەرەوە ﷺ ئەفەرموێ : ﴿ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ ﴾ الأعراف : ١٥٧.

(الْخَبَائِث) / واتە : ئەوانەی کە ئارەزووی مرۆڤ بێزیان لێئەکاتەوە بەشێوەیەکی گشتی، هەرچەندە تاکە تاکەی خەڵك رەنگە هەبن ئارەزوویان لێ بێ.

ئەوانەش پێغەمبەر ﷺ نەرێی خواردنی گۆشتی گوێدرێژیماڵی کرد لە

**ڕۆژی خەیبەردا)[1] ئەوەتا لە (الصحیحن)دا گێڕاوەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ نەرێی کردووە لەخواردنی گۆشتی هەموو ئاژەڵێکی خاوەن کەڵبەو هەموو باڵندەیەکی خاوەن چنگ – یاخود نینۆك)[2].**

**مەبەستیش لەئاژەڵی دڕندە ئەوانەن کە ئاژەڵی تر ئەترسێننو ئەیانکوژن وەك شێرو پڵنگو گورگو ئەوجۆرانە، وە مەبەستیش لەنینۆکداریی باڵداریش ئەوانەن کە چنگو نینۆکی تیژیان هەیەو گیانداری تری پێ ئەکوژن وەك داڵو بازو هەڵۆو ئەو جۆرانە.**

**ڕێبازی (ابن عباس) ﷺ بەو جۆریە کە ئەفەرموێ حەرام تەنها ئەو چوارە ناوبراوەن کە لەقورئاندا هاتوون، هەروەك پێی وابێت کەئەو فەرموودانەی دەربارەی یاساغ کردنی دڕندە مەبەست پێیان کراهییەتە نەك حەرام کردن، یان ئەگونجێ پێی نەگەیشتبێ، فەرمووی: مرۆڤایەتی سەردەمی نەفامی شتێکیان ئەخواردو شتێکیان واز لێ دەهێنا لەبەر بێزلێکردنەوە، بۆیە خوای گەورە پێغەمبەری نارد ﷺ و پەیامی بۆ ناردو حەڵاڵو حەرامی بۆ دیاری کرد، ئەوەی حەڵاڵ کراوە حەڵاڵەو، ئەوەی حەرامیش کراوە حەرامە، وەئەوەشی لێی بێدەنگ بووە ئەوا لێبوراوە ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوێندەوە ﴿ قل لا اجد فیما اوحي الي محرماً علی طاعم ...﴾[3].**

**بەم ئایەتە پیرۆزە (ابن عباس) ﷺ وای ئەبینێتەوە کەناو نەهێنانی گۆشتی گوێدرێژی ماڵی لەم ئایەتەدا بەڵگەیە لەسەر حەڵاڵ بوونی.**

**هەروەها پێشەوا مالیك پشتگیریی ڕای (ابن عباس) ئەکات، کە خواردنی گۆشتی دڕندەی حەرام نەکردووە، بەڵکو حوکمی مەکروهی بەسەردا داوە.**

**ئەوەی بڕیاری لەسەردراوە ئەوەیە کە سەربڕینی شەرعی کاریگەر نییە لەسەر حەڵاڵکردنی گۆشتی ئاژەڵە حەرامەکان، مەگەر بۆ پاککردنەوەی پێستەکەی بێت ، تاوەکو پێویستی بە دەباغ کردن نەبێت.**

---

[1] البخاري ئەوتری : حەرامکردنی گوێدرێژ لەهۆکارێکی کاتی بووە ، ئەویش لەبەر پێویستی بوونیان بووە کە وەك ولاغ بۆ هاتوچۆ بەکاریان ئەهێنا، هەروەك ئەوەی ئێستا هەندێ حکومەت سەربڕینی گوێرەکەیان قەدەغە کردووە ، ئەوەش لەبەر پێویستیان بە گۆشتەکەی لەکاتی گەورەبوونیدا ، ت : ٣٢.

[2] ت : ٣٣.

[3] ابو داود لە (ابن عباس)ەوە ئەیگێڕێتەوە بە مەوقوف.

## مەرجی سەربڕین بۆ ڕێگەدان بەخواردنی ئاژەڵانی ماڵی

ئەو ئاژەڵانەی لە وشکانیدا ئەژین و خواردنیان ڕەوایە، دوو جۆرن:

جۆرێکیان تواناو دەستەڵاتیان بەسەردا هەیە ، وەکو وڵاخ لە وشترو مانگاو مەڕو هاوچەشنیان وەجێگەی بەخێوکردنی باڵداران و ئەوانەشی لەناو ماڵدا بەخێو ئەکرێن.

بەڵام جۆرێکی تریان ئەوانەن کە دەستەڵات و توانایان بەسەردا ناکرێ بەڵام جۆری یەکەم ئیسلام ڕێگەی بەخواردنی داوە، چونکە ئەتوانرێ بەسەر بڕینی شەرعی سەر ببڕێت .

## مەرجەکانی سەربڕینی شەرعی

لەسەربڕینی شەرعیدا پێویستە ئەم مەرجانە هەبن:

١. سەربڕینی ئاژەڵەکە بەئامێرێکی تیژ بەجۆرێ خوێن بڕێژێ و دەمارەکان بپچڕێنێ، ئیتر ئەو ئامێرە بەرد یان داربێت، عەدی کوری حاتەمی تائی ئەڵێت: وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئێمە کاتێ ڕاوئەکەین چەقۆمان دەست ناکەوێ جگە لە هەندێك بەردو ئەو جۆرە شتانە فەمووی: خوێنی بڕێژە بەهەرچییەك لەئارەزووت کرد و ناوی خوای لەسەر بهێنە [1].

٢. ـ ئەبێت سەبڕینەکە لە گەردنیدا یاخود لە خوار قورگیدا بێت، واتە ئەو شوێنەی کە خواردن و خواردنەوەی پێدا تێپەڕ ئەبێت، بەو جۆرە ئیتر گیانی دەرئەچێ، وەئەم مەرجە ڕەچاو ناکرێ ئەگەر پاساوێك هەبوو بۆ سەربڕینی لەجێگەی تایبەتی خۆیدا، وەك ئەوەی ئاژەڵەکە بەسەردا کەوتبێتە ناو بیرێکەوەو جێگەی ئەوە نەبێت کەچەقۆکە بخرێتە سەرگەردنی با لە سنگی ، یاخود ئاژەڵەکە هەڵهاتبێ لە سروشتی ماڵی بوونەکەی ، بەو جۆرە مامەڵەی ڕاو کردنی لەگەڵدا ئەکرێت و لەهەر جێگەکەوە پێ بکرێ، ڕەوایە.

لە (الصحیحین)دا هاتووە لە (رافع بن خدیج) ئەڵێت: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بووین لەگەشتێکدا ، حوشترێك هەڵهات، وەئەسپیان پێ نەبوو هەتا وەکو بیگرینەوە، بۆیە پیاوێك نیرێکی تێگرت و وەستانی ، پاشان پێغەمبەر ﷺ

---

[1] / احمد وابوداود والنسائي وابن ماجه وابن حبان گێراویانەتەوە، ت:٣٤.

فەرمووی: (إن لهذه البهائم أوابد كأوابد الوحش فما فعل منها هذا فأفعلوا به هكذا)[1]. واتە: ئـەم ولاَغانـە كێـویی بوونیـان هەیـە وەك ئـاژەڵو گیانـداری كێـوی، ئـەوەیان بـەم شێوەیەی ئەنجامدا، ئەوا وەهای بەسەر بهێنن.

٣. ئـەبێت نـاوی جگـە لـەخوای گـەورە لەسـەر نـەبرێت، ئـەم خاڵـەش هـاودەنگی زانایانی لەسەرە ، لەبەرئەوە كە مرۆڤی سـەردەمی نـەفامی بـەهۆی سـەربڕینێك بۆیانەوە لەخواوەندو بتەكانیان نزیـك ئـەبوونـەوە، یـاخود بـەهۆی ناوهێنـانی ئەوەی مەبەستیانە لەسەر سەربڕاوەكە، یاخود لەسەر تـەختو بـەردە دیـاری كراوەكان سەریان ئەبڕین، بۆیە قورئانی پیرۆز هەموو ئەمانـەی حـەرام كـردو ئەفەرموێت: ﴿ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ ... وَمَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ ﴾.

٤. پێویستە ناوی خوای گەورە ببریٚ لەسـەر سـەربڕاوەكە ئەمـەش لـە دەقەكانـدا دیار ئەكەویٚ ، بۆیە قورئـان ئەفـەرمویٚ: ﴿ فَكُلُوا مِمَّا ذُكِرَ اسْمُ اللهِ عَلَيْهِ انْ كُنْتُم بِآيَاتِهِ مُؤْمِنِينْ ﴾ الأنعام : ١١٨ هـەروەها ئەفـەرمویٚ: ﴿ وَلَا تَاكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللهِ عَلَيهِ وَانَهُ لَفِسْق ﴾ الأنعام : ١٢١ وەپێغەمبەریش ﷺ ئەفـەرمویٚ: ( ما انهر الدَمُ وَذُكِرَ اسْمُ اللهِ عَلَيهِ فَكُلُــوا )[2] واتـە: ئـەوەی خـوێنی لێهاتو نـاوی خـوای گـەورەی لەسەر برا، ئەوا بیخۆن.

ئەوەشـی كـە پشـتگیریی پێویسـت ئـەم مەرجەئـەكا، ئـەو فەرموودانـەن كەلەباسی راوكردندا لێیانەوە ئەدوێن، لەكاتی نێر لێگرتنیدا یاخود ناردنی سـەگی راهێنراو بۆی، هەروەك دێتە سەرباسیان.

هەندێك لە زانایان پێیان وایە كە نـاوبردنی خـوای گـەورە ئـەبێت مسـۆگەر بێت ، بەلاَم مەرج نییە كە هەر ئەبێت لـەكاتی سـەربڕینەكەدا بێـت، بـەڵكو ئەگـەر لـە كـاتی خواردنیشـدا نـاوی خوابهێنێـت ئـەوا دروسـتە ، چـونكە ئەگـەر لـەكاتی خواردنیشدا ناوی خوای گەورە بهێنێت لەو خواردنانە ناژمێردرێت كە ناوی خوای لەسەر نەهاتووە.

وەلە (صحیح البخاری) دا لـە عایشـەوە (خـوا لێـی رازی بێـت) كـە هـۆزێكی نزیك لە سەردەمی نەفامییەوە. مەبەست پێی ئەوەیە كە تـازە موسوڵمان بـوون. بـە

---

[1] / اخرجه الشيخان ، ت: ٣٥.
[2] / البخاری گێراویەتیەوە ، ت: ٣٦.

پێغەمبەریان وت ﷺ کۆمەڵێك هەن گۆشتمان بۆ ئەهێنن نازانین ناوی خوای گەورەیان لەسەر براوە یان نا، نازانین لێیان بخۆین یان نا؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ناوی خوای لەسەر بهێننو پاشان بیخۆن )[1].

## نهێنی ئەم سەربڕینەو دانایی تیایدا

دیارە نهێنی لەم سەربڕینەدا . هەروەك بۆمان دەرئەکەوێ ـ دەرکردنی بە پەلەی گیانی ئەو گیاندارەیە بەکورتترین رێگەو بەبێ سزادان ، بۆیە مەرجە ئەو ئامێرەی ئاژەڵەکەی پێ سەرئەبڕێ ئەبێت تیژبێت و لەگەردنیشیەوە سەربڕێت ، کە ئەو شوێنە نزیکترین جێگەیە بۆ جیابوونەوەی گیان لەجەستە بەئاسانی، وە پێغەمبەر ﷺ نەرێی کردووە لە سەربڕین بەهۆی نینۆك یان دانەوە، چونکە سزاو ئازاری زۆر دووچاری سەربڕاوەکە ئەکات، وە زۆرجار جگە لەخنکاندن شتێکی دی بەسەر ئاژەڵەکەدا نایەنێت، وەپێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کردووە بە تیژ کردنی ئەو تیغەی سەربڕینەکەی ئەنجام ئەدەن، هەتا زوو گیانی دەرچێ: ( إنَّ اللهَ كَتَـبَ الإحسان عَلى كُلِ شَيء فإذا قَتَلْتُم فأَحْسِنُوا القَتلة، وإذا ذَبَحتُم فأَحسنوا الذَبحَة وَلْيَحدْ أَحَدَكُمْ شِفرَتَهُ وَلْيُرِح ذَبِيحَتَهُ )[2].

واتە: خوای گەورە چاکەی لەسەر هەموو شتێك پێویست کردووە، ئەگەر کوشتنتان ئەنجامدا ئەوا بەچاکترین شێوە بیکوژن، وە ئەگەر گیاندارێکتان سەر بڕی ، بەباشترین شێوەی سەری ببڕن، وە تیغەکەتان با تیژ بێت و بەخێرایی گیانی دەربکەن. وە لەچاکەیە ئەوەیە کە (ابن عمر) لەپێغەمبەرەوە ﷺ ئەگێڕێتەوە کە فەرمانی کردووە بەتیژکردنی تیغی سەربڕین ، وە نەهێڵرێ ئاژەڵەکە ئەو ئامێری سەربڕینە ببینێ وە ئەفەرمووێ : ( اذا ذبح احدكم فليجهز )[3] واتە: ئەگەر یەکێکتان ئاژەڵی سەربری بابەتەواوی سەرببڕێ.

وە لە (ابن عباس)ە وە کە پیاوێك بەرخێکی پاڵخستبوو و تیغەکەی تیژ ئەکرد، بۆیە پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: (أتريد أن تميتها موتات؟ هلا أَحدَدْتَ شِفرَتَك قبل أن تَضْجعَها؟ )[4]. واتە: ئەتەوێت چەند جارێك بیمرێنێت؟ با تیغەکەی تیژ بکردایە بەر لەوەی پاڵی بخەیت.

---

[1] / ت:٣٧.
[2] / مسلم لە شەدادی کوڕی اوس گێراویەتیەوە ، ت : ٣٨.
[3] / ابن ماجە گێراویەتیەوە ، ت: ٣٩.
[4] / الحاكم وقال صحيح على شرط البخاري ، ت:٤.

پێشەوا(عمر) ﷺ پیاوێکی دی بەقاچی مەڕێك ڕائەکێشێ بۆئەوەی سەری بیڕێ، بۆیە پێی فەرموو: (ماڵ وێران ! بەجوانیو ڕێکوپێکی بەرەو مردن ڕاپێچی بکە)[1].

بەم جۆرە بۆچوونێکی گشتی لەم دەروازەیەدا بەدەرئەکەوێ، کە بریتییە لە نەرمو نیانی لەگەڵ ئاژەڵانداو سزانەدانیان بە هەرجۆرێك مرۆڤ لە توانایدا بێ لەم بارەیەوە ئەنجامی بدات.

خەڵکانی سەردەمی نەفامی حەزیان لەگۆشتی وشترەکانیان بوو لێیان ئەکردەوە بەزیندوویی کەئەمەش جۆرێکە لەو چەندین ئازارو سزایانەی دووچاری ئاژەڵانیان ئەهێنا لەکاتی سەربڕیندا، بۆیە پێغەمبەر ﷺ ئەم مەبەستەی پێ لابردنو حەرامی کرد کە بە زیندوویی سوود لەو پارچە گۆشتانە وەربگرن ، بۆیە ئەفەرموێ ( ماقطع من البهجة وهي حية فهو ميتة )[2]. واتە: هەربەشێك لە ئاژەڵ بە زیندوویی لێ بکرێتەوە وەك مردارەوەبوو وەهایە.

## ڕەچاوکردنی دانایی ( بِسْمِ اللهِ ) لەکاتی سەربڕیندا

داواکردنی ناوهێنانی خوای گەورە لەکاتی سەربڕیندا نهێنەیەکی زۆر جوانی تیادایە، کەجێگەی ئاگاداربوون لێیو ئاوڕدانەوەیە، لەو ڕووەوە وەك بەرپەرچ دانەوەیەك بۆ بتپەرستە نەفامەکان کە لەکاتی سەربڕیندا ناوی خواکانی خۆیان ئەهێنا، ئەگەر مرۆڤی بێبڕوا بە خوای گەورە لەکاتی سەربڕیندا ناوی بتێك بهێنێت ، ئەی چۆن موسوڵمان ناوی خوای خۆی نەهێنێت؟!

وەلەلایەکی تریشەوە ، ئەم ئاژەڵانە لەگەڵ مرۆڤدا هاوبەشن لە ڕووی ئافراندنیانەوە لەلایەن خوای گەورەو، ئەوانیش بوونەوەرێکی زیندووی خاوەن گیانن ، بۆیە کاتێك مرۆڤ دەستەڵاتی بەسەردا ئەوانو ڕۆحی دەرئەکات ، ئەمە بە ڕێگە پێوانە لەلایەك پەروەردگارەوە ، ئەو پەروەردگارەی هەموو ئەوانەی لەسەر زەویدایە بۆی بەدی هێناوە. بۆیە ناوهێنانی خوای گەورە لێرەدا ڕاگەیاندنی ئەم ڕێگە پێوانە خواییەیە، هەروەك ئەوەی مرۆڤ بڵێت: من ئەم کارەی ئەنجامی ئەدەم دژایەتیەك نییە بۆ ئەو دروستکراوانە، یاخود لاوازی بێت بۆیان، بەڵام بەناوی خواوە سەری ئەبڕم، بەناوی خواوە ڕاوی ئەکەم وە بەناوی خوایشەوە ئەیخۆم.

---

[1] / عبدالرزاق گێڕاویەتیەوە.

[2] / احمد وابوداود والترمذي والحاكم گێڕاویانەتەوە. ت:٤١.

## سەربڕاوی خاوەن پەیامەکان ( جولەکە و مەسیحی )

بۆمان دەرکەوت کە چۆن ئیسلام چەند بەگرنگییەوە ئەڕوانێت بۆ سەر بڕین ، چونکە هاوبەش بڕیاردەرە عەرەبەکان و هاووێنەیەیان سەربڕینیان گێڕاوە بەکارە گرنگەکانی بەندایەتی، بەڵکو بە بیرو باوەڕو بنەڕەتی ئایینی دائەنێت. بەو جۆرە یان لەسەر بەردی دیاری کراو سەریان ئەبڕین، یاخود لەکاتی سەر بڕینیاندا ناوی خواکانیان لەسەر ئەهێنا، بۆیە ئیسلام هات و ئەم بیروباوەڕە ناپاکانەی پووچەڵ کردەوە، وەپێویستی کرد کە لەکاتی سەربڕینی ئاژەڵدا جگە لەناوی خوای گەورە، ناوێکی دی نەبرێت، وەئەوانەی لەسەر ئەو پەردە دیاری کراوانەو ئەوانەشی کە بۆ جگە لەخوای گەورە سەر ئەبڕدرێن، حەرامی کردن.

لەکاتێکدا کە خاوەن پەیامە ئاسمانییەکان لەبنچینەدا خاوەن یەکتا پەرستین پاشان بۆچوونی هاوبەش بریادان بۆ خوای گەورە بەسەر بیرو باوەڕیاندا تێپەری، بەهۆی ئەو کەسانەی کە هاتنە ناو ئایینە نوێیەکەوە لەبیرو بۆچوونە پووچ و کۆنەکانیانی پاك نەکردبوونەوە، ئەمەش جێگەی گومان بوو ، چونکە هەندێك لەموسوڵمان واتێگەیشتبوون کە مامەڵەکردن لەگەڵ خاوەن پەڕاوەکاندا لەم رووەوە وەك بت پەرستەکانن، خوای گەورە ڕێگەی داوە بەوەی کە خواردنیان بخورێت، هەروەك ڕێگەی داوە کە ژنیان لێ بهێنرێ، بۆیە خوای گەورە لەکۆتایی ئەوەی لەقورئان دابەزیووە ئەفەرموێ: ﴿ الْيَوْمَ أُحِلَّ لَكُمُ الطَّيِّبَاتُ وَطَعَامُ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حِلٌّ لَّكُمْ وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَّهُمْ ﴾ المائدة : ٥.

مانای ئەم ئایەتە پیرۆزە بەکورتی بەم جۆرەیە: ئەمڕۆ پاك و جوانەکانتان بۆ حەڵاڵ کرا ئیدی نە (بحیرە)و نە (سائبە)و نە (وەصیلە)و نە (حام) حەڵاڵ نییە بۆتان ، وەخواردنی ئەوانەی خاوەن پەڕاوی ئاسمانیین لەجولەکەو مەسیحی بۆتان حەڵاڵە بەگوێرەی ئەو یاسایەی کە ئەصل لەهەموو شتێکدا حەڵاڵە تاکو بە دەقێك حەرام ئەکرێ . وەخواردنی موسوڵمانانیش ڕەوایە بۆیان، بۆتان هەیە لە خواردنی ئاژەڵە سەربڕاوەکانیان بخۆن یاخود ئاژەڵە ڕاوکراوەکانیان، وە ئەوانیش ئەتوانن لەو ئاژەڵەی کە ئێوە سەریان ئەبڕن یان ڕاویان ئەکەن، بخۆن.

بۆیە خوای گەورە لەم رووەوە لەگەڵ هاوبەش بڕیاردەرەکانی عەرەبدا توندی نواندووە، بەڵام لەگەڵ خاوەن پەڕاوەکاندا ئاسانکاری کردووە، چونکە

ئەوان نزیكترین بیروباوەڕێك لە باوەڕدارانەوە ، چونكە باوەڕیان بە (نیگا – الوحی ) و بە پێغەمبەرایەتیو بنچینەكانی ئایین هەیە بەشێوەیەكی گشتی ، وە خوای گەورە وەها بەرنامە ڕێژیی بۆكردووین كە لەگەڵیاندا خواردن بخۆین‌و ژنیان لێ بهێنن و مامەڵەمان باش بێت لەگەلیاندا، چونكە ئەگەر مامەڵەمان لەگەلدا بكەن ، ئیسلام ئەناسن‌و لە ژینگەو كەس و كاریاندا بەشێوەیەكی راست بە تیۆری وپراكتیكی و رەوشتیی وەبۆیان دەرئەكەوێ كە ئایینەكەمان ئاینێكە لە بەرزترین ماناكانیداو لە تەواوترین شێوەو پاكترین پەڕاویدا، و بە دوور لە هەموو دروستكراوێكی ئایینی و بیرو بۆچوونی پڕوپووچدا.

وە وشەی (طَعَامُ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ) وشەیەكی گشتییە و هەموو خواردنێك نەگرێتەوە بە سەربڕاوو دانەوێڵەیانەوە، ئەمانە هەموو حەلاڵن بۆمان ، مادام خوودی خواردنەكە لەئیسلامدا حەرام ئەبێت وەك خوێنی ڕێژراوو گۆشتی بەراز، چونكە ئەمانە بەهاودەنگی زانایان خواردنیان دروست نییە ئیتر ئایا خواردنی خاوەن كتێبێك بن یان خواردنی موسڵمان.

## ئەوەی بۆ كڵێسەو جەژنەكان سەر ئەبڕدرێت

١. نەبیسترا لەخاوەن پەڕاو كە ناوی جگە لەخوای گەورە لەكاتی سەربڕینندا بهێنێ، وەك مەسیح و عزیر، ئەو سەربڕینە حەلاڵە، بەلاّم گەر ناوی جگە لە خوای گەورە لەسەر بیسترا، ئەوا هەندێك لە زانایان بە حەرام ئەم سەر بڕینە ئەدەنە قەڵەم، چونكە بۆ جگە لەخوای گەورە ئەنجام دراوە.

وەهەندێكیشیان ئەفەرموون: خوای گەورە ڕێگەی داوین بۆ خواردنەكانیان ، وەهەر ئەویش زانایە بەوەی ئەیڵێن.

پرسیاركرا لە (ابو الدرداء) ﷺ لەسەر گۆشتی بەرانێك كە بۆ كڵێسەیەك سەر بڕابوو پێیان ئەوت (جرجس) وەك دیاری‌یەك بۆ ئەو كەنیسەیە، كەئایا لێی بخۆین ؟

(ابو الدرداء) وەلاّمی دایەوە، خوای گەورە ببورە، ئەوانە خاوەن پەڕاون خواردنیان حەلاّڵە بۆمان‌و خواردنی ئێمەش بۆ ئەوان حەلاّڵە . فەرمانی پێدا بە خواردنی[1].

---

[1] / الطبري گێراویەتیەوە، ت:٤٢ .

وە پرسـیـارکرا لەپێشـەوا مالیـك ﷺ سـەبارەت بەگۆشـتی ئـەو ئاژەڵانـەی خاوەن پەراوەکان بەبۆنەی جەژنەکانیانەوە سەری ئەبڕن، یاخود بۆ کڵێساکانیان ، فـەرمووی: پـێم بـاش نییـە ، بـەڵام نـاڵێم حەرامـە ، بۆیـە بەباشـی دانـەناوە لەبـەر مەسەلەی وەرع ، لە ترسی ئەوەی نەوەکو بچێتە ریزی ئەوانەی کەبۆ جگە لـەخوای گەورە سەرئەبڕێن ، وەحەرامی نەکرد ، چونکە مانـای (ما اهـــل بـــە) لـەلای ئـەو وە سەبارەت بەخاوەن کتێبەکان ئەوانەن کە لەبۆ خواکانیان سەرئەبڕێن بەمەبەستی لێ نزیکبوونەوەو بەلام لێی ناخۆن، بەڵکو ئەوەی سەری ئەبڕن و لێشی ئـەخۆن ، ئـەوە خواردنیانە ، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿ وطعام الذين اوتوا الكتاب حل لكم ﴾ [1].

## ئەوانەی بەئامێری نوێ و کارەبا سەر ئەبڕدرێن

٢. ئایا مەرجە سەربڕینیان وەك سەربڕینی ئێمە بێت ، واتە بەئامێرێکی تیژو لە گەردنەوە بێت ؟

زۆرینـەی زانایـان ئەمـەیان کردووەتـە مـەرج ، وە ئەوەشـی کۆمـەڵێك لـە مالکییەکان فەتوای پێ ئەدەن ، ئەوەیە کە ئەم خاڵە مەرج نییە.

(القاضي ابن العربي) لەراڤەی ئـەم ئایەتـە پـیرۆزەدا لەسـوورەتی (المائدة) ئەفەرموێ : ئەمە بەڵگەیەکی راستەقینەی تەواوە لەسەرئەوەی کەنێچیرو خواردنی خاوەن پەراوەکان مادام پاك و چاك بێت رەوایەو بەرەهایی حەڵاڵە بۆمان ، وەخـوای گەورەش دووبارەی کردووەتەوە هەتاوەکو گومان و دوو دڵیو رەخنـەگرتنی لەسـەر لاببات، بەجۆرێك درێژە بکێشێ، پرسـیارکرا سـەبارەت بەجولەکە کـە ملـی مریشـك بائەدەن پاشان ئەیکەن بەچێشت ئایا بەکەڵکی خواردن دێ؟ وتم: ئەخورێ، چونکە ئەمە گۆشت . یاخود خواردنی . خۆیانە، خواردنی قەشەو پیاوانی ئایینییانـە ، هـەر چەندە ئەمـە لـەلای ئێمـە سـەربڕین نییـە، بـەڵام خـوای گـەورە بـۆی رەوابینیـون بـە رەهای خواردنیان بخۆین، وە هەموو ئەوانەی بە پێـی ئاینەکەیانـە، حـەڵاڵن بۆمـان، تەنها ئەوانە نـەبێت کـەخوای گەورە لەسـەریان بە درۆی خستوونەتەوە زانایانمـان فەرموویانە: خاوەن پەراوەکان کچەکانیانمان ئەدەنێ کە بیانکەینە خێزانمان، ئیتر

---

[1] / ئـەم فەتوایـە لـەدیارترین بەڵگەکانـە لەسـەر فیقهـی پێشـەوا مالیـكو نـایینو وەرعەکـەی ﷺ بـەجۆرێ یەکسـەر حەرامی نەکردووە هەروەك هەندێ لەوانەی ئەمرۆ ئەنجامی ئەدەن (تەنها پێی باش نـەبووە . مکروە . کـە دوو گشـتی بەرامبـەر یـەکی هێنـاوە ، گشتییەکیان: ئەوەیـە کـە بۆ جگـە لـەخوا سـەربڕێ ، ئـەوەی تریشـیان خـواردنی خـاوەن پەڕاوەکانەوە بەوەی باسمان کرد هەردووکیانی کۆکردووەتەوە.

چۆن لەگۆشتی سەربڕاوەکانیان نەخۆین، خۆ پلەی مامەڵە سێکسییەکان کە دروستە ئافرەتیان ببنە خێزانمان. لەسەرو پلەی خواردنەوەیە !

ئەمە (ابن العربی) بڕیاری لەسەرداوە وە لە جێگەیەکی تردا ئەفەرموێ : (ئەوەی ئەوان ئەیخۆن لەسەر شێوەی جگە سەربڕین وەك خنکاندن و سەر شکاندن واتە بەبێ نیازو مەبەستی سەربڕین ، ئەوا مردارەوەبووەو حەرامە ) .

وەئەم دوو بڕیارە دژیەك نین، چونکە مەبەست ئەوەیە، ئەوەی کە ئەوان بە سەربڕاوی لەقەڵەم ئەدەن بۆ ئێمە دروستە، ئیتر ئەگەر شێوەی سەربڕینەکەش لەلای ئێمەی موسوڵمان راست نەبێت، وەئەوەشی کەئەوان بە سەربڕاوی دانەنێن ، ئەوا بۆ ئێمەش دروست نییە کەبیخۆین. وەمانای هاوبەش لە سەربڕینیدا جیا کردنەوەی رۆحی گیاندارەکەیە لەجەستەی بەنییەتی حەڵاڵکردنی گۆشتەکەی .

## ئەمە ڕێبازی کۆمەڵێکە لە مالکییە

وەلەبەر رۆشنایی ئەوەی کە باسمانکرد حوکمی ئەو گۆشتە نێردراوانەمان بۆ دەرئەکەوێ کەلەلایەن خاوەن پەڕاوەکانەوە بۆمان دێت وەك مریشك و گۆشتی مانگای پێچراو، کە رەنگە بەئامێری کارەبایی و ئەو جۆرە شتانە سەربڕابێت ، بەڵام مادام ئەوان بەئایینەکەی خۆیان بەحەڵاڵی دائەنێن ئەوا بۆ ئێمەش حەڵاڵە ، بە گوێرەی گشتگیریی ئایەتەکە.

بەڵام ئەو گۆشتانەی کە لە وڵاتە شیوعی‌یەکانەوە بۆمان دێن: ئەوەتا خواردنیان حەرامەو دروست نییە، چونکە ئەوان خاوەن پەڕاونین و بەهەموو ئایینەکان بێباوەڕن، و تەنانەت بەخودی خوای گەورەش و سەرجەم پەیامەکانیشی.

## سەربڕین لەلای مەجووسیەکان و هاوشێوەیان

زانایان را جیاوازن لەسەر سەربڕین لەلای مەجوسیەکان، زۆرینەیان ڕێگری خواردنی سەربڕاوەکانیان ئەکەن، چونکە هاوبەش بڕیار دەدەن.

وەهەندێکی تریان ئەفەرموون: حەڵاڵە، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ( وەك خاوەن پەڕاوەکان مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن ) [1]. وە لە مەجووسی هیجر جزیەی وەرگرتووە [2].

---

[1] / مالك و شافعی گێراویانەتەوە ت : ٤٣.
[2] / بوخاری و چەند کەسێکی‌تر گێراویانەتەوە ، ت: ٤٤.

هەروەها (ابن حزم) لە دەروازەی (سەربڕیندا) لە کتێبی (المحلی)دا ئەفەرموێ : ( وەك خاوەن پەڕاو وانو حوکمیان وەك حوکمی خاوەن پەیامەکان وایە لە هەموو ئەمانەدا ) .

هەروەها صابئەکانیش لەلای پێشەوا (ابو حنیفه) خاوەن پەڕاون [1].

## ئەوەی لێمان نادیاربوو پرسیاری لەسەر ناکەین

لەسەر موسوڵمان پێویست نییە ئەوەی لێی نادیار بوو پرسیاری لەسەر بکات: چۆن سەربراوە، ئایا مەرجەکانی تێدا هاتووەتەدی یان نا؟ وە ئایا ناوی خوای گەورە لەسەر سەربراوەکە هاتووە، یان نا؟ بەڵکو هەموو ئەوانەی لێمانەوە نادیاربوو موسوڵمان سەری بریووە، یان نەفام یان فاسیق یان خاوەن پەڕاو بێت ، ئەوا خواردنی گۆشتەکەی حەڵاڵە.

هەروەك پێشتر فەرموودەکەی (البخاری) مان گێڕایەوە کە میللەتێك پرسیاریان کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ئەو گۆشتەی بۆیان دێت، پاشان پێی فەرموون: ناوی خوای لەسەر بهێنن وبیخۆن.

زانایان لەبارەی ئەم فەرموودەیەوە ئەفەرموون: ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هەموو کردارو رەفتارێك بەراستو دروست ئەدرێتە قەڵەم، هەتا ئەو کاتەی بەڵگەیەك دێت لەسەر بەتاڵو پووچ کردنەوەی.

## ڕاو کـــردن

زۆرێك لەعەرەبو ناعەرەبەکانیش لەگەلانی پێشوو ژیانیان لەسەر راو کردن بەند بووە، لەبەرئەوە قورئانو فەرموودە بایەخێکی زۆریان پێداوەو زانایانی فیقهی ئیسلامیش دەروازەی سەربەخۆیان بۆ ئەم بابەتە دیاری کردووە و ئەوەی حەرامەو ئەوەی حەڵاڵە جیاکراوەتەوە.

چونکە زۆرێك لەئاژەڵو باڵداران گۆشتیان خاوێنو پاکە بۆ خواردنو ، مرۆڤ تواناداrو دەستەڵاتدارنییە بەسەریاندا، چونکە ماڵی نییە ، بۆیە ئەوەی کە مەرجە بۆ ئاژەڵە ماڵییەکان کە سەربڕین لەگەردندا یان خوار گەردندا بێت، بۆ ئاژەڵە کێوییەکان مەرج نییە بۆ مرۆڤ بڕیاری داوەو بواری بۆ بەرفراوان کردووە، وەمرۆڤیش بڕیاری لەسەرئەوە ئەدات کەسروشتیانو پێویستیان داواخوازیەتی ،

[1] هەندێ لە لێکۆڵەرەوانی سەردەم بەراهیمەو بوزی و ئەو جۆرە بت پەرستانە لە ریزی مەجوسدا دائەنێن.

بەڵکو چەند ڕێکخستن مەرجدارییەك هاتووەتە ناوی، کە ملکەچی ئەکات لە بەردەم بیروباوەڕی ئیسلامداو، لەبەردەم دەستووری ئیسلامدا ـ وەك هەموو کارو بارێکی تری موسوڵمان . بە ڕاوچییەوە ، و هەندێکیان پەیوەندیان بە ڕاو کراوەکەوە هەیە، هەروەك هەندێکی تریان پەیوەستن بەوەی کە ڕاوکردنەکەی پێ ئەنجام ئەدرێ.

ئەمانە هەموویان سەبارەت بە ڕاوی وشکانین، بەڵام ڕاوی ئاژەڵە دەریاییەکان ، خوای گەورە بەبێ جۆرە مەرج و کۆت و سنوورێك حەڵاڵی کردووە : ﴿ أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ الْبَحْرِ وَطَعَامُهُ مَتَاعًا لَّكُمْ وَلِلسَّيَّارَةِ ﴾ المائدة: ٩٦ .

## ئەو مەرجانەی پەیوەندیان بەڕاوچییەوە هەیە

١. مەرجی ڕاوچی و وشکایی هەمان مەرجی سەربڕینی هەیە، کە ئەبێت موسوڵمان بێت یاخود خاوەن پەیامە ئاسمانییەکان بێت، یاخود لە ڕیزی خاوەن پەڕاوو پەیامەکان بژمێردرێن وەك مەجوس و صائبە.

وەلەو ئاراستە کردنانەی کە ئیسلام ڕاوچی هۆشیار کردووەتەوە ئەوەیە کە ڕاوکردنەکەی نابێ بێمەبەست بێ، و ئەم گیانانە لەجەستەکان جیابکاتەوە ، بە بێئەوەی مەبەستی خواردنی گۆشتەکەی بێت یاخود سوودی لێ وەربگرێ. وە لە فەرموودەیەکدا ( من قتل عصفوراً عبثاً فما فوقها بغير حقها، الا سأله الله عنها يوم القيامة قيل: يارسول الله : وما حقها؟ قالَ: ان يذبحها فيأكُلَها، ولا يقطع رأسها فيرمي به )[1]. واتە : مرۆڤێك نییە کە چۆلەکەیەك یان سەروتر بکوژێ بە ناحەق مەگەر خوای گەورە پرسیاری لەسەر لێ ئەکات لە ڕۆژی دواییدا، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، حەقەکەی چییە؟ فەرمووی: ئەبێت سەری ببڕێت و پاشان بیخوات، نەك سەری ببڕێت و فڕێی بدات.

ئەمەو پێویستە ڕاوچییەکە لە ئیحرامی حەج و عەمرەدا نەبێت، چونکە موسوڵمان لەماوەی ئیحرامدا ئەکەوێتە قۆناغی ئاشتییەکی تەواو ئاسایشێکی سەراپاگیر ، بەو جۆرە سنوورەکەی فراوان ئەبێت هەتاوەکو ئاژەڵ و گیاندارانی دەوروبەریشی ئەگرێتەوە لەئاسمان و زەویدا، تەنانەت ئەگەر نێچیری ڕاوەکە لەبەر دەستیابوو، یان ئەیزانی بە ڕم دەستگیری بکات، بەڵام ئەمە تاقیکردنەوەیە بەسەر مرۆڤی موسوڵماندا تێیەڕ ئەبێت هەتاوەکو بەهێزو ئارام گرتووبێت.

---

[1] / النسائی والحاکم و ئەڵێت ئیسنادێکی ڕاستی هەیە ، ت:٤٧.

وە لەم بارەیەوە خوای گەورە ئەفەرموێ :

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لَيَبْلُوَنَّكُمُ اللّهُ بِشَيْءٍ مِّنَ الصَّيْدِ تَنَالُهُ أَيْدِيكُمْ وَرِمَاحُكُمْ لِيَعْلَمَ اللّهُ مَن يَخَافُهُ بِالْغَيْبِ فَمَنِ اعْتَدَى بَعْدَ ذَلِكَ فَلَهُ عَذَابٌ أَلِيمٌ {٩٤} يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَقْتُلُواْ الصَّيْدَ وَأَنتُمْ حُرُمٌ ﴾ المائدة .

﴿ وَحُرِّمَ عَلَيْكُمْ صَيْدُ الْبَرِّ مَا دُمْتُمْ حُرُمًا ﴾ المائدة :٩٦ ،

﴿ غَيْرَ مُحِلِّي الصَّيْدِ وَأَنتُمْ حُرُمٌ ﴾ المائدة: ١.

## ئەوەی پەیوەندی بە راو كـراوەكەوە هەیە

بەلاّم ئەو مەرجانەی پەیوەستن بە راوكراوەكەوە، ئەوەیە كە ئەبێت ئاژەڵێك بێت مرۆڤ نەتوانێ لەشوێنی تایبەتی سەربڕینەوە سەری ببڕێت، چونكە ئەگەر توانی سەری ببڕێ پێویستە سەری ببڕێو ، پەنا بۆ جگە لە سەربڕین نەبات، چونكە ئەوە ئەصڵە.

هەروەها ئەگەر تیرەكەی تێگرت، یاخود سەگەكەی گرتی پاشان ژیانی تیادا بوو، ئەوا پێویستە پەنا بەرێتە بەر سەربڕینی لەجێگەی خۆیەوە، بەلاّم ئەگەر ژیانێكی ناجێگیری تیادامابوو، ئەوا سەربڕینەكەی باشترە ، وەگەر وازی لێ بهێنێو خۆی بمرێت، ئەوا تاوانی لەسەر نیە، وەلە (الصحیحن)دا ( إذا أَرْسَلْتَ كَلْبَكَ فَاذْكُر إسْمَ اللهِ عَلَيه، فإنْ أَمْسَك عَلَيْكَ فأَدْرَكْتَهُ حَياً فاذْبَحْهُ ﴾ [1].

## ئەوەی راوی پێوە ئەكرێ

ئەوەی راوی پێ ئەكرێ، دوو جۆرە:

١. ئامێرێكی بریندارکار وەك تیرو شمشێرو رم هەروەك ئایەتەكە ئاماژەی پێ ئەكات : ﴿ تَنَالُهُ أَيْدِيكُمْ وَرِمَاحُكُمْ ﴾ المائدة : ٩٤.

ب . ئەو ئاژەڵە بریندارکارەی توانای فێربوونی هەیە، وەك سەگ ، وە لە باڵندەشدا وەك بازو هەڵۆ، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿ قُلْ أُحِلَّ لَكُمُ الطَّيِّبَاتُ وَمَا عَلَّمْتُم مِّنَ الْجَوَارِحِ مُكَلِّبِينَ تُعَلِّمُونَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَكُمُ اللّهُ ﴾ المائدة : ٤.

---

[1] / ت: ٤٨.

## راوکــردن به چەکی برینداركار

راوكردن به ئامێر ئەبێت دوو مەرجی تێدا بەدی بێت:

١. ئەبێت ئامێرەكە بچێتە ناوجەستەیەوەو لێشی دەربچێ، بەم جۆرەیە، نـەك بـەهۆی هێـزو قورسـاییەكەوە بێـت . عـەدی كـوری حاتـەم پرسـیاری كـرد لـە پێغەمبەر ﷺ وتی: من به میعراض له نێچیر ئەدەم و ئەیپێكم ! فەرمووی: ئەگـەر بـە میعـراض پێكـات و لەجەسـتەی دەرچـوو، ئـەوا بیخـۆ، بـەلاّم ئەگـەر لەسـەر بـاری پانایی‌یەكەی پێكات ئەوا مەیخۆ )[1].

ئـەم فەرموودەیـە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی كـەگرنگ بێـت دەرچـوونی ئـەو ئامێرەیـە لەجەسـتەی گیاندارەكـەوە، تەنانـەت ئەگـەر بەقورسـاییش بێـت، لەسـەر ئەمەوە ئەوانەی بەتفەنگو دەمانگەو ئەو جۆرە چەكانە بكوژرێ و راو بكرێ، ئەوا به توندتر لەجەستەكەدا دێتە دەرەوە لەهاتنە دەرەوەی تیرو رم و شمشێر.

بەلاّم ئەوەی احمد ئەیگێڕێتەوە: ( لاتأكل من البندقية إلاّ ماذكيت ) ئەوەیە كە البخـاری لـە قسـەی إبـن عمـر سـەبارەت بـە كـوژراوی چـەك بـە (موقـوذ) دائـەنرێ و حەرامـە . (البندقـە) ئـەوەبووە كـە لـەقوڕ دروسـت ئـەكراو پاشـان وشـك ئـەبووەوەو پاشان راویان پێ ئەنجام ئەدا [2].

وەك بندقە كە راوی پێ ئەكرێ بەرد تێگرتنە یاخود جگە بەرد، ئەفەرموێ : ( إنها لا تصيد صيداً ولا تنكأ عدواً لكنها تكسر السن ، وتفقا العين )[3].

ئەوە نێچیر ناخاتو دوژمن لەناو نابات، بەڵكو دان ئەشكێنێ و چاو كوێر ئەكات.

٢. ئەبێت لەكاتی پێكرانی یاخود لێدانی گیاندارەكەدا ناوی خـوای گـەورە بهێنرێ ، هەر وەك پێغەمبەر ﷺ (عەدی كوری حاتەمی) فێر كرد.

## راوكــردن به سەگو هاوچەشنی

ئەگەر راوكردنەكە بە (سـەگ) یـاخود (بـاز) بێـت ئـەوا ئـەوەی داوا ئـەكرێت ئەوەیە :

١. ئەبێت راهێنراو بێت.

---

[1] / ت:٤٩.

[2] / ت:٥٠.

[3] / الشیخان گێراویانەتەوە ، ت: ٥١.

٢. ئەبێت راوکردنەکەی بۆ خاوەنەکەی بێت.

٣. ئەبێت لەکاتی ناردنیدا بۆ راوەکە ناوی خوای گەورە بهێنرێت.

دیارە بنچینەی ئەم مەرجانەش ئایەتە پیرۆزەکە ناوی بردوون ﴿ يَسْأَلُونَكَ مَاذَا أُحِلَّ لَهُمْ قُلْ أُحِلَّ لَكُمُ الطَّيِّبَاتُ وَمَا عَلَّمْتُم مِّنَ الْجَوَارِحِ مُكَلِّبِينَ [1] تُعَلِّمُونَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَكُمُ اللَّهُ فَكُلُواْ مِمَّا أَمْسَكْنَ عَلَيْكُمْ وَاذْكُرُواْ اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهِ ﴾ المائدة : ٤.

١. رادەی فێرکردنەکە زانراوە، کە توانای خاوەن سەگەکەیە لە دەست بەسەرداگرتن و ئاستەکردنی بەجۆرێك کە بانگی کرد وەڵامی بداتەوە، وە بە راوکردن هەڵی بنێت، ئەویش بکەوێتە شوێن نێچیرەکە . هەرچەندە لەم خاڵانەدا هەندێك راجیایی زانایانی تیایە - لەوەی گرنگە ئەویە کە فێر کردنەکە حسابێ بەجێ بێ کەئەویش کارێکە داب و نەرێت پەی پێ ئەبات.

٢. رادەی دەست بەسەراگرتنی خاوەنەکەی بۆی کە نێچیرەکە نەخوات، ئەفەرموێ ﷺ : ( إذا أرسلت الكلب فأكل من الصيد ، فلا تأكل فإنما أمسك على نفسه ، فإذا أرسلته فقتل ولم يأكل فكل فإنما أمسكه على صاحبه )[2].

واتە : ئەگەر سەگت نارد بۆ راوکردن و لەنێچیرەکەی خوارد، ئەوا لێی مەخۆ، چونکە بۆ خۆی گرتووە، وەکاتێ ناردت و کوشتی و لێی نەخوارد ئەوا بیخۆ چونکە ئەوە بۆ خاوەنەکەی گرتووە.

وەهەندێك لە زانایان جیاوازییان کردووە لەنێوەند دڕندەی ئاژەڵ وەك سەگ و دڕندەی باڵندەدا وەك داڵ، بۆیە ئەو نێچیرانەی باڵندەکان ئەیخۆن ، رێگەیان پێداوە، بەبێ خواردنی پاشماوەی دڕەندە ئاژەڵەکان ..

وەدانایی لەم دوو مەرجەدا فێرکردنی سەگ و هاوچەشنیەتی، گرتنیەتی بۆ خاوەنەکەی کە ئەمە رێزو مەزنی مرۆڤ دەرئەخات، وە بەدوورگرتن لەخواردنی مرۆڤ لە زیادەی سەگ، و نێچیری دڕندەکان کە هەندێك دەروون نزم ئەتوانن ئاسان کاریی تیابکەن، بۆیە گەر سەگەکە راهێنراوبوو، و بۆ خاوەنەکەی گرت، ئەمە وەکو ئامێر وەهایە کە راوچی لەگرتنی نێچیرەکەدا بەکاری ئەهێنێت، وەك تیرو رم و ئەو جۆرە شتانە.

٣. وە ناوهێنانی ناوی خوای گەورە لەکاتی ناردنی سەگدا بۆ راو کردن، هەر

---

[1] / فێرکراوو راهێنراو = مکلبین .

[2] / احمد و هاوشێوەکانی لە (الصحیحن)دا گێراویانەتەوە ، ت: ٥٢.

وەك ناوهێنانی وەهایە لەكاتیٚ تێگرتنی تیرو رم و ئەو جۆرە شتانەدا، وە ئایەتەكەش لێرەدا فەرمانی پێكردووە: ﴿ اذْكُرُواْ اسْمَ اللّهِ عَلَيْهِ ﴾ هەروەك ئەوەی لە فەرموودە راستەكاندا ئاماژەی پێكراوە كە (متفق علیه)ی ، وەك فەرموودەكەی (عەدی كوری حاتەم) .

وە ئەوەی بەڵگەیە لەسەر ئەم مەرجە ئەوەیە گەر سەگێكیتر هاوبەشی كرد لەگەڵ سەگەكەیدا ئەوا راوكردنیان حەڵاڵ نییە. كاتێك عەدی پرسیاری كرد لە پێغەمبەر ﷺ : من سەگەكەم ئەنێرم بۆ راو وەسەگێكی تری لەگەڵدا ئەبینم نازانم كامیان نێچیرەكەیان گرتووە، بۆیە فەرمووی: ( فلا تاكل " فانما سمیت علی كلبك ولم تسم علی غیره) [1] واتە: مەیخۆ تۆ (بسم الله)ت لەسەر ئەوەی خۆت كردووە ، ناوی خوات لەسەر جگە لەو نەهێناوە.

وەگەر ناوهێنانی خوای گەورە لەبیرچوو لەكاتی تێگرتنەكەدا یاخود ناردنەكەدا، ئەوا ئەچێتە بازنەی بیرچوونەوەو، ئەتوانێت لەكاتی خواردنەكەیدا ناوی خوای گەورە بهێنێت.

## ئەگەر نێچیرەكە پاش پێكاندن مرداربووەوە

هەندێك جار راوچی كاتێك تیرەكەی ئەهاوێژێتو نێچیرەكەی ئەپێكێت، وە لێی ون ئەبێت و پاشان بەمردارەوە بوویی ئەیدۆزێتەوە، وەهەندێك جار دوای چەند رۆژێك ئەدۆزدرێتەوە ئەوا لەم حاڵەتەدا نێچیرەكە حەڵاڵە بەم مەرجانە:

١. ئەبێت نەكەوێتە ناو ئاوەوە ، بۆیە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمووێ : ( إذا رُميت سهمك فإن وجدته قد قتل فكل إلاّ أن تجده قد وقع في ماء فإنّك لا تدري الماء ، قتله أم سهمك )[2].

واتە: گەر تیرت هاویشت گەر بینیت كوژرابوو ئەوا لێی بخۆ، و گەر لە ئاودا دۆزیتەوە ئەوا تۆ نازانیت بەهۆی ئاوەكەوە كوژراوە یان بەهۆی تیرەكەی تۆوە.

٢. گەر هیچ شوێنەوارێكی تری جگە لەشوێنەواری ئەو تیرە پێوە نەبوو كە بوو بێتە هۆكاری كوژرانی ئەو نێچیرە، لەعەدی كوری حاتەمەوە ، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا: نێچیرەكە ئەپێكمو بۆ سبەینێدا تیرەكەم ئەبینمەوە،

---

[1] / ت: ٥٣.

[2] / الصحیحان: ت: ٥٤.

فەرمووی: (إذا علمت أن سهمك قتله، ولم ترك فيه أثر سبع فكل)[1]. واتە : ئەگەر زانیت کە تیرەکەی تۆ کوشتوویەتی و شوێنەواری دڕندەی پێوە دیار نەبوو ئەوا بیخۆ.

٣. ئەبێت ڕاوەکە نەگاتە پلەی خراپ بوونی گۆشتەکەی، چونکە سروشتی دروست بێز لە خواردنی خراپ بوو ئەکاتەوە ، هەروەك زیانیشی هەیە.

لە (صحیح مسلم)دا " کە پێغەمبەر ﷺ بە ابی ثعلبەی فەرموو: ( إذا رَمَيْتَ سَهمَكَ فَغَابَ – أي الصَّيد – ثلاثة أيام وأدْرَكْتَهُ فَكُلْهُ مَا لَمْ يَنْتَن )[2].

واتە: گەر تیرەکەت دا لەنێچیرو بەبەرچاوتەوە دیارنەما بۆ ماوەی سێ ڕۆژ . وەگەر دوایی دۆزیتەوە بیخۆ مادام گۆشتەکەی خراپ نەبوو بێت و بۆنی نەکردبێ.

## عەرەق و شەراب

## ئەو ماددە کهولییەیە کە مرۆڤ مەست و سەرخۆش ئەکات

جێگەی خۆیەتی لێرەدا زیانەکانی بۆ سەر تاکەکەس ڕوون بکەینەوە لە زیانە ژیرایی و جەستەییەکان، بۆ دونیاو ئایین ، یاخود مەترسییەکەی ڕوون بکەینەوە بۆ سەر خێزان لەڕووی چاودێری کردنییەوەو هەستان بە کاروبارەکان دایك بێت یان منداڵەکان، یان باسی هەڕەشەکانی بکەین بۆ سەر کۆمەڵگە مرۆییەکان لە پێکهاتەی گیانی و ماددی و ڕەوشتیدا.

ڕاستە کەیەکێك لەپیتۆڵان ئەفەرموێ: مرۆڤ هیچ لێدان و پێکاندنێك بە چەشنی لێدانی شەراب زیانی پێنەگەیاندووە، وە گەر ئامارێك ئەنجام بدرێ بە شێوەیەکی گشتی لە نەخۆشخانەکانی جیهاندا لەوانەی کە دووچاری تێکچوونی ژیریی و نەخۆشیە بێ چارەسەرەکان بوون بەهۆی خواردنی شەرابەوە ، وەلەسەر ئەوانەی خۆیان کوشتووە یان کوژراون بەم هۆیەوە: وە لەوانەی سکاڵا ئەکەن لە دەست ئازارەکانی دەمارو گەدەو ڕیخۆڵەوە کە بەهۆی شەرابەوە دووچاریان هاتووە، لەسەر ئەوانەی کە بەهۆی عەرەق خواردنەوە دارایی زۆریان لەدەست داوە، لەسەر ئەوانەی لەبەدەستهێنانی بژێوی ژیانیاندا تەنها پشت بەفرۆشتن

---

[1] / الترمذي وصححهُ ، ت: ٥٥.
[2] / ت: ٥٦.

یاخود ناپاکی ئەبەستن بەهۆی عەرەقەوە... وەگەر ئامارێك لەهەموو ئەم بوارانەدا یان هەندێکیاندا ئەنجام بدریٚ، ئەوا بۆمان دەرئەکەویٚ هەرچەندە لەم رووەوە ئامۆژگاری پێشکەش بکەین هەرکەسە دەست نیشانی تەواوی ناکریٚ.

عەرەب لەسەردەمی نەفامییدا بەناوبانگ بوون بە خواردنەوەیان و سەر مەست بوون و بەردەوام بوون لەسەری، ئەمە لە زمانەکەیاندا دەرکەوت، زیاد لە سەد ناویان بۆ دانا، وە لە هۆنراوەکانیاندا باسیان ئەکردو پیایا هەڵیان ئەدا بە سەرخۆیی و پێك و پەرداخ و دانیشتنەکانیەوە.

وەکاتێك ئایینی ئیسلام گرنگی‌دا پرۆگرامێکی پەروەردەییان درایە کە پلە بەپلە بەرەو حەرامکردنی چوو، لەسەرەتادا لەکاتی نوێژکردندا سەرخۆشی قەدەغە کرد، پاشان بۆی روون کردنەوە کە زیانەکانی لە سوودەکانی زیاترە ، پاشان ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە کە ئەفەرمویٚ: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالأَنصَابُ وَالأَزْلاَمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ {٩٠} إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاء فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ اللّهِ وَعَنِ الصَّلاَةِ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ {٩١} ﴾ المائدة: ٩٠-٩١.

وە لەم دوو ئایەتە پیرۆزەدا خوای گەورە جەخت ئەکاتەوە لەسەر حەرام کردنی شەراب و قومار، بەجۆریٚ کردوویەتییە هاوریٚی (انصاب) و (ازلام) وە بە (رجس) ناوزەدیان ئەکات کە (رجس) لە قورئاندا وشەیەکە بۆ شتێك زۆر خراپ و ناشرین نەبێت بەکار نایەت، وە بەکردەوەی شەیتانی گێڕاوانی، وکارێکی ناڕەواو خراپە، وەداوای دوور لیٚ کەوتنەوەی کردووە لێی و کردوویەتیە میکانیزمی سەرفرازی و سەرکەوتن ، وە هاتووەتە سەرباسی زیانە سۆسیۆ لۆژییەکانی کە ئەبێتە هۆی بچڕاندنی پەیوەندییەکان و دوژمنایەتی نانەوەو رق لێبوونەوە، وە لەزیانە ئایینییەکانیشی رێگری کردنییەتی لە واجیباتە ئایینەیکان و ئەنجام دانیان، پاشان بە رەوانبێژترین دەربڕین داوای کۆتایی پێهێنانی ئەکات و ئەفەرمویٚ : ﴿فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴾.

وەلاٚمی موسوڵمانانیش بۆ ئەم بانگەوازە خواییە: کۆتاییمان پیٚ‌هێنا ئەی پەروەردگار ، کۆتاییمان پیٚ هێنا ئەی پەروەردگار.

وە لەدوای دابەزینی ئەم ئایەتە شتی سەرسوڕهێنەر بەسەر موسڵماناندا هات. پیاوێك پێكێك شەرابی بەدەستەوە بوو هەندێكی لێ خواردبووو هەندێكیشی مابووەوە ، بەو جۆرە كە بیستی ئەم ئایەتە هاتووەتە خوارەوە ، یەكسەر پەرداخە شەرابەكەی ڕشتە سەر خۆڵەكە.

وەزۆرێك لە حكومەتەكان باوەڕیان هەیە بە زیانەكانی شەراب و عەرەق لەسەر تاكەكان و خێزانەكان و نیشتمانەكان، هەیان بووەو ویستوویەتی بەهێزی یاساوە دەستەڵات قەدەغەی بكات ، وەك ئەمریكا ـ بەڵام سەرنەكەوتو بووە ، لە كاتێكدا ئیسلام بەتەنها توانیوویەتی لەجەنگاندن و كۆنترۆڵ كردنیدا سەركەوتوو بێت.

وەپیاوانی كڵێسا مەسیحییەكان هەڵوێستیان بەرامبەر شەراب جیاوازە، وە هەندێكیان پێیان وایە كە لەئینجیلدا دەقێك هەیە ئەڵێت: عەرەق بۆ گەدە سوود بەخشەو چاكی ئەكاتەوە ، وەگەر ئەم قسەیە ڕاست ببوایە، و كەمێك شەراب گەدەی چاك بكردایەتەوە بەڕاستی، ئەوا پێویست بوو كە ئەو كەمە قەدەغە ببوایە . چونكە كەمێك شەراب ، زۆر بەدوا خۆدا ڕائەكێشێ بەو جۆرە پێك لەدوای پێك هەتا بەرەو ئیدمان و سەرمەست بوون ئەچێت.

ئەمە لەكاتێكدایە كە هەڵوێستی ئیسلام ئاشكرایە دەربارەی عەرەق و شەراب و هەموو ئەوانەشی یارمەتی دەری خواردنەوەین.

## هەموو سەرخۆشكارێك شەراب یان عەرەقە :

یەكەم شتێك كە پێغەمبەر ﷺ لەم ڕووەوە ڕایگەیاند، ئەوە بوو كە بڕوانرێتە ئەو ماددەیەی شەرابەكەی لێدروست ئەكرێت، وە تێڕوانین بۆ ئەو شوێنەوارەی بەجێی دەهێڵێ كە سەرخۆش بوونە، هەرچی هێزی سەرخۆش كردنی تیادابوو ئەوا شەرابە ئیتر خەڵكی هەر ناوو ناوبانگێكی لێ بنێن، وەئیتر هەرجۆرە ماددەیەك بێت و لە دروستكردنیدا بەكاربێت، بۆیە بیرەو هەموو هاو چەشنەكانی حەرامە.

پرسیار كرا لە پێغەمبەر ﷺ سەبارەت بەو شەرابانەی كە لە هەنگوین دروست ئەكرێن یاخود زڕات یان جۆ دائەنرێ هەتاوەكو هێز پەیدا ئەكات، وە پێغەمبەریش ﷺ بەم وتەكورتە پوختە وەڵامی هەموو ئەمانەی دایەوە ﴿كُلُّ مُسْكِرٍ خَمْرٌ، وَكُلُّ خَمْرٍ حَرَامٌ﴾[1]. واتە هەموو سەرخۆشكارێك عەرەقەو، هەموو عەرەقێكیش حەرامە.

---

[1] / مسلم گێڕاویەتیەوە ، ت: ٥٧.

وەپێشەوا عمر ﷺ لەسەر مینبەرەوە بۆ خەڵکی ڕاگەیاند هەرچی ژیری تێك بدا ئەوا عەرەقە[1].

## خواردنەوەی بڕی زۆرو کەم وەك یەك وەهایە

پاشان ئیسلام ڕاشکاوانە جارێکی دی، ناڕوانێتە بڕی ئەو شەرابەی ئەخورێتەوە زۆربێت یان کەم، چونکە هەرهێندە بەسە کەپێی مرۆڤ لەم ڕێگایەدا هەڵبخلیسکێ و بڕوات و توانای خۆگرتنەوەی نەبێت.

بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ : (ماأسكر كثيرة فقليله حرام)[2]. واتە: ئەو ماددەیەی خواردنی زۆرەکەی سەرخۆشی ئەنجام بدات، ئەو کەمەکەیشی حەرامە . ( ماأسكر الفرق منه فملْ الكف منـــه حـــرام )[3]. واتە: هەرچی زۆرەکەی سەرخۆشی ئەنجام بدات کەمەکەیشی حەرامە، وە هەر ماددەیەکیشی (فرق) ێکی سەرخۆشی ئەنجام بدات ( الفرق) پێوەرێکە ١٦ ڕەتڵ ئەگرێ. ئەوا کەمەکەشی حەرامە.

## بازرگانی کردن بەشەرابەوە

پێغەمبەر ﷺ تەنها بەحەرام کردنی خواردنەوەی کەم و زۆری عەرەق و شەراب نەوەستاوە ، بەڵکو بازرگانی پێوەکردنیشی حەرام کردووە، تەنانەت ئەگەر بۆ ناموسوڵمانانیش بێت، حەلاڵ نییە بۆ موسوڵمان کەببێتە نێرەر یاخود داواکاری شەراب یاخود ببێتە سەرچاوە بۆی یان ببێتە خاوەن فرۆشگای شەراب و عەرەق ، یان کرێکارێك بێت لەو فرۆشگایانەدا.

وە لەپێناوی ئەمەدا ( لعن النبي ﷺ في الخمر عشرة : عاصرها ومعتصرها ، شاربها وحاملها، والمحمولة اليه، وساقيها وبائعها، واكل ثمنها، والمشتري لها، والمشتراة له )[4]. واتە : پێغەمبەر ﷺ نەفرەتی نەکردووە لە (١٠) جۆر کەس لەسەر شەراب لەوەی شەرابەکەی ئەگرێتەوە لەوەی داوای ئەو گرتنوەیەی لێ ئەکات، لەوەی ئەیخواتەوە و، لەوەی هەلیگرێ، وە لەوەی بۆی هەڵئەگرێ، وەلەوەی ئەیگێڕێ لەوەی ئەفرۆشێ، لەوەی پارەکەی ئەخوا، لەوەی ئەیکڕێ، وەلەوەی بۆی ئەکڕدرێ.

وەکاتێك ئەن ئایەتەی پێشوو لەسوورەتی (المائدە) دابەزی، پێغەمبەر ﷺ

---

[1] / احمد وابو داود والترمذي گیراویانەتەوە ، ت: ٥٨.
[2] / احمد وابو داود والترمذي گێڕاویانەتەوە ، ت: ٥٨.
[3] / احمد وابوداود والترمذي گێڕاویانەتەوە، ت : ٥٩.
[4] / الترمذي وابن ماجه وەگێڕەرەوانی باوەڕ پێکراون ، ت : ٥٤ .

فەرمووی: ( ان الله حرم الخمر فمن ادركته هذه الاية ، وعنده منها شيء ، فلا يشـــرب ولا يبيع )[1]. واتـە: بەڕاستی خوای گەورە عـەرەقی حەرام کردووە ، جا هەرکەس ئەم ئایەتـەی گەیشـتە دەسـت و عـەرەقی لابـوو نەیخواتـەوەو، نەیفرۆشـێ. گێـڕەرەوەی فەرموودەکە ئەفـەرموێ: خەڵکی شاری مەدینـە هەرچی عارەقیان هـەبوو بردیـان‌و دەستیان کرد بە ڕشتنیان.

وە لە ڕێگەی ئیسلامەوە لەگرتنی هۆکارەکان بەرەو حەرام واتـە (الــذرائع) لەبەرئـەوە ڕەوانییـە بـۆ موسـڵمان تـرێ بفرۆشـێ بەکەسـێك کـە بزانێـت ئەیکاتـە شەراب‌و عـەرەق، وە لـە فەرموودەکەدا: ( من حبس العنب أيّام القطاف، حتى يبيعه مــن يهودي – أي ليهودي– أو نصراني أو من يتخذه خمراً– أي لوكان مسلماً– فقد تَقَحَّمَ النَّــار على بَصْيرة )[2] . واتە: هەرکەسێ ترێ لـە ڕۆژانـی خۆیـدا نەفرۆشـێ‌و هـەڵی گرێ، بـۆ ئەوەی بیفرۆشێتە جوولەکەیەك یان مەسیحییەك یان هەرکەسێ کـە بیکاتـە عـەرەق با موسڵمانیش بێ، ئەوا بەچاو ڕوونییەوە گەیشتووە بەئاگری دۆزەخ.

## موسوڵمان شەراب بەدیاری نانێرێت

ئەگـەر فرۆشـتن‌و خـواردنی نرخـی شـەراب حـەرام بێـت لەسـەر موسـوڵمان، ئەوا بەدیاری ناردنیشی ناڕەوایەو حەرامە کەبۆ جولەکە یان مەسیحییەکی بنێرێت ، نـاگونجێ موسـوڵمان دیـاری دەسـتی شـەراب بێـت، هـەروەك ناشـگونجێ ببێتـە دیاریش بۆي، چونکە موسوڵمان چاك‌و پاکە ، جا بۆیە هەرچی چاك‌و پـاك نـەبێت، نایکاتە دیاریی و هەرچییەکیش چاك و پاك نەبێت وەری ناگرێت.

ئەگێڕنـەوە کـە پیاوێـك ویسـتی پـڕ گۆزەیـەك شـەراب بکاتـە دیـاری بـۆ پێغەمبەر ﷺ ، بۆیە پێی ڕاگەیاند کە خوای گەورە حەرامی کردووە، پیاوەکە وتـی: ئــەی نەیفرۆشــم؟ پێغەمبــەریش ﷺ فــەرمووی: ئــەوەی خواردنــەوەی حەرامــە ، فرۆشتنیشـی حـەرامـە ، پیاوەکـە وتـی: ئـەی نەیبەخشمە جوولەکەیـەك؟ فـەرمووی: ئەوەی حـەرامی کـردووە، حـەرامی کـردووە بیبەخشیتە جوولەکە ، پیاوەکە وتـی: ئەی چی لێ بکەم ؟ فەرمووی: بیڕێژە بەزەوی البطحـاء دا[3].

---

[1] / مسلم گێرایویەتیەوە ، ت: ٦١.
[2] / الطبراني لە (الاوسط)دا گێراویەتیەوە الحافظ بە (حسن)ی داناوە لە (بلوغ المرام) (ت: ٦٢).
[3] / الحميدی لە (مسند)دا گێراویەتیەوە ، ت: ٦٣.

## خۆ دوور گرتن لە دانیشتنەکانی خواردنەوەی شەراب دا

لەسەر ئەم ڕێبازە فەرمان بەموسوڵمان کراوەکە ئامادەی دانیشتنەکانی خواردنەوە نەبێت، لەعەمرەوە - خوای لێی ڕازیبێت - بیستم پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ( من كان يؤمن بالله واليوم الاخر ، فلا يقعد على مائدة تدار عليها الخمـــر )[1].
واتە : ئەوەی باوەڕی بەخواو ڕۆژی دوایی هەیە با لەسەر مێزێك دانەنیشێت کە عەرەقی تیادا ئەگێڕدرێ.

موسوڵمان فەرمان پێکراوە کە هەر ناباشییەکی بەدی کرد بیگۆڕێت، وە ئەگەر نەیتوانی لای ببات، با ئەو خۆی لێ لاببات و، لە سەرخۆش لە کەس و کارو نیشتمانەکەشی.

لە (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) ئەگێڕنەوە کە جەڵدەی داوە لە عەرەق خۆران و ئەوانەشی لەدانیشتنیاندا بوون، تەنانەت ئەگەر لەگەڵیشیاندا نەیان خواردبێتەوە، وەئەگێڕنەوە کەباسی کۆمەڵێکیان بۆکرد کەعەرەقیان ئەخواردەوە ، بۆیە فەرمانیدا کەجەڵدەیان لێ بدرێ و پێیان وت: فلان کەس تیایاندا بە ڕۆژوو بووە؟ فەرمووی: بەو دەست پێبکەن، ئەی نەتانبیستووە خوای گەورە ئەفەرموێ :
﴿ وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ آيَاتِ اللّهِ يُكَفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَـلاَ تَقْعُـدُواْ مَعَهُمْ حَتَّى يَخُوضُواْ فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ ﴾ النساء : ١٤٠.

## شەراب دەردە نەك دەرمان !

بەهەموو ئەم دەقە ڕوون و ئاشکرایانە ئاینی ئیسلام بەتوندی سوورە لەسەر جەنگاندنی شەراب و بەدوورگرتنی موسوڵمان لێی و، دروستکردنی نێوەندو لەمپەر لەنێوان موسوڵمان و شەرابدا، بۆیە بچووکترین دەروازەی والا نەکردووە با بچووکیش بێ بۆ خواردنەوەی یان دەستی نێوەیدا.

وەڕێگەی نەداوە موسوڵمان بیخواتەوە هەرچەندە کەمیش بێت، وە ڕێگەشی نەداوە بەدەست تێوەدانی چ بە فرۆشتن یان کرین یان دیاری یان دروست کردن ، یان هەڵگرتنی لەماڵدا یان لەکۆگاکاندا ، یان ببرێتە ئاهەنگەکانەوەو ئامادە بکرێ بۆ بەناوخۆشی! وەك ڕێگەش نەدراوە کە پێشکەشی میوانی ناموسوڵمان بکرێ.

---

[1] / احمد گێراویەتیەوەو ماناکراوە لەلای (الترمذي) ، ت : ٦٤.

ئەوەی لێرەدا ئەمێنێتەوە لایەنێکە کەخەڵکی زۆر پرسیاری لەسەر ئەکەن، ئەویش بەکارهێنانییەتی لەشێوەی دەرماندا، ئەمەیە کەپێغەمبەری خوا ﷺ وەڵامی داوەتەوە، کەپیاوێك لێی پرسیبوو، سەبارەت بەشەراب و عەرەق لەشێوەی دەرماندا، پێغەمبەریش ﷺ نەرێی لێکردووەو فەرموویەتی:(إنَّه لَيس بِدَواء لكنَهُ داء)[1].

واتە: بێگومان شەراب و عەرەق دەرمان نین بەڵکو دەروون و نەخۆشین. هەروەها فەرموویەتی: ( إنَّ الله أنزَل الداء وَالدَواءَ وَجَعَلَ لَكُم دَاء دواء ، فَتَداوَوا ولاَتَداوَوا بِحَرام)[2]

واتە: خوایگەورە نەخۆشیو دەرمانەکەشی ناردووە، نەخۆشی گێراوە بەدەرمان . بۆیە چارەسەر وەربگرن، وە بەشتی حەرام چارەسەری نەخۆشییەکانتان مەکەن.

(ابن مسعود) ﷺ لەبارەی سەرخۆشکارەوە فەرموویەتی: ( ان الله لم يجعل شفاءكم فيما حرم عليكم)[3]. واتە: خوای گەورە شیفای نەخۆشییەکنتانی نەگێراوە لەوەدا کەلێی حەرام کردوون.

وەجێی سەرسووڕمان نییە کە ئیسلام چارەسەرکردنی بە شەراب و عەرەق حەرام کردووە" بۆیە حەرام کردنی شتێك هەروەك پێشەوا ابن القيم الجوزي ئەفەرموێ: پێویستە تەنانەت بەهەموو جۆرێکیش لێی دوور بکەوینەوە وە بەکارهێنانی بۆ دەرمان مانای هاندانە بۆ روو تێکردن و بەکارهێنانی ، دیارە ئەمەش پێچەوانەی مەبەستی بەرنامەکەی خوای گەورەیە.

ئەفەرموێ: لەرێگەپێدانیدا بۆچارەسەرسازیی ـ بەتایبەتی گەر ئارەزووی بەکار هێنانی بکەین لەبەر رێگەگرتن لەبەردەم ئارەزووی خواردنەوەیدا بۆ چێژ وەرگرتن ، بەتایبەت گەر زانرا بەسوودە بۆ دەروون و، لابەری ئازایەتی و شیفادەریەتی.

هەروەها لەم دەرمانە حەرامەدا هەندێك دەرمان هەن گومانی زیاتری شیفای تێدا ئەکرێ. ابن القيم لایەنێکی دەروونی گرنگی روون کردووەتەوە و ئەفەرموێ: لەمەرجی شیفا بەدەرمانەکە ئەوەیە کە ئەبێ بەکارهێنەرەکەی باوەری تەواوی پێ ببێو متمانەی بەسوودەکەی هەبێ، و باوەڕی ببێ بەو رێژەی

---

[1] / مسلم واحمد وابو داود والترمذي گێراویانەتەوە ، ت : ٦٥.
[2] / ابو داود گێراویەتیەوە، ت: ٦٦.
[3] / البخاري گێراویەتیەوە ، ت: ٦٧.

شیفایەی کەخوای گەورە تیایدا داناوە. وەزانراوە کە باوەڕی موسڵمان بەحەرام کردنی ئەمەیەو ئەمەش ئاستەنگە لەبەردەم چاکبوونەوەشدا، بەڵکو هەرکاتیّ مرۆۆ ئیمانی زیاتربێت، زیاتر بیّئارەزوو ئەبێت لەبەکارهێنانیو بیّباوەڕ ئەبێت پێی، وەگەر لەم حاڵەتەدا بیخواتەوە ئەوا ئەبێتە نەخۆشی نەك چارەسەر!

لەگەڵ ئەمەشدا پێویستی و ناچاری لەئیسلامدا بریاری تایبەتی خۆی بەسەردا ئەدرێت، بۆیە گریمان کە شەرابو ئەوەی کە تێکەڵی ئەبێت بووە چارەسەرێکی تەنیا بۆ نەخۆشییەكو جگە لەو دەرمانە ژیانی ئەکەوێتە مەترسییەوە ، ئەوا کە گومانم نییە پێی - وەپزیشکێکی موسوڵمانی وریا لە کارەکەداو پارێزکار بەئاییینەکەیەوە ئەم دەرمانەی بۆ دیاری کرد، ئەوا شەریعەتی ئیسلام لەسەر ئاسانکاریی بونیادنراوە، ئەوا رێگر لێرەدا نییە، کەلە تەسکترین سنووری گونجاودابێت: ﴿فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلاَ عَادٍ فَإِنَّ رَبَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ الأنعام:١٤٥.

## مادده بیّ هۆشکارەکان

(الخَمْرُ مَـا خَـــمَرَ العَقْـلَ) وتەیەکی ئاشکرایەو پێشەوا عمر ﷺ بەسەر مینبەرەوە فەرموویەتی و سنووری شەرابی پیّدیاری کردووە، هەتاوەکو پرسیاری پرسیارکاران زۆر نەبێت لەو رووەوە، بۆیە هەرچییەك ئەیەویّ بیگۆڕیّ و لەشێوازی تایبەتی خۆی تێکی بدات، ئەوە شەرابو عەرەقەو حەرامەو خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی ﷺ حەرامیان کردووە تارۆژی دوایی.

وەلەوانە ئەو ماددانەن کەبە (مادده بیّهۆشکارەکان) ناوزەدەکراون، وەك حەشیشو کۆکایین وئەفیونو ئەوجۆرانە کەکاریگەر ئەبن بەسەر ژیریی مرۆڤەوە، بەو جۆرە دوور بە نزیك ئەبینیّ و بەپێچەوانەوەشەوە، وەئەبێتە کەسێکی ناواقعی، و خەیاڵ بەوانەوە ئەکات کە واقیعی نین، وە لە دەریادا بە خەیاڵ و ئەندێشە مەلە ئەکات، ئەمەیە کە ئەوانەی ئەیخۆن، هەوڵی بۆ ئەدەن، هەتاوەکو خۆیان بیر بچێتەوە بەئایینو دونیایانەوە لەجیهانی رۆمانسیەتدا خەیاڵ بکەنەوە.

جگە لەهەموو ئەمانەش جەستە لاوازو ناکارا ئەکاتو، دەمارەکان سڕ ئەکات، و ئاستی تەندروستی جەستە دائەبەزێو دەروونەکان لاواز ئەکاتو کاریگەر ئەبن لەسەر ئاکارەکانی مرۆڤەوەو، ویستوئیرادەی مرۆۆ هەڵئەوەشێنێت

و هەستی لاواز ئەکات بەرامبەر ئەرکەکانی جگە لەمانەش ئەو کەسانەی لەسەریان بەردەوامن ، ئەبنە کەسانێکی زیانبەخش بەکۆمەڵگە.

هەروەك بەفیڕۆدانی داراییەکی زۆریشە و ماڵەکان ئەشێوێنێ بەهۆی ئەو پارەیەی کەلەم ماددەیەدا خەرج ئەکرێ، رەنگە هەندێك جار ئەو کەسەی پێوەی سەرگەرم بووە لە بژێوی مناڵەکانی دابینی بکات، یاخود رەنگە لە پەیداکردنیدا پەنا بەرێتە بەر رێگەیەکی نادروست بۆ دابینکردنی نرخەکەی.

ئەگەر باسمان کرد کە (حەرام) کردن ناپاکیو زیانی تیادایە، بۆمان روون بووەوە کە حەرامکردنی ئەم ناپاکانە کە زیانی مسۆگەری دروستیو دەروونی و رەوشتی و کۆمەڵایەتی و ئابووری هەیە.

وەلەسەر ئەم حەرامکردنە زانایانی فیقهی ئیسلامی هاودەنگ رێککەوتوون ئەو زانایانەی کەئەم دیاردەیە لەسەردەمیاندا بەدەرکەوتووە، وە پێشەنگیانەوە، شێخی ئیسلام (ابن تیمیە) کە ئەفەرموێ: ئەم حەشیشە حەرامە ، ئیتر مرۆڤ سەرخۆش بکات یان نا... وەبێگومان خراپەکاران ئەیانخۆن، چونکە جوڵە بەخش و بزوێنەرە، وەلەم رووەوە لەگەڵ شەرابدا کۆئەبنەوە، وە شەراب و عەرەق ئەبێتە فاکتەری جووڵەو دوژمنایەتیو ئەبێتە هۆی کزبوونو ژێر دەستەیی، لەگەڵ ئەمەشدا لادانی مەزاجو ژیریی تیایدایە، و کردنەوەی دەروازەی ئارەزووبازییە ، وە مرۆڤ هەڵئەنێ بەرەو لەدەستدانی چابوکی و بێ غیرەتی زۆر لە عەرەق خراپترە وە لەسەردەمی تەتەرەکانەوە کەوتووتە ناو مرۆڤایەتیو خواردنەوەی کەم بێت یان زۆر، حەددی هەیە ئەبێت (٨٠) جەڵدی لێ بدرێ.

وە ئەوەی دەرئەکەوێ خواردنی حەشیشەوە ئەمەش وەك ئەوە وایە کەلە خواردنەوەی شەرابەوە دەرئەکەوێ و بگرە لەزۆر رووەوە خراپترە، وە سزایشی لەسەر ئەدرێ. ئەڵێت: یاسای شەرعی ئەوەیە کە ئەوەی دەروونەکان ئارەزووی ئەکەن لەشتە حەرامەکان وەك شەراب خواردنەوەو بەدرەوشتی ئەمانە سزایان لەسەرە واتە (حد) وە ئەگەر دەروون ئارەزووی لەسەر نەبوو وەك خواردنی گۆشتی مردوو ئەوا ( التعزیزی)ی لەسەرە، وە حەشیشەش لەوانەیە کە بخۆرەکانی ئارەزووی ئەکەنو، وازی لێ ناهێنن، وەدەقەکانی حەرام کردن لە قورئانو

سوننەتدا ئەمانەش ئەگرێتەوە، هەروەك جگە لەمانەش ئەگرێتەوە)[1] .

## هەرشتێك خواردن و خواردنەوەی زیانی ببێ ئەوا حەرامە

یاسایەکی گشتی هەیە لەئیسلامدا و بڕیاری لەسەردراوە ، ئەوەیە کە حەلاڵ نییە بۆ موسوڵمان کەشتێك بخوات یان بخواتەوە بیکوژێ بەخێرایی یان لە سەرخۆ بێت، وەك ژەهر بەهەموو جۆرەکانیەوە، یان زیانی لێ بدات و ئازاری پێبگەیەنێ، وەنابێت هێندە زۆر بخوات و بخواتەوە کە دووچاری نەخۆشی بکات ، چونکە موسوڵمان موڵکی خۆی نییە، بەڵکو موڵکی ئایین و میللەتەکەیەتی، وە ژیان و تەندروستی و داراییەکەی ، هەموویان بەخششی خوای گەورەن و سپاردەن لەلای وەحەلاڵ نییە بۆی کەم تەرخەمیان تیادا بنوێنێ ، خوای گەورە ئەفەرموێ ﴿ وَلاَ تُلْقُواْ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ ﴾ البقرة : ١٩٥.

پێغەمبەریش ﷺ ئەفەرموێ: (لاضَرَرَ وَلا ضِرارْ)[2] واتە زیان مەدەو پاداشتی زیانیش بەزیان مەدەرەوە. بەگوێرەی ئەم پرنسیپە ئەڵێن: جگەرە کێشان مادام زیان بەخش بێت ئەوا حەرامە، بەتایبەت گەر پزیشکی تایبەت ئەم بڕیارە بدات لەسەر کەسێکی دیاریکراو، ئەگەر زیانە دروستیەکانی دەرنەکەوتایە ، ئەوا خۆ هەر ماڵ بەفیڕۆدانی تیادایە بە بێ ئەوەی سوودی بۆ دین یان دونیا ببێت . (نهى النبي ﷺ عن إضاعة المال)[3].

وە ئەرێ کردنەکەش زیاتر جەختی لەسەر ئەکرێتەوە ئەگەر کەس و کارو خێزان پێویستیان بەو داراییە بەفیڕۆ دراوە ببێ.

---

[1] / فتاوى ابن تيميه، ج٤، ل٢٦٢ و لەدوای ئەوەشەوە، بگەڕێرەوە سەر (السياسة الشرعية).
[2] / احمد وابن ماجه، ت : ٦٨.
[3] / البخاري / ت : ٦٩.

## پۆشاكو رازاندنەوە

ئیسلام رێگەی داوە بەموسڵمان ، بەڵكو داواشی لێكردووە كە رووكاری حرمووەی جوان بێتو لەو بەخششە خواییانە سوودمەند بێت لە رازاندنەوەو پۆشاك ، وەمەبەست لەپۆشاك لە ئیسلامدا دوو خاڵە: داپۆشین، و رازاندنەوە بۆیە خوای گەورە باس لە بەهرەكانی دەكات بەسەر بەندەكانییەوە ﴿ يَا بَنِي آدَمَ قَدْ أَنزَلْنَا عَلَيْكُمْ لِبَاسًا يُوَارِي سَوْءَاتِكُمْ وَرِيشًا ﴾ الأعراف : ٢٦.

بۆیە هەركەسێ لەیەكێك لەم دوو خاڵەدا كەمتەرخەمی بنوێنێ – كە داپۆشینو رازاندنەوەیە – بێگومان لە راستە شەقامی ئیسلام لایداوە بۆ سەر رێگاكانی شەیتان . ئەمەش نهێنی ئەو دوو بانگەوازەیە كە خوای گەورە ئاراستەی ئادەمیزادی ئەكات و لە بێبەرگی و وازهێنان لەرازاندنەوە ئاگاداریان ئەكاتەوە بە هۆی بەشوێن كەوتنی هەنگاوەكانی شەیتان ﴿يَا بَنِي آدَمَ لاَ يَفْتِنَنَّكُمُ الشَّيْطَانُ كَمَا أَخْرَجَ أَبَوَيْكُم مِّنَ الْجَنَّةِ يَنزِعُ عَنْهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوْءَاتِهِمَا ﴾ الأعراف : ٢٧. هەروەها ئەفەرموێ: ﴿يَا بَنِي آدَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ وكُلُواْ وَاشْرَبُواْ وَلاَ تُسْرِفُواْ﴾ الأعراف : ٣١.

ئیسلام لەسەر موسوڵمانی پێویست كردووە كە (عورە) یان داپپۆشن كە مرۆڤی نوێ شەرمێ لێ ئەكات ، هەتا لەئاژەڵی رووت جیا بكرێتەوە. بەڵكو بانگی كردووە بۆ ئەم داپۆشینە ، تەنانەت گەر بە تەنیاش بێت و لە خەڵكیشەوە دوور بێت ، هەتاوەكو شەرم و كەسایەتییەكی بەرز بێتە سیمایەك بۆی.

لە (بهز بن حكيم) لە باوكیەوە لە باپیریەوە ﷺ وتی: وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ شەرمگا كوێیە تا بیپۆشین و غەیری ئەوە واز لێ بهێنین؟ فەرمووی : (إحفظ عورتك إلا من زوجتك أو ماملكت يمينك) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەگەر خەڵكانێك تێكەڵ بەیەكتر بوو بێت ؟ فەرمووی: ( فإنْ إستطعْتَ أن لا يَراها أحَدٌ فلا يَرَّنها ) پاشان وتم: ئەی ئەگەر یەكێكمان بەتەنیا بوو ؟ فەرمووی: ( فالله تبارك وتعالى أحق أن يستحي منه )[1].

---

[1] / احمد وابو داود والترمذي وابن ماجه والبيهقي والحاكم گێڕاویانەتەوە، ت: ٧٠.

## ئاییینی پاك‌و خاوێنی و جوانكاری

بەرلەوەی ئیسلام گرنگی بداتە رازاندنەوە رێكوپێكی رووخساری دەرەوە، زیاتر گرنگی‌داوە بەپاك‌و خاوێنی، چونكە بنچینەی هەموو رازاندنەوەیەكی جوانەو هەموو روخسارێكی جوانە.

لە پێغەمبەرەوە ئەگێڕنەوە ﷺ ( تنظفوا فإن الإسلام نظيف)[1] ( النظافة تدعوا إلى الإيمان ، والإيمان مع صاحبه في الجنة )[2].

وەهانی داوین لەسەر پاكوخاوێنی پۆشاك و جەستەو ماڵ‌و رێگاو گرنگی دانی تایبەت بەپاك‌و خاوێنی دانەكان و...

ئەمانە جێگەی سەرسوورمان نین لەئاینێكدا كەپاك‌و خاوێنی كردووەتە كلیلێك بۆ كردنەوەی یەكەم دەروازەی رەزامەندی كە نوێژە، وەنوێژ لەموسوڵمان وەرناگرێ هەتا جەستەی خاوێن نەبێت، تەنانەت پۆشاك‌و ئەو جێگەیەشی كە نوێژەكەی تیادا ئەنجام ئەدات، ئەمانە جگە لەو پاك‌و خاوێنییەی كە پێویستە لە جەستەو ئەو ئەندامانەدا بێن كە بەر خۆڵ نەكەون، كە لە ئیسلامدا بە (غسل) و (الوضوء) دەست نوێژ ناوبراون.

وە ئەگەر ژینگەی عەرەب لەسەردەمی خۆیاندا گرنگی‌یان بە رووكەش‌و پاك‌و خاوێنی نەئەدا، بۆیە پێغەمبەر ﷺ بەبەردەوامی رێنموویی‌و ئاساتەی ئەكردن لەو رووەوەو ئامۆژگاری ئەكردن، هەتاوەكو بوونە كەسانێكی خاوەن ژیارو پاك‌و خاوێن.

پیاوێك هات بۆلای پێغەمبەر ﷺ كە قژی‌و ریشی تۆزاوی و چڵكن بوون، بۆیە پێغەمبەر ﷺ ئامارەی پێ‌كرد و فەرمانی پێ‌كرد سەری چاك بكات ـ وە ئەنجامی‌دا . پاشان گەڕایەوە فەرمووی: ( اليس هذا خيراً من أن ياتي احدكم ثائر الرأس كانه شيطان) [3].

پێغەمبەر ﷺ پیاوێكی بینی قژێكی ئاڵۆسكاوو ناباری هەبوو، فەرمووی: ( ئەوەشتێكی وانییە قژو سەرتی پێ چاك بكەیت ؟! )

وەیەكێكی تری بینی كە پۆشاكێكی چڵكنی لەبەردابوو فەرمووی: ئەوە

---

[1] / ابن حبان ، ت: ٧١.
[2] / الطبراني ، ت: ٧٢.
[3] / مالك في (الموطا) ، ت: ٧٣.

شتێك نییه پۆشاكەكەتی پێ بشۆیت ؟[1]

پیاوێك هات بۆ لای بەبەرگێكی شڕەوه ئەویش فەرمووی: ئەوه دارایيت نییه؟ وتی: بەڵێ هەمه، فەرمووی: لەچ جۆره ماڵو داراییەك؟ ئەویش وتی: لە هەموو جۆره ماڵو داراییەك خوای گەوره پێی داوم . پاشان فەرمووی: ئەگەر خوای گەوره دارایی پێبەخشیت باشوێنەواری ئەو بەخششەی و رێزی بەسەرتەوه ببینێ )[2].

و جەختی كردووەتەوه لەسەر هاندان بۆ پاكو خاوێنیو جوانكاریی لە شوێنی كۆبوونەوەی خەڵكیدا وەك رۆژی هەینیو جەژنەكان ، فەرمووی: ( ما على احدكم – ان وجد – ان يتخذ ثوبين ليوم الجمعة غير ثوبي مهنته )[3].

واتە: ئەگەر یەكێك لەئێوه – توانا بوو– با بەجلی جەژنەكانو رۆژی هەینی لەگەڵ پۆشاكی ئیشو كارەكەیدا جیاواز بێت .

## ئاڵتونو ئاوریشمی ساغ بۆ پیاوان قەدەغەیه

گەر ئیسلام رێگەی بە رازاندنەوه دابێو، بەڵكو داواشی كردبێ، نكوڵی حەرامكردنی ئەكات: ﴿قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللَّهِ الَّتِيَ أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ وَالْطَّيِّبَاتِ مِنَ الرِّزْقِ﴾ الأعراف:٣٢.

خوای گەوره دوو جۆر هۆكاری رازاندنەوەی لەسەر پیاوان حەرام كردووه لەكاتێكدا بۆ ئافرەتان حەڵاڵكراوه:

١. خۆرازاندنەوه بەئاڵتون.
٢. لەبەركردنی پۆشاكی ئاوریشمی ساغ.

لە (علی) ﷺ پێغەمبەر ﷺ ، ئاوریشمێكی خستەلای راستییەوه ، و ئاڵتونێكیشی خستەلای چەپییەوەو ، پاشان فەرمووی: ( إنَّ هَذين حَرام عَلَى ذُكور أُمَتِي )[4]. واتە: ئەم دوانە حەرامن لەسەر نێرینەكانی ئوممەتەكەم.

وه لە عمرەوه ﷺ ئەفەرموێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەر ﷺ ئەیفەرموو: ( لا تلبسوا الحرير، فإنَّ مَنْ لَبِسَهُ في الدُنيا لَمْ يَلْبِسْهُ في الآخِرَة)[5].

---

[1] / ابوداود : ت : ٧٤.
[2] / النسائي ، ت: ٧٥.
[3] / ابوداود گێراویەتیەوه ، ت: ٧٦.
[4] / احمد وابو داود والنسائي وابن ماجه گێراویانەتەوه، ابن ماجه ئەمەی زیادكردووه ( حل لاناثهم) ت: ٧٧.
[5] / الشیخان لە حەدیثي (الغسل)ەوه گێراویانەتەوه ت: ٧٨.

هەروەها فەرموودی دەربارەی دروستکراوێك لە ئاوریشم : ( إنَّما هذه لباسُ مَنْ لا خَلاق لَهُ ) [١].

وە ئەڵقەیەکی یان موستیلەیەکی ئاڵتونی بینی لەدەستی پیاوێکدا ، بۆیە لەدەستی دەرهێناو فرێی‌داو فەرمووی: (يعمد أحدكم الى جمرة من نار فيجعلها في يده) بەپیاوێك وترا لەدوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشت: بگرە مستیلەکەت‌و سوودی لێ وەرگرە، وتی: نەخێر واللە هەڵیناگرمەوە لەکاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ فرێی‌داوە[٢].

وە لە وێنەی موستیلە ئەوانەیە کە لەلای کەسانی لە دونیادا خۆشگوزار دەست ئەکەون لە پێنووس و سەعات‌و پەرداخ و قوتوی جگەرەو ئاڵتون .

بەڵام لە پەنجەکردنی موستیلەی زیو، خوای گەورە ڕێگەی پی‌داوە لەسەر زمانی پێغەمبەری خوا ﷺ البخاری لە (ابن عمر)ەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ موستیلەیەکی زیوی لە پەنجەدا بووە، پاشان چووە دەستی ابوبکر ؓ پاشان چووە دەست عمر ؓ پاشان چووە دەستی عوسمان ؓ هەتا کەوتە بیری ئەریسەوە[٣].

بەڵام مادده کانزاییەکان وەك ئاسن، ئەوا دەقێکی ڕاشکاوی لەسەر نییە سەبارەت بەحەرام بوونەکەی، بەڵکو لە(صحیح)ی بوخاریدا هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەپیاوێکی فەرموو کە ئەیویست ئافرەتێك بهێنێت کە خۆی پێشکەش کردووە: (التمس ولو خاتماً من حديد)[٤]وە البخاری ئەمەی کردووەتە بەڵگەی ئەوەی کە مستیلەی ئاسن حەڵاڵە.

وەبواری داوە بە لەبەرکردنی ئاوریشم بۆ پیاوان ، ئەگەر بە مەبەستێکی ڕاست‌و بۆ پێویستی بێت، چونکە ڕێگەی داوە بە (عبدالرحمن بن عوف) و (زوبیر بن العوام) ؓ . کە ئاوریشم لەبەر بکەن بەهۆی ئاڵۆشێکەوە کە هەیانبوو[٥].

## ڕەچاوکردنی دانایی لەحەرامکردنیدا لەسەر پیاوان

ئیسلام بەم هەنگاوی حەرامکردنەی ئاوریشم لەسەر پیاوان ئامانج و مەبەستێکی پەروەردەیی‌و ڕەوشتی باشی پێکاوە، چونکە ئیسلام ئایینی هێزو تێکۆشانە، بۆیە پێویستە ئازایەتی پیاو پارێزگاریی بکرێت لە لاوازی‌و تێك

---

1 / الشیخان ، ت: ٧٩.
2 / مسلم گێراویەتیەوە : ٨٠ .
3 / البخاری فی کتاب اللباس : ت : ٨١.
4 / ت : ٨٢.
5 / البخاري ، ت: ٨٣ ، ولە ژێر ژمارە (٣١) دا ڕۆیشتووە.

شكاندن و لەبەرهەڵوەشانن. وەپیاو خوای گەورە بەپێکهاتەیەکی جەستەیی جیای کردووەتەوە کەجیاوازە لە پێکهاتەی جەستەی ئافرەت، وە لەوە بەرزترە لەگەڵ ئەو جۆرە ئافرەتانەدا پێشبڕکێ لەبەرکردنی ئاوریشم بکات.

جگە لەمەش ئامانجێکی کۆمەڵایەتی لەپشتی ئەم حەرامکردنەوەیە: حەرامکردنی ئاڵتون و ئاوریشم بۆ پیاوان، بەشێکە لەئیسلام لەجەنگاندا بەرامبەر رابواردنی بێئەندازە، چونکە ئەو جۆرە رابوارانە واتە (الترف) نزیکە لەو لەبەریەك هەڵوەشانەی گەلان کە هەرەشەی لەناوبردنیان ئەکات، وە دیاردەی ستەمە کۆمەڵایەتییەکانە، کە کۆمەڵێك کەم لەسەر حسابی خەڵکانێکی چەوساوە و زۆرنیە، ئەیپۆشن و لەدوای ئەمەشەوە ئەبنە دوژمنی هەموو پەیامێکی راست و باش و چاکخوازی. قورئان ئەفەرموێ:

﴿وَإِذَا أَرَدْنَا أَن نُّهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيْهَا الْقَوْلُ فَدَمَّرْنَاهَا تَدْمِيرًا﴾ الإسراء: ١٦.

﴿وَمَا أَرْسَلْنَا فِي قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَا إِنَّا بِمَا أُرْسِلْتُم بِهِ كَافِرُونَ﴾ سبأ: ٣٤.

مەبەستی پەیکەڵکردنی رابواردنی زیاد لە سنووری حەرام کردووە لە ژیانی مرۆڤی موسوڵماندا، هەروەك ئاڵتون و ئاوریشمی بەتەنها لەسەر پیاوان حەرام کردووە، بەکارهێنانی قاپ و قاچاخ و کوپی ئاڵتون زیوی لەسەر هەردوو رەگەز حەرام کردووە، هەروەك دێتە سەرباسی.

لەدوای ئەمانەشەوە فاکتەرێکی ئابووری لەپشت حەرام کردنەکەیانەوە هەیە، کەخۆی بۆ خۆی ئەمیش کێشی تایبەتی هەیە. چونکە ئاڵتون بوونێکی سەرەکی و جیهانی هەیە سەبارەت بەتەخت (النقد) بۆیە ناگونجێ لە دروست کردنی قاپ و کەل و پەلی خواردندا یان بۆ رازاندنەوەی پیاوان بەکاربهێنرێ.

## رەچاوکردنی دانایی لەحەڵاڵبوونیدا بۆ ئافرەتان

بێگومان لەم بریاری حەرام کردنەدا ئافرەتان بەدەرن، ئەمەش بۆ رەچاو کردنی لایەنی ئافرەت و بەو حوکمەی رەگەزی مێیە و ئارەزووی خۆرازاندنەوە ئەکات، وە بۆئەوەی ئامانجی نەبێتە خۆرازاندنەوە بۆ لەخشتە بردنی پیاوان و بزواندن ئارەزوویان. لەفەرموودەکەدا: ( ايما امرأة استعطرت فمرت على قوم ليجدوا ريحها فهي زانية ، وكل عين زانية ) . واتە: هەرئافرەتێك بۆنی خۆش بەکاربهێنێ، و

بەلای خەڵکانێکدا تێپەڕببێت بۆ ئەوەی بۆنی بکەن، ئەوا زینای کردووە، وە هەموو چاوێکیش زینا ئەکات.

هەروەها خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِــن زِينَتِهِنَّ ﴾ النور:٣١.

## پۆشاکی ئافرەتی موسڵمان

بێگومان ئایینی ئیسلام لەسەر ئافرەتی موسوڵمانی حەرام کردووەکە پۆشاکی تەسكو تەنك بپۆشیٚ بەجۆریٚ ببێتە باسێك بۆ جەستەی، یان پۆشاکێك کە ئەندامەکانی جەستە دیاری ئەکات، وە بەتایبەت هەندێك ئەندام کە جێگەی خراپەن، وەك سنگو هەندێك ئەندامی‌تر لە ملو گەردنو ئەو جۆرە شوێنانە.

لە (الصحيح) دا لە ابو هريرەوە ئەفەرموێ: ( قال رسول الله ﷺ صنفان مــن أهل النار لم أرهما: قوم معهم سياط كأذناب البقر يضربون بها الناس، ونساء كاسيات عاريات مميلات مائلات رؤوسهن كأسنمة البخت المائلة . لا يدخلن الجنة ولا يجدن ريحها، وإنّ ريحها ليوجد مسيرة كذا وكذا)[1] واتە: دووگروپ و دەستەهەن لە ئاگردانو من نەمبینیون:

**یەکەمیان :** جۆرێك لەدار حەیزەرانیان بەدەستەوەیە کە وەك کلکی مانگا وەهایەو لەخەڵکی پیٚ ئەدەن ـ کە ئاماژەیە بۆ کاربەدەست و کەسانی ستەمکار.

**وە دووەمیان :** ئەو ئافرەتانەن کە پۆشتەی بیٚ بەرگن ـ واتە کاری داپۆشین بەتەواوی ئەنجام نادات ئیتر ئایا بەهۆی تەسکی یان کورتی یان تەنکییەوە بێت ـ بەنازو لەنجەوە بەرێگادا ئەرۆن، سەریان وەك سەرپشتی وشتر وەهایە ، ئەوانە ناچنە بەهەشتو بۆنیشی ناکەن، کە بۆنی بەهەشت لە ئەوەندەو ئەوەندە ئەڕواتو ئەبیستریٚ.

هەروەك پێغەمبەر ﷺ لەپشتی سروشتی بینراوەوە رووانیبێتە ئەم سەردەمە، کە بۆ پۆلێنکردنو چاککردنو جوانکردنی ئافرەت چەندەها جێگەو کۆگای تایبەتی بەئاشکرا لەجیهاندا هەن، کە زۆرجار پیاوان سەرپەرشتی ئەم شوێنانە ئەکەن و لەو بەرامبەریشدا دارایی‌یەکی باش وەرئەگرن . تەنها ئەمە نییەو بەس ، بەڵکو زۆرێك لەئافرەتان بەدەرخستنی قژی خۆشیانەوە ناوەستن بەڵکو پەنا ئەبەنە بەر بۆ قژی دروستکراو یان قژی کەسانی دی بەکارئەهێنن، بۆ

---

[1] / مسلم گێراویەتیەوە ، ت: ٨٥.

ئەوەی بە نەرمیو بریسکەو جوانییەکی زیاترەوە پیشانی بدات ، تاوەکو زۆر سەرنج راکێشەو هەڵنەر بێت، ئەوەی لەم فەرموودەیەدا جێگەی سەر سوورمانە، کە هەستاوە بە وابەستە کردنی لەبەریەك هەڵوەشانی سیاسیو رەوشتی پێکەوە کە زیاتر واقیع میصداقیەتە بۆ ئەمە، چونکە زۆرداران هەمیشە میللەتان بە شتانێکەوە سەرقاڵ ئەکەن کە ئارەزوو بەهێز بکاتو مرۆڤ هەوڵی رابواردنی کەسی خۆی بدات ، تاوەکو نەپەرژێتە سەر کۆمەڵگەو ئەوانیش لەو دەروازەیەوە کاری خۆیان ئەنجام بدەن.

## لێکچوونی ئافرەتو پیاو بەیەکتری

پێغەمبەر ﷺ رای گەیاندوە کە حەرامە لەسەر ئافرەت پۆشاکی پیاو بپۆشێ و ، بەهەمان شێوەش سەبارەت بەپیاو کە نابێ پۆشاکی ئافرەت بپۆشێ [1] وە نەفرەتی کردووە لەو پیاوانەی خۆیان ئەکەنە قاڵبی ئافرەتەوەو بەهەمان شێوەش ئەو ئافرەتانەی خۆیان ئەکەنە قاڵبی پیاوەوە [2] کە ئەمە قسە کردن و جۆری جووڵەو رۆشتنو پۆشاکو ئەو جۆرانە ئەگرێتەوە.

خراپترین شتێك کە دووچاری ژیان هاتووەو کۆمەڵگە گیرۆدەی دەستیەتی ، دەرچوونە لە سروشتی خودو خۆدەرخستن بەجۆرێکی جگە لە سروشتی خود، وە سروشت هەردوو پیاو ئافرەتە، وەهەریەکەیان تایبەتمەندی خۆیان هەیە، بۆیە گەر پیاوێك خۆی بکاتە ئافرەت لەو بارانەوە کە لە سەرەوە باسمان کرد، وەئافرەتیش خۆی بکاتە پیاو ، ئەمە ئەبێتە خاڵی نێگەتیڤ بەسەر کۆمەڵگەو لەبەریەکتر هەڵوەشێنێت.

وە پێغەمبەر ﷺ لەریزی ئەوانەی نەفرەتیان لێ ئەکات ئەو پیاوەیەکە خوای گەورە بە نێر دروستی کردووە، بەڵام خۆی نەکاتە ئافرەت، وە ئەو ئافرەتەی خوای گەورە بە مێ دروستی کردوو، خۆی نەکاتە پیاو لاسایی پیاو ئەکاتەوە [3].

پێشەوا عمر ﷺ ئەفەرموێ: ( رأى رسول الله ﷺ ثَوْبَين مُصَفَرَين فَقالَ: انَ هَـذه مِن ثِيابِ الكُفار فَلا تَلْبَسْها ) .

---

[1] / احمد و ابو داود والنسائي وابن ماجه وابن حبان لەصەحیحەکەیدا و الحاكم ئەفەرموێ: صەحیحە لەسەر مەرجی مسلم( ت: ٨٦) .

[2] / البخاری جگە لەو گێراویانەتەوە ، ت: ٨٧.

[3] / الطبراني / ت: ٨٨.

## پۆشاکی بەناوبانگی و نرخداری

وەك یاسایەکی گشتی بەسەر هەموو بەخششەکانی خوای گەورە لە خواردن و خواردنەوەو هەموو ئەمانەدا، لە بەکارهێنانیاندا (اسراف)و زیادە ڕۆیی تیادا نەبێ.

وە(إسراف) یش، بریتییە لە تێپەڕاندنی سنووری حەڵاڵ بۆ سەر حەرام، و مەسەلەی خۆ بەگەورە زانینو ئەو جۆرە مەبەستانەش شتانێکن پابەندن بە نییەت و مەبەستی دڵەکانەوە زۆرتر لەوەی کە لە رووکاری دەرەوەدا بەدەرئەکەوێ، کە ئەویش مەبەستی خۆ بە گەورە زانینو نازکردنە بەسەر خەڵکیداو شانازی کردنە ﴿ وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ﴾ الحدید : ٢٣.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: (من جر ثوبه خيلاء لم ينظر الله اليه يوم القيامة)[1]. واتە: ئەوەی بۆ مەبەستی شانازی و خۆ بە گەورە زانین پۆشاکەکەی درێژ بکات، ئەوا خوای گەورە لە رۆژی دواییدا بۆی ناڕوانێت.

وەبۆ ئەوەی موسوڵمان لەگومانی خۆ بەگەورە زانین بەدوور بێ، پێغەمبەر ﷺ نەرێی کردووە لەپۆشاکی بەناوبانگ و گرانبەهای زیاد کە سەرنجی زۆرینە رابکێشێ و ببێتە جێگەی مقۆمقۆی خەڵك . لە فەرموودەیەکدا ( من لبس ثوب شهرة البسه الله ثوب مذلة يوم القيامة )[2]. پیاوێك پرسیاری کرد لە (ابن عمر) چی بپۆشم ؟ فەرمووی: ئەوەی کە زۆر ناشرین و بێ نموونە بێتو عەیببار نەبێت لەسەری[3].

واتە : سنووری ئاسایی ببەزێنێ.

## رۆچوون لەخۆرازاندنەوەدا بەگۆڕینی دروستکردنی خوای گەورە

ئیسلام رۆچوونی لە جوانکارییدا رەت کردووەتەوە بۆ ئەو سنوورەی کە بگاتە گۆڕینی دروست کردنەکانی خوای گەورە کە قورئان بە نیگای شەیتان ناوی دێنێ ، لە بارەی شوێنکەوتەیانەوە ئەفەرموێ : ﴿ وَلَآمُرَنَّهُمْ فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلْقَ اللَّهِ ﴾ النساء: ١١٩.

---

[1] / متفق علیه / ت: ٩٠.
[2] / احمد و ابو داود والنسائي وابن ماجه گێڕاویانەتەوە، واسنادەکەشی باوەڕپێکراوە، ت: ٩١.
[3] / الطبراني، ت: ٩٢ .

## حەرامکردنی خاڵ و جیاکردنەوەی دانەکان و نەشتەرگەری جوانکاریی

خاڵ کوتان و دەستکاری کردنی ددانەکان حەرامن چونکە پێغەمبەر ﷺ نەفرەتی کردووە لە ( الواشمة والمستوشمة ، الواشرة والمستوشرة )[1].

بەڵام خاڵ کوتاندن و تێکدانی دەم و چاوو دەستەکانە بەو رەنگە شین و نەخشە ناشرینانە ، وە زۆرێك لەعەرەب زیادەڕەوییان تیادا کردووە، بەتایبەت ئافرەتان، بەم خاڵانە زۆربەی جەستەیان نەخشین کردووە. تەنانەت هەندێك لە گەلان وێنەی خواوەندو شاعیرەکانیان لەسەر پێستیان بەو خاڵانە ئەکێشا، هەروەك ئەیبینین کە مەسیحییەکان بەو کوتاندنە وێنەی خاچ لەسەر دەست و سنگیان ئەکێشن . سەرباری ئەمانەش ئازارێکی زۆر بەجەستە ئەگەیەنێت .

( الواشمة ) : ئەو کەسەیە کە خاڵ ئەکوتێ، واتە بکەرەکەیەتی ئیتر بۆ خۆی بێ یان بۆ خەڵکی تر.

( المستوشمة ) : ئەو کەسەیە کە داوای خاڵ کوتان ئەکات بۆ خۆی .

بەڵام ( وشر الاسنان) واتە: جیاکردنەوەو کورت کردنەوەی، ئەوە بێگومان پێغەمبەر ﷺ نەفرەتی کردووە لەو ئافرەتانەی هەڵئەستن بەم کارە واتە (الواشرة) وە ئەو ئافرەتانەی داوا ئەکات بۆی ئەنجام بدرێ ، واتە: (المستوشرة) بەڵام خۆ ئەگەر پیاو ئەم کارە بکات، ئەوا بەپلەی یەکەم شیاوی نەفرین کردنە.

هەروەها دەستکاری کردنی دانەکانیشی حەرام کردووە: ( ولعن المتفلجات للحسن المتغيرات خلق الله )

المتفلجة: واتە ئەو ئافرەتانەی نێوەند ددانەکانی جیا ئەکاتەوە هەتاوەکو وابنوێنێ کە ئافرەتێکی گەنجە، چونکە بوونی ئەو بۆشاییە کەمانەی نێوەند ددانەکان تەنها لەگەنجدا بەدەر ئەکەوێ و کەمێك چووە تەمەنەوە بەو جۆرە نامێنێ، دیارە ئەمەش وەك خەڵەتاندنی خەڵکی وەهایە و، زیادەڕۆچوونیشە لە جوانکارییەکدا کە سروشتی مرۆڤ لەگەڵیدا تەبا نییە و ئیسلامیش پشتی لێ هەڵئەکات.

بەم فەرموودە(صەحیحانە) حوکمی ئەو نەشتەرگەرییانە ئەزانین کە ئەمرۆ بەناوی (نەشتەرگەری جوانکارییەوە) ئەنجام ئەدرێت، کە ژیاری جەستەو ئارەزوو

---

[1] / البخاري ومسلم لە فەرموودەی ابن مسعودەوە گێڕاویانەتەوە ، ت: ٩٤.

برەوی پێداوە . مەبەستم ژیاری ڕۆژئاوایەو بەو ماددییەتە نوێیەی ـ ئەبینیت کە ئافرەت یان پیاو سەدان و هەزاران ئەبەخشێ هەتاوەکو شێوەی لووتی ڕێک بکاتەوە یان هەرئەندامێکی تری جەستەی بێت. ئەمانە هەموو ئەچنە بازنەی ئەوانەی کە خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی ﷺ نەفرینیان لێکردوون، بە هۆی ئەو ئازارو سزایەوە کە مرۆڤ دووچاری ئەبێتو، جگە لەمەش گۆڕانێکە لە دروستکراوی خوادا، و بەبێ پێویستیەك پەنا ئەباتە بەر ئەم جۆرە کارانەو گرنگی پێدانی لە سنوور بەدەر بەرووکەش و بەفۆرمی دەرەوە دوور لە جەوهەرو ناوەڕۆك و ، بەجەستە نەك بە گیان.

بەڵام ئەگەر لە مرۆڤدا کەمو کورتییەکی نامۆ هەبوو سەرنجی ڕائەکێشا وەك ئەو پارچە زیادانەی کە ئازار زیاد ئەکەن یان لە رووی دەروونییەوە هەست بە کەمو کورتی ئەکات لە دانیشتداو لە کۆڕو کۆمەڵدا، ئەوا لێرەدا ئەتوانێت چارەسەری بکات، مادام بواری لابردنی ئەو ناڕەحەتییەی لەسەر هەیە، و ژیانی لێ تاڵ کردووە، چونکە خوای گەورە ناڕەحەتی لەئاییندا دانەناوە[1].

وەئەوەی فەرموودەکە پشتگیریی ئەکات ئەوکەسانەیە کە بۆجوانی دەستکاریی دان ئەکات، بەڵام گەر بۆ لابردنی ئازارێك یان زیانێك بێت، ئەوا دروستەو خوای گەورەش زاناترە.

## باریك كردنەوەی برۆكان

لەو ڕۆچوونانەی لە ڕازاندنەوەدا ئەنجام ئەدرێ و ئیسلام حەرامی کردووە لابردنی هەندێك مووی برۆکانە بۆ بەرزکردنەوەو ڕێککردنەوەیان، پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرینی کردووە لە (النامصة) و (المتنمصة)[2]: واتە: ئەوەی داوای ئەنجامدانی ئەم کارەی بۆ ئەکرێ . و حەرام بوونی ئەم موو لابردنە جێگیر ئەبێت ، ئەگەر بۆ ئافرەتانی بەدرەوشت بن.

وەهەندێك لەزانایانی حنابلە ئەفەرموون: ئەگونجێ و دروستە ئافرەتان هەندێك لە مووی دەمو چاویان لاببەن، وە دروستیشە مکیاژو ئارایشت کردن گەر بەرێگەدانی هاوسەرەکەی بوو ، و (النووی) ئەفەرمویٚ : تەنانەت لابردنی مووی دەمو چاویش دروست نییە . ابو داود لە (السنن)دا ئەفەرموێ: (نامصــــة) ئەو

---

[1] / المرأة بين البيتء المجتمع نووسینی م. البهي الخولي لا : ١٠٥ چاپی دووەم.
[2] / ابو داود اسنادێکی حسن گێراویەتیەوە هەروەك (فتح) داهاتووە ، ت: ٩٥

ئافرەتەیە کە برۆکانی نەخشی تیا ئەکات هەتاوەکو باریکیان ئەکاتەوە، کە ئەم ئافرەتە لابردنی زیادەی دەمو چاو ناگرێتەوە.

(الطبري) لەخێزانەکەی (ابی اسحاق) ئەگێڕێتەوە کە چوو بۆلای عائیشە ، وە گەنجو جوان بوو، وتی: ئایا ئافرەت بۆی هەیە مووی زیادەی رووخساری لاببات ؟ فەرمووی: ئەوەی ئازاری بۆت هەیە بەپێی توانا لایان ببە[1].

## مووچاخ کردن ( وصل الشعر )

لە حەرام کراوەکان دووبارە کە لەجوانکارییدا ئەنجام ئەدرێت، گەیاندنی قژە بەقژێکی تر ، ئیتر ئایا ئەو قژە راستەقینە یان دەستکرد بێت، کە ئەمڕۆ پێی ئەوترێ (باررووکە).

(البخاری) و جگە لە (عائیشەوە) ئەگێڕنەوە لە (ئەسما)و (ئیبن مەسعود) و (ئیبن عومەر) و (ئەبی هورەیرە) وە کە پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرەتی کردووە لە (الواصلة والمستوصلة)[2]

الواصلة: ئەوکەسەیە کەبکەری ئەم کارەیە،

والمستوصلة: ئەوکەسەیە کەداوا ئەکات ئەم کارەی بۆ ئەنجام بدریٚ.

دیارە بازنەی حەرام کردنەکە لەبارەی پیاوانە ئەوا بەپلەی یەکەم دێت، ئیتر ئایا لە هەرکامیان بێت.

بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ بەتوندی دژی ئەم جۆرە کەسانە وەستاوە کە بەو جۆرە هەڵخەڵەتاندن پیشەیانە، تەنانەت باروکە دانان بۆ ئەو کەسانەش کە لە دەرەنجامی نەخۆشییەوە مووی سەریان پێوە نەماوە، دروست نییە، تەنانەت گەر بووک بێت و بۆ زاوای ئەنجام بدات.

البخاری لە عائیشەوە ئەگێڕێتەوە کە کەنیزەکێکی ئەنصاری شووی کرد ، و بەهۆی نەخۆشییەوە قژی رووتابووەوە، ویستیان قژی تری بۆ دابنێن، بۆیە پێغەمبەریان ئاگادار کرد ﷺ و فەرمووی: ( لعن الله الواصلة والمستوصلة)[3].

وەلە ئەسماوە ئەفەرمویٚ: پرسیارکرا لەلایەن ئافرەتێکەوە لەپێغەمبەر ﷺ : ئەی پێغەمبەری خوا ! کچەکەم سورێژەی گرتووەو سەری رووتاوەتەوەو شووی

---

[1] / فتح الباري ، شرح ابن مسعود في باب (المتنصمات ) من كتاب اللباس ت: ٩٦.

[2] / ت : ٩٧.

[3] / هەموو ئەم فەرموودانە البخاری لەکتابی (اللباس) دا ئەیگێڕێتەوە لە (صەحیحە) کەیدا، ت :٩٨.

کردووه ئایا بۆم هەیە موچاغی بۆ بکەم؟ فەرمووی: ( لعن الله الواصلة والمستوصلة )[1].

وە لە (سەعید ی کوری مەسیب)ە وە ئەفەرمویٚ: بۆ کۆتاجار معاویە کە هاتە شاری مەدینە وتاریٚکی پیٚشکەش کردین، هەندیٚك قژی دەرهیٚناو فەرمووی: کەسم نەدیووە ئەمکارە ئەنجام بدات جگە لەجوولەکە نەبیٚت، وە پیٚغەمبەریش ﷺ ناوی بردووە بەشایەتی درۆ، وە لەگیٚرانەوەیەکی تردا بەخەڵکی مەدینەی فەرمووە: کوان زانایانتان؟ گویٚم لیٚبوو پیٚغەمبەری خوا ﷺ نەریٚی لەمانە کردووەو فەرموویەتی: (إنّما أهلكت بنو اسرائيل حين إتّخذ هذه نساؤهم)[2]. واتە: جولەکەو بەنی ئیسرائیل بەهۆی ئەم کارەوە کە ئافرەتانیان ئەنجامیان ئەدا لەناو چوون.

وەناوبردنی ئەمکارە بە (شایەتی درۆ) لەلایەن پیٚغەمبەرەوە ﷺ ئاشکرایە کە زانایی تیادایە، کە جۆریٚکە لەساختەو ناپاکی، و ئیسلامیش ناپاکی ناویٚت، و بیٚ بەرییە لەهەموو ناپاکیٚك لەهەموو کاریٚکیدا ، ئیتر ئایا ئەوکارەی ماددی بیٚت یان مەعنەوی ، ( من غشنا فليس منا )[3].

(الخطابي) ئەفەرمویٚ: بیٚگومان ئەو هەڕەشە توندە لەم شتانەدا هاتووە ، چونکە غەشو ناپاکی تیادایە، وە ئەگەر لەشتیٚکدا ریٚگەی بدایە، ئەوا ئەبووە میکانیزمیٚك بۆ ریٚگەدان بەجگە لەو شتەو لەو جۆرە ساختانە کەگۆرینی دروست کراوی خوای تیادایە، ئەمەش لەفەرموودەکەی (ابن مسعود) دا ئاماژەی پیٚکراوە ( المتغيرات خلق الله )[4].

ئەوەی فەرموودەکان ئەیانگریٚتەوە، گەیاندنی قژە بەقژ، ئیتر دروستکراو یان سروشتی بیٚت، ئەوەیە کەمانای ساختەوهەڵخەڵەتاندنی تیادایە، بەڵام ئەگەر قژی گەیاند بەخوری و دەزوو ئەوجۆرە شتانە ئەوا بەرئەو نەریٚ کردنە ناکەویٚ.

لەم رووەوە لە (سەعیدی کوری جوبەیر)ە وە هاتووەو فەرموویەتی: ( لاَ بَأسَ بالتَواصِلْ )[5] کە مەبەست لیٚرەدا دەزووە لە ئاوریشم و خوری و ئەوجۆرە شتانە کە ئافرەت قژی پیٚ بگەیەنیٚ وەپیٚشەوا (احمد)یش رای لەسەر دروستی ئەم حاڵەتەیە[6].

---

[1] / البخاری گێراویەتیەوە ، ت: ٩٩.
[2] / ت : ١٠٠
[3] / کۆمەڵێك لە هاوەڵان گێراویانەتەوە ، ت: ١٠١.
[4] / فتح الباري باب وصل الشعر ، ت: ١٠٢.
[5] / لە فتح الباری دا وتویەتی : ابو داود بەسەنەدێکی صحيح اخراجی کردووە ، ت : ١٠٢.
[6] / فتح الباری.

## ڕەنگ کردن،

## یان بڵێن ڕووپۆش کردنی تاڵە سپییەکان

ئەوەشـی کەهـەر وابەسـتەیە بەبابـەتی جوانکارییـەوە مەسـەلەی بۆیـە کردنـەوەی قـژە سـپییەکانە یـان مـووی ریـش، هـاتووە کـە جوولەکـەو مەسـیحی قەدەغەی بۆیەکردنەوەی سپێتی‌یان کـردووە، هەروەك پیشەی زۆرێك لە راهیب و گۆشـەگیرەکانی ئایینەکـەیان، بـەلام پێغەمبـەر ﷺ نـەرێی کـردووە لەلاسـایی کردنەوەیان و شوێن کەوتنی هەنگاوەکانیان، بۆ ئەوەی موسوڵمان هەمیشە خاوەن کەسایەتییەکی جیاوازو دیاری خۆی بێت، لە رووکارو ناوەرۆکدا، البخاري لە (ابو هريـره) وە ئەگێرێتـەوە ( إنَّ اليهود والنصارى لا يصبغون فخالفوهم ) واتـە : جولەکەو مەسیحی سـەرو ریشیان بۆیە ناکەنەوە، وەئەم کارە بۆ (استحباب) ە هـەروەك بە کرداری هاوەڵان بەڵگەی لەسەر ئەهێننەوە، بۆیە هەندێك لە هاوەڵان وەك ئەبوبەکرو عومەر بۆیـەیان کـردووەو هەنـدێکی تریـان ئەنجامیان نەداوە وەك ( عـەلی و ئوبـەی کوڕی کەعب و ئەنەس )[1].

بەلام ئەم رەنگ کردنە بەچی ئەبێت؟

ئایـا ئـەبێت بـەرەنگی رەش و رەنگـەکانی تـر، یـان لـەرەنگی رەش دوور بکەوینەوە؟

بەلام ئەو مرۆڤە زۆر بەسالا چووەی کە سەرو ریشی سپی بووە، شیاوی نییە کە بەرەنگی رەش بۆیـەی سـەری بکاتـەوەو لەدوای بەسـەربردنی ئـەو تەمەنـە زۆرە ، بۆیـە کـاتێ ئەبوبـەکر بـاوکی هێنـا ئـەبو قوحافـە لـە رۆژی فـەتحی مەککـەدا هـەڵگی گرتبـوو هـەتا خسـتیە بەردەسـت پێغەمبـەری خـوا ﷺ بینـی سـەری وەکـو (ثغامـە) وایـە، واتـە جـۆرە گیایەکـە گـوڵ و بەرەکەشـی سـپییە، فـەرمووی : ( ئـەم رەنگە بگۆڕن، بەلام لە رەنگی رەش دوور بکەونەوە )[2].

بـەلام ئـەوەی لەحاڵەتەکـەی وەك (ابـی قحافـە)دا نـەبێت و لەتەمـەنی ئـەودا نـەبێ، ئـەوا گوناهبـار نـابێ گـەر بـەرەنگی رەش رەنگـی قـژی بکـات، لـەم بارەیـەوە الزهـري ئەفـەرمویٚ : ( ئێمـە سـەرو ریشـمان رەنـگ رەش ئـەکرد گـەر رووخسـارمان

---

[1] / فتح الباري ، في شرح الحديث المذكور باب ( الخضاب).

[2] / مسلم گێراویەتیەوە ، ت: ١٠٥.

تازه واته گەنج بووایه، وەکاتێك دەم و چاوو دانەکانمان بەو جۆره نەمان وازمان لێ هێنا )[1].

وههەندێك له زانایانی پێشین ڕێگەیان داوه به ڕەنگی ڕەشی لەوانەو له هاوەڵان (سەعد بن وەقاص)، (عەقبەی کوڕی عامر)، و (حەسەن و حوسەین)و (جەریر)و کەسانێکی دی.

وههەندێکیش لەزانایان هەن ڕێگەیان پێنەدراوه تەنها له تێکۆشان و جەنگدا نەبێت، ئەوەش بۆ ترساندنی دوژمنانه، گەر ببینن سەربازانی ئیسلام هەموویان ڕووخساریان لاوه [2].

وەك فەرموودەیەی کە ابوزر ەیگێڕێتەوه( إِنَّ أَحْسَنَ مَا غَيَّرْتُمْ بِهِ الشَّيْبَ الحِناءُ وَالكَــتَمُ )[3]. واته: چاکترین شتێك که ڕەنگی سپێتی پێ بگۆڕن ڕەنگی خەنه و کەتەمه . وه کەتەم ڕووەکێکێکه له یەمەن و ڕوویەکی ڕەش دەرئەکا بەلای سووردا ئەڕوانێ ، بەڵام ڕەنگی خەنه سووره.

له فەرموودەکەی ئەنەسەوه ئەگێڕنەوه: ( إختَضَبَ أبوبكر بالحَنَــاء والكَــتْم ، وإختصَبَ عُمَر بالحِنا لحياً) واته: ڕەنگی سەری کردو عمریش تەنها بەخەنه.

## ریش هێشتنەوه

ئـەوەی پەیوەندیـداره بـه بابەتەکەمانـەوه مەسـەلەی ریـش هێشـتنەوەیه ، (البخاری) ئەگێڕێتەوه له (ابن عمر) له پێغەمبەرەوه ﷺ (خالفوا المشركين، وفروا اللحــي ، وأحفوا الشوارب)[4] واتـه: پێچەوانەی هاوبەش بڕیـاردەران بجوڵێتـەوه، ریـش بهێڵنـەوەو سمێڵتـان کـورت بکەنـەوه . وەفەرموودەکـه هـۆی ئـەم حەرامکردنـەی دیـاری کـردووه کەپێچەوانه بوونه لەگەڵ بێباوەڕاندا ، کەمەبەست پێیان مەجوسییه ئاگر پەرستەکانه ، چـونکه ئـەوان کورتیـان ئـەکردەوه تیایانـا بـوو ریشـی ئەتاشـی، بـۆ ئـەوه بـوو کـه موسـوڵمانان پـەروەرده بکـات لەسـەر سـەربەخۆیی تاکه کەسـی، و جیـابوون لـه مانـاو ڕووخسـاردا، جگـه لـەوەش ریـش تاشـین هەڵهاتنـه لەدەسـت سروشـتو لـه ئـافرەت چوون، چونکه ریش لوتکەی ڕووکەشی پیاوەتییەو خاڵی جیاکاری خۆیەتی.

---

[1] / ابن عاصم لەکتێبی (الخصاب)دا گێڕاویەتیەوه، هەروەك له فتح دا ئاماژەی پێکردووه ت: ١٠٦.
[2] / الفتح دا باسی کردووه.
[3] / ت: ١٠٧ الترمذي گێڕاویەتیەوه هەروەها اصحاب السنن ، هەروەك له الفتح دا هاتووه.
[4] / ت : ١٠٨.

وه مەبەستیش هێشتنەوەی ریش ئەوە نییە کە بەهیچ جۆری دەستکاری نەکریٚ و جار لەگەلٚ جار درێژ بێتەوەو دیمەنێکی ناباوی هەبێ، بەڵکو لە درێژی و پانییەکەی ئەگیرێت هەروەك ئەوەی لەفەرموودەکەی لای (الترمذي) دا گێڕاوەتەوە، هەروەك ئەوەی زانایانی پێشین ئەنجامیان ئەدا، (عیاض) ئەفەرموێ : ریش تاشین و کورتکردنەوەو رێککردنەوەی مەکروهە، بەلاٚم گرتنی لەباری پانی و درێژی گەر زۆربوو ئەوا باشە.

وه (ابو شامه) ئەفەرموێ: کۆمەڵێك داهاتوون ریش ئەتاشن ، ئەوە بەناو بانگ ترینە لەوەی کە لە مەجوسەوە وەریان گرتووە کە ئەوان ئەیانبڕی[1].

ئەڵێم: بەڵکو زۆرێك لە موسوڵمانان ریشیان ئەتاشن، وەك لاسایی کردنەوەیەك بۆ داگیرکارەکانی ولاٚتەکەیان لە جولەکەو مەسیحی، کە هەمیشە ژێر دەستە لاسایی سەرکەوتوو ئەکاتەوە، لەوە بێئاگان کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی داوە بە جیاوازبوونی بێباوەڕانی، تاوەکو لەوان نەچن، چونکە (من تشبه بقوم فهو منهم)[2] واتە : ئەوەی لەهەر گەلێك بچێت ئەوا سەربەوانە.

زۆرێك لەزانایان فەتوای حەرامکردنی ریش تاشینیان داوە بەرێگەی ئەو فەرمانەی پێغەمبەر ﷺ کە فرمانی هێشتنەوەی کردووە، وەبنچینەش لەهەموو فەرمان پێکردنێکدا بۆ واجیب بوونە، وە بەتایبەت کەهۆکارەکەی جیاواز بوونە لەگەلٚ بێباوەڕانداو، دیارە ئەمەش واجیبە، وە لەپێشینەکانەوە شتێك نەهاتووە کە ئەم واجبە بەتەواوی تەرك کردبێ. وەهەندێك لەزانایانی ئەم سەردەمە پێیان رەوایە بۆ ئەوەی زیاتر واقیعی بن ، وەپێیان وایە ریش هێشتنەوە داب و نەریتێکی پێغەمبەرە ﷺ و کارێك نییە بچێتە بابی پەرستش و بەندایەتییەوە. وە لەراستیدا ریش هێشتنەوە بەفەرمانی پێغەمبەر جێگیر نەبووە بەتەنها، بەڵکو بە فەرمانێکی راستەقینەی کە مەبەستیش زیاتر پێچەوانە بوونە لەگەلٚ بێ باوەڕاندا ، و (ابن تیمیه) بڕیاریداوە کە ئەو جیاواز بوونە لەگەلٚ بێباوەڕاندا مەبەستی پەروەردگارە لەم رووەوە ، چونکە لێکچوون لە فۆرم و شێوازدا، خۆشەویستی و سۆزو ناوەڕۆکدا زیاد ئەکات، ئەمەش شتێکەو هاودەنگی زانایانی ئەزموون گەواهی لەسەر ئەدات ، ئەفەرموێ : قورئان و سوننەت و هاودەنگی زانایانی ئیسلام . کە

---

[1] / فتح الباري . باب اعفاء اللحى.
[2] / ابوداود لە ابن عمرەوە گێڕاویەتیەوە ، ت : ١١٠.

سیٚ سەرچاوەی سەرەکی شەریعەتی ئیسلامن ، ئاماژە ئەکەن بەو جیاوازبوونە لەگەڵ بیٚباوەڕاندا، وەهەر شتێك جێی گومان بێت لەخراپە بەپەنهانی ئەوا بڕیاری حەرامیی بەسەردا ئەدریٚ، چونکە چاولێکردنیان لە رواڵەتدا ئەبێتە هۆی چاولێکردنیان لەئاکارو رەوشتە بێزراوەکانیان ، بەڵکو لەخودی بیروباوەڕەکان ، وە ئەم کاریگەرییشە دیاریی ناکریٚ ، وەخودی ئەو خراپەیەشی کە لەدەرەنجامی ئەو چاولێکەرییەوە دروست ئەبیٚ ، ئەگونجیٚ بە دیار نەکەویٚ، وە رەنگە بەگران دوایی شوێنەوارەکەی یان خودی خراپەکە لابریٚ، وە هەموو ئەوانەی ئەبنە هۆپێناوی خراپە پەروەردگار حەرامی کردوو، بڕوانە پەڕاوی ( اقتضاء صراط المستقيم ) .

بەمە بۆمان روون ئەبێتەوە کە لە ریش تاشیندا سیٚ راهەیە "

رایەکیان بەحەرامی ئەزانێت، و

رایەکی تر بەباشی دادانێت کە لە (الفتح)دا لە عیاضەوە هاتووەو جگە لەو کەسی تر ئەمەی نەوتووە،

وە رایەکی تریان لەسەر رەوابوونیەتی واتە لە ( اباحيه ) ئەمەش رای هەندێك لە زانایانی ئەم چەرخە نوێیەیە، رەنگ بێت لەم نێوەندەدا رای ناوەند لە هەموویان پەسەندترو دادوەرانە تر بێت . کە حوکمی کەراهیەتی بەسەردا ئەدەن - چونکە ئەو فەرمانە دەلالەت ناکاتە سەر واجب بوونێکی تەواو هەرچەندە بەهۆی جیاواز بوونە لەگەڵ بیٚباوەڕاندا هۆکاری دیاری کردووە ، وەنزیکرتین نموونەش لەسەر ئەمە فەرمان کردنە بەرەنگ کردنی سپێتی قژی سەر بۆ ئەوەی پێچەوانەی جوولەکە و مەسیحی بوەشێننەوە ، وەهەندێك لە هاوەڵانیش رەنگیان نەکردووە ، دیارە فەرمانەکە بۆ (استحباب)ە.

راستەکە لەکەسێك لەپێشینەکانەوە ریش تاشین نەگێڕدراوەتەوە، رەنگە ئەوەش لەبەرئەوەبێت کەپێویستیان بەتاشینی نەبووەو نەبووەتە نەریتێك بۆیان.

## لە ماڵدا

نشینگە یان خانوو ئەوەیە کە مرۆڤ ئەپۆشێت لە دوژمنە سروشتیەکان ، وە تێیدا هەست بە تایبەتمەندی و سەربەستی ئەکرێت لە زۆرێك لە کۆتە کۆمەڵایەتیەکان ، بۆیە تێیدا جەستەی ماندوو ئەحەوێتەوەو ، دەروونەکان تێیاندا ئارام ئەبن ، بۆیە خوای گەورە ئەفەرمویٚ لەو پێشانگایەدا کە بەخششەکانی پیشان بەندەکانی ئەدات ﴿ وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّن بُيُوتِكُمْ سَكَنًا﴾ النحل: ٨٠ .

وەپێغەمبەر ﷺ ئارەزووی لەخانووبەری بەرفراوان بووە، و لەرەگەزەکانی بەختەوەری دونیای ژماردووەو ئەفەرموێ: ( اربع من السعادة: المرأة الصالحة، والمسكن الواسع، والجار الصالح، والمركب الهنيء)[1].

واتە : بەختەوەری لە چوار شتدایە: ئافرەت ـ یان خێزانی باش ، و خانووی فراوان و دراوسێی باش و هۆیەکی گواستنەوەی هێمن ڕەو.

وە زۆر نزای کردووە بەم جۆرە نزایە: ( اللهم اغفر لي ذنبي ، ووسع لي في داري ، وبارك لي في رزقي ) پێی وترا: هۆی چییە ئەم دوعایە زۆر ئەخوێنی ئەی پێغەمبەری خوا ؟ ! فەرمووی : ئایا ئەمانە هیچییان بەجێ هێشتووە )[2] .

هەروەك پێغەمبەر ﷺ هانی داوین لەسەر پاك و خاوێنی و خانووبەرە تاوەکو ببێتە سیمایەك لە سیماکانی ئیسلام و، ببێتە خەصڵەتی جیاکاری مرۆڤی موسوڵمان . پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( ان الله تعالى طيب يحب الطيب، نظيف يحب النظافة ، كريم يحب الكرم ، جواد يحب الجود ، فنظفوا افنيتكم ولا تشبهوا باليهود )[3].

واتە: خوای گەورە پاکیزەیەو پاکیزەیی ئەوێ ، خاوێنەو خاوێنی ئەوێت ، خاوەن ڕێزەو خاوەن ڕێزی خۆش ئەوێت ، بەخشەرەو بەخشەری خۆش ئەوێت ، بەرەو ماڵ و نیشنگەتان خاوێن بکەنەوەو لاسایی جوولەکە مەکەنەوە.

## سیماکانی رابواردن و بت پەرستی

رازاندنەوەی ناوماڵ بە رەنگ و گوڵزار نارەحەتی بۆ موسوڵمان تیانییە، وەك ئەفەرموێ : ﴿قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللَّهِ الَّتِيَ أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ﴾ الأعراف : ٣٢.

بەڵێ نارەحەتی بۆ موسوڵمان تیانییە کە ئارەزووی جوانکاری بکات، لە ماڵیدا یان لەپۆشاك و پێڵاویداو هەرشتێکی تر کەپەیوەندیدارە بەمەوە، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ : (لايدخل الجَنَّة مَن كانَ في قَلبِه مثقَالَ ذَرَةٍ مِن كِبْـر) پیاوێك وتی: مرۆڤ حەز ئەکات پۆشاك و پێڵاوی جوان بێت؟ فەرمووی: ( ان الله جميل يحب الجمال )[4].

وە لەگێڕانەوەیەکی تردا: پیاوێکی جوان هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتی : من ئارەزووی جوانی ئەکەم و پێشم بەخشراوە و ئەوەی کە ئەبینی ، پێم خۆش نییە کەس من زیاترو جوانتر بپۆشێ، ئایا ئەمە خۆ بە گەورە زانینە ئەی پێغەمبەری

---

[1] / ابن حبان في (صحيحه) ت :١١١.
[2] / النسائي و ابن السني بە اسنادێکی صحيح ، ت: ١١٢.
[3] / الترمذي: ت: ١١٣.
[4] / مسلم ، ت: ١١٤.

خوا؟ فەرمووی: نەخێر، بەڵکو خۆ بەگەورە زانین ئەوەیە سەر بۆ حەق و راستی دانەنەوێنێت و خەڵکیش لا سووك بێت).

ئەبێ ئاگاداری ئەوەش بین کە ئیسلام لەهەموو شتێکدا زیادەڕۆیی و رۆچوونی لا باش نییە ، پێغەمبەر ﷺ رەزامەند نییە لە ماڵی موسوڵمان دیاردەی زیادەڕۆیی لە رابواردنی تیادابێ، کە قورئان زۆر بەتوندی رەخنەی لێ ئەگرێت، یان دیاردەی بتپەرستی کە ئیسلام بەهەموو چەشنێ دژی حەرام جەنگیوە.

## قاپ و قاچاغی زێڕ و زیوو

هەر لەبەر ئەوەیە کە بەکارهێنانی قاپ و کەلوپەلی زێڕو زیوو راخەری ئاوریشم حەرام کراوەو پێغەمبەر ﷺ هەڕەشەی توندی لەوانە کردووە کە لەم رێبازە لا ئەدەن و فەرموویەتی: ( ان الذي ياكل ويشرب في انية الذهب والفضة انما يجرجر في بطنه نار جهنم ) واتە : ئەوەی لە قاپی زێڕو زیودا ئەخواتەوە ئەوە بڵقی ئاگری دۆزەخ لە سکیدا ساز ئەکات.

پێشەوا (البخاری) لە حوزەیفەوە فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ رێگەی ئەوەی لێگرتووین کەلە قاپ و کەلوپەلی زێڕو زیودا بخۆین و بخۆینەوەو لە پۆشینی ئاوریشم و دیباج و لەسەردا نیشتنیان، و فەرمووی ئەوە لەدنیادا بۆ بێ باوەڕانەو لەقیامەتدا بۆ موسوڵمانانە، وە هەرچییەك بەکارهێنانی حەرام بێت ، ئەوا بەدیاری ناردن و داتاشینی بەبێ بەکارهێنانی هەر حەرامە.

حەرامکردنی بەکارهێنانی قاپی زێڕو زیوو راخەری ئاوریشم ؛ بە مەبەستی خاوێنی دەروونی خاوەنەکەیە کەمایەی زیادەڕۆیی‌یەو خوای گەورە پێی خۆش نیە ، و(ابن حذافە) ئەفەرموێ پیاوو ئافرەت لەم فەرموودەیەدا یەکسانن واتە فەرموودەیەکی گشتی‌یە.

ابن قدامە فەرموویەتی: لە حوکمەکەدا ئافرەتان و پیاوان یەکسانن ، لەبەر گشتگیریی فەرموودەکە، لەبەرئەوەی هۆی حەرامییەکەی سنوور بەزاندن و سەرسام بوون بەخۆو، خۆ بەگەورەزانین و شکاندنی دڵی هەژارانی تیادایە، وەئەم مانایەش هەردوو گروپ دەگرێتەوە، بەڵام رێگەدراوە بەئافرەتان کە لەشێوەی خشڵداو بۆ خۆرازاندنەوە بەکاری بهێنن، دیارە ئەمەش پێویستە کە بۆ هاوسەرەکانیانی ئەنجام بدەن، واتە تەنها بۆ ئەو مەبەستەی ئاماژەمان پێکرد، دروستە ، نەك بۆ مەبەستی تر.

گەر وترا: ئەگەر هۆکاری حەرامکردنەکەی ئەوەیە کە ئاماژەی پێکراوە،

نەبوایە قاپو ئامانی یاقووتو هاوچەشنی ئەمانە حەرام بوونایە کە بە بەهاترن لە ئاڵتونو زیوو)، لەوەلامدا ئەڵێین: کەم دەستو هەژاران هەست بەوانە ناکەنو دڵشکاو نابن بەوەی کە دەوڵەمەندان بەکاریان بهێنن، لەبەر دەگمەنی ئەو جۆرە ماددانە قاپو قاچاغیان لێ دروست ناکرێ، بۆیە پێویست ناکات حەرام بکرێت، بە پێچەوانەی زێڕو زیوەوە.

سەرباری ئەو لایەنە ئابوورییەی لە حەرامکردنی ئاڵتوندا بۆ پیاوان ئاماژەمان پێکرد، لێرەدا ئاشکراترو دیارترە، چونکە زێڕو زیوو دوو رەسیدی نەختینەیی جیهانیش کەخوای گەورە کردوونیەتیە پێوەر بۆ بەهای شمەکەکان، وە بوونەتە دادوەر بۆ فەراهەمکردنی دار لەنێوانیاندا، وەئاسانکردنیان بۆ خەڵك لە کاتی ئاڵوگۆڕکردندا دابین ئەکات، خوای گەورە رێنمویی خەڵکی کردووە بۆ بەکار بردنیان وەکو بەخششێکی خوایی، بۆ ئەوەی ئاڵوێری پێ بکرێ لەنێوان یەکتریدا، نەك بۆ بەکاربردنیان بەقاپو قاچاغەوە یان بەهۆی کردنیان بەتوحفەو ئەو شتانە.

بەڕاستی پێشەوا غەزالی (رەحمەتی خوای لێبێت) زۆر جوان لەم مانایەداو لە کتێبی (الشكر) لە (الاحياء) دا فەرموویەتی: هەرکەسێ بەهۆی دنیارو درهەمەوە لە ئاڵتونو زیوو قاپو قاچاغ دروست بکات، ئەوا بێگومان کوفری بە بەخششەکانی خوای گەورە کردووە، ئەو جۆرە کاسانە خراپتر ن لەوانەش کە بۆ کۆکردنەوە هەڵیان ئەگرن، چونکە نموونەیان وەك ئەوە کە فەرمانڕەوای وڵات بکرێتە جۆلاً یان خزمەتگوزاری پاكوخاوێکی ئەو کارانەی کە خەڵکانێکی کەم ئەنجامیان ئەدەن، لەبەرئەوە بەندکردنی ئەو نەختینایە باشترە تاوەکو بەو شێوەیەی بەسەر بێت، ئەمەش لەبەرئەوەیە کەماددەکانی ئەو نەختینیایە باشترە تاوەکو بەو شێوەیەی بەسەر بێت، ئەمەش لەبەرئەوە کە ماددەکانی وەگو گڵو ئاسن مسو قورقوشم ئەتوانن هەمان رۆڵی زێڕو زیوەکە ببینن بۆ پاراستنی شلەمەنیەکان لەخراپ بوون، چونکە ئەم ماددانە لەپاراستنی خۆراکدا هەمان کاری ئاڵتون و زیوەکە ئەکەن، نەك لە رووی بەهاو نەختینییەوە، هەر کەس بە تێفکرینو مەعریفەی خۆی دەرك بەم مانایە ئەکات، ئەوا لەلایەن خوای گەورەوە بۆی روون ئەکرێتەوەو پێی ئەوترێ: (من شرب في انية من ذهب او فضة فأكانما يجرجر في بطنه نار جهنم )[1].

واتە: هەرکەسێ لەئامانێکی ئاڵتون یان لە زیودا هەر شلەمەنیەك بخواتەوە

---

(١) ج٤ لە (احياء علوم الدين) كتاب الشكر والصبر لا ٧٩ ط ــ مصطفى الحلبي.

وەکو ئەوەیە کە جۆگەیەك لەئاگری دۆزەخ بەناو سکیدا جۆگە ببەستێ ) .

دەبا کەسیش گومانی وانەبات کە ئەمە بوار بۆ مرۆڤی موسوڵمان تەسك دەکاتەوە لەماڵی خۆیدا، چونکە بێگان زۆری تر هەن کە حەلاڵن لەجیاتی ئەو دوو ماددەیە ئەتوانرێت بەکار بهێنرێت، وەکو شووشەو گڵو مسو سەرجەم لەو ماددانەی کە بۆ ئەم مەبەستە بەکاردێن، یاخود چەندجوانە ئەو راخەرو پێچەوانەی کە لە لۆکەو کەتانو ئەم چەشنە ماددانە دروست کراون !

## ئیسلام پەیکەری حەرام کردووە

ئایینی پیرۆزی ئیسلام قەدەغەی بوونی هەر پەیکەرێکی کردووە کە لە ماڵی موسوڵماندا بێت، دیارە مەبەستیش پێیان ، بوونی وێنەیەکی بەرجەستەی بووە کە سێبەری ببێتو وبەکار هێنانیشی لەبەر پێدا نەبێت، بەم جۆرە بوونی ئەم پەیکەرانە وائەکات کەفریشتەکانی خوایگەورە لەومالانە هەڵبێن، لەکاتێکدا ئامادەبوونی ئەو فریشتانە مانای خۆشنوودی و رەزامەندی پەروەردگارە.

پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: (إنَّ الملائكة لا تدخُلُ بَيتاً فيه تَماثيل أو تَصاوير)[1]. واتە : بێگومان فریشتەکان ناچنە ماڵێکەوە کەپەیکەریان (وێنە)یان تیادابێ.

زانایان فەرموویانە: بۆیە فریشتەکان ناچنە ماڵێکەوە وێنەی تیادابێ، چونکە ئەو کەسەی وێنە دابنێ و هەڵیبواسێ ، ئەوا لەم خاڵەدا لەکەسێکی بێ بڕوا دەچێت، دیارە ئەمەش لەبەرئەوەیە کە زیاتر بێباوەڕان بەم جۆرە کارانەیان هەڵئەستن و بەچاوی رێزومەزنییەوە بۆی ئەڕوانن، وەفریشتەکانیش ئەم کارانەیان پێ خۆش نییە، بۆئەوەی ئەوجۆرە هەڵوێستانە نەبینن، ناچنە ئەو جۆرە ماڵانەوە.

بۆیە ئیسلام لە مرۆڤی موسوڵمانی قەدەغە کردووە کەخۆی سەرقاڵ بکات بەدروستکردنی پەیکەرەوە، تەنانەت گەر بۆ ناموسوڵمانیشی دروست بکات، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: (إنَّ من أشد الناس عذابُ يوم القيامة الذين يُصَّورن هذه الصُورَ)، وە لەگێرانەوەیەکی تردا : (الذين يُضاهون بخَلْقِ الله)[2]. واتە: ئەو کەسانەی لە رۆژی دواییدا بە سەختترین ئێوە سزای ئەدرێن، ئەوانەن کە ئەم وێنانە دروست ئەگەن، لەگێڕانەوەیەکی تردا: ( ئەوانەی لەسەر بەدیهێنراوان لاسایی خوای گەورە ئەکەونەوە لەوێنە کێشاندا ). هەروەها ئەفەرموێ: ( مَن صَوَّرَ صُوْرَةً كُلِّفَ يَوْمَ القِيامَةِ

---

(١) متفق عليه ، واللفظ لمسلم ، ت: ١١٨.

(٢) متفق عليه : ت: ١١٩.

نْ يَنْفُخَ فِيها الرُوْح، وَلَيس بِنافِخٍ فِيها أَبَداً )[1]. واتـه: هەركەسـێ وێنەیەك بكێشـێ، ئـەوا لە ڕۆژی دواییدا داوای لێ ئەكرێ گیانی بكات بە بەردا، وەهەرگیز ناتوانێت گیان بكات بە بەریدا ). مەبەستیش ئەوەیە " كە بەتەواوەتی ژیان بۆ ئەو وێنەیە بهێنێتە بـوون... وەبێگومـان ئـەم داواكارییشـە مەبەسـت پێـی ئاشـكراكردنی زیـاتری بـێ دەستەلاتی مرۆڤە.

## حەرام كردنی پەیكەر ... بۆچی ؟!

ا . لەنهێنیەكانی ئـەم حەرامكردنـە تـەنها بریتـی نییـە لەپاراسـتنی یـەكتا پەرسـتی خـوای گـەورە، وەكـو هەنـدێك وەهـا گومـان ئەبـەن، یـاخود بـۆ بـە دوور كەوتنـەوەمان لەلێكچـوون لەگـەڵ بتپەرسـتان، لـەو بـت و پەیكەرانـەدا كە بەدەسـتی خۆیان دروستیان ئەكەن، وپاشـان بـەپیرۆزی بۆیـان ئـەڕوانن و لـە بەردەمیانـدا دڵ و گەردن كەچ رائەمێنن.

بێگومـان ئیسـلام زۆر بـەووردی كـاری كـردووە لەسـەر پاراسـتنی یـەكتا پەرستی لەهەموو لێچوونێك بەبت پەرستان، دیارە ئەمـەش مـافی خۆیـەتی كە بـەو شێوەیەو بەوردی بۆ مەسەلەكە بڕوانی، و ئاكـام گەیشـتنە بەئاسـتێك كە نیگـاری مردوو پیاوچاكانیان ئەكێشا بۆ باركردنیان... هەربۆیەو بەم چەشنە ئـەم كارەیـان سەری كێشـا بـۆ بـەپیرۆز سـەیركردنیان، هـەتا ئاسـتێكی وەهـا كـە كردیاننـە خـوا لەبری پەروەردگاری بالآدەست ئەپەرستران، ولێیان ئەترسان و تكایان لێ ئەكردن، و داوای ڕێژەن (بركە) و نزای خێریان لێئەكرا... هـەروەك ئـەوەی بەسـەر گـەلی (نـوح) دا هات ﷺ كەچەندین بتیان هەبوو بەناوی ( ود ، سواع ، یغوث ، یعوق ، نسر ).

هـەرگیز مایـەی سەرسـوورمان نییـە لـەئانێك كـە لەرێسـاكانی شـەریعەتدا هەوڵی گرتن و پڕكردنەوەی هەر كەلێن و دەروازەیەك بدات، كە لێوەیان عەقڵی مـرۆڤ دووچـاری هاوبەشـی بڕیـاردان بكـات بەئاشـكرا بێـت یـاخود نهێنـی لێچـوون بـە بتپەرستان و ئەوانەی زۆر لە ئاینەكەیاندا ڕۆچوون، بەتایبەت بەرنامەیەك كە تەنها بۆنەوەیـەك یـاخود دووان دانەرێـژراوە، بـەڵكو بـۆ هـەموو مرۆڤایـەتی و هـەموو شوێنكەوتوان تارۆژی دوایی، وەبۆ هەلومەرجێكی كـاتی دوور نییـەو بـۆ دۆخێكـی دی نزیـك، یـان بـۆ چـەرخێك بەسـوودو بـۆ چـەرخێكی دی بـێ سـوودبێ، یـاخود لـە

---

[1] / البخاري وغيره، ت: ١٢٠.

چەرخێکدا شتێك لەبازنەی . مستحیلات . دابێت، وە لەچەرخێکی دیدا . نزیك بێ یان دوور ببێتە واقیعێکی چەسپاو.

ب ـ یەکێکی دی لەنهێنیەکانی ئەم حەرامکردنە ئەوەیە" کە وێنەکێش یاخود پەیکەرتاش کاتێك وێنە یاخود پەیکەرێك دروست ئەکات، دروست کراوێکی لەنەبوونەوە هێناوەتە بوون، یان بوونێکی زیندووی لەخۆڵەوە داهێناوە. ئەگێڕنەوە یەکێك لەوانە پەیکەرێکی دروست کردبوو ، لە دروست کردنیدا رۆژگارێکی دوورو درێژی بەسەر برد، کاتێ گەیشتە خاڵی کۆتایی دروست کردنی پەیکەرەکە، لەبەردەمیدا وەستا بەجۆرێك سەرسام بوو بەدابەش کردن و یەکە بەندییەکانی، پاشان بە لەخۆبایی بوونێکەوە کەوتە وتوێژ لەگەڵیدا : دە بدوێ ... دە بدوێ !!

لەبەر ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرمووی : ( ان الذین یصنعون هذه الصور یعذبون یوم القیامة ، یقال لهم : أحیوا ماخلقتم )[1]. واتە: بێگومان ئەوانەی ئەم جۆرە وێنانە ئەکێشن و دروست ئەکەن، رۆژی دوایی بەدەم سزادانەوە پێیان ئەوترێ: ئەوانەی بەدیتان هێناون ، گیانیان بکەن بەبەردا.

وەك خوای گەورەو ، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ( ومن أظلم ممن ذهب یخلق کخلقي؟ فلیخلقوا ذرة ، فلیخلقوا شعیرة !! )[2]. واتە: کێ هەیە بەهێندی ئەو کەسە ستەمکار بێت کە بەدی ئەهێنێت ، وەکو بەدیهێنانی من؟ گەر لە تواناییاندا هەیە با گەردیلەیەك یان دەنکە جۆیەك دروست بکەن.

ج . پاشان ئەوانەی لەم هونەرەدا ئەگەنە چڵەپۆپەو لەسنورێکدا ناوەستن ، ئافرەتی بێ بەرگ، یاخود بەرگێکی کەمەوە وێنە ئەکێشن، و وێنەی سیمای بتپەرستی و دروشمی ئاینەکانی تر ئەکێشن ، وەك خاچو بت و ئەو شتانەی دروست نییە موسوڵمان قبوڵی بکات.

د ـ سەرباری ئەمە، بێگومان پەیکەر لە کۆنەوەو هەنووکەش سیمای ئەو کەسانەن کە هەمیشە لە رابواردن و خۆشگوزەرانیدان و ئاپەرتمانەکانیانی پێ پڕ ئەکەن و ، بەمەبەستی رازاندنەوە بەکاریان دێنن و کاری هونەری بەجۆرەها ماددەی گرانە بەها ئەنجام دەدەن.

---

[1] متفق علیه: ت . ١٢١ .
[2] متفق علیه ، ت. ١٢٢ .

ئایینی ئیسلامیسش ئاینێکە دژ بەهەموو رووکەش و رابواردن وەستاوە لە ئـالتون و زیـوو ئاوریشـم، وە لـەرێزی ئەمانـەدا پەیکەریشـی لـەماڵی موسـوڵماندا حەرام کردووە.

## پرۆگرامی ئیسلام لە بە نەمر راگرتنی گەورە پیاوان

رەنگە بوترێ: گەر مرۆڤ هەندێ جوانکاری ئەنجام بدات بۆ گـەورە پیـاوان، ئەوانەی کە لاپەڕەکانی مێژوویان بەنەمری نووسیووەتەوە، ئایا گـەر شتێکیان لـەم چەشنە بۆ ئەنجام بدرێ، بە وەفاداری راڤە ناکرێ ؟ بەجۆرێ هەنـدێ پەیکـەریان بـۆ دروست ئەکرێ ، تاوەکو نەوەکانی داهاتوو پێیان ئاشنابن و پەی بـە سـەروەری - یەکانیان ببەن کە تۆماریان کردووە، چونکە گـەلان بـەزۆری دووچاری بیرچوونەوە دێن لـەو رووەوە، و ئـەوانـەی ئـەنجام دراون، یادیـان نـامێنێ . ئایـا جیـاوازی نێـوان شەوو رۆژ بیر ئەکرێت؟

وەلامیش بۆ ئەم پرسیارە " ئایینی ئیسلام زۆر بۆچوونی پێ باش نییـە لەبەر گـەورە زانـین بـۆ کەسـایەتییەکان ئاسـتیان گەیشـتبێتە هـەر پلەیـەك زینـدوو بـن یـاخود مردوو، پێغەمبـەر ﷺ ئەفـەرموێ : ( لا تَطْرُوني كَما أَطْرَت النَّصارَى عِيسَى بنَ مَرْيَم ، وَلَكِـنْ قُولوا عَبْدُالله وَرَسُولُه )[1] . واتە: زیادەرەوی مەکەن لە مـەدح و ستایشـی منـدا بـەو جـۆرەی کـە مەسـیحیەکان لەباسـی عیسـای کـوری مـریم ئـەنجامیان ئـەدا، بـەلام بلـێن: بەنـدەو نێراوی خوایە.

کاتێـك پێغەمبـەر ﷺ ، بـەناو هـاوەلان و خەلکیـدا بڕۆشـتایە، وەکـو رێـزو بـەرز راگرتنـی پلـەو پایەکـەی ، لەبـەری هەلئەسـان ، بۆیـە ئـەم کـارەی لێ قەدەغـە کـردن و فەرمووی : (لا تَقُوموا كَما تَقُومُ الأَعاجِمُ يُعَظِّـمُ بَعْضُـها بَعْضـاً)[2] . واتـە: لەبـەرم هەلمەسـتن، هەروەك چۆن بێگانەکان بۆ بەگەورە راگرتنی هەندێکیان ، لەبەر هەندێکیان هەلئەستان.

هەروەها گەلەکەی ئاگادار کردووەتەوە، کە لەدوای کۆچی دواییـدا ، زیـادە ڕۆیی نەکەن لەئەنجامدانی هەرشتێکدا بـۆی و ئەفـەرموێ : (لاتَجْعَلُوا قَبْرِيَ عِيـداً)[3] . واتە: سـەر گۆڕەکەم مەکەنە نزرگـەی جـەژن لەبـەر پیرۆزیـی، و داوای لـە پـەروەردگار کردووەو فەرموویەتی : (اللهُم لا تَجْعَل قَـبْرِيَ وَثَنـاً يُعبَـد)[4] . واتـە : پـەروەردگارا !

---

[1] / البخاري وغيره، ت: ١٢٣.
[2] / ابوداود وابن ماجه ، ت: ١٢٤.
[3] / ابوداود ، ت: ١٢٥.
[4] / مالك في (الموطأ) ت: ١٢٦.

گۆڕەکەم مەکە بە بتو بپەرسترێت.

جارێك خەڵکانێکی زۆر هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و وتیان: يا رَسُولَ الله ، يا خَيرنا وإبْنَ خَيرنا سَّيدَنا وإبنَ سيِّدنا، فَقال: ﴿ يا أَيُّها النَاس قُولوا بقَولكُم أو بَعْضَ قَولكُمْ ، وَلا يَستهوِيَنَّكُم الشَّيطان ، أَنا مُحَمَّدٌ عَبدُالله وَرَسولُه، وَما أُحِبُّ أن تَرفَعوني فَوق مَنزِلَتيَ التي أنزلني الله عَزَوَجَل )[1]. واتە: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی چاکترینی ئێمەو، کوڕی چاکترینی ئێمە، گەورە کوڕی گەورەی ئێمە، فەرمووی: ئەی خەڵکینە ! قسەکانتان یان هەندیٚ لەقسەکانتان بکەن، وریابن شەیتان لە خشتەتان نەبات، من محمدی بەندەو نێراوی خوام، پێم خۆش نییە ئاستم لەو ئاستە بەرزتر بکەنەوە، کەخوای پێی بەخشیووم.

ئایینێك ئەمە هەڵوێستی بێت بۆ بەگەورە زانینی مرۆڤ، رازی نابێت کە بۆ هەندیٚ مرۆڤ پلەیەکی بۆ دابنێن بەچەشنی بت، و بەهەزاران دینار یان هەر جۆرە دراوێکی دی بۆ بەهەدەر ببریٚ، تاکو ئاماژەیەك بێت بۆ خەڵکی تا بە گەورەیی و ڕێزی زیاد لە سنوورەوە، بۆی بڕوانن.

لەراستیدا نەمری راستەقینە ئەو نەمرییەیە، کە بڕواداران هەستی پیٚ ئەکەن لەلای ئەو پەروەردگارەی زانایە بەهەموو ئاشکراو پەنهانێك، ئەو پەروەردگارەی شتی لیٚ ون نابێت و بیری ناچێتەوە . چەندن ئەو کەڵە پیاوانەی لە تۆماری نەمریداو لەلای خوای گەورە تۆمار کراون، لەکاتێکدا ئەو کەسانە لەلای خەڵك سەربازی نەناسراون، دیارە ئەمەش لەبەرئەوەیە کەخوای گەورە ئەو کەسە پاكو پارێزکارو نەناسراوانەی خۆش ئەوێت کە بۆ نەناسین لەلایەن خەڵکیەوە ئامادە بن، و گەر دیارنەمان لەکەس ون نابن، وەگەر پێویستیش بوو لەلای خەڵکی نەمرین، بایاداشت و یادکردنیان بەپەیکەر دروست کردنی ئەنجام نەدریٚ... تاکە ڕێگەیەك بۆ بەنەمر سەیرکردنی گەورە پیاوان لە گۆشەنیگای رەزامەندی ئایینی ئیسلامەوە، بەنەمر سەیرکردنیانە لەدڵو دەروونو هزرەکانماندا ، وباشکردنی ئەو باشکارییانەی کە پێشکەشیان کردووە، و ئەو شوێنەوارە پۆزەتیڤانەی لەدوای خۆیان بەجێیان هێشتووە.

هەرگیز نەپێغەمبەر ﷺ و نەجێنشینەکانی و نەسەرکردەو نەپێشەوایانی ئیسلام نەناسراوان بەمیکانیزمێکی ماددی بەنەمر دانەنراون، بەچەشنێك کە

---

[1] / النسائي بسند جيد ، ت: ١٢٧

پەیکەرو هەیکەلی بەردینیان بۆ دروست بکریٚ، نەخێر، بەڵکو لەرێگەی باسکردنی ئەو شوێنەوارو سوودانەی هەیانبووەو ئەوە بە ئەوە یادیان کراوەتەوەو، پێشینەکان پێشکەشی ئەوانەی دوای خۆیان و باوکان بە رۆڵەکانیان کردووە، و بە نێو زەمینەی دڵ و دەروونیاندا رەگی بەهێزی داکوتاوە، هەمیشە بە زمان یادیان ئەکرێنەوە ، و دانیشتن و سیمینارو زنجیرەکانی دنیای خوای گەورە بۆنخۆش ئەکەن و، بەبیٚ هیچ وێنەو پەیکەرێك، ژیریی و دڵەکان سەررێژ پیٚ ئەکەن[1]

ئەگەر هەرجۆرە پەیکەرێك هەبێت، بەلأم مەبەست پێی بەگەورە سەیر کردن و پیرۆز راگرتن نەبێت، و بەهیچ مەبەستێکی نادروست دانەنرا بن، ئیسلام بواری بۆ تەسك نەکردووەتەوەو بەخراپی دانەناوە.

ئەمەش وەکو کەلوپەلی یاریکردنی منالی بچووك کە لەسەر شێوەی بووکە • شووشە گیانلەبەران دروست ئەکرێن، ئەمان کەلوپەلێکن بەدەستی منالەوە یارییان

---

(١) لێرەدا بۆ روونکردنەوەی ئەم مانایە وتەیەکی رۆشنی مامۆستا (محمدی مبارك) باس ئەکات کە راگری کۆلیژی شەریعەتە لەزانکۆی دیمەشق لە (محاضرة)یەکدا کە لەئەزهەردا پێشکەشی کردووە، لەژێر ناونیشانی (بەرەو هۆشیارییەکی نوێی ئیسلامی) و تیایدا فەرموویەتی: لەژیانماندا زۆر دیاردەو رێکخستن و باوی سۆسیۆلۆژی نویٚ رووبەڕوویان ئەبێتەوە، کە هەیانە لەگەڵ بیروباوەڕی ئیسلامیماندا ویٚك ناکەونەوە، لەوانە ئەو رێگایانەی کە ئەورووپاو ئەمریکا گرتوویانەتەبەر لە بە نەمر راگرتنی پاڵەوانانیان، بەبەرزکردنەوەی پەیکەر، بۆیان وەگەر بەبەرچاو رۆشنی‌یەکی رزگاریخوازانە بۆ ئەم کارانە بڕوانین، تاوەکو لەکۆتی بەندوباوی کوێرانەی رۆژئاوا رزگارمان بێت،و فەلسەفەی ئەم جۆرە یادکردنانەمان دەرك پێکرد بۆمان دەرئەکەویٚ کەعەرەب بەتایبەت گەورەکانیان جگە لە بەنەمر راگرتنی باشکاریی و کردەوەو گوفتاریان نەبێت هیچ جۆرە یادێکی تریان نەکردووەتەوە، دیارە ئەوەش وەکو وەفاو رێزو ئازایەتی، میکانزیمی یادکردنیان بریتی بووە لەیادکردنەوەی چیرۆك و سەرگوزشتەی پاڵەوانانەیان لەنێو خەڵکیدا نەوە بە نەوە، یاخود لە شیعرو هەڵبەستدا یادیان کردوونەتەوە. کاتێك ئیسلام لەدەم کەلی ئاسۆوە تیشکی زێڕینی پەخش کرد، زیاتر جەختی لەسەر ئەم مانایە کردەوە، بەرێزترین بەدیهێنراوان و بایەخی پەیامبەرانی بە مرۆڤێك لەخەڵکی گێڕا ﴿قل إنما أنا بشر مثلكم﴾،و بەرێزترین مرۆڤی بەکارو کردەوەکانییەوە وابەستەکرد نەك بە رووالەت و جەستە، و پێغەمبەری خوا ﷺ کردە پێشەنگ بۆ ئەوەی مرۆڤایەتی لەکاروانی ژیانیدا شوێن پێی هەڵبگرن، رێگری کردووە لە بەمەزن و گەورەکردنی خەڵکان بەجۆرێك کە لەبەندایەتی کردنیان نزیك ببێتەوە، دڵگرانی بۆ سەر دەروونی مرۆڤایەتی‌تر دروست بکات.

بۆیە کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ بەرەو لای پەروەردگار گەڕایەوە، یەکەم جێنشینی‌موسوڵمانان (ابوبکر الصدیق) بانگی خەڵکی کردو فەرمووی: ئەوەی محمدی ئەپەرست ئەوا بەدڵنیایی‌یەوە محمد مرد، وەئەوەشی کە خوای ئەپەرست، ئەوا خوای گەورە زیندووەو هەرگیز نامریٚ پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿وما محمد إلا رسول قد خلت من قبله الرسل، أفإن مات أو قتل انقلبتم على أعقابكم﴾ بەڕاستی ئیسلام بەکاری باشەو یادکردنیان لەدڵی موسوڵماناندا خاوەنەکانیان بە نەمر رائەگرێت.

هەموو عمری کوڕی خەتتاب بە دادوەری‌و، ابوکر بەدانایی‌و لێزانی‌و، علی بەزوهدو ئازایەتی ئەناسین، کەسیان پێویستیان بە پەیکەرێکی ماددی نەکردووە لەبەر رێزیان بالأ بکریٚ تاکو یاد بکرێنەوە چونکە بەڕاستی کردەوەو رەوشتەکانیان لە ولأتدا بەم کارە هەڵئەستن.

بێگومان رێگەی یادکردن و نەمر راگرتن بەهۆی پەیکەر دروستکردنەوە، گەڕانەوەیە بۆ دواوەو دابەزینە لەپلە بەرزەکانەوەو شوێنکەوتنی ئەو رێبازەی کە رۆمان و یۆنان و ئەورووپا گرتوویانەتە بەر، چونکە ئەوان لەناخەوە بتپەرستن و، لەئاستی موسوڵمانان و عەرەب نزمترن لەرووی رەوشتییەوە، بەڵکو ئەوان لەبەر بیٚ دەستەڵأتیان بۆ بونیان بەپاڵەوان لەلای خوای گەورە ، پاڵەوانانیان گەیاندووە بە خواوەندو ، خواوەندیش بە پاڵەوان.

دەرەنجام" پێویستە ئێمە بۆ چەمکە بیانییەکان ملکەچ نەکەین لەم هەلومەرجانەداو پێویستە حوکم و بڕیاری ئیسلام لەبەرامبەر حەرامی پەیکەرەوە نەگۆڕین تاکو زیان بەدەروون و بەدیهێنراوان نەگات).

پێئـەکرێ و بەچـاوی رێـزو پیرۆزییـەوە بۆیـان نـاڕوانرێ . دایکـی موسـوڵمانان حەزرەتی عائیشە (رەزای خوای لەسەر) ئەفەرموێ: ( یـاریم بەبووکە شووشـە ئـەکرد لـەلای پێغەمبـەردا ﷺ ، لـەو کاتـەدا چـەند هاوڕێیـەکم هـاتن بـۆلام ، بۆیـە لەترسـی پێغەمبەر ﷺ بووکە شووشەکانیان شاردەوە، ئەویش پێخۆشحاڵ بـوو بەهاتنیان و یـاری کردنیـان لەگـەڵ منـدا)[1] . وە لەگێڕانەوەیـەکی تـردا " رۆژێك پێغەمبـەر ﷺ بە عائیشەی فەرموو: ئەمانە چین؟ واتە بووکە شووشەکان . ئەویش فـەرمووی کچـمن، پاشان فەرمووی: ئەی ئەوانە چین لە ناویانـدا؟ فەرمووی: ئەوان ئەسـپن...پاشـان پرسـیاری کـرد" ئـەی ئـەوە چـییە بەسـەرییەوە؟ فـەرمووی: باڵەکانییـەتی پاشـان پرسـی: ئەسـپی دووباڵـە پاشـان عائیشـە لەوەڵامـدا فـەرمووی: ئـەی نەتبیسـتووە سـولەیمانی کـوڕی داود ئەسـپێکی چـەندباڵی هـەبووە؟ پێغەمبـەریش ﷺ دەسـتی کردە پێکەنین کە دانە پیرۆزەکانی دەرکەوتن )[2] .

ئـەوەی لـە فەرموودەکەدایـەو نـاوی کچـی هێنـاوە (البنـات) ، ئـەو بووکـە شووشـانە بـوون، کـە منـداڵان یارییـان پـێ کـردوون، و حـەزرەتی عائیشـە (رەزای خوای لەسەر) لەسەرەتای بیناکردنی کۆشکی هاوسەرێتیەوە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ تەمەنێکی کەمی هەبووە.

(الشوکانی) ئەفەرموێ: ئـەم فەرموودەیە بەڵگەیـە بـۆ رێگـەدان بـە منـاڵ بـۆ ئەوەی یاری بەپەیکەرو ئەوجۆرە شـتانە بکـات. لەپێشـەوا مالیکـەوە ئەگێڕنـەوە کـە بە پەسەندی دانەناوە موسوڵمانان ئەم جۆرە شتانە بۆ جگەرگۆشەکانیان بکڕن.

(القاضـي عیـاض) ئەفـەرموێ: یـاریکردن بەبووکـە شووشـە بـۆ کیژۆڵـە جگـەر گۆشـەکان رێگـەی پێـدراوە، لەهـەمان شێوەشـە سـەبارەت بـەو شـیرینیانەی لەچەشـنی بووكو پەیکەر دروست ئەکرێن،و لەرۆژانی جەژنو بۆنە جیاجیاکاندا دروست ئەکرێن ، بەیاری مناڵان، ئەوانە زۆر نامێننەوەو ئەخورێن، بۆیە ئەمانەش رێگەیان پێدراوە.

[1] / متفق علیه: ت: ١٢٨.
[2] / (ابوداود ، ت : ١٢٩.

## پەیکەری ناتەواوو تێك دراو

لەفەرمووودەیەکدا هاتووە کە جبریل ﷺ نەچووە ماڵی پێغەمبەر ﷺ لەبەر ئەوەی پەیکەرێك لەبەردەم دەروازەی ماڵەکەیاندابوو، بۆ رۆژی دواتریش هەر نەچووە ماڵەکەیەوە، تاکو پێی فەرموو: (مُرْ بِرَأسِ التِمْثال فَلْيُقطَع، حَتى يَصِيْرَ كَهَيْئَة الشَجَرة)[1]. واتە: سەری پەیکەرەکە لێ بکەرەوە هەتا ئەچێتە شێوەی درەختەوە.

بێگومان گروپێك لەزانایان بەم فەرموودەیە بەڵگەیان هێناوەتەوە لەسەر ئەوەی کە حەرام لە دروستکردنی وێنەدا، ئەوەیە کە وێنەکە تەواو دروست کرابێت ، بەڵام ئەگەر ئەندامێکی جەستەی بۆ دروست نەکرابوو بەجۆرێك کە بە بێ ئەو ئەندامە ناتوانێت بژی، ئەوا رێگەی پێدراوە، واتە (مباح)ە بەڵام تێڕوانینی راستو دروست بۆ داواکارییەکەی جبریل ﷺ لە لێکردنەوەی سەری پەیکەرەکەدا تاکو وەك درەختی لێبێ، بەڵگەیە لەسەرئەوەی کەپەندەکە کاریگەری ئەندامە ناتەواوەکە نییە لەژیانی وێنەکەیان مردنی بەبێ ئەو ئەندامە، بەڵکو چەند وەرگرتنەکە بریتیە لەوەی کە پەیکەرەکە لەرووکەشدا بەچەشنێك نەمێنێتەوە دوای ئەو ناتەواوییەشی هەررێزو بەگەورە زانینی بۆ بەرەوا ببینرێ.

گومان لەوەدا نییە، گەر ئێمە وردبینەوەو بەدادگەری بڕیار بدەین، بۆمان ئاشکرا دەبێت، کەئەو پەیکەرانەی نیوەی جەستەیەکەو بۆنەمریو رێز لەهەندێ پاشاو گەورەپیاوانو ناوداران دروستکراون، زۆر قەدەغەکراوو حەرامترە لەو پەیکەرە تەواوو بچووکانەی لە ماڵدا بۆجوانی دانراونو بەس.

## وێنەی تابلۆو نەخشە سازییەکان یاخود وێنە (بەرجەستە نەبووەکان)

ئەوانەی پێشتر ئامارەمان پێکردن، هەڵوێستی ئیسلامە بەرامبەر وێنە بەرجەستە بووەکان ، ئەو وێنانەی پێیان ئەوترێ (پەیکەر).

بەڵام ئەی ئەبێت بڕیاری ئیسلام چۆن بێت بەرامبەر بەو وێنەو تابلۆ هونەرییانەی کە لەسەر رووتەختی وەکو کاغەزو جلوبەرگو پەردەو دیوارو راخەرو پارەو هاوچەشنیان دروستکراون؟

وەڵامی ئەم پرسیارەش بەم شێوەیەیە:

بڕیارو بۆچوونی ئیسلام سەبارەت بەم جۆرە وێنانە روون نابێتەوە هەتا

(١) ابوداود والنسائي والترمذي وابن حبان ، ت : ١٣٠ .

وەکو نەزانین ئەو وێنەیە بەچ مەبەستێك دروستکراون، شوێنگەیان کوێیەو چۆن بەکاردێن، و بەمەبەستی وێنەگر چییە لەگرتن‌و دروستکردنی ئەو وێنانەدا؟

گەر هاتوو بەمەبەستی پەرستن دروست کرابێ یاخود گیرابێ ـ وەکو مەسیح لەلای مەسیحییەکان‌و مانگا لەلای هندۆسەکان‌و هاوچەشنیان ـ ئەو کەسەی وێنە بۆ ئەم مەبەستە ئەکێشێ، ئەوا بێ بڕوایەکەو بلاوکاری بیری بێ بڕوایی و گومڕایی‌یە. بۆ ئەم مەبەستە هەڕەشەی ترسناکی پێغەمبەری خوا ﷺ لەو بارەیەوە هەیە کە ئەفەرموێ: ( أَشَدُّ الناسِ عَذاباً يَـومَ القِيامَـةِ المُصَــوِرون )[1]. واتە: (بەڕاستی سەختترین سزا دراو لە رۆژی دواییدا، وێنە گرانن).

(الطبری) ئەفەرموێ: ( بێگومان مەبەست لێرەدا ئەوەیە کەوێنە ئەکێشێ بۆ پەرستن جگە لەخوای گەورەو زانایشە بەو مەبەستەی" ئەو کوفری پێی کردووە، بەلام ئەوەی مەبەست لە دروستکردنی بۆ پەرستن نیە، ئەوا تەنها یاخی بووە بەو وێنەیەی کێشاویەتی ) .

ئەو کەسانەی وێنە هەڵئەواسن بۆ پیرۆزی و گەورە زانینی، ئەمە کاری موسوڵمانان نییە، مەگەر یەکێك بێت بڕیارەکانی ئیسلامی پشتگوێ خستبێ و وەلای نابێ.

هەرکەسێك وێنەیەك بکێشێ، نەك بۆ پەرستن، بەڵکو مەبەست پێی لاسایی کردنەوەی بەدیهێنراوەکانی خوای گەورەبێت‌و، وەها بانگەشە بکات کە گوایا ئەتوانێت وەکو خوای گەورە داهێنان‌و بەدیهێنان ئەنجام بدات، ئەوا ئەو کەسەو بەم مەبەستەوە لەئایینی یەکتاپەرستی‌یەوە ئەچێ، لەم بارەیەوە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: (إنَّ أَشَدَّ الناسِ عَذاباً الذينَ يُضَاهِؤُن بِخَلْـقِ الله)[2]. واتە: سەختترین سزا دراون ئەوانەن کە لاسایی خوای گەورە ئەکەنەوە لە دروستکراو بەدیهێنراوانیدا.

ئەمە شتێکە تەنها وابەستەیە بەمەبەست‌و نییەتی وێنەگر - یاخود وێنە کێشەوە- خوای گەورەش لەفەرمایشتێکدا کەپاڵپشتی فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ( ومن أظلم ممن ذهب يخلق كخلقي، فليخلقوا حبة أو ذرة ).

ئەمە بەڵگەیە لەسەر مەبەستی لاسایی کردنەوەو مەیدانخوازی لەگەڵ پەروەردگاردا لە کاری ئافراندن‌و داهێنانکاریدا.

---

[1] / اخرجه مسلم ، ت: ١٣٢.

[2] / ت: ١٣١.

هەربۆیە خوای گەورەش داوای مەیدانخوازییان لیٚ ئەکات لە ئافراندنی تەنها دەنکیٚك گەنم یاخود ئەتۆمیٚك، ئاماژەیە بەوەی کە لەکارەکانیدا مەبەستیان ئەم واتایە بیٚت.

بۆیە خوای گەورەشە لەرۆژی دواییداو لەبەردەم سەرجەم گرۆهی ئادەمیدا بەوە پاداشتیان ئەواتەوە کاتیٚك داوایان لیٚ ئەکات :

ئەوانەی ئیٚوە بە ئافەریدەی خۆتانیان دائەنیٚن، گیانیان بکەن بە بەردا ! دیارە ئەم فەرمانەشیان هەرگیز بۆ جیٚبەجیٚ ناکریٚ.

وەهەر لە ریزی بەندی ئەوانەی کە حەرامە ویٚنەیان بگیریٚ و لەماڵدا دابنریٚن، ویٚنەی ئەو کەسایەتیانەن کە بەپیرۆزییەکی ئایینی، یاخود گەورە زاتیٚکی دونیایی بۆیان ئەروانریٚ،

**یەکەمیان** / وەکو ویٚنەی پیٚغەمبەران (على نبينا وعليهم أفضل الصلاة والسلام) و فریشتەکانو پیاوچاکان، وەك ئیبراهیمو ئیسحاق و موسی و مریم و جبریل... کە ئەم کارە زۆر نرخ پیٚدراوە لەلای گاورەکان، بەداخەوە هەندیٚك لە موسوڵمانانی (مبتدع)یش چاویان لیٚکردوون، ئەبینین ویٚنەی بەناو حەزرەتی عەلی و فاتیمەو ئەم کەسایتیانە ئەکیٚشن.

**دووەمیان**/ تاوانەکەی کەمترە یاخود بڵیٚین بچووکترە لەوەی یەکەم، بەڵام جەخت ئەکاتەوە سەر تاوانەکە ؛ ئەگەر خاوەنەکانیان لە بیٚبڕوایان و لادەران و گومڕایانی ریٚگەی راستی بن، وەکو ئەو بڕیار بەدەستانەی بڕیار ئەدەن بەسەر بەرنامەیەکی جگە لەبەرنامەکەی خوای گەورە ئەکەن، و ئەو هونەرمەندانەی سەروەری بڕیار ئەدەن بەسەر بەرنامەیەکی جگە لەبەرنامەکەی خوای گەورە کە ناردویەتی، و ئەو سەرکردانەی بانگەواز بۆ جگەی لەپەیامەکەی خوای گەورە ئەکەن، و ئەو هونەرمەندانەی سەروەری بڕیار ئەدەن بۆ شتانیٚکی پووچ و بیٚ بناغەوو سەر گەرمی بڵاوکردنەوەی کاری ناڕەواو بەدن لەناو گەلدا.

هەروەك دەرئەکەویٚ زۆرترین ئەو ویٚنانەی لەسەردەمی پیٚغەمبەرایەتی و دوای ئەو سەردەمە دروستکراون، لەو جۆرە بوون کە بەپیرۆزو گەورە راگیر ئەکران، گەر بهاتایەو زۆرترینی ئەو ویٚنانە دەستکردی رۆم و فارس و گاورو ئاگرپەرستان بووایە، ئەوا ویٚنەکان خاڵی نەئەبوون لەکاریگەریٚتی عەقیدەو پیرۆز سەیرکردنی سەرکردە دینیو دەوڵەتیەکانیان.

پێشەوا مسلم لە (ئەبی الضحی)ە وە دەگێڕێتەوە:

لەگەڵ (مسروق)دا لە ماڵێك بووین چەند پەیکەرێکی تیادابوو، (مسروق) پێی وتم: ئەمانە پەیکەری کیسران ؟

وتم: نەخێر، ئەمانە پەیکەری (مریم)ن ، هەروەك (مسروق) گومانی وابێت کە وێنەگرتن لەلایەن ئاگرپەرستانەوەیە، چونکە ئەوان هەڵئەستان بە دروستکرنی وێنەی پادشاهانیان، تەنانەت لە قاپو قاچاغیشدا، بەم چەشنە دەرکەوت کە وێنە گرتن لە گاورەوە بووە... لەم چیرۆکەدا (مسروق) وتی: گوێم لێ بوو کە عبدالله واتە: (ابن مسعود) فەرموویەتی: بێگومان سەختترین سزا لەلایەن خوای گەورەوە بۆ ئەو کەسانەیە کە وێنە ئەگرن ) .

بەلاّم بەدەر لەوەی پێشوو باسمانکرد، گەر وێنەو تابلۆکان بۆ بێ‌گیان بوون، وەکو رووەك‌و درەخت‌و دەریاو کەشتی‌و چیاو رۆژو مانگ‌و هەسارەکان‌و هاوچەشنیان لەدیمەنە سروشتییەکان - لە رووەك‌و بێ گیان- هیچ تاوانێکی تێدا نییە بۆ کەسێك کە وێنەیان بکێشێ، یاخود لەماڵدا هەڵیان بواسێ، ئەمە بڕیار (حکم) ێکی بەڵگە نەویستەو گفتوگۆو پەیڤین هەڵناگرێ.

وەگەر هاتوو وێنەکە بۆ گیانلەبەرێك بوو ، بەلاّم بەهیچ مەبەستێکی پیرۆزیی و، گەورەیی تێی نەڕوانرێت و بۆ چاولێکەری ئافەریدەکانی خوای گەورە نەبێت، بەبۆچوونی من ئەمەش هەر حەرام نییەو لەم بارەیەوە فەرموودەی صحیحی زۆر هەن.

پێشەوا موسلیم لە (صحیح)ەکەیدا لە (بسر بن سعد)ەوە ئەگێڕێتەوە لە زیدی کوڕی خالیدەوە، لە ئەبی طلحەی هاوەڵی پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی :

( إنَّ الملائكة لا تَدخُل بيتاً فيه صُورة )[1].

واتە: بێگومان فریشتەکان ناچنە ماڵێکەوە کە وێنەی تیادابێت.

بسر فەرموی: پاشان زید نەخۆش کەوت‌و ئێمەش چووین بۆ سەردانی، لەسەر پەردەی دەروازەی ماڵەوەیان وێنەیەك کێشرابوو، فەرمووی: بەعبدالله ی خولانی کوڕی مەیمونەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ فەرموو - کە لەگەڵیدا بوو - ئایا زید هەواڵی ئەو وێنەیەی یەکەم رۆژی پێنەداین؟! عبیدالله فەرمووی: ئەی گوێت لێ نەبووە کە فەرموویەتی: تەنها نەخشی پۆشاك نەبێت؟! .

---

(١) أخرجه مسلم ، ت: ١٣٣.

پێشەوا (الترمذي) بەسەنەدی خۆی لە (عتبە)وە ئەگێڕێتەوە" کە چووە ژوورەوە بۆلای (ابی طلحة انصاری) و هەواڵی پرسیووە، (سەهلی کوڕی حنیف) کە هاوەڵێکی ترە فەرمووی: (ابو طلحة) پیاوێکی بانگ کرد تاوەکو راخەرەکەی هەڵبگرێ کە وێنەو نەخشەساری گیانداری پێوەبوو، سەهل پێی فەرموو: ئەوە بۆچ لای ئەبەیت؟ فەرمووی: چونکە وێنەی تیادایەو ئاگاداریشی لەوەی کە پێغەمبەر ﷺ لەم بارەیەوە فەرموویەتی: سەهل فەرمووی: ئەی نەیفەرموو: (مەگەر نەخش و نیگاری جلوبەرگ بێت ؟) ابو طلحة فەرمووی: فەرمودەیەکی (حسن صحیح) ە[1].

ئایا ئەم دوو فەرموودەیە بەڵگە نییە لەسەر ئەوەی کە وێنە حەرامو قەدەغەکراوەکان ئەو وێنانەن کە بەرجەستەن و پێیان ئەوترێ پەیکەر؟! بەلاّم ئەو وێنانەی کە لەسەر تابلۆ ئەکێشرێ یاخود لەسەر جل وبەرگ و دیوار تێکستێکی (نص) راست و بەڵگەنەویستیان لەسەر نییە لە شەریعەتی ئیسلامدا تاکو ئاماژە بە حەرام کردنیان بکات.

بەڵێ، فەرموودەی صحیح مان هەیە لەسەر ئەوەی کەپێغەمبەر ﷺ کە ئەم جۆرە وێنانەی بە - مکروه- داناوە چونکە لەکاری ئارەزوو پەرستان و دونیا ویستانە.

پێشەوا موسلیم لە زەیدی کوڕی خالیدی جوهەینەوە ئەگێڕێتەوە لەئەبی طلحەی ئەنصارییەوە ئەفەرموێ:

گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ ئەیفەرموو: ( لا تَدخُل الملائكَةُ بَيتاً فِيه كَلْبٌ ولا تَماثِيلْ ) واتە: فریشتەکان ناچنەماڵێکەوە کە سەگ و پەیکەری تیادابێت، ئەفەرموێ: هاتم بۆلای عائیشەو وتم: ئەو واهەواڵ ئەدات کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لاتَدخُل الملائكة بَيتاً فيه كُلبٌ وَلا تَماثيل) واتە: فریشتەکان ناچنە ماڵێکەوە کە سەگ و پەیکەری تیادابێ. وەئایا بیستوتە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمەی فەرموبێ ؟ فەرمووی: نەخێر، بەلاّم ئەوەتان بۆ باس ئەکەم کە بەکردەوە لێوەیم بینووە: بینوومە لەکاتی رۆشتنیدا بۆ یەکێك لە شەڕەکان، منیش پاش ئەو پەردەیەکم دا بەدەروازەی دەرەوەدا، کاتی تەشریفی هێنایە، لە دەموچاوی پیرۆزیدا ناخۆشحاڵییەکم ئەخوێندەوە، بێگومان پەردەکە وێنەیەکی تیادابووە ـ بۆیە پەردەکەی راکێشاو لەتی کردو دڕاندنی و فەرمووی: (إنَّ الله لَم يأمُرنا أن نَكسُوا الحِجَارَة والطِين !! ) واتە: خوای گەورە فەرمانی پێنەکردوین کەکالاّ بکەین بەبالاّی بەردو قوڕدا.

---

[1] / ت: ١٣٤.

فەرموودەی ڕاستەوخۆ دوای ئەو هەڵوێستە، پەردەکەمان لەت کردو ، دوو پشتیمان لێ دروست کردو، پاشان هیچ گلەییەکی لێ نەکردین[1].

لەم فەرموودەیەدا جگە لە کەراهەتێکی تەنزیهی دەربارەی پەردەی دەرەکی دیوارو ئەو جۆرە شتانە بەپەردەی وێنە تێداکێشراو، شتێکی تری لێ وەرناگیرێ، (نەوەوی) ئەفەرموێ: لەم فەرموودەیەدا شتێکی وەهانییە کە بەڵگە بێت لەسەر حەرام کردن، چونکە ڕاستی وتەکە، ئەوەیە" کە بێگومان خوای گەورە بەمە فرمانی پێنەکردووین، ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێت کە ئەم کارە نە واجبو نە مەندوبە و، لەگەڵ ئەمانەشدا حەرام نییە.

هەروەها موسلیم لەحەزرەتی عائیشەوە (ڕەزای خوای لەسەر) ئەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: پەردەیەکمان هەبوو وێنەی پەیکەرێکی باڵداری تیادابوو، هەر کەسێ بهاتایەتە ژوورەوە ئەیبینی، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم : (حَوِّلِي هذا، فإنِّي كُلَّما دَخَلْتُ فَرأيتُهُ ذَكَرتُ الدُنيا)[2] ، واتە: ئەم پەردەیە بگۆڕە، چونکە هەر کاتێ دیمە ژوورەوەو چاوم پێی ئەکەوێ، دونیام بیر ئەکەوێتەوە.

پێغەمبەر ﷺ سەرجەم فەرمانی نەکردووە بەدڕاندنی، بەڵکو فەرمانی کردووە بەگۆڕینی شوێنەکەی چونکە لەو شوێنەدا هەرکەسێ بهاتایەتە ژوورەوە چاوی پێی ئەکەوت، دیارە ئەمەش ناخۆشحاڵییەکی پێئەبەخشی کەئەم جۆرە شتانەی ئەبینی، بەجۆرێك کە وابەستەیی و ئامێزکردنەوەی مرۆڤ بۆ دونیاو جوانکارییەکانی یادئەخاتەوە... بەتایبەتی و بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ سەرجەم نوێژە سوننەتەکانی لەماڵەوە ئەنجامداوە، ئەو جۆرە شێوەو پەردانەی کە وێنەیان لەسەرە، ڕەنگە دڵی مرۆڤ کەمەندکێش بکات، بەجۆرێك کە لە پابەندی و دڵکەچیو ئامادەیی تەواوی مرۆڤ بۆ نوێژەکەی و بۆ موناجاتی خوای گەورە کاڵی بکاتەوە. پێشەوا بوخاری لەئەنەسەوە ئەگێڕێتەوە: عائیشە (ڕەزای خوای لەسەر) پەردەیەکی هەبوو ئەیدا بەلای ژوورەکەیدا، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو : (أميطيه عني، فإنَّهُ لاتَزالُ تَصاوِيرُهُ تُعْرَضُ لِيَ فِي صَلاتِي)[3] . واتە: ئەم پەردەیە بپێچەرەوە لەبەرچاومدا لای ببە، چونکە لەکاتی نوێژەکانمدا وێنەکانی دەکەونە بەرچاوم.

ئەم فەرموودەیە تیشك ئەخاتە سەر ئەو ڕاستییەی کەپێغەمبەر ﷺ بێدەنگ بووە لەبوونی پەردەو هەرشتێکی تری لەو بابەتە کەپەیکەری باڵداری تیادابێ، وە

---

[1] / ت: ١٣٥.
[2] / اخرجه مسلم، ت: ١٣٦.
[3] / اخرجه البخاري: ت: ١٣٧.

یان بەرگێك بێت و وێنەی تیادابێت.

بۆیە لەبەرئەم فەرموودانەو هاوچەشنیان، هەندێ لەپێشینەکان ئەفەرموون : لەو وێنانەی بەرگری لێکراوە، ئەوانەن کە سێبەریان هەیە، واتە بەرجەستەن، بەم جۆرە، ئەو وێنانەی کە سێبەریان نییە چاویان لێپۆشراوە )[1].

هەر لەوانەی کەئەم رەئییە بەهێزتر ئەکات، فەرموودەیەکە لەخوای گەورەوە: (وَمَن أظلَمُ ممَّن ذَهَبَ يَخلُق كَخَلقِي فَلْيَخْلُقوا ذَرَّة، فَلْيَخلُقوا شَعِيْرَة)[2] بێگومان ئافراندنەکانی خوای گەورە ـ وەکو لەبەرچاون ـ وێنەی رووتەخت نین، بەڵکو ئافراندنی وێنەی بەرجەستەی قەوارەو بارستاییدارە، هەروەك خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿ هُوَ الَّذِي يُصَوِّرُكُمْ فِي الأَرْحَامِ كَيْفَ يَشَاءُ ﴾ ال عمران: ٦.

تێکستێکی لەو جۆرە نییە کە دژ بەم (مذهب) رێبازە بوەستێ، تەنها فەرموودەیەکی حەزرەتی عائیشە (رەزای خوای لەسەر) کە لەیەکێك لە گێڕانەوەکانی (الشيخين)دا هاتووە: کە حەزرەتی عائیشە پشتییەکی کڕی بوو کە بەرگەکەی وێنەی گیانداری تیادابوو، بۆیە کاتێك پێغەمبەر ﷺ پشتییەکەی بینی، لەبەردەم دەروازەی ماڵەوە وەستاو نەهاتە ژوورەوە، عائیشە ئەفەرموێ: ناخۆشحاڵییەکم لە رووخساری پیرۆزیدا بینی ﷺ پاشان فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ! تاوانم چییە تەوبەی لێ ئەکەم؟ پاشان ﷺ فەرمووی: ئەم پشتییە چییە؟ عائیشە فەرمووی: ئەوە بۆ تۆم کڕیووە، هەتاوەکو لەسەری دابنیشی و پاڵی پێوە بدەیتەوە، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (إنَّ أَصْحَابَ هَذه الصُوَر يُعَذّبون ويُقال لَهُم: أحْيَوا ماخَلَقْتُم) پاشان فەرمووی: (إنَّ البَيْتَ الذي فيهِ الصُّوَرُ لا تَدْخُلُهُ الملائكَة) وە موسلیم لە گێڕانەوەیەکییدا لە عائیشەوە ئەمەی بۆ زیادکردووە کە عائیشە فەرموویەتی: پاشان بردمو دۆشەکەکەم لێ دروست

---

[1] / پێشەوا نەوەوی لە (شەرحی موسلیم)دا هێناویەتی. ئەفەرموێ انه مذهب باطل. و (الحافظ)یش لە (الفتح)دا هێناویەتی کە بەسەنەدێکی صحیح لە القاسم بن محمد گێڕدراوەتەوە، کەیەکێکە لە فەقیهەکان و لە باشترینی کەسانی سەردەمی خۆی.

شێخ (بخیت) لە (الخطابي)یەوە ئەم فەرموودەیە وەرئەگرێ: ئەوەی وێنەی ئاژەڵ ئەکێشێ، و ئەو نەخشەسازەی وێنەی درەخت و ئەوجۆرە شتانە ئەکێشێت، من ئومێدەوارم کەبەر ئەم بەڵێنە ترسناکە نەکەون، گەر هەموو ئەمانە لە دەروازەی مەکروهەوە سەردەکەون و بچنە ریزی ئەوانەی دڵ بەشتانێکەوە خەریك بکەن کەپەیوەندییان پێوە نییە)

وەهەر لەسەر ئەمە ئەفەرموێ: (جگە لەمانە لەبەرئەوەی وێنەکێشی سکێچی ئاژەڵ وێنەکەی بەدی ناهێنێ، بەڵکو هێڵکاری وێنەکەی ئەکات، و ئەو وێنەیەی بەم جۆرە بێت، زۆر ئەندامی لەشی تیادا دروست ناکرێ، کە بەبێ ئەو ئەندامانە ناژێت، چونکە ئەو وێنەیە نییە کە لەرۆژی دواییدا داوای ئەوەی لێ ئەکرێ کەگیانی بکرێ بەبەرداو ناتوانێت ئەمکارە بکا. چونکە ئەمە دەربارەی وێنەی بەرجەستەیە، کە سێبەری ببێ و، هەموو ئەو ئەندامانەی لەشی دروستکردووە کەبەبێ ئەوانە ناژی، تائەو ئاستەی تەنها رۆحی مابێ کەبکرێ بەبەریدا، بۆیە لەوێدا بێدەستەڵاتی وێنەکێشەکە دەرئەکەوێ لە ناتەواوییەکەی بۆ گیان بەبەرداکردنی، نەك لەبەرئەوە بێت کە وێنەکە قابلییەتی ژیانی نییە.

[2] / اخرجه الشيخان وغيرهما. ت: ١٣٨

کرد ، واته : وێنەکەی دووکەرت کردووەو پاشان ئەوانەی لێ دروست کردووە)[1] .

بەڵام چەند خاڵێك بەرەنگاری ئەم فەرموودەیەن:

١ـ ئەم فەرموودەیە بەچەند گێڕانەوەیەکی دژ بەیەکتر گێڕدراوەتەوە، هەندێکیان بەڵگەن لەسەرئەوەی کە ئەو پەردەیەی وێنەکەی تیادابووە، دوای پارچە پارچە کردنی، دۆشەکەڵەی لێ دروستکراوە، هەندێکی بەڵگەن لەسەر ئەوەی کەبەهیچ شێوازێك بەکار نەهاتووە.

٢ ـ هەندێك لە گێڕاندنەوەکان تەنها بەڵگەن لەسەر – کراهیە – وە کەراهییەت بۆ داپۆشینی دیوارە بە وێنە، ئەمەش جۆرێکە لەخۆ بە گەورە زانین و، پێغەمبەریش ﷺ پێی رازی نییە، لەبەرئەوە لەگێڕاندنەوەیەکی موسلیمدا ئەفەرموێ : هەروەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد: ( خوای گەورە فەرمانی پێ نەکردووین کە بەردو قوڕ بەرگ پۆش بکەین ) .

٣ـ فەرموودەی موسلیم لەعائیشەوە ﷺ دەربارەی ئەو پەردەیەی وێنەی پەیکەری باڵندەیەکی تیادا نەخشێنرابوو، وەئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ دەربارەی: (ئەم پەردەیە جێگۆڕ پێبکە، چونکە هەرکات ئەبینم، دونیام بیر ئەکەوێتەوە) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ناتوانین بە رەهایی بڵێین وێنە حەرامو قەدەغەیە.

٤ ـ ئەم فەرموودەیە بەرامبەر فەرموودەی (القرام) وەستاوە، کە لەماڵی عائیشە بووەو، پێغەمبەر ﷺ فەرمانیداوە بەپێچانەوەی لەبەرچاویدا، چونکە وێنەکان لەکاتی نوێژەکانیدا ئەکەونە بەرچاوی (الحافظ) ئەفەرموێ: کۆ کردنەوەی ئەم فەرموودەیە لەگەڵ فەرموودەکەی عائیشە دەربارەی راخەرەکە، گرفتێك دروست ئەکات، ئەمەش بەڵگەیە لەسەرئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی بێدەنگ بووەو نوێژی کردووە لەکاتێکدا ئەوە هەڵواسراوە، هەتاوەکو فەرمانی بە لابردنی کردووە، لەبەرئەوەی لەکاتی نوێژەکەیدا دێتە بەرچاوی، نەك لەبەر ئەوەی وێنەیەو هەڵواسراوە فەرمانی لابردنی بکات.

وە(الحافظ) ئەم دوو فەرموودەیەی کۆکردووەتەوە، بەجۆرێك فەرموودەی یەکەم دەربارەی وێنەی گیانداربووەو، ئەمەیان وێنەکانی لەچەشنی وێنەی بێ گیان بوون، بەڵام فەرموودەکەی (القرام) دژی کۆکردنەوەی نێوان ئەم دوو فەرموودەیەیە.

---

[1] / اخرجه الشیخان: ت: ١٣٩.

٥ ـ ئەم فەرموودەیە بەفەرموودەیەکی (ابي طلحة) دژایەتی کراوە، کە ئەو جۆرە وێنانەی لێ جیاکردووەتەوە کەنەخشی سەرجل و بەرگن (قرطبي) ئەفەرموێ: ئەم دوو فەرموودەیە بەم جۆرە کۆئەکرێنەوە" فەرموودەکەی حەزرەتی عائیشە حوکمی مەکروهی هەیەو، فەرموودەکەی (ابی طلحة) بە ڕەهایی دروستە، ئەمەش نەرێی کراهییەت ناکات ) .

(حافظ ابن الجر) بۆچوونەی بە بۆچوونێکی جوان لە قەڵەم داوە.

٦ . ئەو کەسەی فەرموودەکەی حەزرەتی عائیشە ئەگێڕێتەوە، برازاکەیەتی کە ناوی قاسمی کوڕی محمدی کوڕی ئەبوبکرە، بەلایەوە وێنەی بێ سێبەر دروستە ... چونکە (ابن عون) ئەفەرموێت: چووم بۆ ماڵی قاسم لای ژووروی مەککەوە، بینیم کەژاوەیەکیان هەیە وێنەی باڵندەیەکی خەیاڵی (العنقاء) و وێنەی قندسی تیادابوو.

(الحافظ) ئەفەرموێ: ئەگونجێ (قاسم) کاری بە گشتگیری وتەکەی ( الا رقما في الثوب ) کردبێ، هەروەك نکووڵی کردنەکەی پێغەمبەری ﷺ بۆ هەڵواسینی پەردەی ناوبراو لەلایەن حەزرەتی عائیشەوە لەسەرئەوە بووبێت، کە پەردەکە وێنەی تیادا نەخشێنرابوو و ، بۆ داپۆشینی دیوارەکە بووە.

ئەمەش گێڕانەوەیەك پشتگیری ئەکات: ( ان الله لم یامرنا ان نکسوا الحجـــارة والطـــین) وە القاسمی کوری محمد یەکێکە لە حەوت قەفیهەکانی مەدینە وە لە باشترین مەردوومانی سەردەمی خۆی بووە کە گێڕەرەوەی فەرموودەی (پشتییەکە) یە (الخرقە . وەگەر لە فەلسەفەی ڕێگەپێدانی وەکو کەژاوەکە شارەزا نەبووایە ، ئەوا ڕێگەی بەکارهێنانی نەئەدا.

بەلاّم لێرەداو لەوەی کەلەم فەرموودانەی دەربارەی وێنەو وێنەگران هاتووە، دەرئەکەوێ، هەڵئەگرێت کەبڵێن: بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەرەتادا کارەکەی بەتوندی گرت، چونکە سەردەمەکەی لەهاوبەشی بڕیاردان بۆ خواو بتپەرستیو بەپیرۆز سەیرکردنی وێنەو پەیکەر نزیك بووە، کاتێك بیرو باوەڕی یەکتاپەرستی لە دەروونەکاندا جێگیربوو، و ڕەگو ڕیشەی باوەشی بە زەمینەی دڵو ژیرییەکاندا کرد، ڕێگەدرا بەو وێنانەی کە قەوارەیان نییەو بەرجەستە نین و بۆ نەخش و نیگار دروست ئەکرێن، وەگەرنا پێغەمبەر ﷺ ڕەزامەندی نەبووە لەسەر بوونی پەردەیەك یان ڕاخەرێك لەماڵیدا کە وێنەیان وێنەی پەیکەری تیادابێت. وە وێنەی نەخش و نیگاری جل وبەرگی جیا نەکردووەتەوە ، وەکو بەرگی کاغەزو دیوارو ئەم جۆرە شتانە.

(الطحاوي) لە کەڵە پێشەوایانی ڕێبازی حەنەفییە، ئەفەرموێ: بێگومان لەسەرەتادا خوای پەروەردگار ڕێگری کردووە لە وێنە بەهەموو جۆرێك و تەنانەت گەر وێنەکان بۆ نەخشین بوونایە، چونکە نزیکبوون لەسەردەمی وێنە پەرستییەوە ، بۆیە ڕێگەی هەموو جۆرە وێنەیەکیان لێ گیرابوو، پاشان کاتێك ئەم ڕێگەگیرییەی جێگربوو، ڕێگەی‌دا بەو وێنانەی کە نەخشی جل و بەرگن، چونکە مرۆڤ ناچارە لە بەرکارهێنانی ئەو جۆرە بەرگانە، هەروەها ڕێگە دراوە بەو وێنانەی کە ئەکەونە ژێر پێوەوەو بەچاوی ڕێزو مەزنییەوە بۆیان ناڕوانرێت، و ڕێگرییەکەی مایەوە بۆ ئەو وێنانەی ڕێزیان بۆ دائەنرێت و بەکار ناهێنرێن ) .

## بەکارهێنانی وێنە ئەبێتە هۆی حەلاڵ بوونی

ئەمەو هەموو گۆڕانکارییەك لەوێنەدا کە ئەبێتە هۆی بەدوور گرتنی لەبەر گەورە ڕوانین بۆی و نزیکی بخاتەوە لەبەکارهێنان، لەبازنەی کەراهییەتەوە ئەگوێزرێتەوە بۆ بازنەی (اباحە) لە فەرموودەیەکدا هاتووە: جبریل ﷺ داوای ڕێگەپێدانی کرد لە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (أُدخُل قَالَ كَيفَ أَدْخُلُ وَفِي بَيتكَ سِتْرَ فِيهِ تَصاوِيْر؟! فَإنْ كُنتَ لابُدَ فاعلاً، فاقطَع رَأسَها، أو إقطَعها وَسائد، أو إجعَلها بساطاً)[1] **واتە:** فەرموو وەرە ژوورەوە، جبریل فەرمووی: چۆن بێمە ماڵێکەوە پەردەیەکی تیادایە وێنەی لەسەر نەخشێنراوە؟! هەر پێویستت پێیەتی سەرەکەی ببڕە یان بیکە بە سەرین و پشتی و ڕاخەر.

بۆیە کاتێك خاتوو عائیشە بینی پێغەمبەر ﷺ پێی خۆش نییە کە پشتییەکەی وێنەی تیادایە، کردی بەدوو بەشەوە، چونکە بەوە ئیتر بەڕێزەوە بۆی ناڕوانرێت و بەکاریان دێنێت، وەدوور ئەکەوێتەوە لەبچووکترین گومانێك لە بە گەورە ڕوانینی وێنەکە.

وە لەزانایانی پێشینەوە هاتووە کە بەکارهێنانی ئەو شتانەی وێنەیان تیادایەو، پێویستن، ئەوا دروستەو ئیشکالی تیادا نییە. لە عروەوە هاتووەکە پاڵی داوە بەپشتی وێنەدار بە باڵندە پەیکەرو وێنەی مرۆڤ، عکرمە فەرموویەتی: ئەو پەیکەرانەی کە بەرز کراونەتەوە بەلایانەوە مەکروه بووە، بەڵام هیچ کام لەم وێنانەیان بەخراپ دانەناوە کە ژێرپێ ئەخرێن، چونکە ژێر پێ خستنەکەیان سووکایەتییە بۆیان.

---

(١) النسائي وابن حبان في (صحيحه)، ت: ١٤١.

شاراوە نییە کە هەموو ئەوانەی دەربارەی وێنەو وێنەگرتن هاتوون، مەبەست پێیان ئەو وێنانەیە کە دائەتاشرێ (پەیکەر) یاخود دروست ئەکرێن بە گوێرەی ئەوانەی پێشتر باسمان لێوەکرد.

بەڵام ئەو وێنە تیشکییانەی کە بەئامێری فۆتۆگرافی ئەگیرێن، شتانێکی مۆدێرن، نە لەسەردەمی پێغەمبەرو ﷺ نە لەسەردەمی پێشینیە موسوڵمانەکاندا نەبوون، ئایا ئەوەی سەبارەت بە وێنەکێشان هاتووە، بەهەمان شێوەشە بەسەر ئەم تەکنەلۆژیا نوێیەشدا کە بەئامێری فۆتۆگرافی ئەگیرێت، ئەچەسپێ؟ ئەوانەی بڕیاری حەرامکردنو قەدەغەیان لەپەیکەرو وێنە بەرجەستەکاندا کۆکردووەتەوە، ئەوا بۆ وێنە فۆتۆگرافی، هیچ جۆرە نەرێیەکی شەرعییان بڕیار نەداوەو بە تایبەت گەر وێنەکە تەواو نەبێ.

بەڵام لەسەر رەئی ئەوانیتر، ئایا ئەم وێنە تیشکییانە بەو وێنەی کە پەراموچەی وێنەکێش دایئەهێنێ، پێوانە ئەکرێ؟ یان ئەو هۆیەی کە تێکتێکی فەرمووده شیرینەکانی پێغەمبەر ﷺ دەربارەی سزای وێنەگرنیهێناوەتە بوون، ئەوەیە کە وێنەگران لاسایی ئافەریدانی خوای گەورە ئەکەنەوە، ئەمەش لە وێنەی فۆتۆگرافیدا پراکتیزە نابێ؟ هەرکات (علە) لەدونیای عەدەمدا بوو، ئەوا (معلوم) ئەچێتە دونیای عەدەمەوە هەروەك زانایانی اصول ئەفەرموون.

ئەوەی ئاشکرایە لێرەدا، ئەوەیە کە خوالێخۆشبوو شێخ محمد بخیت کە موفتی مصر بووە، ئەفەرمووێ: وێنەگرتنی فۆتۆگرافی بریتییە لەگرتنی سێبەرەکەی و، وێنەیەك کە رێگریی کرابێ، چونکە ئەو وێنەگرتنەی رێگری لێ کراوە، ئەوەیە کە وێنەیەك بهێنرێتە بوون کەپێشتر نەبووبێتو پێشتر دروستیش نەکرابێو، چاولێکەری ئافراندنی گیانلەبەرێکی تیادابێت کە خوای گەورە دروستی کردووە، و دیارە ئەم واتایەش لەوێنە گرتنی فۆتۆگرافیی دا نایەتەدی. هەرچەندە هەندێك لەزانایان هەمیشەو بەتوندی پێ لەسەر هەموو جۆرە وێنەیەك دائەگرن، وەبەباش نەزانینیو کەراهییەتی بەهەموو جۆرێکییەوە، تەنانەت وێنەی فۆتۆگرافیش، وەبێگومان لەکاتی پێویستو گرنگ، یاخود بۆ بەرژەوەندییەکی مەشروع دروستەو رێگەی پێدراوە، وەکو وێنەی کەپسی بۆ مامەڵەی فەرمانگەکان و یا پاسپۆرت و وێنەی گومان لێ کراوانو، ئەو وێنانەی وەکو میکانیزمێکی روونکردنەوەو ئەو جۆرە شتانە بەکاردێن، کە لەم بوارانەدا گومان دروست نابێ لە

بەگەورەو پیرۆز سەیرکردنی ئەو وێنانە، بەجۆرێك كە مەترسی بۆ سەر بیروباوەڕ تێدا نەبێ. بێگومان پێویستی مرۆڤ بۆ ئەم جۆرە وێنانە زۆر زیاترە لەو وێنانەی كە لەجل‌وبەرگدا بەكاردێن‌و پێغەمبەر ﷺ لەڕیز بەندی وێنە حەرامەكاندا هێناونییە دەرەوە.

## بابــەتی وێنــە

ئەوەی بڕیاری لەسەر دراوە، كەباسی وێنە شوێنەواری خۆی هەیە لە بڕیاری حەرامی، یاخود هەر بڕیارێكی‌تر بەسەریدا، وە موسولمانیش هەرگیز سەرپێچی حەرامكردنی وێنە ناكات، گەر باسەكەی سەرپێچی بیروباوەڕی ئیسلام، یاخود شەریعەو نەریتی بێت" بۆیە وێنەگرتنی ئافرەتانی دانەپۆشراو یان نیمچە داپۆشراو و ، ئاشكراكردنی رەگەزی مێینەو، وێنەكێشان یان وێنەگرتنیان لەبارێكدا كە ئارەزووی سێكسی مرۆڤ ئەووروژێنێ ... هەروەك بە ئاشكرا ئەمانە لەهەندێ گۆڤارو رۆژنامەو ، رۆلی سینەما ئەكەونە بەرچاو، ئەمانە هەموویان بچووكترین گومانێك لەحەرامی وێنەو وێنەگرتنیان و بلاو كردنەوەیان‌و دانەنانیان لەهەموو مال‌و نووسینگەیەكداو هەلواسینیان بەدیوارو تەماشاكردنیان نییە.

هەر لەمیانەی ئەو وێنە قەدەغەكراوانەدا، وێنەی بێ‌باوەڕان‌و ستەمكاران و تاوانبارانە، كەپێویستە لەسەر موسلمان لەپێناوی خوای گەورەدا دوژمنایەتی و كینەداریەتیان بكات، بەهیچ جۆرێك دروست نییە كەمرۆڤی موسولمان وێنەی كەسێكی بێ‌باوەڕی نكولی‌كاری بوونی خوای گەورە دابنێ، یان دانانی وێنەی بتپەرستێكی هاوبەش بڕیاردەر بۆ خوای گەورە، كە مانگاو ئاگرو ئەو جۆرە شتانە ئەكاتە هاوبەشی خوای گەورە، یان جوولەكەیەك یان مەسیحییەك، كە نكولی پێغەمبەرایەتی (محمد) ﷺ ئەكات، یان دانانی وێنەی ئەو كەسانەی بانگەواز ئەكەن كەبەناو موسولمانن و، كەچی جگە لەبەرنامەی ئیسلام ئەبێتە ژێدەری هەلگۆستنی یاساكانی ژیانی دوونیایان، یاخود وێنەی ئەو كەسانەی خراپەو بەدخویی لە كۆمەلگەدا بلاو ئەكەنەوە، وەكو بەناو هونەرمەندانی بواری نواندن‌و گۆرانی، بە هەردوو ڕەگەزی پیاوو ئافرەتەوە.

وە لەنموونەی ئەمەدا، ئەو وێنانەی كە ئاماژەن بۆ هاوبەشی بڕیاردان یاخود دروشمی هەندێ لەئاینەكان، كە ئیسلام هەرگیز پێیان خۆشنوود نییە، وەك بت‌و خاچ‌و ئەوجۆرە ماكانە . لەوانەیە زۆرێك لەو بەڕەو راخەرەو پەردەو

پشتیپانەی لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ بوون، ئەم جۆرە وێنەو نیگارانەیان تیادا کێشرا بوو، پێشەوا بوخاری لەپێغەمبەرەوە ﷺ ئەگێڕێتەوە ، کە پێغەمبەر ﷺ هەرگیز نەیهێشتووە هیچ جۆرێك لەشت لەماڵیدا بێت کەخاچیان پێوە بوو بێت، مەگەر کەرت و پەرتی کردوون [1].

هەروەها (ابن عباس) ئەگێڕێتەوە : ( کە پێغەمبەر ﷺ لەساڵی (فتح)دا چەند وێنەیەکی بینی لە (بیت الحرام)دا بوون، زاتی پیرۆزی نەچووە ژوورەوە، هەتا وەکو فەرمانی کرد بە سڕینەوەیان )[2].

لێرەودا گومانی تێدانییە کەئەو وێنانەی لە (بیت الحرام)دا بوون، ئاماژە بوون بۆ بتپەرستیی و هاوبەشی بڕیاردان لەلایەن کەسانی خۆیانەوەو گومڕایی دێرینیان . وە لە عەلی کوری ئەبوطالیبەوە ئەفەرموێ: جارێك پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ تەرمێکدا بوو، فەرمووی: ( ایکم ینطلق الی المدینة فلا یدع بها وثناً الا کسره، ولا قبراً الا سواه ، ولا صورة الا لطخها ؟ ) واتە: کێ لەئێوە بەرەو (مەدینە) ئەچێت، وە هەر بتێکی تیادایە بیشکێنێ‌و، هەر گۆڕێکی تیادایە تەختی بکات‌و. هەر وێنەیەکی تێدایە بیسڕێتەوە ژێرپێی خات؟ بۆیە کابرایەك فەرمووی: من ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: ( فهاب أهل المدینة ) کابرا بەرەو جێی مەبەست کەوتە ڕێ و پاشان گەڕایەوەو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا هەر بتێکی تێدابوو تێکم شکاندن، هەر گۆڕێکی تێدابوو تەختم کرد، هەر وێنەیەکی تێدابوو سڕیمەوە، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (مَن عَادَ الی شَيء مِن هَذا فَقد کَفَرَ بما أُنزِلَ عَلَی مُحَمَّد ﷺ)[3] واتە: هەر کەسێ بگەڕێتەوە سەریەکێ لەمانە، ئەوا بێباوەڕی نواندووە بەرامبەر ئەو پەیامەی بۆ محمد نێردراوە ﷺ.

ڕەنگە ئەو وێنەیەی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بەلابردن‌و سڕینەوەی کردووە، هێما بووبێ بۆ بتپەرستی لەنەفامی‌دا، کە پێغەمبەر ﷺ لەسەر پاك کردنەوەی (مدینە) لە شوێنەواری ئەم دیاردەیە، بۆیە ئەم گەڕاندنەوەی گێڕاوە بە بێ‌بڕوایی نواندنێك بەرامبەر ئەوەی خوای گەورە ناردوویەتی !!

---

(١) اخرجه البخاري، ت: ١٤٢.
(٢) أخرجه البخاري، ت: ١٤٣.
(٣) رواه احمد / قال المنذري باسناد جيد .

## پوختەیەك دەربارەی ( حكـم ) بڕیاری وێنەو وێنەگران :

ئـەتوانین حـوكمی وێنـەو وێنـەگران لـەم پوختەیـەی خـوارەوەدا كـورت بكەینەوە:

ا ـ حەرامترین جۆری وێنەو خراپترینی ئەو وێنانەن كە لەبری خوای گەورە ئەپەرسترێن، وەكـو مەسیح لـەلای مەسـیحییەكان، ئەمـە وێنـە كێشـەكەی ئەخاتـە ریزی بێبڕوایانـەوە، بەمەرجێ لە حوكمەكـەی زانابێتو مەبەستیشـی لـە دروست كردنیـدا، مەبەسـتی نـاوبراو بێـت. وە لەمیانـەی ئـەو وێنانـەدا وێنـە بەرجەسـتەو قەوارەدارەكانیان زیاتر حەرام و خراپترە، هەركەسێ بەچاوێكی پڕ بەهاو گەورە بۆ ئەم جۆرە وێنانە بڕوانـیێو بە هـەرجۆرێ بـێ، ئەوا ئەچێتە ئەم بازنەیەی خراپـەوە بەئەندازەی بەشداری كردنەكەی.

ب ـ لەدوای ئەو جۆرە وێنەیەی پێشوو باسمـان كـرد، ئـەو وێنانـەن كـە بـۆ پەرستن دروست نەكراون، بەڵام مەبەست پێیان بانگەواز كردنـە بـۆ ئـەوەی كـە ئـەم وێنەكێشـە ئـەتوانێ وەكـو خـوای گـەورە داهێنـانو ئافراندنی هـەبێ، ئـەمیش بـەو مەبەسـتەوە بێبـاوەڕی ئـەنوێنێ، دیـارە ئەمـەش تـەنها پەیوەسـتە بەنییـەتی وێنـە كێشەكەوە.

ج ـ وەجگە لەم وێنانەی پێشوو باسمانكرد، ئەو وێنانـەن كـە بەرجەسـتەو قـەبارەدارنو بەمەبەسـتی پەرسـتن دروسـت نـەكراون، بـەڵكو مەبەسـتیان بەگـەورە روانینی وێنـەی گـەورە پادشـاهانو سـەركردەو سـەرۆكەكانە، وەئەوانـەی مەبەسـت پێیان بەنەمر راگرتنیانە، دیارە ئەم مەبەستەیشیان بەدروستكردنی پەیكـەر دێننـە دی و لەگۆڕەپانەكانـدا بـەرزیان ئەكەنـەوە، ئەگـەر ئـەم مەبەسـتەی لەپشـتەوە بێـت، پەیكەرەكە تەواو دروستكراوبێت، یاخود نیوەی، وەك یەك وەهایە لە حوكمدا.

د . مەبەسـەتێكی تـر لـە وێنـە، ئەوانـەن كـە وێنـەی گیانـەوەرنو وێنـەی بەرجەستە نین، بەڵكو تابلۆی هونەرییو خاوەنیـان بەگـەورە بۆیـان ئـەڕوانن، وەكـو وێنـەی سـەركردەو فـەرمانڕەواو ئـەو جـۆرە كەسـایەتییانە، بەتایبـەت گـەر بـەرز بكرێنەوە، یاخود هەڵبواسرێ، ئەوا بڕیاری حەرامكردنی ئەم جۆرە وێنانە جەخت لێ كراوتـر ئـەبێت گـەربێت و ئـەو سـەركردانە كەسـانی سـتەمكارو خراپـەكار و بێباوەڕ بەبوونی خوا بن، لەبەرئەوە بەگەورە زانینیان تێكشكاندنی بڕبڕەی پشـتی ئیسلامە.

هـ . جۆرێکیتر وێنه ئەوانەن کە قەوارەدارن‌و وێنەی گیانەوەرن، بەبێ هیچ مەبەستێکی گـەورە زانـین‌و پـیرۆز راگـرتن، ئـەم جۆرانـەیان بـەهاودەنگی زانایـان بڕیاری حـەرامییان بەسەردا ئـەدرێ، جگـە لەوانـەی کە بـەکاردێن کـە وەکـو بابـەتی یـاری کردنــی منــاڵان، و ئــەو شـیرینییانەی کــە بــۆ خــواردن شـێوەی پەیکــەری گیانـەوەردا دروسـت ئـەکرێن، ئەمانـە دروسـتن‌و رێگـەیان پـێدراوە، جگـە لەمانـە، وێنـەی گیانـەوەری بـێ قـەوارەی سـەروو تـەختی پـەرەو ئـەو جـۆرە شـتانەیە، کـە مەبەسـتی دروسـتکردنی بەگــەورە زانــین نییــە، بــەڵام هێمــای بــۆ رابــواردن‌و خۆشگوزاری کە دیوارو ئەوجۆرە شتانەی پـێ رووپـۆش کـراون ، ئەمانـە حوکمیـان (مکروه)ە واتـە: باش وایە نەکرێن.

ز . بـەڵام وێنـەی شـتی بـێ گیـان لـە درەخـت‌و دارو دەریـاو کەشـتی‌و چیاو دیمـەنی سروشـتی‌و ئـەو جـۆرە شـتانە، دروسـتەو هـیچ گومـانێکی تیادانییـە بـۆ ئەوانەی دروستی ئەکەن و هەڵیان ئەواسن‌و بۆ جوانی بەکاریان دێنن، مـادام مـرۆڤ زۆر سەرقاڵ نەکات، بەجۆرێ کە گوێڕایەڵی خوای گەورە بیر بەرێتـەوە، یـان بـۆ بـە گەورە زانین نەبێ، چونکە گەروابێ ئەوا بڕیاری (مکروه)ی بەسەردا ئەدرێ.

ح ـ بـەڵام وێنە تیشـکییەکان، واتـە وێنـەی فۆتـۆگرافی، ئەصـڵ لـەم جـۆرە (اباحه)یە واتە رێگـەی لێنـەگیراوە، بەمـەرجێ بـۆ بەگـەورە زانین‌و پیرۆزیـی نـەبێت، ئیتر ئایا بۆ بەگەورە راگرتنی دونیایی یاخود دینی بێت، بەتایبەت گەر ئەو وێنانـە وێنەی خراپەکارو ستەمکارو بتپەرست‌و شیوعی‌و هونەرمەندە لارەکان بێت.

ط ـ لەکۆتاییدا" پەیکـەرو وێنـەی حـەرام ئەگـەر شـێوێنرابوو یـاخود بـەکار هات، لەبازنەی حەرامی ئەگوێزرێتەوە بەرەو بازنەی حەڵاڵ‌و دروست، وەکو وێنەی ناو راخەرو فەرش کە ئەکەونە ژێر پێ‌و پێڵاوەوە ئەو جۆرەشتانە.

## راگرتنی سەگ بەبێ پێویست

لەمیانەی ئەوانەی ئەوانەی پێغەمبەر ﷺ حەرامی کردوون، راگرتنی سەگە بەبێ پێویستی، ئەبینین زۆرێك لەکەسانی خۆ بەگەورەزان، سەروەت‌و سامانێکی زۆر لــەپێناوی ســەگدا کارئەکــەن، لەکاتێکــدا دەروازەی دەســتیان روو بــە ڕووی مرۆڤایـەتی داخـراوە، هـەروەك ئـەبینین ئـەو جـۆرە کەسـانە داراییـەکی زۆر ئـەدەن بەفیڕۆ بۆ راهێنانی سەگەکانیان لەسەر هەندێ جوڵەو کـردار، بەمەشـەوە ناوەسـتن، بـەڵکو هـەموو سـۆزێکی خـۆی تـەرخان ئـەکات بـۆ سـەگەکەی، لەکاتێکـدا ئەشـێت کەسانی نزیکی برسی بن و دراوسێ‌و براکانی بیرخۆی بەرێتەوە.

سەرەڕای ئەمانەش" بوونی سەگ لەماڵدا ئەبێتە هۆی پیس بوونی قاپ و قاچاغ و کەلوپەل . پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: ( اذا وَلَغَ الكَلْبُ فِي إنَاءِ أحَدِكُم فَلْيَغْسِلْهُ سَبْعَ مَرّات ، إحْداهُن بالتُراب )[1] . واتە: ئەگەر سەگ دەمی خستە ناو قاپ و قاچاغی یەکێکتانەوە با حەوت جار بیشوات جارێکیان بەخۆڵ.

هەندێك لەزانایان، لەفەلسەفەی ڕانەگرتنی سەگدا ئەفەرموێ: لەبەرئەوەیە کە بەمیوان ئەوەڕێت و دەرۆزەکار ئەترسێنێت و ئازاری ڕێبورا ئەدات.

لەپێغەمبەرەوە ﷺ ئەفەرموێ: ( أتاني جبريل عليه السلام فقال لي: أتيتك البارحة فلم يمنعني أن اكون دخلت؛ إلاّ أنَّهُ كان على الباب تماثيل، وكان في البيت قرام ستر فيه تماثيل، و كان في البيت كلب، فمره برأس التمثال الذي في البيت بقطع فيصير كهيئة الشجرة، ومُره بالستر فليقطع فيجعل فيه وسادتان توطان، ومر بالكلب فليخرج )[2] . واتە: جبریل عليه السلام هاتەلام و پێی وتم: دوێنێ هاتم بۆ لات، هیچ شتێك ڕێگەی هاتنە ژوورەوەی لێ نەگرتم، تەنها ئەوە نەبێ بەدەرکی دەروازەکەتانەوە پەیکەر هەبوون، و لەماڵەکەدا پەردەی داپۆشین هەبوون وێنەی پەیکەری تیادابوو. سەرەڕای ئەوەش سەگێك لە ماڵەکەدا بوو، سەری پەیکەرەکە ببڕە لەماڵەوە، پاشان ئەچێتە شێوەی درەختەوە، و پەردەکە بکە بە دووکەرتەوەو دوو دۆشەکەکەی لێ دروست بکە، کە دابخرێن و، سەگەکەش لەماڵەکە دەربکەن بابڕوات ) بێگومان ئەم قەدەغە کردنە، بۆ ئەو سەگانەیە کە بەبێ پێویستی ڕائەگیرێن.

## ڕاگرتنی سەگی ڕاوکردن و پاسەوانی درووستە

بەلام ئەو سەگانەی کە بۆ پێویستی ڕائەگیرێن، وەکو سەگی ڕاوکردن، یاخود پاسەوانی کشتوکاڵ و ئاژەڵ و ئەو جۆرە شتانە، ئەوا حوکمیان جیاوازەو ڕێگەی پێدراوە.

لەفەرموودەیەکی (متفق علیه) پێغەمبەردا ﷺ هاتووە، ئەفەرموێ: ( من اتخذ كلباً إلاّ كَلبُ صَيد أو زَرعٍ أو حَاشية، إنتقص مِن أجْرِه كُلَّ يَومٍ قِرَاط )[3] . هەندێ لە زانایانی فیقه، بەم فەرموودەیە بەڵگە دێننەوە بۆ ڕێگەگیری لەڕاگرتنی سەگ کە باش نییە نەك لەبەر حەرامی بێ، چونکە حەرام هیچ کاتێك دروست نییە ، ئیتر پاداشت کەم بێتەوە یان نا.

---

[1] / البخاري، ت: ١٤٥.

[2] / رواه ابوداود والنسائي والترمذي وابن حبان في(صحيحه) ، ت: ١٤٦.

[3] / رواه الجماعة . ت: ١٤٧.

رێگە گیریی لە ڕاگرتنی سەگ لەماڵدا، ئەوە ناگەیەنێت کەمرۆڤ بەرامبەر ئەم ئاژەڵە دڵ ڕەق بێت، یاخود هەوڵی نەهێشتنی بدات، ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ( لولا أن الكلاب امة من الامم لأمرت بقتلها )[1].

پێغەمبەر ﷺ بەم فەرمودەیە ئاماژە ئەکات بۆ ئەو مانا گەورەیەو ڕاستییە بەرزەی کە قورئان ئاگاداری کردووەتەوە کاتێك خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿ وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي الأَرْضِ وَلاَ طَائِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلاَّ أُمَمٌ أَمْثَالُكُم ﴾ الانعام: ٣٨.

هەروەها پێغەمبەرﷺ چیرۆکی ئەو پیاوە بۆهاوەڵانی ئەگێڕێتەوە کە سەگێکی بینووە لەچۆڵەوانییەکدا زمانی کێشاوەتە دەرەوە لەتینویەتییدا خۆڵی خواردووە، کابراش لەسەر بیرێك بوو بەپێڵاوەکەی ئاوی دەرهێناو سەگەکەی پێ تێرئاو کردووە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: خوای گەورە لەپاداشتی ئەو پیاوەدا لێخۆشبوونی خۆی پێبەخشی[2].

## بۆچوونی زانستی نوێ لەبارەی سەگ ڕاگرتنەوە

ئەمەو ڕەنگە زۆرێك هەبن لەناوخەڵکیدا کەعاشقی ڕۆژئاوابن،و گومانیان بە خۆیان بەچەشنێك بێت کەزۆر هەست ناسكو مرۆڤایەتییەکی بەرزو سۆزێکی لەرادده بەدەریان بۆ هەموو کائینێکی زیندوو هەبێ، بەچاوێکی ڕەخنەگرانەوە، ئەڕواننە ئیسلام کاتێك فەرمان ئەکات مرۆڤ خۆی لەم گیانداره هێمنو بەناو ئەمینە بە دوور بگرێ!! جا بۆ ئەو جۆرە کەسانە ئەم گوتارە زانستیە بەبەهایە ئەخەینە ڕوو، کە زانای ئەڵمانی تایبەتمەند لەگۆڤارێکی ئەڵمانیدا[3] مەترسییەکانی ڕاگرتنی سەگو نزیکبوونەوەی ڕوونکردووەتەوە ، لەوانە:

( لەراستیدا زیادبوونی حەزو خۆشەویستی خەڵکی بەرامبەر ڕاگرتنی سەگ لەم ساڵانەی دواییدا ناچارمان ئەکات ئاوڕێك بدەینەوە لە رای گشتی بۆ ئەو زیانانەی لەئەنجامی ئەمەدا ڕووبەڕوو ئەبێتەوە، بەتایبەت کار گەیشتووەتە ئاستێك کەتەنها بەڕاگرتنی سەگەوە نەوەستاون، بەڵکو بەرەو دەست لەملانیو ماچ کردنی و ڕێگەدانی بەلێسانەوەی دەستی گەورەو بچووكو تەنانەت زۆر جاریش ئەو قاپو کەلو پەلانەش ئەلێسێتەوە کە بۆ پاراستنی خواردەمەنیو خواردنەوەی مرۆڤ ئامادە کراون.

---

[1] / رواه ابوداود والترمذي ت: ١٤٨.
[2] / البخاري، ت: ١٤٩.
[3] / بابەتێکی وەرگێراوە لەگۆڤاری نور الاسلام ژ. ڕەبیعی دووەم لەبەرگی دووەمدا کەگۆڤارێکی د. دراد فتستمرمەو لە گۆڤاری (Kosinos) ی ئەڵمانییەوە وەرگێراوە.

لەگەڵ ئەوەشدا زۆرێك لەو باوو نەریتانەی باسکرا، نەنگییە بۆ مرۆڤو یەکانگیر نابێ لەگەڵ ژیریەکی پارێزراودا، سەرباری ئەمەش ئەم نەریتە لەگەڵ رێساو سیستمی تەندروستیو پاكو خاوێنیدا وێك ناکەونەوە، لێرەدا ئێمە لەم بارەیەوە چاوی لێئەپۆشین، چونکە لەبازنەی گوتارە زانستییەکە بەدەرمان ئەکا، بۆیە بەجێی دێڵین بۆ پەروەردەی رەوشتو پاکیزراگرتنی دەروون.

هەروەها لەرووی پزیشکییەوە . ئەو رووەی لەم باسەدا خاڵی گرنگی پێدانی ئێمەیە . ئەو مەترسییانەن کە هەڕەشە لە تەندروستی مرۆڤ و ژیانی ئەکەن بەهۆی راگرتنی سەگو یاری لەگەڵ کردنییەوە، نەبوەتە جێگەی گاڵتە پێکردن، چونکە خەڵکانێکی زۆرهەن کە بەهایەکی زۆریان لەم بارەیەوە بەخت کردووە، چونکە کرمی شریتی کەلە سەگەوە پەیدائەبێ هۆکارێکی کاریگەرە بۆ نەخۆشییە درێژخایەنەکان، بەڵکو تەنها جاریش زەفەری بەژیانی لەتووشبووانی ئەم نەخۆشییانە بردووەو لەناوی بردوون.

وەئەم کرمە بریتییە لەیەکێك لەئاوە لێك شریتییە شێوە کۆبووەکانو پێشی ئەوترێ کرمی سەگی شریتیو، لەمرۆڤدا لەشێوەی بڵقو بیرۆکەدا دەرئەکەوێ . هەروەها لەئاژەڵیشدا دەرئەکەوێ بەتایبەت بەراز، بەڵام ئەم کرمەو بەگەشەیەکی تەواوەتییەوە تەنها لەسەگدا، دەرئەکەوێ، بەهەمان شێوەشە لە چەقەڵ و گورگیشدا، بەڵام لەپشیلەدا زۆر دەگمەن، وەئەم جۆرە کرمە جیاوازە لە کرمی شریتیتر، بەشێوەیەك کە قەبارەی بچووکەو بەزەحمەت ئەبینرێ، وە شتێکی وەها دەربارەی نەبینراوەتەوە، لەم ساڵانەی دواییدا ئەبێ ) تائەگاتە ئەوەی ئەڵێت:

قۆناغەکانی گەشەکردنی ئەم کرمە چەند تایبەتمەنییەکی بێ وێنەی لە زانستی ئاژەڵدا هەیە لەیەك هێلکۆکەدا چەندین سەری کرمی شریتی بەهۆی برینی ئەو کرمانەوە گەشە ئەکەن، هەروەك لەتوانادایە لەچەند هێلکۆکەیەکی لێك چوو، چەندین جۆری جیاواز لە بڵقو زام وەبەردێت، ئەمەو سەری ئەو کرمانەی بەهۆی کەرت بوونەکەوە دروست بوون، ئەچنە قۆناغی کرمێکی تەواو هەراشەوە لەکولانەی سەگەکاندا، وە بە مرۆڤو ئاژەڵ جگە لەچەند بڵقو زامێك هیچ گەشە ناکات، کەجیاوازییەکی تەواویان لەگەڵ کرمە شریتییەکەدا هەیە.

ئەم برینە لەگیاندارانـدا لەقەوارەی سێوێك گەورەتر نابێ، مەگەر بە دەگمەن ، لەگەڵ ئەوەشدا سەرنج ئەدرێ کە قورسایی جگە بە زیادبوونی زۆر زیاد

نەكات، هەندێ جار ئەگاتە (٥ – ١٠) ئەوەندەی قورسایی ئاسایی خۆی، بەلاّم لەمرۆڤدا ئەگاتە قەوارەی مستەكۆڵە یان سەری كۆرپەیەكی ساواو، پڕ ئەبێت لە شلەیەكی رەنگ زەردو كێش ئەگاتە (١٠ – ٢٠) رەتڵ.

زیاتریش لەمرۆڤدا، لەجگەرییدا ئەبینرێ،و بەچەند شێوازو جۆرێكی جیاواز دەرئەكەوێ زۆری پیّناچێ تووشی سیو ماسولكەكانو سپڵو گورچلە ئەبێتو جومگەكان وشك ئەكاتەوەو ، شیوەو پێكهاتنیان گۆڕانێكی زۆری بە سەردا دێت، بەجۆرێك تایبەتمەندیەكانیش ناتوانن جیاوازی بكەن لەنێوانیاندا، و تائەم نزیكانەش نەیانتوانیووە، ئەم جیاكردنەوەیە ئەنجام بدەن.

هەرچۆنێك بێت، ئەم برینە لەهەر شوێنێكی جەستەدا بێت، مەترسییەكی حاشا هەڵنەگری هەیە بۆ تەندروستیو ژیانی تووش بووەكە، وە بەداخەوە تاكو ئێستا نەمانتوانیووە پەی بەقۆناغەكانی ژیانیو رێگاكانی گەشەو پێكهێنانیو چارەسەرەكەی ببەین، تەنها ئەوە نەبێت، كەئەم پێكهاتە ئاوییە لێلآنە (طفيليات) لەلایەن خۆیەوە ئەمرن، رەنگە فاكتەری ئەم لەناوچوونەش، ماددەیەكەی دەرداری لەش بێتو بەسەر مردنیانەوە، لەم دواییەدا ئەو راستییە جێگیربوو كەجەستەی مرۆڤ لەم حاڵەتانەدا دژە ماددەیەك دەرئەدا كە لەناویان ئەبات و، كاریگەرییە ژەهراوی بوونەكەیان ناهێڵێت.

بەلاّم بەداخێكی زۆرەوە ئەو حاڵەتانەی كەتیایدا ئەمرن بەبێ زیان كەوتنەوە لەچاو حاڵەتەكانی تردا زۆر دەگمەن، لەگەڵ ئەوەی كە بەچەندین رێگایی كیمیایی هەوڵی چارەسەركردنی دراوە، بەلاّم ئاكامی بێ سوود بووە.

وەگەر توشبوو پەنای نەبردبێتە بەر چەكی دەستی (جراح)ەكان ، هیچ رێگە چارەیەكی تری نەبووە.

هەموو ئەم فاكتەرانەو بەشێوەیەكی كۆمەڵ ناچارمان ئەكات هەموو جۆرە میكانیزمێكی توانادار بگرینەبەر بۆ كۆنترۆڵكردنی ئەم نەخۆشیە یاخییەو پارێزگاری كردنی مرۆڤ لە زیانە كتو پڕەكان.

(د. نوالر) لە ئەڵمانیا لە توێكاری تەرمدا ئەو راستیەی چەسپاند، كە تووشبوونی مرۆڤ بەبرینی كرمی شریتی سەگەكان لە ( ١ ٪ ) كەمتر نییە، بەلاّم زۆرینەی ئەو ولاّتانەی كە دووچاری دەردی ئەم كرمە بوون، زەوییە نزمەكانی باكوورو دالماسیا و قرمو ئایسلەندەو باشووری رۆژهەلاّتی ئوستراليا و هەرێمی فریزلند لەهۆڵەندا كە بۆ راكێشان بەكار دێنن، توشبوون بەو كرمی شریتی

تیایاندا بەدەرکەوت کە لەرێژەی ( ١٢ ٪ ) کەمترە نەبوو لە سەگدا، هەروەك لە ئایسلەندە دەرکەوت کە لەنێوەند هەموو ( ٤٣ ٪ ) یەکدا لەدانیشتوان کەسێکی توشبوو بەم برینە دەرئەکەویٚ، وەگەر ئەو ژیانەی دووچاری خواردەمەی مرۆڤ ئەبێت بیخەینە پالٚ ئەو مەترسییانەی هەڕەشە لە تەندروستی مرۆڤ ئەکەن بە بوونی ئەم کرمە شریتی‌یە، بەهۆی دوورخستنەوەی ئەو ئاژەڵە تووشبووانە، کەس نکوڵی ئەو راستییە ناکات کە لەناوبردن‌و قەلاٚچۆکردنی پێویستە ئەنجام بدرێت ، بۆ پاراستنی تەندروستی گشتی‌و پاراستنی خواردەمەنی هاوولاٚتیان، بەتایبەت ئەو ناوچانەی کە لەمەترسییەکانی ئەم کرمە هەتا هەنووکە پارێزراون، تاکو ئاستەنگ لەبەردەم گوێزانەوەی ئەم دەردەدا بۆ ئەو ناوچانە دروست بکریٚ.

ئەگونجیٚ لە سەرکەوتووترین ڕێگەچارە بۆ کۆنترۆڵکردنی ئەم کرمە شریتیانە ئەوەبیٚ کە بکۆشین لەپێناوی گەمارۆدانیدا لە سەگەکاندا، لەبەرئەوەیە کە تەواناباین بەسەر گۆڕینی ئەوا واقعە تاڵە لە سەگ راگرتن‌و هۆگرتبوون پێوەی بەشێوەیەکی بنەبڕیی.

وەناشبێت چارەسەری ئەو سەگانەی لە تووشبوونیان بەچارەسەرێکی پێویست پشت گویٚ بخریٚ لەئاوەها حالاٚتێکدا بەدەرکردنی کرمە خۆپەنادرلوەکە لەکولانەی سەگەکەدا، باشتر وایە ئەم کردارە دووبارە بکرێتەوە لەکاتێکەوە بۆ کاتێکی تر بۆ سەگی چاودێرو پاسەوانەکان .

مرۆڤ ئەتوانیٚ بۆ پاراستنی خۆیی‌و ژیانی تەندروستی زۆر بە ووردی دوور بکەوێتەوە لەیاری کردنی لەگەلٚ سەگدا، و ڕێگە نەدات کە سەگەکە لێی نزیك ببێتەوە، و لە پەروەردەکردنی منالٚدا جەخت بکەیتەوە لەسەر تێکەلٚ نەبوونیان بە سەگ‌و، نەهێلٚریٚ دەستیان بلێسرێتەوە لەلایەن سەگەوەو ، لە جێگەی سەیران‌و یاری کردنی منالٚدا بمێنێتەوە، بەلاٚم بەداخەوە ئەبینین ژمارەیەکی زۆر سەگ لەجێگای وەرزشی منالاٚندا هەن، ئەمە جگە لەپیسییەکەی، کە لەملاو لا بلاٚو ئەبێتەوە، هەروەك پێویستە قاپی تایبەت بۆ دەرخواردەکردنیان دابنریٚ ، و نەهێلٚین ئەو قاپ‌و کەلوپەلانە بلێسنەوە کەمرۆڤ تیایاندا ئەخوات‌و ئەخواتەوە، وەرێگە نەدریٚ سەگ بێتە فرۆشگای خواردەمەنی‌و بازاڕە گشتییەکان ، یان چێشتخانەکان‌و ئەو جۆرە شوێنانەو، بەشێوەیەکی گشتی مرۆڤ پێویستە ئامادەباشی‌و پێشبینی زۆری هەبیٚ لە بەدوورکەوتنەوە لە سەگ‌و لە هەرشتیٚ پەیوەستبیٚ بەخواردن‌و خواردنەوەی مرۆڤ ) .

ئەبینین كە چۆن پێغەمبەر ﷺ ڕێگری كردووە لەتێكەڵ بوون بەسەگو ئاگاداربوون لەدەم خستنیەوە بۆناو قاپی مرۆڤ، و ئاگاداربوون لەراگرتنی سەگ بە بێ هیچ پێویستیەك ؟! چۆن زانیارییەكانی محمدی نەخوێندەوار لەگەڵ مۆدێرنترین خاڵێك لەم بارەیەوە كە زانستی نوێو نوژداریی تازە پێیگەیشتووە ، یەك ئەگرنەوە؟! قورئان ئەفەرموێ: ﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى {٣} إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى {٤} ﴾ سورة النجم.

## لەبارەی پیشە گەرییەوە

ئەمە بنەمایەكی ئیسلامە: خوای گەورە زەوی رام كردووە بۆ مرۆڤو پێویستە مرۆڤ سوود لەم بەخششە وەربگرێ، بەگشت لایەكیدا بكۆشێ لە پێناوی خوای گەورەدا.

## كارنەكردنی مرۆڤی تواناداری نادروستە

بۆ موسوڵمانان ڕەوانییە كەسستیو تەمەڵی بنوێنێ لەداواكردنو دەست خستنی ژیواری خۆی بەناوی لێبڕان بۆ بەندایەتی خوای گەورە، یان بەناوی پشت بەستن بەخوای گەورەوە، چونكە بێگومان ئاسمان زێڕو زیوو نابارێنێت.

هەروەك درووستیش نییە پشت ببەستێ بەو(صدقە)و بەخشیشانەی پێی ئەبەخشرێ، لەبەرئەوەی میكانزیمی هێزو توتانای پێبەخشراوە تاكو بۆخۆییو خێزانو كەسوكاری هەوڵ بدات، بۆیە لەم بارەیەوە پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ( لا تحل الصدقة لغني، ولا لذي مرة، (أي قوة) سوي )[1]. واتە: خێرو زەكات بەدەوڵەمەندو كەسێكی توانادار بەسەركاردا ڕەوانییەو پێی ناشێت.

پێغەمبەر ﷺ بەتوندی لەسەر موسڵمانی قەدەغە كردووە كە پەنابەرێتە بەر دەرۆزە (سواڵ) كردن لەدابین كردنی پێداویستییەكانیدا، چونكە ئەبێتە مایەی شەرمەزاری و شكاندنی ڕێزو كەسایەتی مرۆڤو، بەبێ هیچ پێویستییەك بەرەو دۆزەرە كردنی ئەبات.

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ: (الذي يَسأل مِنْ غَيرِ حَاجَة ، كَمَثَلِ الذي يَلْتَقطُ الجَمْرَ)[2].

واتە: ئەوكەسەی بەبێ ناچاریی دەرۆزەكاری ئەكات، وەكو ئەوە وەهایە پشكۆی ئاگر هەڵبگرێ، هەروەها ئەفەرموێ: ( مَن سَأل الناس لِيُثْرِيَ بِهِ مَالَهُ كانَ خموشاً

---

[1] / الترمذي، ت: ١٥٠.

[2] / البيهقي وابن خزيمة في (صحيحه)، ت: ١٥١.

في وَجهِهِ الى يَومِ القيامة، وَرَضفاً يأكُلُهُ من جهنم، فمن شاءَ فليقلل ، وَمَن شاء فَليُكثِر)[1] .

واتـه: هەرکەسـێ دۆزەرە بکـات بـۆ زیـادبوونی سـامانەکەی، هـەتا رۆژی دوایـی لـە رووخسـاریدا دیـارە، و ئەبێتـە بـەردێکی سـوورەوە بـووی نـاو دۆزەخ و دەرخـواردی ئـەدرێ، جـا ئـەوەی ئـارەزوو ئـەکات بـا کـەمی بکاتـەوەو ، ئەوەشـی ئارەزوو ئەکات با زیادی بکات.

هـەروەها ئەفـەرموێ : ( لا تَزال المسألَةُ بأحَدِكُم حَتى يَلقَى اللهَ وَلَيسَت فِي وَجْهِه مزْعَةُ لَحْـــم)[2] . واتـە: بەردەوام شوێنەورای دەرۆزەکـردن بەرووخسـاری دەرۆزەرە کارانـەوە دیارە، هەتا بەخوای گەورە ئەگەن و پارچە گۆشتێك بەرووخساریانەوە نییە.

بـەم ئاگادارکردنـەو نواندنـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ رێـزی موسـوڵمانانی پـێ پاراستووەو فێری پشت بەخۆبەستن و دوورکەوتنـە لەخۆ بـەخێوکردنی بـە خـەڵکی کردووین.

## لە چ هەلومەرجێکدا دۆزەرە کردن ڕەوایە؟

پێغەمبەر ﷺ کاتی ناچاریی لەبەرچاو گرتووە، هەرکەسێ ناچارکرا لـە ژێـر فشـاری پێویسـتدا کـە دەرۆزەکـان بکـات و، داوای یارمـەتی لەدەوڵـەت و تـاك بکـات، ئەوا هیچ تاوانێکی تێدانییە. ئەفـەرموێ: ( إنَّما المسائل كدح يكدح الرجل بها وجهـــه، فمن شاء أبقى على وجهه، وَمَن شاء تَرَك، إلاّ أن يسأل ذا سلطان أو في أمر لايجد فيه بدا)[3] .

واتـە: بێگومـان دەرۆزە کـردن لەکەیـە، مـرۆڤ رووی خـۆی پـێ لەکـەدار ئـەکات ، جـا ئـەوەی ئـارەزوو ئـەکات ، بـا بـە رووخسـارییەوە بیهێڵێتـەوە، وەئەوەشـی ئـارەزوو ئەکات، وازی لێبهێنێ، مەگەر داوا لە دەسەڵاتدارێك بکات، یاخود بۆ کارێك بێت کە جگە لەو رێگەیە رێگەیەکی دی نەبێت.

پێشـەوا موسلیم لە(صحیح)ەکەیدا ئەگێڕێتـەوە لـە ئـەبی بشـر قـوبیصـە بـن المخـارق ئەفـەرموێ: بـارێکی زۆرم هـەڵگرتبوو، رۆشـتم بـۆلای پێغەمبـەر ﷺ و داوام لێکرد، پاشان فەرمووی: (أقم حتى تأتينا الصدقة فَنأمر لَكَ بها ، ثُمَ قَالَ: يا قُبيصَةَ! إنَّ المسألَةَ لا تَحِلُّ، إلاّ لأحَدِ ثَلاثة: رَجُلٌ تَحَمَلَ حَمَالَةً فَحَلَتْ لَهُ المسألة حَتى يُصيبُها ، ثُمَّ يُمْسِكُ ، وَرَجَـــلٌ أصَابَتْهُ جَائِحة إجتاحت ماله فَحَلّت لَهُ المسألة حَتّى يُصِيب قواماً من العَيش، وَرَجُلٌ أصابته فَاقَـــة

---

[1] / الترمذي ، ت: ١٥٢.
[2] / متفق عليه ، ت: ١٥٣.
[3] / رواه ابوداود والنسـائي ، ق: ١٥٤.

حَتَى يَقول ثَلاثَةٌ مِن ذَوي الحُجا مِن قَومه: لَقَد أصابَت فُلاناً فاقَةَ! فحَلَّت لَهُ المسألَة حَتَى يُصيب قَواماً مِن عَيش ... فَما سِواهُنَّ مِنَ المسألة يا قَبيصَة سُحْتٌ يأكُلُها صاحبُها سُـحْتاً) [1] . واتـه : راوەسـتە هـەتا زەكاتمـان بـۆ دێ ئەوسـا فـەرمان ئەكـەين بـۆت هـەڵگرن، پاشـان فەرمووی: ئەی قوبەیسە ! داواکردن‌و دەرۆزە رەوا نییە مەگەر بۆ (٣) سێ کەس نەبێت ،

١- مرۆڤێك كەوتبێتە ژێـر بارێكی گرانەوە، هـەتا ئەكەوێتـەوە دۆخـی ئاسایی ئەوسا وازدێنێ،

٢- وە مرۆڤێك سەروەت‌و سامانی تیاچووبێت بۆی هەیە داوا لە خەڵكی بكات هەتا خۆی ئەگرێتەوە،

٣- وەمرۆڤێك هەژار كەوتبێ هەتا سێ كەس لە خزمانی پێی ئەڵێن : فلاَن كەس هەژاركەوتووە، ئەم جۆرە مرۆڤەش داوا كردن بۆی رەوایە هـەتا لـە رووی داراییەوە خۆی ئەگرێتەوە، جگە لەم جۆرە كەسانە ئەی قوبەیسە! كارێكی نادروست‌و حەرام ئەنجام ئەدات‌و حەرامیش كۆ ئەكاتەوە.

## رێزداریی ... لەكـاركردندایە

پێغەمبەر ﷺ رێگریی كردووە لە بە سووك سەیركردنی هەندێ كارو پیشە لەلایەن هەندەێ كەسەوە، وەهاوەلاَنی وەها فێركردووە" كە رێزداری تەواوەتی لەكاركردندایە ئیتر هەركارێك بێت، وە بەپێچەوانەشەوە سووكایەتی مرۆڤ لەوەدایە كە چاوەڕوانی یارمەتی خەڵكی بێت‌و ئەفەرموێ: ( لأن يَأخذ أحَدَكُم حَبلَهُ فيأتِي بحزْمَة حَطَبٍ عَلى ظَهرِه فَيبيعَها. فَيَكُفَ الله بِها وَجهَهُ خَيرٌ مِن أن يَسأَل النَاس، أعْطَوهُ أو مَنَعُوه) [2] .

واتە : هەركام لەئێوە پەتەكەی (گوریسەكەی) هەڵبگریّو بڕوا لەشاخ كۆڵێ داری پێ هەڵبگرێ لەبازاردا بیفرۆشێ، و بەوە خۆی لە دەرۆزەكـردن بپارێزێ، زۆر لەوە باشترە كە بەئومێدی خەڵكی بێت، بیدەنێ یان نەیدەنێ).

بۆیە لەسەر موسوڵمان پێویستە كە بژێوی ژیانی لەرێگەی كشتوكاڵ كردن یاخود بازرگانی یان پیشەسازی یـان هەرپیشـەیەك و فەرمانبەرییەك مادام لەسـەر حەرام بناغەبەند نەكرابێ، یان لەسەر حەرام دیاری نەكرابێ، یـان وابەسـتە نەبێت بە حەرامەوە.

---

[1] / رواه مسلم وابوداود والنسائي، ت: ١٥٥.
[2] / متفق عليه، ت: ١٥٦.

# دابین کردنی بژێویی ژیان له ڕێگەی کشتوکاڵ کردنەوە

خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا . لەپێشانگای ئەو بەخششانەی بەمرۆڤی بەخشی بوو . ئاماژە بەو بناغانە ئەکات کە لەکشتوکاڵ کردندا رەچاو ئەکرێت.

بۆیە خوای گەورە زەوی رام کردووە بۆ چاندن و رەنیوهێنان و ژێرباری خستووە بۆ مرۆڤی راخستووە، ئەمەش بێگومان بەهرەی خوای گەورەیە بەسەر بونەوەرەوەو پێویستە یادو سوپاسگوزاریی لەسەر بکرێ ﴿ وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ بِسَاطًا {١٩} لِتَسْلُكُوا مِنْهَا سُبُلًا فِجَاجًا {٢٠} ﴾ نوح .

﴿ وَالْأَرْضَ وَضَعَهَا لِلْأَنَامِ {١٠} فِيهَا فَاكِهَةٌ وَالنَّخْلُ ذَاتُ الْأَكْمَامِ {١١} وَالْحَبُّ ذُو الْعَصْفِ وَالرَّيْحَانُ {١٢} فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾ الرحمن .

هەروەها خوای گەورە ئاویشی خستووەتە خزمەتمەوەو بەشێوەی باران یان لەرێچکەی رووبارەکاندا ئەیگوزەرێنێ، بۆیە زەوی لەدوای مردنیەوە پیێزیندوو ئەکاتەوە ﴿ وَهُوَ الَّذِيَ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ نَبَاتَ كُلِّ شَيْءٍ فَأَخْرَجْنَا مِنْهُ خَضِرًا نُّخْرِجُ مِنْهُ حَبًّا مُّتَرَاكِبًا ﴾ الأنعام : ٩٩.

﴿ فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ إِلَى طَعَامِهِ {٢٤} أَنَّا صَبَبْنَا الْمَاءَ صَبًّا {٢٥} ثُمَّ شَقَقْنَا الْأَرْضَ شَقًّا{٢٦} فَأَنبَتْنَا فِيهَا حَبًّا{٢٧} وَعِنَبًا وَقَضْبًا ﴾ عبس .

هەروا (با) کان کەخوای گەورە بەمزگێنی ئەیاننێرێت، بەوجۆرە هەورەکان راپێچ ئەداو رووەکی پیێ سەوز ئەبێت، بۆیە خوای گەورە لەبارەی هەموو ئەمانەوە ئەفەرموێ: ﴿ وَالأَرْضَ مَدَدْنَاهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَاسِيَ وَأَنبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ شَيْءٍ مَّوْزُونٍ {١٩} وَجَعَلْنَا لَكُمْ فِيهَا مَعَايِشَ وَمَن لَّسْتُمْ لَهُ بِرَازِقِينَ {٢٠} وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلاَّ عِندَنَا خَزَائِنُهُ وَمَا نُنَزِّلُهُ إِلاَّ بِقَدَرٍ مَّعْلُومٍ {٢١} وَأَرْسَلْنَا الرِّيَاحَ لَوَاقِحَ فَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَسْقَيْنَاكُمُوهُ وَمَا أَنتُمْ لَهُ بِخَازِنِينَ ﴾ الحجر . هەموو ئەم ئایەتانە تیشك ئەخاتە سەر ئەو بەخششی کشتوکاڵ کردنەی کەخوای گەورە داوێتی و میکانیزمەکانی بۆ ئاسان کردووە.

ئەوەتا پێغەمبەریش ﷺ ئەفەرموێ: ( ما مِن مُسلِمٍ يَغرِسُ غَرساً أو يَزرَعُ زرعاً، فيأكل فيه طَير ولا إنسان إلاّ كان لَهُ به صَدَقَة)[٢] واتە: هەر موسوڵمانێك درەختێکی بەردار بروێنێ یان کشتوکاڵێك بکات، وە باڵندەیەك یان مرۆڤێك لیێ بخوات، ئەوا بە مسۆگەری بەچاکە بۆی لە قەڵەم دەدری، هەروەها فەرموویەتی: ( ما من مسلم

(٢) متفق عليه، ت: ١٥٧.

يغرس غرساً إلاَ كان ما أكَلَ منهُ لَهُ صَدَقَة، وما سُرِقَ منه لَه صَدَقة، ولا يَرزؤه أحَدٌ إلاّ كان لَهُ صَدَقَة إلى يوم القيامة )[٣]. واته: هەر موسوڵمانێك درەختێكی بەردار بنێژێ ، هەرچی بخورێ و لێی ببڕێ ئەوا تا ڕۆژی دوایی بە چاكە بۆی ئەنووسرێ.

مانای فەرموودەكە ئەوە ئەگەیەنێت كە پاداشتەكەی بەردەوامە ، مادام درەختە بەردارەكە یان كشتوكاڵەكە لێی بخورێ، هەرچەندە خاوەنەكانیان زیندوو بن یان مردوو، یاخود خاوەندارێتییەكەی لەو كەسەوە بۆ كەسێكی دی بگوێزرێتەوە .

زانایان ئەفەرموون: ڕێزلێنانی خوای گەورە هێندە فراوانە، كە لە دوای مردنیشی هەرپاداشتی چاكە بۆ ئەنووسرێ، هەروەك چۆن لەژیانیدا پاداشتی چاكەی بۆ ئەنووسرا، دیارە ئەوەش لە (٦) خاڵدایە چاكەیەكی بەردەوام (صدقه جاریه) ، یان زانیارییەكی سوود بەخش، یان جگەرگۆشەی خواناس كە نزای خێر بۆ دایكو باوكی بكات، یان ناشتنی داری بەردار، یان كشتوكاڵ كردن، یان پاسەوانی سنووری خاكی موسوڵمانان.

ئەگێڕنەوە پیاوێك بەلای (ابو درداء) دا تێپەڕی، بینی واخەریكی ناشتنی نەمامە گوێزێكە، بۆیە پێی وت: واتۆ بە تەمەندا چوویت، كەچی خەریكی ناشتنی دارگوێزی؟!

خۆ ئەم نەمامە تا ئەوەندە ساڵ نایەتە بەرهەم، بۆیە (ابو درداء) فەرمووی: چی تیایە گەر پاداشتەكەی بۆ من بێتو جگە لەخۆم لێی بخۆن؟!

وە لە هاوەڵێكی پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی: گوێی لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ( من نَصَبَ شجرة فصبر على حفظها والقيام عليها حتى أثْمَر ، فإنَ لَهُ في كُلِ شَيء يصَان مِن ثمرها صدقة عند الله عزوجل )[٤]. واته: هەركەسێ درەختێ بنێژێ و ئارام گربێت لەسەر پارێزگاری لێكردنی هەتاكو دێتەبەر، ئەوا هەركەسێ لێی بخوات، پاداشتێكی لەلای خوای گەورە بۆ ئەنووسرێ، زانایان ئەم فەرموودەیەو هاوچەشنەكانیان كردووە بەبەڵگە لەسەر ئەوەی كەكشتوكاڵ كردن باشترین پیشەیە، هەندێ لەزانایانیتر ئەفەرموون : بەڵكو پیشەسازیو كاری دەست باشترین پیشەیە، وزانایانی تریش هەن كە ئەفەرموون بازرگانی باشترین پیشەیە.

---

(٣) مسلم ، ت: ١٥٨.
(٤) احمد، ت: ١٥٩.

هەندێ لە لێکۆڵەران ئەفەرموون: ئەشێت ئەمە بە گۆڕانی هەل‌ومەرج بگۆڕێ ، هەروەك هەندێ کات ئەشێت کشتوکاڵ کردن باشترین پیشە بێت، دیارە ئەویش لەبەر زۆر بلاوبوونەوەی پێویستی مرۆڤ بەبەروبوومی کشتوکاڵی ، وە ئەگەر لەبەر رێگە گیران بازرگانی پێویست بوو، ئەوا لەو کاتەدا باشترین پیشەیە، هەروەك زیادبوونی پێویستی مرۆڤ بەپیشەسازی، ئەوا لەوکاتەدا پیشەسازی کردن باشترین پیشەیە.

وەئەم روونکردوەیەی کۆتایی یەك ئەگرێتەوە لەگەڵ باشترینی ئەو کۆتا خاڵەی ئابووری نوێ ، گەیشتوویەتێ.

## کشتوکاڵ کردنی حەرام

هەر رووەکێك لەئیسلامدا خواردنی قەدەغە کرابێ، یاخود جگە لە زیان خوێندنەوەیەکی دی بۆ ئەو بەروبوومە کشتوکاڵییە نەکرابێ، وەکو چاندنی حەشیش و ماددەی لەو چەشنانە، ئەوا کشتوکاڵ کردنیشیان قەدەغەکراوە لە ئیسلامدا.

بەهەمان شێوەشە بۆ چاندنی تووتن، گەر بڵێین خواردنی جگەرە حەرامە - هەروەك ئەمە – بەهێزە– کەواتە چاندنی تووتنەکەش بەهەمان شێوە ناردوست و حەرامە، بەوجۆرە هەر بڕیارێکی نادروستی‌و ناباشی بەسەر جگەرەدا بدەین، ئەوا تووتنیش ئەگرێتەوە.

بۆ موسوڵمان رەوا نییە کە رووەکی قەدەغەکراو بچێنێ، بەو نیازەی بە ناموسوڵمانی بفرۆشێ، چونکە موسوڵمان هەرگیز نرخ بەحەرام نادات، هەروەك دروست نییە کە خزمەتیان بکات بەو نیازەی کە بەدینداریکی جگە لەدینداری موسوڵمانی بفرۆشێ. هەروەك فرۆشتنی ترێ دروست نییە بەکەسێك گەر بزانرێ ئەو کەسە ترێکەی بۆ مەی ئەوێت.

## پیشەو کارکردن

بێگومان ئیسلام هەمیشە مرۆڤ هەڵئەنێ بۆ کشتوکاڵ کردن‌و پاداشتی بۆ دیاری کردووە بۆ ئەنجامدانی ئەم پیشەیە، بەلاّم بەباشی نەناسیووە کە گەلەکەی هەموو تێکۆشان و هەوڵێکیان لەکشتوکاڵ کردندا کۆ بکەنەوە، هەروەك چۆن مرواری دەریا لە سەدەفەکەیدا خۆی کۆئەکاتەوە. هەروەها پێشی باش نەبووە کە موسوڵمانان تەنها خۆیان بەکشتوکاڵ‌و ئاژەڵدارییەوە خەریك بکەن، چونکە

بەڕاستی ئەمە کەمو کورتییەکە لەموسوڵماناندا کە دووچاری مەترسییان ئەکات.

جێگەی سەرسووڕمان نییە کە پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی بەوە کردبێ کە کشتوکاڵ کردن چاووگەی خراپەو ژێردەستەیی گەلانە، ڕۆژگاریش زۆرباش ئەم ڕاستییەی سەلماندووە. ئەفەرمووێ ﷺ: ( إذا تبايعتم بالعيينة وأخــذتم أذنــاب البقــر، ورضيتم بالزرع، وتركتم الجهاد، سلط الله عليكم ذلاً لا يترعه عنكم حتى ترجعوا إلى دينكم ) [١] واتە: هەرکاتێ کڕینو فرۆشتنتان ئەنجامدا بەشێوەی (بيع العتبه) ئەو کڕینو فرۆشتنەیە کەیەکێك کاڵایەك بەکەسێکی دی بفرۆشێ بەشێوەی قەرزو کت و پڕ لێی ئەکڕێتەوە زۆر بەکەمتر لەوەی کەپێی فرۆشتووە . وکلکی گاتان بەدەستەوە گرتو ڕازی بوون تەنها بە کشتوکاڵ کردن و وازتان لە تێکۆشانی ڕێگای خوا هێنا ، ئەوا خوای گەورە ژێردەستەییەکتان بەسەردێنێ بەجۆرێك لێتان دانـاڕنێ هەتاوەکو ئەگەڕێنەوە سەر ئایینەکەتان.

بۆیە پێویستە لەگەڵ کشتوکاڵ کردندا پیشەو پیشەسازی تریش ئەنجام بدرێ، کە بەهۆیانەوە ڕەگەزەکانی ژیانێکی سروشتیو پێکهاتەکانی گەلێکی خۆشەویستو دەوڵەتێکی بەهێزی دەوڵەتمەندی پێ تەواو دەبێ. ئەم پیشە گەرییانە نەك تەنها ڕێگەیان پێدراوە لەئیسلامدا، بەڵکو هەروەك پێشەواو زانایان بڕیاریان لەسەر داوە (فرض كفاية) لە ئایینی موسوڵماندا، بەو مانایەی کە کۆمەڵی ئیسلامی پێویستە لەناو دانیشتوانیدا هەموو خاوەن پیشەو زانیارییەکی تیادابێ کە پێویستیەکانی خۆی دابین بکات . وە گەر کەمو کورتییەك لەیەکێ لەلایەنەکانی ژیاندا کەوتەوە چ بواری زانیاری یاخود پیشەگەری بێتو کەسێك نەبوو ئەو بۆشاییە پڕبکاتەوە، ئەوا کۆمەڵەکە هەموویان گوناهبارن بەتایبەت فەرمان بەدەستانو کەڵەپیاوان.

پێشەوا غەزالی ئەفەرموێ: ( فەرزی کیفایە ) هەر زانیارییەکە کە گەل ئەتوانێ لێی دابڕێت لە کاروباری دونیادا وەك بواری پزیشکی کە گرنگە لە پێویستی مانەوەی جەستەی مرۆڤ، هەروەها زانستی بیرکاری کە گرنگە لە مامەڵە و سەوداو دابەشکردنی میراتدا، ئەمانە لەو زانیارییانەن کە پێویستە لە هەر کۆمەڵێکدا کەسانێکی تایبەتمەندی لەم بوارانەدا هەبن ) .

بۆیە بەلامانەوە سەیر نەبێت گەر بڵێن بواری پزیشکیو زانستی بیرکاریو

---

(١) ابوداود: ت: ١٦.

هەرجۆرە زانستێك فەرزی كیفایەیە، بەو جۆرەش ئوصولی پیشەگەری فەرزی كیفایەیە ، وەكو: جووتیاریی‌و رستن‌و چنین‌و ئەو جۆرە پیشانە.

وەخوای گەورەش لەقورئاندا ئامارەی بەچەند جۆرێك لەپیشەگەری كردووەو، بە بەخششێكی خوایی لەقەڵەم داون‌و دەربارەی داود پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێت: ﴿وَأَلَنَّا لَهُ الْحَدِيدَ {١٠} أَنِ اعْمَلْ سَابِغَاتٍ وَقَدِّرْ فِي السَّرْدِ ﴾ سبأ ﴿وَعَلَّمْنَاهُ صَنْعَةَ لَبُوسٍ لَّكُمْ لِتُحْصِنَكُم مِّن بَأْسِكُمْ فَهَلْ أَنتُمْ شَاكِرُونَ {٨٠} ﴾ الأنبياء.

هەروەها دەربارەی سولەیمان پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ : ﴿ وَأَسَلْنَا لَهُ عَيْنَ الْقِطْرِ وَمِنَ الْجِنِّ مَن يَعْمَلُ بَيْنَ يَدَيْهِ بِإِذْنِ رَبِّهِ وَمَن يَزِغْ مِنْهُمْ عَنْ أَمْرِنَا نُذِقْهُ مِنْ عَذَابِ السَّعِيرِ {١٢} يَعْمَلُونَ لَهُ مَا يَشَاءُ مِن مَّحَارِيبَ وَتَمَاثِيلَ وَجِفَانٍ كَالْجَوَابِ وَقُدُورٍ رَّاسِيَاتٍ اعْمَلُوا آلَ دَاوُودَ شُكْرًا ﴾ سبأ. هەروەك دەربارەی (ذي القرنين) ئەفەرموێ: ﴿ قَالَ مَا مَكَّنِّي فِيهِ رَبِّي خَيْرٌ فَأَعِينُونِي بِقُوَّةٍ أَجْعَلْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ رَدْمًا {٩٥} آتُونِي زُبَرَ الْحَدِيدِ حَتَّى إِذَا سَاوَى بَيْنَ الصَّدَفَيْنِ قَالَ انفُخُوا حَتَّى إِذَا جَعَلَهُ نَارًا قَالَ آتُونِي أُفْرِغْ عَلَيْهِ قِطْرًا {٩٦} فَمَا اسْطَاعُوا أَن يَظْهَرُوهُ وَمَا اسْتَطَاعُوا لَهُ نَقْبًا {٩٧} ﴾ الكهف.

هەروەك ئامارەی بەدروستكردنی كەشتییەكەی حەزرەتی نوح كردووە لە چیرۆكی نوح پێغەمبەردا ﷺ وەلە گەورەیی‌و مەزنی ئەو كەشتییەدا خوای گەورە بە شاخی چووزاندووە ﴿ وَمِنْ آيَاتِهِ الْجَوَارِ فِي الْبَحْرِ كَالْأَعْلَامِ {٣٢} ﴾ الشورى.

هەر لە قورئاندا ئامارە كراوە بە پیشەیی راو كردن بەهەموو جۆرو شێوەكانییەوە لە راوكردنی ماسی‌و گیانەوەرە ئاوییەكان و راوكردنی گیانەوەرە وشكانییەكان، هەروەها پیشەی چوونە ناوقوڵایی ئاوەوە بۆ دەرهێنانی دووڕوو و مرواری و بابەتی بەنرخی لەو جۆرانە.

لە سەروو هەموو ئەمانەشەوە قورئانی پیرۆز باسی نرخی ئاسنی كردووە بەجۆرێ كەپێشتر هەرگیز بەو جۆرە باس نەكراوە، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿ وَأَنزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ ﴾ الحديد : ٢٥. هەروەك ناوی سوورەتەكەش بە ناوی (الحديد)ەوە نراوە.

بەو جۆرە هەر پیشەیەك یان هەر كارێك پێداویستیەكانی كۆمەڵگە پڕ بكاتەوە، یان بەرژەوەندی‌یەكی راستەقینەی تیادابێت، ئەوا كارێكی باشە (عمل صالح) بەمەرجێ بەرێك‌و پێكی ئەنجامی بدات، بەو جۆرەی كە ئیسلام فەرمانی پێكردووە.

ئایینی پیرۆزی ئیسلام زۆر پیشەی بەسەروە ڕاگرتووە لەکاتێکدا پێشتر بە چاوێکی سووکەوە تەماشای ئەکرا، بۆ نموونە پیشەی شوانێتی کەپێش ئیسلام خەڵکی بەچاوێکی سووکەوە بۆیان ئەڕوانی، بەڵام ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ : ( ما بعث الله نبياً إلاّ رَعَى الغَنَم ) پێیان فەرموو: تەنانەت تۆش ئەی پێغەمبەری خوا ؟ فەرمووی : ( نعم ، كُنتُ أرعاها على قَرارِيط لأَهْلِ مَكَة )[1] ، واتە: بەڵێ منیش مەڕم بۆ خەڵکی مەککە ئەلەوەڕاند بەرامبەر هەندێ پارە .

(محمد) پێغەمبەری خوایەو پایەنی پێغەمبەرانە، شوانی کردووەو ، زۆر لەوەش زیاتر ئەو ئاژەڵانەش کە شوانی کردوون خۆی خاوەنیان نەبووە، بەڵکو بە کرێیەك دیاریکراوو بۆ هەندێ لەخەڵکی مەککە شوانی ئەنجام داوە.

ئەمەش بەو مەبەستەی کە مرۆڤایەتی تێبگەیەنێ کە شانازیی کردن بۆ پیشەوەرانە، نەك کارنەکەران و دەست بەتاڵان.

قورئانی پیرۆز چیرۆکی موسی پێغەمبەرمان بۆ ئەگێڕێتەوە ﷺ کە بە کرێکار لەلای پیاوێکی پیر بەکرێ کاری کردووە بۆ ماوەی (٨) ساڵ، تاوەکو یەکێ لەکچەکانی بداتێ، بەو جۆرە باشترین کرێکاری ئەو پیاوە بووە، وەڕاستی لێهاتوویی کچی پیاوە پیرەکەی تیا بەرجەستە ئەبێ کە وتویەتی و قورئان بۆمان ئەگێڕێتەوە: ﴿قَالَتْ إِحْدَاهُمَا يَا أَبَتِ اسْتَأْجِرْهُ إِنَّ خَيْرَ مَنِ اسْتَأْجَرْتَ الْقَوِيُّ الْأَمِينُ﴾ القصص : ٢٦.

(ابن عباس) ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ وەستای زرێ و زرێ پۆشی بووە، ئادەم جووتیارە بووەو، نوح دارتاش بووەو ئیدریس بەگردرووبووەو موسا شوان بووە[2] .

دەی بایپرۆزبایی لە موسوڵمانان بکەین لەسەر ئەو کارانەی ئەنجامی ئەدەن، چونکە پێغەمبەرێك نەبووە کارو پیشەکی ئەنجام نەدابێ، لە (الصحیح) دا هاتووە : ( کەسێك هیچ خواردنێکی نەخواردووە باشتربێت لەوەی کە لەکاری دەستی خۆی خواردووە ) وەفەرموودەکە بەم جۆرەیە: ( ما أكل أحَدٌ طَعاماً قَطُ خَيراً من أن يأكل مِن عَمَلِ يَدِه ، وإنَّ نَبِيَ الله داود عليه السلام كان يأكل مِن عَمَلِ يَدِه )[3] هەروەك داوود پێغەمبەریش لەکاری دەستی خۆی خواردووە.

---

[1] / البخاري : ١٦١.
[2] / الحاكم ، ت: ١٦٢، الملحق
[3] / البخاري وغيره، ت: ١٦٣.

## ئەو کارو پیشانەی کە ئیسلام لە بەرامبەریاندا وەستاوەتەوە

هەندێ کارو پیشەگەری هەن کە ئیسلام هێڵی قەدەغەکردنی بەسەردا هێناون، چونکە زیانی بۆ بیروباوەڕی کۆمەڵگە هەیە، چ لە رووی رەوشتییەوە بێت، یا زیانی بۆ بەهاو نەریتە بالأکان ببێت.

## البغـــاء = بەدرەوشتی

ئاشکرایە کەپیشەی بەدڕەوشتی پیشەیەکە، زۆرێك لەولأتە رۆژئاواییەکان برەویان پێداوەو، رێگەو هەلومەرجی تایبەتیان بۆ سازاندوون، ئەمە لەکاتێکدایە کە ئیسلام بەتووندی رێگری لەئەنجامدانی ئەم کارە کردووەو، رێگەنادات ئافرەت . ئازار بێت یا بەندە . بەکاری بەدرەوشتی بژێوی ژیانی دابین بکات.

بۆیە هەندێ لەخەڵکانی پێش ئیسلام، باجێکی رۆژانەیان بەسەر بەندەو کۆیلەکاندا سەپاندبوو، و بەهەر شێوەیەك بوایە، ئەبوایە ئەو برە پارەیەیان دابین بکردایە، بۆ ئەم مەبەستەش زۆرێکیان پەنایان ئەبردە بەر بەدرەوشتی بۆ دابین کردنی ئەو هێندە پارەیەی بەسەریدا سەپێنرابوو لەلایەن خاوەنەکەیەوە.

وەکاتێك ئاینی پیرۆزی ئیسلام تیشکی زێرینی خۆی پەخش کرد، پێگەی کۆمەڵأیەتی کوڕان و کچانی بەرز کردووەو، ئایەتێك لەو بارەیەوە هاتە خوارەوە ، کە ئەفەرموێ : ﴿ وَلَا تُكْرِهُوا فَتَيَاتِكُمْ عَلَى الْبِغَاءِ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا لِّتَبْتَغُوا عَرَضَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ﴾ النور : ٣٣.

(ابن عباس) ئەگێڕێتەوە" ( عەبدوڵلأی کوڕی ابیی سەرۆکی دووڕووەکان هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و کەنیزەکێکی لەگەڵدابوو ، کە زۆر جوان بوو ناوی (معاذة) بوو ، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەم کەنیزەکە لە بێباوکانی فلأنە، ئایا فەرمانی پێ نەکەم بەکاری بەدڕەوشتی؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: نەخێر[1].

## سەماو بەناو هونەری سێکسی

ئاشکرایە کە ئیسلام رێگە نادات بەلادان لەبواری سەماکردن و هونەرە سێکسیە سەرنج راکێشەکان، ئەمانەو هەر کردارێك کە ئارەزووە سێکسییەکان لەمرۆڤدا بخرۆشێنێ وەکو گۆرانی ناپەسەندو نواندنی ناڕەوا، هەرچەندە هەندێ کەس لەژێر ناوی(هونەر)دا دارشتەیان ئەکەن و هەندێکیتر بەپێشکەوتنیان لە

---

(١) تفسير الفخر الرازي ج٢٣ ص ٢٢٠ ، ت: ١٦٤

قەڵەم ئەدەن و بەم جۆرە ناوزەد کردنە گومڕاکارانە.

ئایینی پیرۆزی ئیسلام هەر پەیوەندییەکی سێکسی قەدەغە کردووە مادام لە ڕێگەی ژنهێنانی شەرعییەوە نەبێ، ئەمەو هەرکردار یا گوفتارێکیشی قەدەغە کرووە، کە دەروازە بە رووی ئەم پەیوەندییەدا والاّ ئەکات.

ئەمەش رازی ڕێگریی کردنی ئیسلامە بۆ بەدڕەوشتی و بەم جۆرە قورئانی پیرۆز ئاماژە ئەکات: ﴿ وَلاَ تَقْرَبُواْ الزِّنَى إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاء سَبِيلاً {٣٢}﴾ الإسراء. ئەگەر سەرنجی ئایەتەکە بدەین، بۆمان دەرئەکەوێ، تەنها ئەنجامدانی زیناکەی نەکردووە، بەڵکو قەدەغەی لێ نزیك بوونەوەشی کردووە.

## پیشەی دروست کردنی پەیکەرو خاچو...

کاتێك ئیسلام هەڵواسینو دانانی پەیکەری قەدەغەکردووە، بەو جۆرەش دروست کردنو پیشە گەرییەکەشی قەدەغەکردووە.

پێشەوا البخاری لە(سعیدی) کوری (ابی السحن)ەوە ئەگێڕێتەوە: لەلای (ابن عباس) بووم کاتێ پیاوێك هات بۆلایو وتی: ئەی (ابن عباس) من پیاوێکم بژێوی ژیانی خۆم لەسەر کاری دەستمە کە ئەم جۆرە وێنانە دروست ئەکەم، (ابن عباسیش فەرمووی: هیچت پێناڵێم، هێندە کەلە پێغەمبەرەوە ﷺ بیستوومە فەرموویەتی: هەرکەسێ وێنەیەك بکێشێ ، خوای گەورە سزای ئەدات هەتاکو گیانی بەبەردا ئەکات، وەهەرگیزیش ناتوانێ گیانی بەبەردا بکات... بۆیە پیاوەکە زۆر تووڕەبوو، (ابن عباس) فەرمووی: ماڵ وێران ! گەر هەر ناچاریت ئەو پیشەیە ئەنجام بدەیت، ئەوا وێنەی دارو درەختو شتی بێگیان بکێشە[1].

بەلاّم وێنەگرتنی تابلۆو وێنەگرتنی فۆتۆگرافی، ئەوا هەردوو بڕیاری (مباح) و (مکروە)ی بەسەردا ئەدرێ دیارە ئەمەش بەگوێرەی راجیایی زانایانە، و کاتێك (مباح)ە کە ئەو وێنەیە قەدەغەکراو نەبێ، وەکو پیشاندانی ئەندامە شاراوەکانی جەستەی ئافرەت، وەیان وێنەی ماچ کردنی ئافرەتێك بێت لەلایەن پیاوێکەوە، ئەمانەو هەروەها ئەو وێنانەی کە بە گەورەو مەزنو پیرۆز بۆیان ئەڕوانرێ، وەکو وێنەی بەناو فریشتەکان یاخود پێغەمبەران و ئەو جۆرانە.

---

(١) اخرجه البخاري ، ت: ١٦٥.

## پیشەی دروست کردنی مادده سڕکەرو سەرخۆشکەرەکان

پێشتر باسمان کرد کەئیسلام نرخ و بەهادان بەمادده سەرخۆشکەرەکانی قەدەغە کردووە، چ لەبورای دروست کردن یاخود دابەش کردن یا خواردنەوەیان بێت، وەهەرکەسێ بەپێچەوانەوە بجولێتەوە، ئەوا لەسەر زمانی پێغەمبەرەوە ﷺ بە نەفرەت کراوە واتە بێبەری کردن لە رەحمی خوای گەورە.

مادده سڕکەرەکان لە حەشیش و افیون و ئەو جۆرانە وەکو مادده سەرخۆشکەرەکان وایە لە حەرامکردنی مامەڵە پێکردن و دروست کردن و خواردنیان.

بۆیە ئیسلام رێگرە لەوەی کە مرۆڤی موسوڵمان خۆی خەریك بکات بە هەر پیشەیەکەوە کە لەسەر کارێکی حەرام یان نرخ پێدانی کارێکی حەرام بناغە بەند کرابێ . دەردەست خستنی دارایی لە رێگەی بازرگانیەوە ) ئەمە ناونیشانی ئەو بابەتە کە سەرەتاکەی بە ( ئاینی ئیسلام... ) دەست پێ ئەکات.

ئاینی ئیسلام لە تێکستە قورئانی و فەرمودەکانی پێغەمبەردا ﷺ زۆر بەهێز بانگهێشت بۆ بازرگانی کردن ئەکات و گرنگی پێ ئەدات، مرۆڤ هان دەدات لەسەر گەشت و سەفەرکردن لەپێناویدا و بە ﴿ابتغاء من فضل الله﴾ ناوی ئەبات... خوای گەورە ئەو کەسانەی بەشوێن بازرگانی کردندا ئەگەرێن، لە ریزی تێکۆشەرانی رێی خوای گەورە داینا و ئەفەرموێ: ﴿وَآخَرُونَ يَضْرِبُونَ فِي الْأَرْضِ يَبْتَغُونَ مِن فَضْلِ اللَّهِ وَآخَرُونَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ المزمل : ٢٠.

خوای گەورە لە قورئاندا باسی بەخششەکانی ئەکات بەوەی کە رێگەی بازرگانی ناوخۆو دەرەوەی بۆ فەراهەم کردوون بەرێگەی دەریایی، کە هەتاکو هەنووکەش بە پێشکەوتووترین رێگەی هاتووچۆی بازرگانی کردن دائەنرێت لە جیهاندا، بۆیە خوای گەورە لەباسی رامکردنی دەریادا بۆ مرۆڤ و گەڕگەشت کردنی کەشتی بازرگانی تیایدا، ئەفەرموێ: ﴿ وَتَرَى الْفُلْكَ فِيهِ مَوَاخِرَ لِتَبْتَغُوا مِن فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ {١٢} ﴾ الفاطر .

وە هەندێ جار ئەمە وابەستە ئەکات بە هەڵکردنی (با)وە ، و ئەفەرموێ: ﴿ وَمِنْ آيَاتِهِ أَن يُرْسِلَ الرِّيَاحَ مُبَشِّرَاتٍ وَلِيُذِيقَكُم مِّن رَّحْمَتِهِ وَلِتَجْرِيَ الْفُلْكُ بِأَمْرِهِ وَلِتَبْتَغُوا مِن فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ {٤٦} ﴾ الروم ، خوای گەورە ئەمە دووبارە ئەکاتەوە بەمەبەستی بیرخستنەوەی بەخششەکانی ، و ئاگادارکردن لە سوودمەندبوون پێیان، تا

**رادەیەکی وا کەخوای گەورە کە شتی کردووە بەبەڵگەو نیشانە بەسەر بوونو تواناو دەستەڵاتو داناییەوەو ئەفەرموێ : ﴿وَالْفُلْكِ الَّتِي تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِمَا يَنفَعُ النَّاسَ﴾** البقرة: ١٦٤، ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ الْجَوَارِ فِي الْبَحْرِ كَالْأَعْلَامِ {٣٢}﴾ الشورى:٣٢

**هەروەها خوای گەورە لەباسی بەهرەو بەخششەکانیداو فەراهەمکردنی میکانیزمەکانیان لە بازرگانیدا لەپێگەی جوگرافی دوورگەی عەرەبیدا کەباشترین جێگەیە بۆ بازرگانی ئەفەرموێ:** ﴿أَوَلَمْ نُمَكِّن لَّهُمْ حَرَمًا آمِنًا يُجْبَى إِلَيْهِ ثَمَرَاتُ كُلِّ شَيْءٍ رِزْقًا مِن لَّدُنَّا﴾ القصص : ٥٧. **بەمەش بانگەوازەکەی پێغەمبەر ابراهیم (سەلامی خوای لێبێت) جێبەجێبوو:** ﴿رَّبَّنَا إِنِّي أَسْكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيْرِ ذِي زَرْعٍ عِندَ بَيْتِكَ الْمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ الصَّلاَةَ فَاجْعَلْ أَفْئِدَةً مِّنَ النَّاسِ تَهْوِي إِلَيْهِمْ وَارْزُقْهُم مِّنَ الثَّمَرَاتِ لَعَلَّهُمْ يَشْكُرُونَ {٣٧}﴾ إبراهيم : ٣٧.

**ئەوەتا خوای گەورە لەباسی بەهرەکانیدا بەسەر گەلی قورەیشەوە ئاماژە بەو دوو گەشتە بازرگانیە ئەکات کە لە زستانو هاویندا ئەنجامیان ئەدا، گەشتێکیان لەهاویندا بەرەو شام بوو، ئەوەی تریان لە زستان بوو بەرەو یەمەن و، بەئاسایشو ئارامیەوە گوزەریان ئەکرد...باسوپاس گوزاری ئەم بەخششانە بن بەبەندایەتی کردنێکی یەکتاناسیانە بۆ خوای گەورە، پەروەردگار (بیت)و خاوەنی زیادە بەسەریانەوە :** ﴿لِإِيلَافِ قُرَيْشٍ {١} إِيلَافِهِمْ رِحْلَةَ الشِّتَاء وَالصَّيْفِ {٢} فَلْيَعْبُدُوا رَبَّ هَذَا الْبَيْتِ {٣} الَّذِي أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٍ وَآمَنَهُم مِّنْ خَوْفٍ {٤}﴾ سورة قريش.

**بەو جۆرە ئیسلام هەلی ئاڵوگۆڕی بازرگانی ئاڵوێری بازرگانی بۆ موسوڵمانان رەخساندووە لەنێوان هەرێمو گەلانی جیاوازدا لەسەر شێوازێکی جیهانی فراوان لەهەموو ساڵێکدا، و ئەمەش لە وەرزی ساڵانەی ئیسلامی جیهانیدا، کە وەرزی حەجی ماڵی خوایە، کاتێك دێن:** ﴿رِجَالًا وَعَلَى كُلِّ ضَامِرٍ يَأْتِينَ مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ {٢٧} لِيَشْهَدُوا مَنَافِعَ لَهُمْ وَيَذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ﴾ الحج : ٢٧، ٢٨.

**وەهەر لە میانەی ئەو سوودانەی بازرگانی هەیەتی" بخاری ئەگێڕێتەوە کە موسوڵمانان سڵیان لە بازرگانی وەرزی حەج ئەکردەوە لەترسی ئەوەی نەبادا زیان لەنیازپاکیان (اخلاص) بدات، وپاکیزەیی بەندایەتی کردنەکەیان لەکەدار بکات ، بۆیە خوای گەورە لەو بارەیەوە ئایەتی ناردە خوارەوە کە ئەفەرموێ :** ﴿لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَبْتَغُواْ فَضْلاً مِّن رَّبِّكُمْ﴾ البقرة : ١٩٨.

**قورئان ستایشی موسوڵمانانی کردووە کە بەیانیانو ئێوارە روو ئەکەنە**

مزگەوتەکان بۆ نوێژ کردنو یادی خواو بازرگانی ﴿ رِجَالٌ لَّا تُلْهِيهِمْ تِجَارَةٌ وَلَا بَيْعٌ عَن ذِكْرِ اللَّهِ وَإِقَامِ الصَّلَاةِ وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ ﴾ النور : ٣٧.

موسوڵمانان لە گۆشەنیگای قورئانەوە نەسیپاڵی مزگەوتو نەدەروێشی تەکیەو خانەقاکانن و نە گۆشەگیرانی دیرن، بەڵکو موسوڵمان مرۆڤی کاری دونیان بەجۆرێك سەرگەرمیان ناکات کە واجباتە ئایینیەکانیان بیر بەرێتەوە.

ئەمانە گوڵەوەچنێك بوون دەربارەی ئەو ئایەتانەی سەبارەت بازرگانی کردن هاتوون بەڵام لە سوننتەدا، پێغەمبەر ﷺ موسوڵمانانی هانداوە لەسەر بازرگانی و گرنگیدان بەئەنجامدانو بناغەی یاسایەکی پتەوی بۆ داڕشتووە بە کرداروو گوفتارو تقریی - تقریر - واتە: کرداری کەسێکی دی کە لەبەرچاوی کرا بێتو بێدەنگییەکی ڕەزامەندیی نوواندووە، بۆیە لە وتە شیرینەکانیدا گوێ بیستی ئەم وتەیەی ئەبینین ( التاجر الأمين الصَدُوق مع الشُهداء يَـومَ القيامَـة ) [1] هەروەها (التَاجرُ الصَّدوق الأَمين مَع النَبيين والصِديقين والشُهداء )[2].

بۆیە بەلامانەوە جێگەی سەرسووڕمان نەبێ کە پێغەمبەر ﷺ بازرگانی ڕاستگۆی گێڕاوە بەپلەی تێکۆشەری خواو شەهید ، هەر بۆیە ئەزموونەکانی ژیان گەواهی ئەم ڕاستیانەن ، کە تێکۆشان تەنها لەگۆڕەپانی جەنگدا نیە، بەڵکو تێکۆشان لە مەیدانی ئابووریشدا هەیە.

بەڕاستی بەڵێندان بە بازرگان بەم پلە بەرزە لەلایەن خوای گەورەو، ئەم پاداشتە لەرۆژی دواییدا، بۆ ئەوەیە کەبازرگانی لەرێگەی چاوچنۆکیو تەماعەوە و زەفەری پێ ئەبرێ و لەخشتە ئەبرێ وەدەست خستنی (سوو) بەهەر رێگەیەك بێت، دارایی لێ ئەبێو (سوو)ش بە(سوو)ی زیاتر هەڵ ئەنرێ بۆیە هەر بازرگانێك لەسەر سنووری ڕاستگۆییو متمانە بوەستێ، بێگومان ئەوە تێکۆشەرێکەو لە جەنگانی ئارەزوودا سەرکەوتنی بەدەست هێناوە، و پلەوپایەی تێکۆشەرانی بۆ ڕەوا بینراوە.

جگە لەوەش کاری بازرگانی کردن مرۆڤ نگرۆی بیرکردنەوەو ژماردە کردنی سەرمایەو قازانج ئەکات، ئەوەی لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ ئەبینین کاروانی بازرگانی ئەگەیشتە پێشەوە، لەکاتێکدا پێغەمبەر ﷺ وتاری ئەخوێندەوە، بۆیە موسوڵمانان هەر کە بینیان وا کاروانەکە گەیشتووەتە جێگە ، وتارەکەیان بەجێهێشت،

---

(١) ابن ماجه ، والحاكم وصححه . ت: ١٦٦.

(٢) الحاكم والترمذي باسناد حسن. ت: ١٦٧.

بۆیە ئەم ئایەتە پیرۆزە هاتە خوارەوە کە ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا رَأَوْا تِجَارَةً أَوْ لَهْوًا انفَضُّوا إِلَيْهَا وَتَرَكُوكَ قَائِمًا قُلْ مَا عِندَ اللَّهِ خَيْرٌ مِّنَ اللَّهْوِ وَمِنَ التِّجَارَةِ وَاللَّهُ خَيْرُ الرَّازِقِينَ﴾ الجمعة: ١١. بۆیە هەرکەسێ لەناو ئەم نارەحەتیە بەهێزەدا خۆڕاگر بێت ، ئەوا بێگومان دڵی ئاوەدانە بەترسی خوای گەورەو زمانی پاراوە بە یادی خوای گەورە، ئەوا شایستەی ئەوەیە کە لە ڕیزی خۆشەویستانی خوای گەورەدا بێ لە پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان.

هێندەمان بەسە کە پێغەمبەر ﷺ هەروەك چۆن بایەخی داوە بەلایەنی روحی و، مزگەوتەکەی لەمەدینە لەسەر بناغەی پارێزکاری خوای گەورەو ڕەزامەندی بونیاد نا، تاکو ببێتە مزگەوتی بەندایەتی و زانکۆی زانیاری و مەڵبەندی بانگەوازو دەوڵەت، هەر بەو شێوەیەش گرنگیدا بەلایەنی ئابووری، بۆیە بازاڕێکی ئیسلامی کردەوە، کە دەستەڵاتی یەهوود بەسەرەوە نەبوو کە پێشتر بازاڕی بنو قینقاع بوو، وە پێغەمبەر ﷺ خۆی سەرپەرشتی بارودۆخی ئەو بازاڕەی ئەکردو، بە تەعالیم و ئاڕاستە کردنی خۆی چاودێری ئەکرا، بەبێ بوونی هیچ ناپاکی و تەرازوو بازییەك و دوور لە هەموو شاردنەوەو دیاردەیەکی ناڕەوا.

هەروەها لە ژیاننامەی هاوەڵانی پێغەمبەردا ﷺ زۆر وریاو کارامەیان تیادا ئەبینێتەوە ، هەروەك چۆن پیشەکارو جووتیارو سەرجەم خاوەن پیشەو کارەکانیان تیادا دەبینێتەوە.

ئەوەش پێغەمبەر ﷺ بووە ( بەسەریانەوەو ئایەتەکانی بۆ هاتووەتە خوارەوەو، ئەویش بەگوتاری ئاسمانی چەپاندوویەتی بەگوێیاندا... بۆیە هەموویان زۆر پێغەمبەریان خۆش ئەویست ﷺ و هەریەکەیان ئاواتی ئەخواست کە بۆ تەنها چاو تروکاندنێکیش لێی جیا ئەبێتەوە، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئەبینین کە هاوەڵانی هەر یەکەیان لەسەر پیشەو کاری خۆی بووە... بەو جۆرە هەر کامیان لەکاتی فەرمووونی وتارێکدا ئامادەی نەبوونایە، داوایان لەیەکتری ئەکرد کە باسی بکات بۆ ئەوەی ئامادە نەبووەو ، فەرمانیان پێ کرابوو کە ئامادە بوو بە نائامادە بوو رابگەیەنێ.

بۆیە پشتیوانەکان (الانصار) زۆرینەیان خاوەنی کێڵگەی خورماو کشتوکاڵ کردن بوون، کۆچکەرانیش (المهاجر) زۆرینەیان بازرگانی کڕین و فرۆشتنیان ئەنجام ئەدا لە بازاڕەکاندا.

ئەوەتا عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف کۆچی کردوو، سەعدی کوڕی رەبیعی پشتیوان برایەتی خۆی بۆ ئاشکرا ئەکات و داوای لێ ئەکات کە ببێتە

هاوبەشی لە خێزان وماڵیداو پێی فەرموو دوو هاوسەرم هەیە کامیان پەسەند ئەکەیت تەڵاقی ئەدەمو بیخوازە، بەڕاستی ئەمە گەورەترین مانای ایثاری تیا ئەبینرێتەوە، بۆیە بە سعد ئەفەرموێ: خوای گەورە رێژەنی خۆی ببارێنێتە سەر ماڵو خێزانتو پێویستم پێیان نییە، بازارێکم پیشان بدە بازرگانی تیادا بکرێ، بۆیە سەعد فەرمووی: بەڵێ بازاڕی بنو قینقاع هەیە... پاشان عەبدولڕەحمان رووی کردە بازاڕەکەو دەستی کرد بە کڕینو فرۆشتنی چەند پارچە پەنیرێك لەگەڵ ڕۆندا... بەم جۆرە بەردەوام بوو هەتا بووە یەکێك لەهەرە موسوڵمانە دەوڵەمەندەکان، و پاش کۆچی دوایی دارایییەکی زۆری بەجێهێشت.

هەروەها (ابوبکر)یش سەرقاڵی هەوڵو بازرگانی بوو ، هەتا ئەو کاتەی کە موسوڵمانان بەیعەتی خەلیفایەتیان پێبەخشی ، ئەیویست کە بچێت بۆ بازاڕ بۆ بازرگانی، بەهەمان شێوە عومەری کوڕی خەتتاب دەربارەی خۆی ئەفەرموێ: بەهۆی کارکردنم لە بازاڕدا بیستنی فەرموودەکانی پێغەمبەرم ﷺ لەدەست ئەچوو، بەم جۆرە عوسمانو کەسانی تریش.

## هەڵوێستی کەنیسە لە بەرامبەر بازرگانی کردن

بەم جۆرە گرۆهی موسوڵمانان پێشوازییان لەدونیا ئەکرد لە ژێر سێبەری ئاینیاندا، کە بازرگانیو کڕین ئەنجام ئەدەن، بەڵام ئەم بازرگانییە لە یادی خوا بێ ئاگایان ناکات، لەکاتێکدا جەماوەر لەسەدەکانی ناوەڕاستدا بەزۆربەی شانشینەکان و دەوڵەتە ئەوروپییە مەسیحییەکانەوە دوودڵن لەبەرامبەر رووبەڕوو بوونەوەیەکی نادیاردا وەستاون، ئەویش بیری (تخليص) و (اخلاص)ە واتە: بازرگانی کردنی دەروون لەو هەڵانەی کە تیایدا نقوم ئەبن ئەگەر دژی رای (الاكليرۆس) بوەستنو خەریکی پیشەو بازرگانی نەبن.

وەیان خۆیان ئەخەنە بەر ئەو نەفرتە کە بەسەر مرۆڤدا ئەدرێ کاتێ رووبەڕووی یاساو تەعالیمی پاپاکان بوەستن لەپیاوە ئایینیەکانو خەریکبن بە بازرگانی و پیشەسازییەوە، ئەمە ئاواتێکی هەروا ئاسایی نییە، بەڵکو تاوانێکی تا هەتاییو جێگەی نەفرینە لەسەر زەویو لەژیانی دونیاو دواڕۆژدا.

وە القديس اوغسطين ئەڵێ: بێگومان کارکردن لەراستیدا هەڵەیە، چونکە دەروون بێ ئاگا ئەکات لە راستی، کە خوای گەورەیە ) .

یەکێکی‌تر ئەڵێت: ئەو کەسەی کاڵایەك ئەکڕێ تا لەسەر حاڵەتەکەی خۆی

بیفرۆشێتەوەو بەبێ هیچ گۆڕانکارییەك کە بەسەریدا بهێنێ ئەوە ئەو کەسە لە ڕیزی ئەو فرۆشیارو کڕیارانە پۆلێن ئەکرێ کە دوورن لە کۆمەڵی بەندایەتی خانەو پیرۆزیی پەرستگا.

ئەم وتانە لەیاساکانی (الفیدس) دەرناچن‌و درێژە پێدەری تەعالیمەکانی (القدیس بولس)ە کە بڕیاری داوە مەسیحی نابێ هەرگیز لەگەڵ برای مەسیحیدا دەمەقاڵە بکات‌و نابێ لەناو مەسیحیدا بازرگانییەکی کارا لەو جۆرە ببێ[1].

## بازرگانی قەدەغەکراو

ئایینی ئیسلام بازرگانی قەدەغە نەکردووە مەگەر ستەم یا ناپاکی و قۆستنەوەو نرخی پێدانی شتێکی تێدابێت کە ئیسلام یاساغی کردووە.

بۆیە بازرگانی کردن بە مەی و مادده سڕکەرەکان‌و بەرازو بت‌و پەیکەرو ئەو جۆرە شتانەی ئیسلام قەدەغەی کردوون لەخواردن‌و ئاڵوگۆڕکردن‌و سوود لێوەرگرتنیان بە بازرگانی کردنیان شتێکی ناڕەوایەو ئیسلام پێی ڕازی نییە، هەر دەردەست خراوێ لەرێگەی بازرگانی کردنی ئەم جۆرە شتانەوە دەست بکەوێ ، ئەوا ناڕەوایەو ئیسلام حەرامی کردووە، وە هەر گۆشتێك بەو هۆیەوە پەیدابێ و جەستەی پێ دروست ببێ، حەرامەو ئاگر باشترین شوێنە بۆی، و ئەو بازرگانەی بەم چەشنە حەرامانە مامەڵە بکات، هەرچەندە هێمن‌و ئەمین و دەستپاك‌و ڕاستگۆ بێت، ئەواجێی تاوانەکەی بۆ ناگرێ ، چونکە بنەڕەتی مامەڵەکەی حەرامەو ئیسلام پەسەندی ناکات‌و هەرگیز بڕیاری لەسەر نادات بۆ ئەنجامدانی.

بەڵام کڕین‌و فرۆشتنی زێڕو ئاوریشم ئەمانە دروستن ، مەگەر بازرگانیان بەجۆرێ پێوە بکات کە تەنها بۆ بەکارهێنانی پیاوان بشێن.

بۆیە ئەگەر بازرگانی کردنەکە لە شتێکی دروستدا بوو، ئەوەی لەسەر بازرگان ئەمێنێتەوە ئەوەیە کە لەهەندێ خاڵی گرنگ ئاگادار بێ، تاکو ڕۆژی دوایی لەگرۆهی تاوانکاران ڕیز نەکرێ‌و بێگومانیش خراپەکاران لە دۆزەخدان.

ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ ڕۆشت بۆ نوێژگە، بینی واخەڵکانێك سەودای کڕین‌و فرۆشتن ئەکەن، پێی فەرموون: ( یامعشــر التجــار...) ئەوانیش وەڵامیان دایەوەو سەریان بەرزکردەوەو چاویان تێ بڕی، پاشان فەرمووی: ( ان التجار یبعثــون یــوم

---

(١) لەوانەیەکی مامۆستا (عیسى عبده ابراهیم) بەناوی (وضع الربا في بناء الاقتصاد القومي)، ص: ٢٠ لەپاش ئەوەوە بە دەستکارییەوە، کە مامۆستا ئەم ڕاستییانەی لەچەند سەرچاوەیەکی ڕۆژئاوایی وەرگرتووە.

القيامة فجاراً الا من اتقى الله وبر وصدق )[1]. واتە: بەڕاستی بازرگانان ڕۆژی دوایی بە تاوانکاریی زیندوو ئەکرێنەوە، ئەگەر ئەوانەیان لە خوا بترسیّو چاکە ئەنجام بداتو ڕاستگۆی بێت.

لە (وائلة بن الاسقع)ە وە کە پێغەمبەر ﷺ ( هات بۆ لامان کاتیّ بازرگان بووین، ئەیفەرموو: ( یا معشر التجار اياكم والكــذب )[2] بۆیە پێویستە کە بازرگان ئاگاداری ناڕاستگۆیی بێت، چونکە بەڕاستی ئەمە بەلای بازرگانانە، درۆ سەر ئەکێشیّ بۆ تاوان، تاوانیش مرۆڤ پەلکێش ئەکات بەرەو ئاگر، وەبا ئاگاداری زۆر سوێند خواردن بەگشتیو بەتایبەت، سوێندی ناڕاست، چونکە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمویّ: ( ثلاثة لاينظر الله اليهم يوم القيامة ولا يزكيهم ولهم عذاب اليم ؛ احدهم المنفق سلعته بالحلف الكاذب )[3] واتە: سیّ دەستە خەڵکی هەن خوای گەورە لە ڕۆژی دوایدا ڕوویان تیّ ناکات و پاکیان ناکاتەوەو سزایەکی سەختییان هەیە یەکێك لەو سیّ دەستە خەڵکانە ئەو کەسەیە کە بە سوێندی درۆ کاڵایەکی ئەفرۆشیّ.

وە لە (ابی سعد)ە وە : دەشتیەکییەك بەلای بەچکە وشترێکدا تێپەڕی، وتم: ئەیفرۆشی بە سیّ درهەم؟ وتی: نەخێر نەوەڵڵا، پاشان فرۆشتی، و دوایی ئەمەم بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە ، فەرمووی: ( باع اخرته بدنياه )[4].

هەروەك پێویستە لەسەر بازرگان کە ئاگاداری ناپاکی بێت، چونکە ناپاکان لە دەرەوەی بازنەی گەلانی موسڵمانن، وەبا ئاگاداری تەرازووبازی بێت لە کێشانەو پێوانە کردنیدا ﴿ وَيْــلٌ لِّلْمُطَفِّفِــينَ ﴾ وە دووربێت لە شاردنەوەی هەر کاڵایەك تاوەکو خوای گەورە پێغەمبەرەکەی لەخۆیانی بیّ بەری نەکەن.

هەروەك پێویستە ئاگاداری سووخواردن بن، چونکە خوای گەورە بەقێزەوونی بۆی ئەڕوانیّ ، لە فەرموودەیەکدا هاتووە: ( دِرهَمُ رِبا يَأكُلُهُ الرَّجُل وَهُــوَ يَعْلَم أَشَدُّ مِنْ سِــتَة وَثَلاثــينَ زَنِيَــة )[5]. واتە: خواردنی درهەمێکی سوود لەکاتێکدا خاوەنەکەی بەو سووە زانابیّ تاوانەکەی لەلای خوای گەورە لە (٣٦) زینا کردن گەورەترە.

---

[1] / الترمذي وابن حبان وابن ماجة والحاكم، وقال الترمذي: حسن صحيح ، ت: ١٦٨.
[2] / الطبراني / ت: ١٦٩ .
[3] / المسلم وغيره ، ت: ١٧٠.
[4] / إبن حبان في (صحيحه) ، ت: ١٧١
[5] / أحمد ورجاله رجال الصحيح ، وقد وردت في الرواية هكذا (ستة و ثلاثين زنية) على غير المشهور في العدد ، ت : ١٧٢.

## سەرقاڵ بوون بە فەرمانبەرییەوە

بۆ موسوڵمان ڕەوایە کە لە ڕێگەی فەرمانبەرییەوە، ژیانی ماددی خۆی دابین بکات، ئیتر ئایا فەرمانبەری میریی بێت یان دەزگا یان کەسێك، مادام تەوانا بیَ لە ئەستۆگرتنی پاشکۆی کارەکانیو جیَبەجیَ کردنی ئەرکەکانی سەرشانی دروست نییە بۆ موسوڵمان کە خۆی کاندید بکا بۆ کارێك کە شیاوی نەبێت ، بە تایبەت لە پلەوپایەی دەستەڵاداری، یان بڕیارداندا.

لە ئەبوهورەیرەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئەفەرمویَ: ( وَيْلٌ للأُمراء، وَيْلٌ للعُرَفاءُ، الرُؤساء ، وَيْلٌ للأُمَناء لَيَتَمَنَّيَن أقوام يَومَ القِيامَة أنْ ذَوائبهم مُعَلَّقَةُ بالثُرَيّا، يَدلُونَ بَينَ السَّماء وَالأَرض، وأَنَّهُم لَمْ يُلَوا عَمَلاً)[٢]. واتە: دۆزەخ بۆ پێشەوایان ، دۆزەخ بۆ سەرکردەکان ، دۆزەخ بۆ ئەوانەی سەرپەرشتیاری ماڵی دەوڵەتن، لە ڕۆژی دواییدا کەسانێکی زۆر ئاواتەخوازن کە بەقژیان هەڵواسرانایە لەنێوان زەوی و ئاسماندا، بەلاّم لە دونیادا نەکرانایە بە کاربەدەست.

لە ئەبی ذرەوە: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ لەکارێکی دەوڵەتدا دامنامەزرێنی؟ واتە : پلەوپایەیەکم نادەیتیَ ؟

فەرمووی: دەستی کێشا بەسەر شانمداو فەرمووی: ( يا أبا ذر ، إنَّكَ ضعيف وإنّها أمانة، وإنها يوم القيامة خزي وندامة، إلاّ مَن أخذها بحقها وأدى الذي عليه فيها)[٣].

واتە : ئەی ئەبا ذەر ( تۆ لاوازیت، ئەویش سپاردەیە، و لە ڕۆژی دواییدا ئەبێتە مایەی ناڕەحەتیو پەشیمانی، گەر یەکێك مافی تەواوی خۆی بداتیَ کە بە سەریەوەیەتی، هەروەها فەرموویەتی : ( القضاة ثلاثة: واحد في الجنة ، وإثنان في النار، فأمّا الذي في الجنة ، فَرَجُلٌ عَرَفَ الحَقَ فقضى به، وَرَجُلٌ عَرَفَ الحق فجار فهو في النار ، ورجل قضى للناس على جهل فهو في النار )[٤] .

واتە : بڕیار بەدەستان سیَ جۆرن: جۆریَ یەکەمیان ئەوانەن کە لە بەهەشتدان ، دوو جۆرەکەی تریان ئەوانەن لە ئاگردان ،

ئەوەی لە بەهەشتدایە ، یەکێکە پەی بە ڕاستییەکان ئەبات، بڕیاریان پێئەدات ،

---

(٢) ابن حبان في (صحيحه) والحاكم وصحح اسناده. ت: ١٧٣

(٣) مسلم ، ت: ١٧٤.

(٤) ابوداود والترمذي، وابن ماجه ، ت: ١٧٥.

وە ئەوانەیان لەئاگردان ئەوانەن پەیان بە ڕاستی بردووەو خۆیان لێ لاداوەو بڕیاریان پێنەداوە،

جۆری سێهەمیان ئەوانەن بەبێ زانینی ڕاستی بڕیاریان داوە، ئەمەش جێگەی ئاگری دۆزەخە.

باشتر وایە موسوڵمان زۆر سوور نەبێت لەسەرئەو جۆرە پلەوپایە بەرزانە ، و هەوڵی بۆ نەدات، تەنانەت گەر تواناداریش بێت، چونکە پلەوپایە بکاتە پەرستراوی خۆی، ئەوا پلەوپایەش ئەو ئەکاتە بەندەی خۆی، و هەرکەسێ هەموو ئاوات و ئومێدێکی ئاراستەی دونیا بکات، ئەوا بێگومان لە یارمەتی خوایی بێبەش ئەبێت.

لە (عبدالرحمن بن سمرە)وە : پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: ( یا عبد الرحمن! لا تسأل الإمارة، فإنك إن أعطيتها من غير مسألة أعنت عليها ، وإن أعطيتها عن مسألة وكلت إليها )[1] . واتە: ئەی عەبدولرەحمان ! داوای پلەوپایەی دەستەڵات مەکە ، چونکە ئەگەر بێ داواکاریی خۆت پێت بەخشرێ ، ئەوا خوای گەورە لە کارەکەتدا کۆمەکت ئەکات، بەڵام ئەگەر داوای خۆتی تیادابێ، ئەوا هەموو ئەرکەکە ئەکەوێتەوە سەرشانی خۆت و، خوای گەورە یارمەتیت نادات.

لە ئەنەسەوە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ( من إبتغى القضاء وسأل فيه شفعاء ، وكل إلى نفسه، ومن أكره عليه، أنزل الله عليه ملكا يسدده )[2] . واتە: ئەوەی داوای پلەوپایەی بڕیاردان بکات، ئەوا هەمووی ئەسپێردرێ بەخۆی، وە ئەوەی بەزۆر بکرێ بەدادوەرو بڕیار بەدەست ، ئەوا خوای گەورە فریشتەیەك ئەنێرێتە خوارەوە تا کۆمەکیی بکات. ئەمەش کاتێکە کە نەزانی جگە لەو کەسێکی‌تر نییە ئەو جێگەیە پڕبکاتەوە، وەگەر خۆی پێشکەش نەکات، ئەوا بەرژەوەندییەکان پەکیان ئەکەوێ و ، گوریسی کارەکان تێك ئەچێت، ئەوەتا خوای گەورە سەر گوزشتەی یوسف عليه السلام بۆ ئەگێڕێتەوە کاتێك بەپادشاکەی فەرموو: ﴿ اجْعَلْنِي عَلَى خَزَآئِنِ الأَرْضِ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٌ {٥٥}﴾ يوسف.

ئەمە نەریتی ئیسلامە لە داواکردنی فەرمانبەرداریی و سیاسەت و ئەو جۆرە پلەوپایانەدا.

---

(١) متفق عليه، ت: ١٧٦.

(٢) ابوداود والترمذي: ت: ١٧٧.

## فەرمانبەرییە قەدەغە کراوەکان

پێشتر ئاماژەمان بەوەکرد کە بەڕاستی ئەو خاڵەی کە فەرمانبەریی بە ڕەوا بینیووە ئەوەیە کە لەفەرمانبەرییەکەیدا زیان نەبەخشێتە موسوڵمانان، بۆیە کە دروست نییە موسوڵمانان ببێتە ئەفسەر یان سەرباز لەسوپایەکدا کە دژی موسوڵمانان بجەنگیٚ، هەروەك دروست نییە موسوڵمان ببێتە کرێکار لە دامەزراوەیەکدا کەچەك و تەقەمەنی دژی موسوڵمانان دروست بکات و بۆ جەنگاندن دژیان ، یان فەرمانبەری کۆمپانیایەك بێت کە دژ بە موسوڵمانان بجەنگیٚ بێگومان بێت لەوەدا کە یارمەتی ستەمکار ئەدات.

بەهەمان شێوە ئەوەی سەرقاڵی فەرمانبەرییەك بێت کە لەکاری سەر شانی ستەمکار یان حەرامێك ئاسان بکا، ئەوا حەرامە هەروەك ئەو کەسەی لە کارێکی (سوو)کاری دا کار ئەکات، یان لە نووسینگەیەکی خواردنەوەی (مەی)دا یان لە سەماگەیەکدا، یان لەجێگەی رابواردن و ئەو جۆرە شوێنانەدا کارئەکات. وەهیچ پاساوێکیان بۆ نییە بەوەی کە ئەڵێن ئێمە خۆمان ئەوکارە ئەنجام نادەین، هەروەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد کە لەپرەنسیپەکانی ئیسلام کۆمەکی کردنی تاوان ، تاوانە... لەپێناوی ئەمەدا پێغمبەر ﷺ نەفرینی کردووە لە (کاتب) نووسەری سوو گەواهی دەرەکانی هەروەك چۆن سووخۆرەکەی بەر نەفرین خستووە ، هەروەها نەفرینی ئەو کەسەیشی کردووە کە شەربەتی مەی دروست ئەکات و ئەوەش ئەیهێنێت و ئەوەشی ئەیخواتەوە.

هەموو ئەمانە بەمەرجێکە کە ناچارکردن زۆر لە مرۆڤ نەکات بۆ دابین کردنی بژێوی روو بکاتە ئەم جۆرە کارانە، گەر وابوو ئەوا دروستە بەو هێندەی کە لەدڵ و دەروونەوە پێی ناخۆش بێت و، بەردەوام سەرقاڵی گەڕان بێت، بە شوێن پیشەیەکی تردا، هەتاوەکو خوای گەورە پیشەیەکی حەڵاڵی پیٚ‌ئەبەخشیٚ.

موسوڵمان هەمیشە دەروونی بەدوور ئەگریٚ لە هەرگومانێك لە پراکتیزەکانی ئاینەکەیدا بۆی دروست ببیٚ ، ئیتر هەرچەندە دەسکەوتێکی ماددی باشی هەبێت و داراییەکی زۆریشی دەست بکەویٚ. ئەوەتا ﷺ ئەفەرمویٚ: ( دع ما يُريبُكَ إلى ما لا يُرِيبُك )[1] واتە: واز لەگومانلێکراو بهێنەو کارێك ئەنجام بدە کە

(١) احمد، والترمذي، والنسائي، وابن حبان في (صحيحه) والحاكم ، وقال الترمذي : حديث حسن صحيح ت: ١٧٨.

گومانی تیادا نەبێ. هەروەها ئەفەرموێ: ( لا يبلغ عبد درجة المتقين، حتى يدع ما لابأس به حذراً مما به بأس )[2]. واتە: بەندەی خوا ناچێتە پلەی پارێزکاران (متقین) هەتا وەکو لەشتی حەلاڵیش خۆی نەپارێزێ لە مەترسی ئەوانەدا کە حەرامن.

## یاسای گشتی لەبارەی کارو پیشەوە

یاسای گشتی ئیسلام لەم بارەیەوە ئەوەیە: ( ئیسلام رێگە نادات بە رۆڵەکانی کە بەهەرجۆرێك خۆیان ئارەزووی بکەن داراییان دەست بکەوێ، بەڵکو هاتووە بەجیاکردنەوەی رێگەی مەشروع و نامەشروع لەکاتی دابینکردنی بژێوی ژیاندا لەرێگەی کارێکەوە، بە لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندی گشتی، ئەم جیا کردنەوەیە لەسەر پرەنسیپێکی کوللی دارێژراوە کەئەڵێت: هەموو ئەو رێگایانەی بۆ دەردەست خستنی بژێوی پیادەئەکرێ، ئەگەر بەجۆرێك بێت کە بەرژەوەندی تیادا بێت لە رێگەی زیان گەیاندن بەکەسێکی ترەوە ئەوا نادروستو نارەوایە، وەئەو رێگەیەی کە تاکەکان ئاڵوێرێکی بەرژەوەندیخوازانەی تیادا ئەکەن بە رەزامەندی و یەکسانی بەنسبەت هەردوولاوە، ئەوا دروستەو هیچ گومانێکی تیادا نییە، ئەم پرەنسیپەش خوای گەورە لەئایەتێکی پیرۆزدا ئاشکرای کردووە: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَأْكُلُواْ أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ إِلاَّ أَن تَكُونَ تِجَارَةً عَن تَرَاضٍ مِّنكُمْ وَلاَ تَقْتُلُواْ أَنفُسَكُمْ إِنَّ اللّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا {٢٩} وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ عُدْوَانًا وَظُلْمًا فَسَوْفَ نُصْلِيهِ نَارًا ﴾ النساء، ئەم ئایەتانەی خوای گەورە مەشروعیەتی بازرگانی کردنیان لەسەر دوو مەرج دارشتووە.

١ ـ کە پێویستە بەرەزامەندی لەنێوان هەردوولادا ئەم بازرگانیە ئەنجام بدرێ.

٢ ـ پێویستە بەرژەوەندی لایەکیان نەوەستابێ لەسەر زیان گەیاندن بە لای بەرامبەر.

ئەمەش : ﴿ وَلاَ تَقْتُلُواْ أَنفُسَكُمْ ﴾ روونی کردوونەتەوە لەم ئایەتەدا، و راڤەکانی قورئانی پیرۆز بەم جۆرە راڤەی ئەکەن کە بە دوو واتا لێك ئەدرێتەوە هەریەکەیان بەسەر ئەوەی تریاندا ئەچەسپێ.

مانای یەکەمیان: کە پێویستە یەکتری نەکوژن،

(٢) الترمذي ، ت: ١٧٩

مانـای دووەم: بەدەستی خۆتـان خۆتـان مـەکوژن، بەهـەر جۆرێـك بـێ ئـەم ئایەتە بەرەو ئەوە ئەمانبات کە هەرکەسێ زیان بە جگە لەخۆی بگەیەنێ بـۆ دەسـت خستنی بەرژەوەندی خودی خۆی وەکو ئەوە وایە خوێنی بەردابێ، کەلـە ئەنجامـدا رێگـەی بـۆ لەناوچوونی خـۆی کردۆتـەوە. بۆیـە دزی و بـەرتیل خـواردنو قومـارو چاوبەسـت کـردنو فێـلۆ تەڵەکـەبازیو، سـووخۆریو ئـەم جـۆرە شـتانە ئـەم دوو رێگایـەیان تیـادا بـەدی ئـەکرێ بـۆ نادروسـتیان، وەگـەر لـە هەندێکیانـدا مـەرجی رەزامەندی هاتەدی ئەوا مـەرجی دووەم قـەرەبووی ئەکاتـەوە کە ئـەم فەرموودەیـەی خوای گەورە لەخۆی گرتووە: ﴿وَلاَ تَقْتُلُواْ أَنفُسَكُمْ ﴾[1].

---

(١) ص١٥٢ من كتاب (أسس الاقتصاد) ، للاستاذ ابي الاعلى المودودي.

## دەروازەی سێیەم

# حەڵاڵ و حەرام
# لە هاوسەرداریی و ژیانی خێزانداریدا

- ١ ـ لەبواری ئارەزوودا
- ٢ ـ لەبواری هاوسەرایەتیدا
- ٣ ـ لەبواری پەیوەندیی نێوان هەردو هاوسەردا
- ٤ ـ لەبواری دیاری کردنی وەچە
- ٥ ـ لەبواری جیابوونەوەدا
- ٦ـ لەبواری نێوان دایك و باوك و جگەرگۆشەکانیاندا

## له بواری ئارەزوودا

خوای گەورە مرۆڤی بەدی هێناوە کەببێتە جێنشینی پەروەردگار لەسەر زەوی‌و ئاوەدانی بکاتەوە، ئەم مەرامەش نایەتەدی تاوەو مرۆڤایەتی بەرەو زۆر بوون نەچێت، و ژیانی بەردەوام بێت لەسەر زەوی، بۆ ئەوەی خۆی بەپیشەکانی وەکو کشتوکاڵ‌و پیشەسازی‌و بیناسازی‌و ئاوەدان کردنەوەوە خەریك بکات، و مافی خوای گەورە بەسەرییەوە چییە، بەچاکی جێ‌بەجێی بکات، جا بۆ ئەم مەبەستە خوای گەورە لەمرۆڤدا کۆمەڵەگەلێك ئارەزوو هاندەری دەروونی داناوەن تاوەکو بەرەو مانەوەی ڕەگەزی مرۆڤایەتی لەسەر زەویدا کەمەندکێشی بکات، چ وەك تاك ، چ وەك جۆر.

وە لە میانەی ئەو ئارەزووانە، ئارەزووی گەڕان‌و تێکۆشانە بەشوێن پەیدا کردنی خۆراکدا، کە بە تێرکردنی ئەو ئارەزووە، مانەوە ئەبەخشێتە مرۆڤایەتی.

بەو جۆرە ئارەزووی سێکسیش بە وەڵام دانەوەو تێرکردنی، ئەبێتە فاکتەری سەرەکی لەسەر مانەوەی ڕەگەزی ئادەمیزاد. کە بێگومان ئارەزووی سێکسی ئارەزوویەکی زۆر بەهێزو دەستەڵاتدارە بەسەر مرۆڤدا، و پێویستە بواری تایبەتی خۆی بدرێتێ، هەتا ڕۆڵی پۆزەتیفانەی خۆی بگێڕێ...

مرۆڤیش ناچارە کە بە یەك لەم سێ هەڵوێستە بەرامبەری بوەستێتەوە:

- یاخود ئەوەتا بەرەهایی جڵەوی خۆی ئەداتە دەست، لەهەر کوێ و چۆن ئارەزووی کرد ئەوها لەگەڵیدا بجوڵێتەوە، و سنووری بۆ دانەنێت‌و لە هیچ جۆرە خاڵێك سڵ نەکاتەوە، یان بەبێ هیچ هەڵوێستە کردنێك لەبەردەم ئایین یا داب‌و نەریتێکدا.

هەروەك ئەمە کاری ئارەزووی سێکسی‌یە لەلای ئەو ڕێبازو ئایدۆلۆژیانەی گرنگی بە ئایین یاخود ڕەوشت بەرزی نادەن، بەم هەڵوێستەش، دابەزینی مرۆڤە لە پلەوپایەی خۆیەوە بۆ پلەی ئاژەڵ، و دابینکردنی خراپەکاری بۆ تاك‌و خێزان‌و هەموو کۆمەڵگە.

- یاخود بەتەواوی ئەو ئارەزووە سەر کوت ئەکات، هەروەك هەندێ ڕێبازی توندگیرو قەدەغەکاری لایەنی سێکسی وەك (مانەوی) و ڕێبازە گۆشە گیرەکان‌و هاوچەشنیان . کە ئاشکرایە، ئەم جۆرە هەڵوێست وەرگرتنە، زیندەبەچاڵ کردنی ئارەزووەکانی مرۆڤو لەکارخستنیانە،و نەرێ کردنی فەلسەفەی ئەو زاتەی ئەم ئارەزووانەی مرۆڤدا داڕشتووە، هەروەك ئەبێتە

بەرهەڵستکاری سوننەتی ژیان، بەڵێ ئەو ژیانەی کە بەهۆی ئەم ئارەزووانەوە بەردەوامی پێ دەبەخشرێت.

- یاخود سکێچێکی بۆ ئەکێشێت و لەچوارچێوە دیاریکراودا ئەم ئارەزووانە رێك ئەخات، بەجۆرێك نە بەتەواوی خەفەی ئەکات، وە نە بە رەهایی جڵەوی بۆ شل ئەکات... هەروەك ئەوەی پەیامە ئاسمانییەکان بانگەشەی بۆ ئەکەن لە حەرام کردنی بەدرەوشتیو رێگەدان بەهاوسەرگیری، بەتایبەت ئەو ئیسلامەی کە دانی بەئارەزووەکاندا ناوە، وە لەدەروازەی حەڵاڵەوە ئاسان کاریی بۆ کردووەو ، بەرگری کردووە لەوەی کە مرۆڤ واز لەچێژ وەرگرتنی رەواو دروست بهێنێ و بە رەبەنی ژیان بگوزەرێنێ، هەروەك لەو سەریشەوە زیناو پاشکۆکانی بەتوندترین شێوە حەرام کردووە.

ئەم هەڵوێستە بریتییە لە دادپەروەییو میانەرەویی... گەر هاوسەرداری لە ئیسلامدا رێگەی پێنەدرایە، ئەوا هەرگیز ئارەزووەکان رۆڵی خۆیان لە بەخشینی مانەوە بەمرۆڤدا نەئەگێرا... بەهەمان شێوەشە گەر بەدرەوشتی حەرام نەکرایە، و پێویستی تایبەت بوونی پیاوی بەئافرەتەوە نەکردایە، هەرگیز ئەو خێزانە پێك نەدەهات کە لە سایەیدا سۆزە کۆمەڵایەتییە ناسکەکان گەشە ئەکەن" لە خۆشەویستی و دڵ نەرمیو خوێندنەو بەرامبەر، بەهەمان شێوەشە گەر خێزان نەبووایە ، ئەوا کۆمەڵگەش گەشەی نەدەکردو بەرەو تەواویو پایەبڵندی ئاراستە نەدەبوو.

## نزیکی بەدرەوشتی مەکەون

جێگەی سەرسوورمان نییە کاتێك ئەبینین هەموو ئاینە ئاسمانییەکان بەد رەوشتی (زینا) کردنیان قەدەغە کردووەو بەرەنگاری ئەکەن، کە ئایینی ئیسلام کۆتا ئایینەو زۆر بەتووندی دەستی لەسەر قەدەغەکردنی بەدرەوشتی داگرتووەو مرۆڤی لێ ئاگادار کردووەتەوە، کە ئەبێتە هۆی ئاوێتە بوونی رەگەزو نەسەبەکان و تاوانکاری بەسەر نەوەکانو تواندنەوەی خێزانەکان و هەڵوەشاندنەوەی پەیوەندییەکان و بڵاوبوونەوەی نەخۆشییە درمەکان و یاخی بوونی ئارەزووەکان و دارمانی خوو رەوشتە بالاکان، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿ وَلاَ تَقْرَبُواْ الزِّنَى إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاء سَبِيلاً {٣٢}﴾ الإسراء.

هەروەك ئاشکرایە ئیسلام کاتێك شتێك قەدەغە ئەکات ، هەموو دەروازەو توولە رێگەیەك بۆ ئەو شتە دائەخاتو، هەر میکانزیمو پێشەکییەك رێ خۆشکار بێت بۆی قەدەغە ئەکات.

بۆ ئەم مەبەستە هەر هۆکارێکی بزاوندنی ئارەزووی ناپەسەندو کردنەوەی دەروازەی خراپەکاریو لەسەر ئافرەت و پیاو نزیك بوونەوەیان لە خراپە، یاخود ڕێگەیان بۆ خۆش بکات، ئەوا ئیسلام ڕێگەگری ئەکات بۆ دروستکردنی لەمپەر لەبەر دەم ئەوکارەو پەرژینکردنی خۆمان لەخراپەو وێرانکاریی.

## تەنهایی لەگەڵ بێگانەی ڕەگەزی بەرامبەردا حەرامە

یەکێك لە هۆکارەکان کە بریتیە لە تەنیایی لەگەڵ بێگانەی ڕەگەزی بەرامبەردا، ئایینی ئیسلام حەرامی کردووە، تەنیایی پیاو لەگەڵ ئافرەتێکی بێگانە بەودا، بەجۆرێك ئەو ئافرەتە هاوسەری خۆی نەبێتو خزمانی نەبێت کە بە هەتا هەتایی هاوسەرگیری لەگەڵیدا حەرام بێت وەکو دایكو خوشكو پوور هەردوو خوشکی دایكو باوکەوە کە لە ئاییندەدا باسی ئەکەین.

ئەمەش لەبەرئەوە نییە کە متمانەیان بەیەکێکیان نەبێ یاخود هەردووکیان ، بەڵکو قەڵاداریيو شورەکێشانێکە بەدەوری هەردووکیاندا لە هەموو دەست و سەدەیەکی خراپو خەیاڵی بەدناوکردنیان، چونکە تەنیابوونی ئافرەت و پیاوێکی نامەحرەم بەبێ ئەوەی کەسی سێهەم لەنێوەندا بێت، ڕەنگە ببێتە هۆی ئەوەی لەسەرەوە باسمان کرد، لەم بارەیەوە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: (مَن كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ واليَومِ الآخِرْ فَلا يَخلُونَ بِامرَاة لَيسَ مَعها ذَو مَحْرَم مِنها ؛ فإنَّ ثالثَهُما الشَّيطان )[1] . واتە: هەر کەسێ باوەڕی بەخواو ڕۆژی دوایی هەیە با هەرگیز بەتەنیا لەگەڵ ئافرەتێکدا نەبێت کە کەسێکی مەحرەمی لەگەڵدا نییە" چونکە ئەو دووکەسە سێیەمیان شەیتانە.

وە لە ڕاڤەی ئەو فەرمایشتەی خوای گەورە کە سەبارەت بەخێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ( وإذا سألتُوهُنَّ مَتاعَاً فأسألوهُنَّ مِن وَراءِ حِجاب ؛ ذلكم أطهَرُ لِقُلُوبِكُم وَقُلُوبِهِن ) الأحزاب:٥٣. پێشەوا قرطبي ئەفەرموێ: ( مەبەست ئەو خەیاڵە خراپانەیە کە بەدڵی پیاودا دێت لەکاتی بینینی ئافرەتێکدا وە بەپێچەوانەشەوە ، بەجۆرێکی تر ئەمە بەدوور گرتنە لەگومانو تاوانو خاڵێکی بەهێزە بۆ پاراستن، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە نابێت هیچ کەسێك متمانەی بەخۆی ببێت لەکاتی تەنیایدا لەگەڵ کەسێکدا کە بۆی ڕەوانییە، چونکە خۆ دوورگرتن جوانترە بۆ حاڵی مرۆڤو دەروون پارێزراوترو لەتاوان کردن بەدوورتر دەبێت )[2] .

[1] / رواه أحمد عن عامر بن ربيعة ، ت: ١٨٠ وفي (الصحيحين) عن عبدالله بن عباس (لايخلون أحدكم بامرأة إلاّ مع ذي محرم) ت:١٨١.
[2] / تفسير القرطبي، ج١٤ ص٢٢٨.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ ئاگادارمان ئەکاتەوە بەتایبەت لەتەنیایی کەوتنی ئافرەت بەکەس وکاری هاوسەرەکەی وەکو براو ئامۆزاو ئەم جۆرە کەسانە" چونکە بەڕاستی ئەشێت لەدەروازەی داب و نەریتەوە، هەندێك بەئاسان بۆ ئەم تێکەڵبوونە بڕوانرێ، کە لەوانەیە خوای گەورە پەنابدات ـ سەربکێشێ بۆ بابەتێکی خراپ، چونکە تەنیایی مرۆڤ لەگەڵ نزیکانیدا مەترسیدارترە لەکەسانی تر، بەهۆی ئەمەوە ئەگونجێ خراپەکە قوڵتر ببێتەوە، دیارە ئەمەش لەبەر ئەوەیە" لەبەر کەسایەتی ئەگونجێ مرۆڤ بەتەنیا بچێت بۆلای ئافرەتێکی خزم، چونکە مەسەلە خزمایەتییەو هیچ لەمپەرێك لەرێگەدا نییە، بەپێچەوانەی مرۆڤی بێگانەوە، کە وەك خزم هەلو مەرجی بۆ ناڕەخسێ.

لە نموونەی ئەو جۆرە کەسانەش ، کەس و کاری نزیکی ئافرەتە بەبێ ئەوەی کەسێکی مەحرەمی خۆی لەگەڵدا بێت ، وەکو ئامۆزاو خاڵۆزاو پوورزا، کە ئەمانە هەرگیز دروست نییە لەگەڵ ئەو ئافرەتەدا بەتەنها بن.

پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ( إيّاكُم والدُخُولُ عَلى النساء فَقال رَجُلٌ مِنَ الأَنصـــار، يا رَسُولَ الله ! أفرأيت الحمُو ؟ قَالَ : الحَمُو المَوْتُ )[1]. واتە: بەدوورکەون لە بەتەنیایی بوونتان لەگەڵ ئافرەتانی بێگانە، پاشان پیاوێك لەپشتیوانەکان (انصار) فەرمووی : ئەی پێغەمبەر خوا ! ئەی سەبارەت بەکەس وکاری هاوسەر چۆن ئەڕوانێت ؟ فەرمووی: کەس وکاری هاوسەر ئەوە مردنە.

واتە لەم تەنیاییەدا مەترسیو تیاچوون هەیە، تیاچوونی ئایین گەر دووچاری تاوان بوو، وەتیاچوونی ئافرەتەکە گەر هاوسەرەکەی غیرەت گرتیو لێی جیا بووەوە ، و تیاچوونی پەیوەندییە سۆسیۆلۆژییەکان گەر هاتو کەس و کارەکان لەناو خۆیاندا ڕووبەڕووی گومانی خراپ بوونەوە بە یەکتر.

دیارە هۆی بەرپابوونی ئەو مەترسییە ، ئارەزووە مرۆییەکان نییەو ئەوەی لە مەترسی و کارلێك کردن رووئەداتو بەس، بەڵکو سەرباری ئەمانە مەترسی هەیە بۆسەر پێکهاتەی خێزانو ژیانداریی ئافرەتو پیاو رازو نهێنییەکانیان کە زمانی زۆر بڵێیانو کەسانی خۆویستان بگاتێ، یا ئارەزوو مەندانی تێکدانی ماڵو خێزانداری.

لەم بارەیەوە (ابن الأثير) ئەفەرموێ: کەس وکاری هاوسەر ئەوە مردنە، ئەم دەربڕینە عەرەب بەکاری دێنێ، وەکو ئەڵێن (شێر مردنە) و (سوڵتان ئاگرە) وایە،

[1] / متفق عليه، ت: ١٨٢.

واته بەیەکگەیشتنی هەریەکێك لەم دووانە وەك مردنو ئاگر وەهایە، واتە تەنیا بوونی کەسوکاری هاوسەری ئافرەت لەگەڵ ئافرەتەکەدا مەترسیدارە لە کەسانی نامۆو بێگانە، چونکە لەوانەیە هەندێك بارودۆخی بۆ بڕەخسێ کە بارگرانی بۆ سەر ئەستۆی هاوسەرەکەی تیادابێت وەکو داواکردنێك کەتوانای جێبەجێ کردنی نییە، یاخود خراپی مامەڵەکردنو هەرشتێکیتر لەم بوارانەدا. چونکە گەر کەسوکاری پیاوێك ئافرەت بەهۆی هاتوچۆیماڵیانەوە بەهەندێ نهێنی ماڵو خێزانداریان بزانن، ئەوا کاریگەریی بۆ سەر پیاوەکە نابێت.

## تێڕوانینی ئارەزوومەندانە بۆ ڕەگەزی بەرامبەر

لەوانەی کە ئیسلام لەبواری ئارەزووی سێکسیدا قەدەغەی کردووە، چاو تێبڕینی هەردوولایە، بۆ یەکتر، چونکە بێگومان چاو کلیلی دڵە، و تێڕوانین نێراوی خراپەو پۆستەی زینا کردنە، لە مێژەوە شاعیر فەرموویەتی:

كُلُّ الحَوادثِ مَبدَأها مِن النَظَرِ          وَمُعْظَمُ النَّارِ مِنْ مُسْتَصْغَرِ الشَّرَرِ

واتە: هەر ڕووداوێکی نێوەند دوو ڕەگەزەکەی مرۆڤایەتی، سەرەتاکەی لە تێڕوانینەوەیە، و بەشی گەورەی ئاگریش لەپریشکی وردەوەیە.

وە لە سەردەمی نوێشدا شاعیرێکی دی فەرموویەتی:

نَظْـرَةٌ فـإبتِسَامَـةٌ فَسَلامٌ          فَكَـلام فَمَوْعِـدٌ فلقَـاءُ

واتە: تێڕوانینێك، پاشان زەردەخەنەو، پاشان سڵاوکردن، پاشان گفتوگۆو پاشان سازاندنی ژووانو، پاشان و دواتر ژووانی بەیەك گەیشتن .

هەربۆیە خوای گەورە ڕووی فەرمانی ئەکاتە بڕواداران بەئافرەتو پیاوەوە کە چاوانیان بپارێزن بۆ پاراستنی دامێنیان ئەفەرموێ: ﴿قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَلِكَ أَزْكَى لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ {٣٠} وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ آبَائِهِنَّ أَوْ آبَاء بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَائِهِنَّ أَوْ أَبْنَاء بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي أَخَوَاتِهِنَّ أَوْ نِسَائِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُنَّ أَوِ التَّابِعِينَ غَيْرِ أُوْلِي الْإِرْبَةِ مِنَ الرِّجَالِ أَوِ الطِّفْلِ الَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا عَلَى عَوْرَاتِ النِّسَاء وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ﴾ النور.

لەم دوو ئایەتە پیرۆزەدا هەندێ ئاراستەکردنی خوایی بەدی ئەکرێ، کە بە ریز بەندیاندا دوو ئاراستە کردن کە سەرجەم ئافرەتانو پیاوان تیایاندا بەشدارن" ئەوانیش چاوو دامێن پاراستن، وە ئەوانی تر تەنها تایبەتن بە ئافرەتەوە.

گەر تێبینی ئەم دوو ئایەتە پیرۆزە بکەین، ئەبینین خوای گەورلە لە چاو پاراستنەکەدا ئەفەرموێ: ( ألغض من البصر ) واتە: چاو بپارێزن لەگەڵ ئەوەی لە هەندێ حاڵەتدا رێگەی پێدراوە، بەلاّم بۆ پاراستنی دامێن نافەرموێ: ( وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ) ، چونکە دامێن پاکیو پاراستنی ئەبێ بەهەموو جۆرە شێوازێك بێت بەبێ چاوپۆشین لەهەندێ شت، بەپێچەوانەی چاوەوە کە مرۆڤ لەبەر پێویستی لە هەندێ حاڵەتدا بۆ لەبەرچاو گرتنی بەرژەوەندی ،خوای گەورە رێگەی پێداوە هەروەك باسی لێوە ئەکەین.

بەلاّم چاو پاراستن (غض البصر)، بەمانای چاوداخستنی تەواوەتیو سەر شۆڕکردنەوەی هەمیشەیی بەسەر زەویدا ، ئایەت، ئەمانە خاڵی مەبەستنو نە لە توانای مرۆڤدان، بەهەمان شێوەشە پارێزگاری کردنی دەنگو بەرز نەکردنەوەی ، خوای گەورە لەبارەیەوە ئەفەرموێ: ﴿وَاغْضُضْ مِنْ صَوْتِكَ﴾ لقمان : ١٨ ئەم ئایەتە پیرۆزە بەمانای قوفڵکردنی لێوانی مرۆڤ لەگوۆگردن نایەت، هەروەك ( الغض من البصر) بەمانای پاراستنی چاودێت لە هەموو بینراوێکی بەدو خراپو نادروست بە هەردوو رەگەزەکەیەوە، ئەم تێڕوانینو تەماشاکردنە کاتێك نابێتە کارێکی نا دروست گەر بەبێ ویستی مرۆڤ چاوانی کەوتە سەری، یاخود کتوپڕ چاو دابخرێ و دووبارە نەکرێتەوە.

بۆیە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ بەعەلی کوڕی ئەبی تالیب: ( يا علي لا تُتْبِعُ النَظْرَةَ النَظْرَةَ ؛ فإنَّما لَكَ الأُولَى وَلَيْسَتْ لَكَ الآخِرَةَ )[1]. بەدوای تێڕوانیندا تێڕوانینی تر ئەنجام مەدە، چونکە یەکەم تێڕوانین بۆ تۆیە، بەلاّم دووەم بۆت نییە.

ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ تێڕوانیتی نادروستی هەردوو ڕەگەز بۆ یەکتری بە زینای چاو لەقەڵەم ئەدات، بۆیە ئەفەرموێ: ( العينان تزنيان وزناهما النظر )[2]. هەر بۆیە ئەو تەماشاکردنەی بە زینا ناوزەد کردووە چونکە جۆرێکە لە چێژ وەرگرتنو تێر کردنی ئارەزووی سێکسی لە رێگەیەکی نادروستەوە.

ئەمەش لەگەڵ ئەوەی لە (ئینجیل)دا هاتووە وێك ئەکەونەوە، لە مەسیحەوە عليه السلام ئەوانەی لەپێش ئێوە وتویانە زینا مەکەن، بەلاّم من پێیان ئەڵێم: هەر کەسێ بە چاو تەماشایەکی نادروست بکات، ئەوا بێگومان زینای کردووە)

بێگومان ئەم تێڕوانینە نادروستە بەچێژە تەنها مەترسی لەسەر ئافراندنی

(١) احمد وابوداود والترمذي . ت: ١٨٣.
(٢) البخاري وغيره، ت: ١٨٤.

دامێن پاکی نییە، بەڵکو مەترسیدارە بەسەر جێگیریی هزرو بیرو ئارامی ئەو دڵەی کە دووچاری هەڵهاتن و لادان ئەبێتەوە. شاعیر ئەفەرموێ:

وكنت إذا أرسلْتَ طَرْفَك رائداً ... لقَلْبكَ يَوْماً أتعبَتْكَ المَنــــاظِرُ
رَأَيْتَ الذي لأَكْله أنْتَ قَــادِرٌ ... عَلَيه وَلا من بَعْضه أنتَ صَابرُ

واتــە: كــاتێ چــاوانت كــردە ســەرداری دڵ و دەروونــت، ڕۆژێــك دێــت دیمەنەكان ماندووت بكەن، ئەوە نەبێت كە تەوانا بیت بەسەر هەموویانداو، لەسەر هەندێكی تریشیان ئارامگر بیت.

## قەدەغەكردنی تێڕوانین بۆ شەرمگا ( عورة )

جگــە لەوانــەی لەســەرەوە باســمــان كــرد، پێویسـتــە مــرۆڤ چــاوی لــە ئاسـت شەرمگایشـدا بپـارێزی، بۆیـە پێغەمبـەر ﷺ ڕێگریـی كـردووین لـە تێڕوانین بـۆ شـەرمگا، تەنانـەت گـەر لـە پیاوەوە بـۆ پیـاو یـان لـە ئافرەتـەوە بـۆ ئافرەت بێـت بـە ئارەزوومەندانـە یـاخوود بـەبێ ئـارەزوو، ئەفەرموێ: (لا يَنْظُر الرَّجُلُ إلى عَورَة الرَّجُل، وَلا تَنظر المَرأَةُ إلى عَــورَة المرأة وَلا يُفضي الرَّجُلُ إلى الرَّجُلِ في الثَوب الواحد، وَلا المَرأةُ إلىَ المَرأة في الثَوب الوَاحد) [1]. واتـە: باپیاو نەڕوانێتە شەرمگای پیاو، بەهەمان شێوەش ئافرەت نەڕوانێتـە شـەرمگای ئافرەت و، باپیاو لەگەڵ پیاوی تردا ئافرەتێك لەگەڵ ئافرەتێكی تردا لە ژێر پێخەفێكدا نەنوون.

شـەرمگای پیـاو كـە تەماشـاكردنی بـۆ ژن و پیـاویش قەدەغەیـە، ئەكەوێتـە نێوان ناوك و ئەژنۆ، هـەروەك لـە فەرموودەیەكـدا هـاتووە، وە هـەنـدێ لەپێشـەوایان وەك بـۆ كەسـانی مـەحرەم وەكـو بـاوك و بـرا، ئـەوا لـەدووانمان لەسـەر دەرخسـتنی جوانیدا ڕوونی ئەكەیتەوە.

ئەو ئەندامانەی جەستەكە دروست نییـە بۆیـان بڕوانـرێ، بەهـەمان شـێوە دروست نییە كە دەست یاخود هەر ئەندامێكی تری بەربكەوێ، هـەموو ئەوانـەی لـە قەدەغەكردنی تەماشاكردنی شەرمگادا باسمان لێوەكرد ـ بەتێڕوانین بـۆی یـاخود دەست لێدانی بێـت ، بەمـەرجێك كـە پێویسـت نەبێت، بـەڵام لـەكاتی فریـاگوزاری و چارەسەردا، ئەم بڕیاری قەدەغەكردنە لائەچێت . وەهەموو ئەوانەی باسمان كرد لە دروستی تێڕوانین مەرجدارە بـەدڵنیایی لەخراپـەو ئارەزووبـازی، گـەر بەمەبەسـتی ناردوست بوو، ئەو ڕێگەپێدانەش لائەچێ بۆ ڕێگری لەهەموو خراپەیەك.

---

(١) مسلم واحمد وابوداود والترمذي ، ت: ١٨٥.

## سنووری دروست بۆ تێڕوانینی پیاو یان ئافرەت

بەگوێرەی ئەوەی پێشتر باسمانکرد بۆمان روون ئەبێتەوە کە تەماشاکردنی ئافرەت بۆ جگە لە شەرمگای پیاو ، واتە: بۆ سەرووی ناوکیو خوارووی ئەژنۆی درووستە بەمەرجێ بەمەبەستو ئارەزووی نادروستەوە نەبێ، مەترسی خراپەی لێ نەکرێت، هەر بۆیە پێغەمبەر ﷺ رێگەیدا بە عائیشە کە بڕوانێتە ئەو حەبەشیانەی لە مزگەوتی پێغەمبەردا ﷺ یاریان ئەکرد، پاش ئەوەی بەتەواوی لە سەیرکردنیان تێر بوو، پاشان رۆیشت )[1].

بەهەمان شێوەشە درووستە بۆ پیاو بڕوانێتە جگە لە شەرمگای ئافرەت، واتە: دەستەکانی و دەموچاوی ، بەمەرجێ بە نیازی کاری ناڕەوا بۆی نەڕوانێت، یاخود ئەو تێڕوانینەی خراپەیەکی بەدوادا نەیەت.

لە عائیشەوە" ئەسمائی کچی ئەبوبەکر ـ واتە خوشکی عائیشە ـ بە بەرگێکی تەنکەوە کە سکێچی جەستەی کێشابوو هات بۆلای پێغەمبەر ﷺ ، پێغەمبەریش ﷺ نارەزایی نواندو فەرمووی: ئەی ئەسما ئافرەت کە تەمەنی منالی تێپەڕاند، دروست نییە هیچ بەشێك لەجەستەی ببینرێ تەنها ئەمەو ئەمە نەبێ ـ بە دەستی ئامارەی بۆ دەستو دەمو چاوی کرد ـ[2].

وە لەفەرموودەیەکی لاوازدا ــ بەلاَم هەندێ فەرموودەی تری صحیح بەهێزی ئەکەن هاتووە کە دروستە دەستو دەمو چاوی ئافرەت بەدەرەوە بێت لە کاتی دڵنیابوون لەئاسایشی ولاَتو بلاَوبوونەوەی خراپەکاری.

پووختەی وتەکەش ئەوەیە" لەڕاستیدا تێڕوانینێنکی پاك بۆ جگە لە شەرمگا لەپیاو ئافرەتدا دروستە ، بەمەرجێ بەردەوامی و نیازمەندی لەگەڵ نەبێت ، کە هەندێ جار چێژ وەرگرتنو مەترسی بلاَوبوونەوەی خراپەی لێ ئەکرێت.

لە چاوپۆشینی ئیسلام لەم بارەیەوە بینینێکی کتو پڕە بۆ ئەو کەسانەی ناڕەوایە بۆیان بڕوانرێ لەپاشاندا راستەوخۆ چاوی لەسەر ئەو بینراوە لائەبات" بۆیە لەجریری کوری عەبدوڵلاَوە ئەفەرموێ: لەپێغەمبەرم پرسی ﷺ دەربارەی تێڕوانینێکی کتوپڕ، فەرمووی: (إصرِف بَصَرَك)[3]. واتە: چاوت بگوێزەرەوەو مەهێڵە دووبارە ببێتەوە.

---

[1] / متفق علیه ، ت: ١٨٦.

[2] / ابوداود ، ت: ١٨٧.

[3] / احمد ومسلم وابوداود والترمذي ، ت: ١٨٨.

## ئەوەی دروستە لەجوانی ئافرەت دەربکەوێ یان نا

ئەوانەی پێشتر باسکران پەیوەست بوون بەچاو پاراستنەوە ، کە فەرمانێکە بەسەر ئافرەتو پیاوەوە، بەڵام چەند ئاڕاستە کردنێکی خوایی دی کە تایبەتن بە ئافرەتەوە لەم ئایەتەدایە کە ئەفەرموێ:

ا ـ ﴿ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ﴾ النور:٣١، (زينة المرأة) واتە: هەرشتێك کە جوانکاری بێت بۆ ئافرەت، ئیتر ئایا ئەو جوانییە لەئافراندنیدا بوو، وەك جوانی دەموچاوو قژو ئەندامە جوانەکانی تری لەشی ئافرەت، یاخود جوانییەکی بە دەست هاتوو بوو، وەك جل و بەرگو خشڵو زێڕوو زیوو، ئەم جۆرە شتانە، لەم ئایەتە پیرۆزەدا خوای گەورە فەرمانی کردووە بەداپۆشینی جوانییەکانی جەستەی ئافرەت و قەدەغەی دەرخستنی کردووەو هیچ ئەندامێکی لێ جیا نەکردووەتەوە (إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا) .

لەبارەی مانای (مَا ظَهَرَ مِنْهَا) لەم ئایەتەدا زانایان رایان جیاوازە هەندێکیان باوەڕیان وایە کە ماناکەی بەم جۆرەیە : ئەو جێگەیەیە کە بەناچاری دەرئەکەوێ و لە دەستی مرۆڤدا نییە، بۆ نموونە: بایەك هەڵبکات و ئەو ئەندامەی بەدەرخات ، یاخود هەندێکی تریان پێیان وایە کە بەگوێرەی دابو نەریتی ئەو گەلە بە دەرەوەیە .

هەروەك پێمان گەیشتووە کە زۆرینەی زانایان لەسەر رای دووەمن ، لە (ابن عباس) ە وە ئەگێڕنەوە کە لە ڕاڤەی (مَا ظَهَرَ مِنْهَا) فەرموویەتی : مەبەست کلی چاوو مستیلەیە ، بەهەمان شێوەشە لە ئەنەسەوە گێڕدراوەتەوە.

رێگەدان بە کلو مستیلە واپێویست ئەکات کە جێگەکەشیان دەربخرێ کە دەم و چاوو دەستەکانن ، ئەمەش بەراشکاویی لە سعیدی کوڕی جبیرو عەتاو ئەوزاعی و کەسانی ترەوە هاتووە.

وە لە عائیشەو قتادەوە" بازنیشیان خستووەتە پاڵ (مَا ظَهَرَ مِنْهَا)، واتە: هەندێ لەمەچەکیش جیاکراوەتەوە کە دەرخستنی دروست نیە، بەڵام زانایان رایان جیاوازە لە ئەندازەی ئەو بەشەی لەمەچەك دروست نییە دەربکەوێ کە ئایا ئەندازەی مستێکە یاخود نیوەی مەچەکە.

هەر لەبەرامبەر ئەم فراوانخوازییەدا تەسکگیری کۆمەڵێکی دی هەن وەکو عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودی نەغەعی کە ڕاڤەی (مَا ظَهَرَ مِنْهَا) یان بەجلو بەرگێك لێکداوەتەوە بەجلی رووکاری دەرەوە، کە لە توانادا نییە بپۆشرێ.

بەڵام ئەوەی لای من – واتە د . یوسف قرضاوی – پەسەندترین رایان بێت و لە هەموویان سەنگین تربێت ئەوەیە کە ڕاڤەی (مَا ظَهَرَ مِنْهَا) بەم جۆرە بکرێ " کە

مەبەست پێی دەستو دەمو چاوو ئەم جوانكارییانەی بۆ ئەم دوو شوێنە ئەنجام ئەدرێن وەكو كل بۆ چاوو مستیلە بۆ پەنجە كەكۆمەڵێكی زۆرن لە هاوەڵان و شوێنكەوتوان ئەم رایەیان هەیە[1].

ئەمەو بەپێچەوانەی ئەو هۆكاری جوانكارییانەی ئەمرۆ كە بەكاردێ وەكو كەل و پەلی ئارایشت بۆ دەمو چاوو لێوان و ئەو جۆرە شوێنانە، كە بریتین لە رۆچوون لەكاری نادروستدا، ئەمانە تەنها بۆ ناومالْ دروستن، بەلاّم ئەوانەی ئافرەتانی ئەمرۆ بەكاری دێنن بۆ جوانكاری لەكاتی چوونە دەرەوەدا بۆ سەرنج راكێشانی پیاوان ، دیارە ئەمە نادروستەو ناڕەوایە، بەلاّم راڤەی (مَا ظَهَرَ مِنْهَـا) بە جل و بەرگ و پۆشاكی دەرەوە ناگونجێ و دروست نییە، چونكە ئەوە شتێكی سروشتییەو قەدەغە ناكرێ تاجیا بكرێتەوە، بەهەمان شێوەشە راڤە كردنی بەو جێگایانەی كە رەشەباو هاوچەشنی‌دەریبخات لەهەندێ حاڵەتی پێویستدا، چونكە ئەمە لەو حالاّتانەیە كە جێگەی فێڵی تیادا نابێتەوە، ئیتر ئایا جیا بكرێتەوە یان نا، دیارە رێگە دراوە بەئافرەتانی باوەڕدار كە ئاسانكارییەكیان بۆ ئەنجام بدرێ لە خۆداپۆشینەكەیاندا ، ئەویش بەدەرخستنی دەمو چاوو دەستەكان.

بەلاّم چاوپۆشی كردنی ئیسلام لەداپۆشینی دەستو دەمو چاو، لەبەر ئەوەیە كە ناڕەحەتی‌و بارگرانی بۆ ئافرەت دروست ئەكات، بەتایبەتی گەر پێویستی بەچوونە دەرەوەی رەواو دروست هەبێت، وەك بێوەژن بۆ دابینكردنی پێداویستی مناڵە بێ باوكەكانی، یاخود ئافرەتێكە یارمەتی هاوسەرە هەژارەكەی ئەدات، لەم حاڵەتانە پێویست كردنی داپۆشینی دەستو دەموچاوو لەسەری، ناڕەحەتی بۆ ئەو ئافرەتە دێنێتە بوون.

(القرطبي) ئەفەرموێ: لەبەرئەوەی دەست دەمو چاو لەزۆر كاتدا بە دەرەوەن لەناو پەرتشیشدا وەكو كاتی نوێژكرن‌و حەجكردن، ئەگونجێ ئەو جیا كردنەوەیە مەبەستی ئەوان بێت، بەڵگەش بۆ ئەمە ئەو گێڕانەوەیە (ابو داود) لە (عائیشە)ە وە كە ئەسمائی كچی ئەبوبەكر هاتووەتە ژوورەوە بۆلای پێغەمبەر ﷺ كراسێكی تەنكی لەبەردا بووە، پێغەمبەریش ﷺ ناڕەزایی دەربڕی و پێی فەرموو: ئەی ئەسما! ئافرەت كە تەمەنی مناڵی تێپەڕاد ، دروست نییە هیچ بەشێك لە جەستەی ببینرێ، تەنها ئەمەو ئەمە نەبێت ـ بەدەستی ئاماژەی بۆ دەستو دەمو چاوی كرد ـ.

---

[1] ئەمە دەستنیشانكراوی الطبري و الزمخشري و الرازي و هەندێكی تر لە راڤەكارانن كەئەتوانی بگەڕێتەوە سەر راڤەی سوورەتی (النور) لە راڤەكانی ئەم زانا پێشەوایانە.

وە لەفەرموودەکەی خوای گەورەدا هاتووە: ﴿ قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ ﴾ ئەم ئایەتە پیرۆزە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە دەمو چاوی ئافرەت دانەپۆشراوە ، چونکە ئەگەر داپۆشراو بووایە، ئەوا هیچ بوارێك نەدەڕەخسا بۆ پاراستنی چاوو لەئاستیاندا، چونکە هیچ بەشێك لە جەستەی دیار نییە تاوەکو چاوی لێ بپارێزێ .

بەلاَم لەگەڵ ئەمەشدا باشتر وایە ئافرەتی موسوڵمان هەوڵ بدات بۆ خۆداپۆشینی بەچاکترین شێوە بەپێی توانا، چونکە سەردەمی هەنووکە چەرخی بلاَو بوونەوەی بەد رەوشتیو خراپەکارییە، بەتایبەت ئەگەر ئەو ئافرەتە جوان بێت، ئەوا پێویستە زیاتر ئاگاداری بالاَ پۆشییەکەی بکات.

ب ـ ﴿ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ ﴾ النور: ٣١ الخمر: کۆی (الخمار)ە ، واتە: ئەو پۆشەرەی سەردائەپۆشێ . الجيوب: کۆی (جيب)ە کە بریتیە لە یەخەی کراوەی کراس.

واپێویستە لەسەر ئافرەتی موسوڵمان کە سەری بە سەرپۆشەکەی بپۆشێ ، یاخود بەهەر شتێکیتر بووبێت، وەهەر بەوەی سەری پێ ئەپۆشێ، گەردنو سینگو بەرۆکیشی بپۆشێو، هیچ کام لەم ئەندامانەی لەشی بۆ پیاوی بێگانە دەرنەخات لەکاتی هاتوچۆ کردندا.

ج ـ ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ آبَائِهِنَّ ﴾ النور:٣١ واتە: با ئافرەتان جوانی خۆیان دەرنەخەن مەگەر بۆ هاوسەر یاخود باوکیان.

ئەم ئاڕاستەکردنانە لەئایەتەکەدا رێگریی ئافرەتان ئەکات لەدەرخستنی جوانییە شاراوەکانیان بۆ پیاوی بێگانە، وەکو جوانی گوێو قژو سنگو گەردن و قاچەکانی، لەکاتێکدا رێگەی پێدراوە لەبەردەمیاندا دەستو دەموچاوی دەربخات ( مَا ظَهَرَ مِنْهَا ) .

وەلەم قەدەغەکردنە لەئایەتەکەدا ( ١٢ ) جۆر کەسی لێ جیاکردووەتەوە:

١ ـ (بُعُولَتِهِنَّ) واتە: هاوسەرەکانیان، بۆ هاوسەر رەوایە تەماشای هەر ئەندامێکی جەستەی خێزانی بکات، واتە (ژنەکەی)، بەهەمان شێوەشە بۆ ئافرەت رەوایە لە فەرموودەکەدا هاتووە : ( احفظ عورتك الا من زوجتك ).

٢ ـ (آبَاؤهِنَّ) واتە: باوان کە باپیرانیش چ لەلایەن باوکەوەبێت یان دایك.

٣ـ (آباء أزواجهن) واتە: باوانی هاوسەرەکانیان.

٤ ـ (أَبْنَائِهِنَّ) واتە: جگەر گۆشەکانیان لە کوڕو کچ.

٥ـ (ابناء أزواجهن) بەهەمان شێوە کوڕی هاوسەرەکانیشیان ئەگرێتەوە کە لە ژنێکی ترن چونکە ئەم ئافرەتانەی باوەژنیانە، جێگەی دایکیانی گرتووەتەوە لەماڵدا.

٦ ـ (إِخْوَانِهِنَّ ) براکانیان، ئیتر ئایا برای دایكو باوکی بێت، یاخود برا لەدایکەوە یان باوکەوە.

٧ ـ (بَنِو إِخْوَانِهِنَّ) واتە: برازاکانیان ، چونکە پیاو لەگەڵ پووری خۆیدا حەرامی هەتا هەتایین.

٨ . (بَنِو أَخَــوَاتِهِنَّ) واتە: خوشکەزاکانیان، چونکە پیاو لەگەڵ خوشکی دایکیدا حەرامی تاهەتا هەتاهین.

٩ ـ (نِسَــائِهِنَّ): خێزانەکانیان ، واتە: ئەوانەی باسمان کرد، ئیتر ئایا لە رەچەڵەکەوە بێت یاخود لەئایینەوە بێت. بەڵام بۆ ئافرەتی ناموسوڵمان دروست نییە کە جوانی ئافرەتی موسوڵمان ببینێ، تەنها ئەو جێگایانە نەبێت کە بۆ پیاو رەوایە دیارە ئەمەش دروست ترین رایە.

١٠ ـ (وَمَــا مَلَكَـــتْ أَيْمَــانُهُنَّ) واتە: بەندەو کەنیزەکەکانیان، چونکە بە ئەندامێکی ئەو خێزانەی گێڕاون، کەهەندێ تەنها بۆ کەنزیەکەکان رەوایە نەك بۆ نێرینەکان.

١١ ـ (التَّابِعِونَ غَيْرِ أُوْلِي الْإِرْبَةِ مِنَ الرِّجَالِ) واتە: ئەو رەنجبەرو پیاوانەی کە بە هیچ جۆری ئارەزووی سێکسیان تیادا نەماوە لەبەرهۆی جەستەیی یاخود ژیریی بێت، گرنگ ئەوەیە ئەم دوو خاڵە هاتبێتە دی:

ا ـ ناچاریی‌و تێکەڵی لەگەڵ ئەو ماڵەدا.

ب ـ لەدەست دانی ئارەزووی سێکسی یاخود بڵێین زایەندی.

١٢ ـ(الطِّفْلِ الَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا عَلَى عَوْرَاتِ النِّسَاءِ) واتە: ئەو جگەرگۆشەو مناڵە نێرینانەی هێشتا ئارەزووی سێکسیان هەست پێنەکردووە، بەڵام گەر ئەم هەستە زایەندییەیان تیادا بەدی کرا، ئەوا بۆ ئافرەتی موسوڵمان رەوانییە کە جوانی شاراوەی خۆی لەبەردەم ئەم جۆرە منالانەشدا دەربخات، تەنانەت ئەگەر تەمەنی منالیشیان تێنەپەڕاندبێ.

ئایەتەکە ئامـاژەی بـە مـامو خـاڵ نـەکردووە، چـونکە بـە گـوێرەی داب‌و نەریت، ئەو دوو بەشە لەجێگەی باواندان، لە فەرموودەکەدا هاتووە (عم الرجل صنو ابيه) [1] واتە: مامی مرۆڤ برای باوکییەتی.

---

[1] رواه مسلم ، ت: ١٨٩.

## شـەرمگای ئـافرەت

لە ڕوونکردنەوەکانی پێشترەوە بۆمان دەرکەوت کەهەموو ئەو ئەندامانەی جەستەی ئافرەت کە دروست نییە دەریان بخات، ئەوا (عورە) یاخود بڵێین شەرمگایەو پێویستە داپۆشراوبن.

بۆیە شەرمگای ئافرەت بەرامبەر پیاوی بێگانەو ئافرەتانی نا موسوڵمانیش ، هەموو جەستەیەتی جگە لەدەستو دەموچاوی لەسەر ئەوانەی هەڵمان بژاردوون، ئەگەر وەکو پێشەوا (رازی) ئەفەرموێ: لەکاتی پێویستدا ڕێگەی پێدرا بەدەرخستنیان وەکو پێویست کردنیان لەمامەڵەو وەرگرتنو بەخشیندا، بۆیە فەرمانیان پێ کراوە ئەو ئەندامانەی پێویستیان نەکرد دایان بپۆشین، بەلاّم ئەوەی بەگوێرەی دابو نەریت ناچارە بەدەرەوە بێت، وەکو دەستو دەمو چاو، ئەوا دروستە بەدەرەوە بن، چونکە بەرنامەی ئیسلام ئاینێکی پاکیزو لێبوردەیە، پێشەوا (رازی) ئەفەرموێ: لەبەرئەوەی دەرخستنی دەستو دەموچاو پێویستن بۆیە بەشەرمگا نادرێتە قەڵەم، بەلاّم پێیەکان لەبەر ئەوەی پێویست ناکات بۆیە زانایان رایان جیاوازە لەسەر ئەوەی کەپێیەکانی ئافرەت شەرمگان یاخود نا؟ [٢].

شەرمگای ئافرەت لەئاستی ئەو (١٢) گروپەدا کەپێشتر باسمان کرد بریتییە لەو ئەندامانەی کە لەناوەوەن، وەکو گوێیەکان و گەردن و قژو سنگو قۆڵەکان و پوزەکانیان، چونکە ئەم ئەندامانەی جەستەی لەئاستی ئەوانەدا بە شەرمگا دانانرێتو دروستە لەلایەنیانەوە ببینرێن.

بەلاّم بەدەر لەم ئەندامانە وەك پشتو سكو هەردوو شەرمگاو رانەکان ئەوا هەرگیز دروست نییە دەربخرێن نە بۆ ئافرەت نە بۆ پیاو تەنها هاوسەری نەبێ.

ئەوەی لەئایەتەکەوە وەرئەگیرێ، نزیکترە لەوەی کەهەندێ لەپێشەوایان بۆی چوون" کە شەرمگای ئافرەت لەئاستی کەسانی مەحرەمیدا لەنێوەند ناوكو ئەژنۆیە، بەهەمان شێوەشە لەئاستی ئافرەتانی تریشدا، بەڵکو ئەوەی ئایەتەکە ئەبێتە بەڵگە لەسەری، نزیکترە لەوەی کەهەندێ زانایان بۆی چوون، کە شەرمگای ئافرەت بۆ کەسانی مەحرم ئەو ئەندامانەن کە لەکاتی کاروباری ناو ماڵدا پێویست بەدەرکەوتنیان ناکات، بەلاّم ئەوانەی لەکاروباری ناو ماڵدا دەرئەکەون ئەوا دروستە مەحرەمەکان سەیریان بکەن. هەربۆیە خوای گەورە فەرمان بەئافرەتانی

---

[٢] تفسير الفخر الرازي، ج٢٣ ص٢٠٥ ــ ٢٠٦.

باوەڕدار ئەکات کە لەکانی دەرچوونیان لەماڵ بەرگێکی فراوان‌و پۆشراوە خۆیان بپۆشن، تا جیابکرێنەوە لەئافرەتانی بیٚباوەڕو خراپەکاران، وە لەم بارەیەوەخوای گەورە فەرمان دەکات، بەپێغەمبەرەکەی ﷺ کە ئەم بانگەوازە خواییە رابگەیەنیٚ بەگشتی: ﴿ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاء الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ ذَلِكَ أَدْنَى أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ ﴾ الأحزاب ٥٩.

(الجلابيب) کۆی (الجلباب)ە واتە بەرگێکی فراوانی پۆشەر بۆ ئافرەت.

ئەم ئایەتە پیرۆزە لە هەل‌و مەرجێکدا هاتە خوارەوە کە ئافرەتانی سەردەمی نەفامی کاتیٚ لە ماڵ ئەچوونە دەرەوە ئەندامە جوانەکانی جەستەیان دەرئەخشت وەکو مل‌و گەردن‌و قژیان ، بۆیە خراپەکاران دوایان ئەکەوتن بۆ کاری ناپەسەند. لەبەرئەوە ئایەتی ناوبراو هاتە خوارەوە، بۆ ئەوەی بەهۆی پۆشاکەوە باشتر ئەندامە جوانەکانی جەستەی دابپۆشیٚ، نەوەك ئەندامیٚ لەو بەشە ئارەزوو بزوێنانە دەربکەون، تاوەکو بەهۆی فۆرم‌و شێوەی رووی دەرەوەیان بناسرێنەوە کە ئەمانە داوێن پاك‌و بڕوادارن، و بەهیچ جۆرێك ناپاکان دەستی خراپەو ئازار بەخشیان بۆ درێژ نەکەن.

ئاشکرایە کەهۆی هاتنی ئەم ئایەتە لەبارەی بالأپۆشی ئافرەتانەوە، مەترسییە لەدەست درێژکردنە سەریان لەلایەن ناپاکانەوە، نەك مەترسی بێت لە خودی ئافرەتان یاخود ئیسلام متمانەیان پیٚ ئەکات . هەروەك هەندیٚ کەس پڕو پاگەندە ئەکەن . چونکە بێگومان ئافرەتی زیادەڕەو لەدەرخستنی جوانی یا پۆشاکیدا، یاخود رۆشتنێکی بە لەنجەولار بۆ خۆی بسازێنیٚ، یاخود لەکاتی وت‌ووێژدا دەنگی خۆی بەرەو سەرنج راکێشانی پیاو ئاراستە بکا، بەجۆریٚ هەمیشە سەرنجی پیاو بەلای خۆیدا رابکێشیٚ، ئەمەش بەخشینی مصداقییەتە بە ئایەتەکە کە ئەفەرمویٚ: ﴿ فَلَا تَخْضَعْنَ بِالْقَوْلِ فَيَطْمَعَ الَّذِي فِي قَلْبِهِ مَرَضٌ ﴾ الأحزاب: ٣٢

بەڕاستی ئیسلام زۆر بەبایەخەوە بۆ مەسەلەی بالأپۆشی ئافرەتی روانیووەو بەهیچ جۆریٚ رێگەی نەداوە بەخۆدەرخستن لەهەندیٚ بارودۆخی کەمدا نەبیٚ ئەویش بۆ ئاسانکارییە، لەسەر ئافرەتانی بەتەمەن‌و بیٚ دەستەلأت کەمێك فرمانەکە سووك کراوەتەوە، ئەوەتا خوای گەورە ئەفەرمویٚ: ﴿ وَالْقَوَاعِدُ مِنَ النِّسَاء اللَّاتِي لَا يَرْجُونَ نِكَاحًا فَلَيْسَ عَلَيْهِنَّ جُنَاحٌ أَن يَضَعْنَ ثِيَابَهُنَّ غَيْرَ مُتَبَرِّجَاتٍ بِزِينَةٍ وَأَن يَسْتَعْفِفْنَ خَيْرٌ لَّهُنَّ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ {٦٠} ﴾ النور.

مەبەست لە ( الْقَوَاعِدُ مِنَ النِّسَــاء ) ئەو ئافرەتانەیە توانای فسیۆلۆژییان نەماوە بۆ خستنەوەی کۆرپەو لەخولی مانگانە بیٰ ئومێد بوون لەبەر تێپەڕاندنی تەمەنێکی زۆر ئومێدی خێزانداریییان لەگەڵدا ناکرێت‌و سەرنجی پیاوان راناکێشن . بۆیە ئەو ئافرەتانە خوای گەورە کارەکەی لەسەر ئاسانتر کردوون، وە رێگەی پێداون کە هەندیٰ جل‌و بەرگی دەرەوەیان دابنێن وەکو سەرتاپۆشن‌و عەباو سەرپۆش‌و ئەو جۆرە بەرگانە.

بەلاٌم قورئان ئەم رێگەپێدانە بەمەرجێکەوە بەستووە کە ئەفەرموویٰ: ﴿ غَيْرَ مُتَبَرِّجَاتٍ بِزِينَةٍ ﴾ واتە: ئەم دانانی جل‌وبەرگانە مەبەستدار نەبێت، و لەکاتێکدا بێت کە پێویستیان پێیەتی

## چوونی ئافرەتان بۆ گەرماوە گشتییەکان

لەگەڵ ئەم رێگە پێدانەشدا، باشتروایە بۆیان کە هەر داپۆشراو بن‌و لە هەموو پڕو پاگەندەیەك بەدوور بن ﴿ وَأَن يَسْتَعْفِفْنَ خَيْرٌ لَّهُــنَّ ﴾ لەپێناو بایەخدانی ئیسلام بەپاراستنی شەرمگاو داپۆشینی ، پێغەمبەر ﷺ ئاگاداری ئافرەتانی کردووە لە چوونە ناو گەرماوە گشتییەکانداو دەرخستنی جەستە لەبەر چاوی ئافرەتانی تر، لەبەر چاوی ئەو ئافرەتانەی کە هەمیشە خەریکی باسکردنی جەستەی ئافرەتانی ترن‌و ئەیکەنە خاڵی باسکردنی دانیشتنەکانیان‌و بنێشتە خۆشەی ژێردانیان.

بەهەمان شێوەشە پێغەمبەر ﷺ پیاوانیشی لەچوونە ناو ئەو گەرماوە گشتیانە ئاگادار کردووەتەوە، مەگەر بەجۆرێك بێت شەرمگای خۆی پۆشێت لەبەر چاوی پیاوانی تر، بۆیە لەجابرەوە لەپێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی: ( من كان يؤمن بالله واليوم الآخر ، فلا يدخل الحمام الا بمئزر ، ومن كان يؤمن بالله واليوم الآخر فَلا تدخل حليلته الحمام )[1]. واتە: ئەوەی باوەڕی بەخواو رۆژی دوایی هەیە بابەبیٰ پۆشەرێکی شەرمگای نەچێتە گەرماوی گشتییەوە، وەئەو کەسەشی باوەڕی بەخواو رۆژی دوایی هەیە بانەهێڵێت خێزانەکەی بچێتە گەرماوی گشتی.

لە عائیشەوە: ( أن رسول الله ﷺ نهى عن دخول الحمامات ثم رخص للرجــال أن يدخلواها بالمآزر)[2]. واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ رێگریی کردووە لەچوونە ناو گەرماوە

---

[1] قال المنذري : رواه النسائي والترمذي وحسنه ،والحاكم وقال صحيح على شرط مسلم (ترغيب) ، ت: ١٩٠ .
[2] رواه ابوداود ولم يضعفه، واللفظ له ، والترمذي وابن ماجه، وفي اسناده راو غير مشهور (ترغيب) ت: ١٩١.

گشتییەکان ، پاشان ڕێگەی بەپیاوان داوە بەمەرجێ پەشتەماڵ بەکار بهێنن ، بۆ داپۆشینی شەرمگایان .

بەڵام لە هەندێ حاڵەتی پێویستدا ئەو ڕێگرییەی نەکردووە، لەکاتێکدا ئافرەتەکە بۆ چارەسەری نەخۆشی یان لەبەر زەیستانی بچێتە گەرماوی گشتی، بۆیە لەعەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە پێغەمبەر ﷺ لەبارەی ئەو گەرماوانەوە فەرموویەتی: ( فَلا يَدخُلَها الرِّجال إلاّ بمِئزَر، وامْنَعُوا النِّساء إلاّ مَريضٌ أو نَفْسَاء)[1] واتە : نابێت پیاوان بچنە گەرماوی گشتییەوە مەگەر بە پەشتەماڵەوە بچن، وەنەهێڵن ئافرەتان بچێتە ئەو گەرماوانە مەگەر لەبەر نەخۆشی یاخود زەیستانی.

لە سەنەدی فەرموودەکەدا لاوازییەك بەدی ئەکرێت، بەڵام یاساکانی شەرع ڕێگە ئەدات بەنەخۆش و ئاسانکاریی بۆ ئەنجام ئەدات لە پەرستش و واجباتداو بەهێزی ئەکات و پاڵپشتی ئەکات، هەروەك ئەصلە مەشهوورەکە گەواهی لەسەر ئەدات کە لەبەر بڵاوبوونەوەی خراپە قەدەغەکراوە، بەڵام گەر بۆ بەرژەوەندیی بێت ئەوا ڕێگەی پێ ئەدرێ. بەهەمان شێوە گێڕانەوەیەکی دی پاڵپشتی ئەکات، ئەویش لە عەبدوڵڵای کوڕی عەباسەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( إتَّقُوا بَيتًا يُقالُ لَهُ الحُمّام ، قَالُوا : يارَسُولَ الله ! إنَّهُ يُذْهِبُ الدَرَنَ وَيَنْفَعُ المَرِيْضَ ، قَالَ: فَمَن دَخَلَ فَلْيَسْتَتِر)[2].

واتە : خۆتان بپارێزن لەچوون بۆ ئەو شوێنەی پێی ئەوترێ گەرماو وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەوە ناپاکی جەستە لا ئەبات و نەخۆشی ناهێڵێ ، پاشان فەرمووی: هەرکەسێ چوو باخۆی داپۆشێ.

واتە ئەگەر ئافرەت بەبێ هیچ پاساوێك یاخود پێویستیەك چوو بۆ گەرماوی گشتی ئەوا حەرامێکی ئەنجامداوە، وەشیاوی ئەو هەڕەشەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبێت کە (أبو المليح الهذلي) گێڕاویەتیەوە کەچەند ئافرەتێکی (حمص) یان (شام) چوون بۆ لای (عائیشە) ئەویش لێی پرسین: ئێوە ئافرەتانتان ئەچنە گەرماوی گشتی؟ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستوومە کە ئەیفەرموو: ( ما مِنْ إمرَأة تَضَعُ ثِيابَها في غَيرِ بَيتِ زَوجِها إلاّ هَتَكَتْ السِّتر بَينَها وَبَيْنَ رَبِّها)[3] واتە: هەر ئافرەتێك بەرگی لە جگە لەماڵی هاوسەرەکەیدا لاببات، ئەوا ئەو سەترەی شکاندووە کە لە نێوان ئەو پەروەردگاردا هەیە.

---

[1] / رواه ابن ماجه وابوداود في اسناده عبدالرحمن بن زيادة بن انعم الافريقي ت: ١٩٢

[2] / رواه الحاكم وقال صحيح على شرط مسلم ولم يعقب عليه المنذري في الترغيب ، ت: ١٩٣.

[3] / رواه الترمذي واللفظ له، وقال حديث حسن، وابوداود وابن ماجه والحاكم وقال صحيح على شرطها وفي الترغيب . ت : ١٩٤.

وه له (ام سلمه)ه وه پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( أَيّما إمرَأة نَزَعَت ثِيابَهــا في غَيرِ بَيتِها فَرَّقَ الله عَنها سِترَهُ)[1]. واتە: هەر ئافرەتێك پۆشاكی لەجگە لەماڵی خۆیدا دابكەنێ ، ئەوا خوای گەورە ستری خۆی لەسەر لەت ئەكا.

ئەگەر ئیسلام بەگرنگییەوە بڕوانێتە چوونی ئافرەت بۆ گەرماوێك كە لەچوار دیوار پێكهاتووەو جگە لە ئافرەتیش كەسی تری تێناچێ، ئەی ئاخۆ هەڵوێستی ئیسلام چۆن بێت دەربارەی ئەو ئافرەتانەی كەبەبێ هیچ جۆرە بەرگێك جەستەی خۆیان ئەخەنە ڕوو لەسەر كەناری دەریاكان (البلاجــات) بۆ بەرچاوی كەسانی بەدڕەوشت و خراپەكار، ئەوانەی ئاگری ئارەزووە سێكسیەكان تەنگی پێ هەڵچنیوون ؟!

بەڵام ئەو ئافرەتانە هەمووشتێكی نێوەند خۆیان و پەروەردگاریان ژاكاندووەو پیاوانیشیان هاوبەشیانن لەو خراپەكارییەدا، چونكە چاودێرو لێپرسراویانن، گەر بزانن !

## ( التبرج ) خۆپیشاندان و دەرخستنی ئافرەت بۆ پیاوان قەدەغەیە

ئافرەتی موسوڵمان ڕەوشتێكی هەیە لە ئافرەتی بێباوەڕ یاخود ئافرەتی نەفامی لێ جیائەكاتەوە، لەو ڕەوشتانەش، خۆپارێزیو داپۆشراویو داوێن پاكیو شەرمە.

بەڵام ئافرەتانی تێنەگەیشتوو ڕەوشتی بریتیە لەخۆدەرخستن و سەرنج ڕاكێشانی ڕەگەزی بەرامبەر بەشێوەیەكی نادروست، مانای (التــبرج) واتە دەرخستن و نیشاندان بۆ بەرچاوان كاتێكیش لەقورئاندا هاتووە (بروج مشيدة) ئەمەش لەبەر بەرزی و بەدرەویی بەرچاوی بینەراندا، الزمخشري: ڕاستی (تبرج) زۆركردنە لە دەرخستنی ئەو ئەندامانەی كەپێویستە داپۆشراوبن، عەرەب ئەڵێت: (سفينة بارج) واتە كەشتییەكی سەر دانەپۆشراو ... ئەگەر تایبەت بێت بە دەرخستنی ئافرەتەوە بۆ بەرچاوی پیاوان بەدەرخستنی جوانییەكانیان ، هەروەها (الزمخشري) بنەڕەتێكی نوێتر بۆ سەر ماناكە زیاد ئەكات ، ئەویش زۆر لەخۆ كردن و مەبەستە لەدەرخستنی ئەو ئەندامانەی كەپێویستە داپۆشراوبن، هەندێ جار ئەوەی پێویستە داپۆشراوبێ ڕەنگی نەداوەتەوە لەجەستەیدا، یاخود جووڵەی ئەندامێكی، یاخود شێوازی گفتوگۆكردن یان ڕۆشتن، یا كەرەستەیەكی جوانكاریی ئافرەتان یاخود پۆشاكێك بێت كە ئەیپۆشێ یاخود هەر شتێكی تری لەو بابەتانە.

---

[1] / رواه احمد وابويعلى والطبراني والحاكم (ترغيب) ، ت: ١٩٥.

خۆنواندن خۆدەرخستنی ئافرەت شێوازو مەبەستی زۆری هەیە، مرۆڤ لە سەردەمی کۆن و نوێدا ناسیونی، وەزانایانی راڤەکاری قورئان (مفسرون) لە راڤەی ئەم ئایەتەدا هەندێکیان باس کردوون ﴿وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَى﴾ الأحزاب : ٣٢.

مجاهد ئەفەرموێ: لەسەردەمی نەفامیدا ئافرەتان ئەچوونە دەرەوەو بەناو پیاواندا ئەرۆیشتن و رائەبوران.

وه مقاتل ئەفەرموێ: (التبرج) واتە سەرپۆشێك بەکراوەیی ئەدات بەسەریدا مل و گەردن و گەردانەو ئەم جۆرە شتانە دەرئەخات . ئەمە جۆرێکە لە خۆ دەرخستنی نەفامی کۆن " تێکەڵ بوون بەپیاوان ... لەنجەولاری رۆشتن ... سەر پۆشین بەجۆرێ کە جوانیانی تیادا دیاربووە ، ئەمەش شێوازێك بووە لەخۆ دەرخستنی سەردەمە نەفامییەکان کە بە (تبرج الجاهلية) ناوزەدە کراوە.

## ئەو خالانەی ئافرەت لە سنووری خۆدەرخستندا ناهێڵێتەوە:

چەند خاڵێك هەیە پێویستە ئافرەتی موسوڵمان پابەندیان بێت هەتا وەکو لە سنووری (تبرج) بچێتە دەرەوە لەو خالانەش:

أ ـ (غَضُ البَصَرْ) واتە چاوپاراستن: بێگومان بە ئەرزشترین خشڵ بۆ ئافرەت شەرمەو دیارترین ئەدرەس شەرمیش چاوپاراستنە، خوای گەورە ئەفەرموێ : ﴿ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ ﴾.

ب ـ تێکەڵ نەبوونی نادروست، هەروەك ئەوەی لە سینەماو کافتریای زانکۆو هۆڵی وانە وتنەوەکان و هۆیەکانی گواستنەوەدا روو ئەدات. لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئەفەرموێ : (لأن يُطْعَنَ في رَأسِ أحَدِكُم بِمَخيطٍ مِنْ حَديد، خَيْرٌ لَهُ مِنْ أن يَمَسَّ إمرَأة لا تَحِلُّ لَهُ )[1].

ت ـ پێویستە پۆشاکی ئافرەت پۆشاکێکی پەسەند کراوبێ لەلایەن بەرنامەی ئیسلامەوە، وەپۆشاکی دروست و رێگەپێدراو بۆ ئافرەت لەلایەن ئیسلامەوە، ئەوەیە کە ئەم سیفەتانەی تیادابێت:

١. پێویستە هەموو جەستەی ئافرەت دابپۆشێ، تەنها ئەو جێگایانە نەبێت کە لەقورئاندا هاتووە (مَا ظَهَرَ مِنْهَا) و پەسەندترین را لەسەر ئەم ئایەتە ئەوەیە کە مەبەست هەردوو دەست و دەم و چاوە.

---

[1] قال المنذري: رواته الطبراني والبهقي، ورجال الطبراني ثقات، رجال الصحيح ، ت: ١٩٦.

٢. پێویستە تەنك نەبێت کەبەجۆرێ بێ جەستەی تیادا ببینرێ لەبەرئەوەی پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوە: ( إنَّ منْ أَهْلِ النار نساء كاسياتٌ عَارياتٌ مَائلاتٌ مُمْيلات ... لا يَدْخُلنَ الجَنة وَلا يَجْدنَ رِيحَها )[1]. واتە: بێگومان لە دانیشتوانی ئاگرو دۆزەخ ئافرەتانێکن کە بەناو بەرگیان لەبەردایە کەچی رووتن، لەبەر ئەوەی جل و بەرگەکانیان هێند تەنکن کاری داپۆشین جێبەجێ ناکەن ئەو ئافرەتانە ناچنە بەهەشتو تەنانەت بۆنیشی ناکەن ) .

هەندێ لەئافرەتانی بەنی تەمیم رۆشتن بۆ لای عائیشە لەکاتێکدا بەرگێکی تەنکیان لەبەردابوو، بۆیە خاتوو عائیشە پێی فەرموون: ئەگەر ئێوە موسوڵمانن، ئەوا ئەو بەرگانەی بەرتان بەرگی ئافرەتی موسوڵمان نییە)[2].

وەجارێکیتر بوکێکیان هێنا بۆلای حەزرەتی عائیشە کە سەرپۆشێکی تەنك و ناسکی پۆشیبوو، پاشان فەرمووی: ئەو ئافرەتەی بەرگی لەو چەشنە بپۆشێ ، ئەوا باوەڕی بە سوورەتی (النور) نییە.

٣. بەشەکانی جەستەی ئافرەتەکە دیاری نەکاتو جێگەی سەرنج راکێشەرەکان دەرنەخات باتەنکیش نەبێت، لەو جۆرە پۆشاکانە کە ژیاری رۆژئاوایی شانازی پێوە ئەکات، ئەم جۆرە بەرگانەی کە بەسەرنج راکێشەکانی جەستەی ئافرەت دەرئەخەنو ئەبنە بزوێنەری ئارەزووە سێکسیەکان، ئەو ئافرەتانەی ئەمانە خەصڵەتی پۆشاکیان بێ ئەوا بە پۆشتەیی رووت ناوزەدە ئەکرێن ، کە ئەمانە لە جلوبەرگی تەنگ زیاتر سەرنجی نادروستی رائەکێشن.

٤. ئەبێ ئەو بەرگانە تایبەت نەبن بەپیاوەوە، وەکو پانتۆڵ لە سەردەمی ئەمڕۆماندا، دیارە ئەمەش بۆ ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ نەفرەتی کردووە لەو ئافرەتانەی لە روخسارو جلو بەرگدا لاسایی ئافرەت ئەکەنەوە. وە لەبەر کردنی جلو بەرگی پیاوانی لەلایەن ئافرەتەوە یاساغ کردووە. هەروەك یاساغی لەبەر کردنی پۆشاکی ئافرەتانیشی لەلایەن پیاوانەوە کردووە.

٥. پێویستە جۆرە پۆشاکێك نەبێت کەتایبەتی ئافرەتانی ناموسوڵمان و مەسیحی و جوولەکەو بتپەرستان بێ، چونکە مەبەستی لێکچوون لەگەڵ ئەو ئافرەتە

---

[1] / ت : ١٩٧ الملحق

[2] / ت : ١/١٩٨.

ناموسـڵمانەدا لەکاتێکدایـە کـە ئیسـلام داوای ئـەوە ئـەکات چ ئافرەتـان و چ پیاوانی موسوڵمان لە رووخسارو ناوەڕۆکدا خاڵی جیاکردنەوەی خۆیان بن.

لەبەرئەوەی پێغەمبەر ﷺ داوای لێکردووین کە لەزۆر حاڵەتدا لەبێ بڕوایان جیاواز بن و ئەفەرموێ: ( مَنْ تَشَبَّهَ بِقَوْمٍ فَهُوَ مِنْهُمْ )[1].

٦. پێویسـتە ئـافرەتی بـاوەڕدار پابەنـدیو سـەنگینیو جێگیریـی بێـت لـەکاتی رۆشتنو قسەکردنداو دوور بکەوێتەوە لەهـەر کـردارو گوفتارێكو جوڵەیەکدا بەجەستەو رووخساری کە سەرنجی پیاوان رابکێشێ، چونکە لەنجە کـردنو خۆ ناسککردنەوە لەرەفتاری ئافرەتانی خراپـەکارە، نـەك ئافرەتـانی بـاوەڕدار موسڵمان ، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿ فَلَا تَخْضَعْنَ بِالْقَوْلِ فَيَطْمَعَ الَّذِي فِي قَلْبِـهِ مَرَضٌ ﴾ الأحزاب : ٣٢.

ھ. پێویسـتە کـارێکی وەهـا نـەکات کـە سـەرەنجی پیـاو بـۆ ئەندامـە شـاراوەکانی رابکێشێ بەهۆی سەرنج ڕاکێشەوە یان هەرشتێکیتر. خوای گـەورە ئەفـەرموێ: ﴿ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ ﴾ النـور:٣١. لەبـەر ئـەوەی ئافرەتـانی سـەردەمی نـەفامی کاتێـك بـەناو خەڵکیـدا رائـەبورن پێیـەکانیان ئەدا بەزەویـدا، تاوەکو زرنگەی پاوانەکانیان بهاتایە ، بۆیە قورئانی پیرۆز ئەمـەی قەدەغـە کـرد، چـونکە ئـەو رەفتـارە ئەبێتـە هـۆی جوڵانـدنی خـەیاڵو هەسـتی پیـاو بـەدیوی نێگەتیفداو، بـەرەو لای ئـارەزووە سێکسـییەکانی ئەباتـەوە، چـونکە ئـەم خرنگـە خرنگـەی پاوانـە بەڵگەیـە لەسـەر نادروسـتی نییـەتی دڵـی ئـەو ئافرەتـە رێبـوارە تاوەکو پیاوان ئاوڕ بۆ خۆیی و جوانییەکانی بدەنەوە.

بێگومـان ئەوانـەی ئـەو ئافرەتانـە ئـەنجامی ئـەدەن لەبـەرکارهێنانی بـۆنی خۆش و سەرنج ڕاکێش بـۆ بزاوندنی ئـارەزووی ئاگـاهیی پیـاو، لەفەرموودەیەکدا هـاتووە: ( المرأة إذا إسْتَعْطَرَت فَمَرَّتْ بالَمجْلس فَهِيَ كَذا وَكَذا - يَعْنـي زَانِيـةً )[2]. واتـە: ئافرەت کاتێ خـۆی بۆنخـۆش کـردو بـەناو کەسـانێکدا تێپـەڕی ئـەوا ئـاواو ئاوایـە، واتە: بەدڕەوشتە بەو مانایەی زینای کردووە.

لەمـەوە بۆمـان دەردەکـەوێ کـە ئیسـلام بەنـدکردنی لـەنێو چـوار دیـواری ماڵـەوەدا نەسـەپاندووە بەسـەر ئافرەتانـدا، بـەجۆرێ بـۆ گۆڕسـتان نـەبێ بـۆ هـیچ

---

[1] / ت: ١٩٨
[2] / قال المنذري: رواه اوداود والترمذي وقال: حديث حسن صحيح ، ت: ١٩٩.

جێگەیەکی تر نەچێتە دەرەوە، بەڵکو ڕێگەی داوە بەچوونە دەرەوەی بۆ نوێژو دابینکردنی پێداویستیەکانی ، یاخود هەر مەبەستێکی ئایینی یان دونیایی درووست.

وەك ئەوەی خێزانی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ ئەوانەی پاش خۆشیان ئەنجامیان ئەدا ئەو ئافرەتانە تیایاندابووە بۆ بەشداری کردن و غەزوە شەڕەکاندا لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ یاخود لەگەڵ خەلیفە سەردارانی موسوڵمانانی پاش پێغەمبەر ﷺ بەخێزانەکەی (سودە)ی فەرموو: (قَدْ أذِنَ اللهُ لكنَّ أنْ تَخْرُجْنَ لِحَوائِجِكُنَّ)[1]. واتە: خوای گەورە ڕێگەی پێداون کە بۆ جێبەجێ کردنی پێداویستیەکانتان بچنە دەرەوە، هەروەها فەرمووی: (إذا إسْتَأذَنَت إمَرأة أحَدِكُم الى المَسْجِد فَلا يَمْنَعها)[2]. واتە : ئەگەر خێزانی یەکێك لەئێوە چووە دەرەوە بۆ مزگەوت، ئەوا ڕێگری مەکەن، وە لە فەرموودەیەکی تردا : (لا تَمْنَعوا إمـاءَ اللهِ مَسـاجِدَ اللهِ)[3]. واتە : خێزانەکانتان ڕێگری مەکەن لە هاتووچۆکردنیان بۆ مزگەوت .

وەهەندێ لەو زانایانەی چوونە دەرەوەی ئافرەتیان بەتوندی گرتووە ئەفەرموون ئافرەتان یاساغە بۆیان بڕوانن هەر بەشێك لەجەستەی پیاو، بەڵگەش بۆ ڕاکەیان فەرموودەیەکە کەپێشەوا (الترمذي) لەنبهان مولى ام سلمەوە ئەگێڕێتەوە ، کە پێغەمبەر ﷺ لەکاتێکدا عەبدوڵلای کوڕی ام کتوم هاتووەتە ژوورەوە بەووردی بەمەیمونەی خێزانی فەرمووە: (احتجبا) واتە خۆتان بپۆشن، ئەوانیش هەردووکیان فەرموویان: ئەو واتە عەبدوڵلای کوڕی ئوم مەکتوم ـ نابینایە ـ پاشان فەرمووی: أفعمياوان أنتما ؟ ألستما تبصرانه؟ واتە: ئایا ئێوەشە هەردووکتان نابینان؟ ئایا نابینن؟ بەڵام لێکۆڵەران نەقڵ لەبارەی ئەم فەرموودەیەوە ئەفەرموون: ئەم فەرموودەیە لەلای ئەهلی نەقڵ ڕاست نییە، چونکە ئەوکەسەی لە (ام سلمە)وە گێڕاویەتیەوە (نبهان)ە، ئەویش لەو کەسانەیە کە فەرموودەکەی بەبەڵگە وەرناگیرێ[4].

واگریمان فەرموودەکە ڕاستیشە، بەلام ئەم بڕیارە تایبەت بووە بە خێزانەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ هەروەك ابو داودو پێشەوایانی تر ئاماژەیان پێ کردووە، ماوەتەوە مانای ئەو فەرموودە ڕاستە جێگیرەی کەپێغەمبەر ﷺ فەرمانی

---

[1] رواه البخاري في كتاب النكاح : باب خروج النساء لحوائجهن من حديث عائشة . ت: ٢٠٠.
[2] رواه البخاري كذلك : باب استئذان المرأة زوجها في الخروج الى المسجد وغيره من حديث ابن عمر . ت: ٢٠١ .
[3] رواه مسلم ، ت: ٢٠٢.
[4] ت: ٢٠٣.

به (فاطمه)ی کچی (قیس) کردووه که ماوەی (عده)کەی لەماڵی (تم شریك) بێ، پاشان فەرمووی: ئەم ئافرەتە لە شەودا رەنگە هاوەڵانم چاویان پێ بکەوێ، لەلای عەبدوڵڵای کوڕی مەکتوم بمێنەوە هەتا عدەت تەواو ئەبێ، چونکە ئەو نابینایانەو گەر جلەکانیشت هەندێ جار لابەیت ناتبینێت[1].

## خزمەتگوزاریی ئافرەت بۆ میوانانی هاوسەرەکەی:

ئاشکرایە کە پێویستە ئافرەت لەخزمەتی میوانانی هاوسەرەکەیدا بێت، مادام بەشیری ئیسلام گۆش کرابێ، لەپۆشاكو جوانی و قسەکردنو هاتو چۆیاندا، سروشتییە لەم کاتانەدا ببینیێو ببیسترێ، و هیچ تاوانێکی تیادانییە ئەگەر دڵنیابین لەهەردوولا کە مەترسی خراپەیان لێ ناکرێ.

(الشیخان)و جگە لەمانیش لە سەهلی کوڕی سەعدی ئەنصارییەوە ئەگێڕنەوە کە کاتێك ابو اسید المساعدی خێزانی گواستەوە، بانگهێشتی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانیکرد، تەنها (ام اسید)ی خێزانەکەی نەبێت کە خواردنی بۆ ئەکردن و بەشەو خورمای بۆ ئەکردنە قاپێکی بەردینەوەو بۆیانی ئەگێرا، کاتێك پێغەمبەر ﷺ لەخواردنەکەی بووەوە، خورمای ناو ئاوەکەی گوشیو کردییە شەربەت و پاشان دەرخواردی پێغەمبەریخودایدا ﷺ[2].

لەم فەرموودەیەدا هەروەك شێخی ئیسلام (ابن حجر) ئەفەرموێ: درووستە ئافرەت لەخزمەتی میوانی هاوسەرەکەیدا بێت، شاراوە نییە ئەمەش لەکاتێکدایە کە مەترسی خراپ ئەکرێو ئەو ئافرەتەش رەچاوی خۆداپۆشینی دروستی خۆی کردبێ، هەروەها دروستە پیاویش بەم شێوەیە لەخزمەتی خێزانەکەیدا بێت، بەڵام ئەگەر ئافرەت رەچاوی خۆداپۆشینی نەکرد وەك زۆرێك لەئافرەتانی ئەم سەردەمە ئەوا دەرکەوتنی ئەو ئافرەتە کارێکی حەرام و یاساغە.

---

[1] / تفسیر القرطبي ج١٢ ، ص ٢٢٨ ، ت: ٢٠٤.
[2] / ت: ٢٠٥.

## ئەنجامدانی کاری سێکسی لەگەڵ هاو ڕەگەزدا ( الشذوذ الجنسي ) لە گوناهە گەورەکانە

ئەوەی ماوەتەوە لێی بدوێین، مەسەلە پەیوەندارەکانن بەرێکخستنی ئارەزووە سێکسییەکانەوە لە روانگەی ئیسلامەوە، بەجۆرێك کە زیناو میکانیزمی رێگە خۆش کردنی بۆی قەدەغە بکات.

قەدەغە کردنی (شذوذ جنسي) واتە: ئەنجامدانی کاری سێکسی لەلایەن مرۆڤەوە لەگەڵ هاوڕەگەزی خۆیدا لە ئیسلامدا بە کاری نەتەوەی (لوط) ناسراوە، یاخود پێی ئەوترێ (اللّواط).

ئەنجامدانی ئەم کارە، هەڵگەڕانەوەیەکە بە رووی سروشتی مرۆڤداو رۆچوونە لەچاڵی ناپاکیو، بەدناوییە بۆ پیاوانو تاوانە بە ڕووی مافی ئافرەتان.

بڵاوبوونەوەی ئەم کێشە مەترسیدارە بۆ سەر کۆمەڵگە، ژیانیان پێ تاڵ ئەکات و ئەبنە بەندەی دەستی ژیان، هەموو رەوشتو دابو نەریتو چێژێکیان بیر ئەباتەوە.

ئەوەندەمان بەسە کەقورئان لەبارەی نەتەوەی (لوط)ە وە بۆمان ئەگێڕێتەوە کە ئەوان یەکەم گەلێك بوون هەستاون بەئەنجامدانی ئەم کارە، و لە ئافرەتانی حەلاڵی خۆیان دوور ئەکەوتنەوەو، پیاوانیان پێکەوە کاری سێکسیان ئەنجام ئەدا، بۆیە پێغەمبەرەکەیان (لوط) ﷺ پێی فەرموون: ﴿ أَتَأْتُونَ الذُّكْرَانَ مِنَ الْعَالَمِينَ {١٦٥} وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُم مِّنْ أَزْوَاجِكُم بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ عَادُونَ {١٦٦}﴾ الشعراء.

لە سەرسوڕهێنەرترین هەڵوێستەکانی ئەو نەتەوەیەی کە بەلاری لەگەڵ سروشتی خۆیاندا ئەجولانەوەو رەوشتیان تیاچوبوو، و خۆشییەکانیان لەدەست دابوو، هەڵوێستیان بوو بەرامبەر میوانەکانی (لوط) ﷺ کە فریشتەی سزادەر بوون و خوای گەورە لەشێوەی مرۆڤداو بۆ تاقی کردنەوەی ئەو نەتەوەیە ناردنی ، ئەوەتا قورئانە ئەم هەڵوێستەیانی بۆ تۆمارکردووین : ﴿ وَلَمَّا جَاءتْ رُسُلُنَا لُوطًا سِيءَ بِهِمْ وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعًا وَقَالَ هَـذَا يَوْمٌ عَصِيبٌ {٧٧} وَجَاءهُ قَوْمُهُ يُهْرَعُونَ إِلَيْهِ وَمِن قَبْلُ كَانُواْ يَعْمَلُونَ السَّيِّئَاتِ قَالَ يَا قَوْمِ هَـؤُلاء بَنَاتِي هُنَّ أَطْهَرُ لَكُمْ فَاتَّقُواْ اللّهَ وَلاَ تُخْزُونِ فِي ضَيْفِي أَلَيْسَ مِنكُمْ رَجُلٌ رَّشِيدٌ {٧٨} قَالُواْ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا لَنَا فِي بَنَاتِكَ مِنْ حَقٍّ وَإِنَّكَ لَتَعْلَمُ مَا نُرِيدُ {٧٩} قَالَ لَوْ أَنَّ لِي بِكُمْ قُوَّةً أَوْ آوِي إِلَى رُكْنٍ شَدِيدٍ {٨٠} قَالُواْ يَا لُوطُ إِنَّا رُسُلُ رَبِّكَ لَن يَصِلُواْ إِلَيْكَ ﴾ هود : ٧٧ - ٨١.

کورتـەی واتاکـە ئـەو هـۆزە بەدڕەفتارەیـە کـە درێـژەیان داوە بـەو کـردەوە ناشیرینەو وازیان لەخێزانەکانیان هێناوە، هەرچەندە پێغەمبەرەکەیان (لـوط) ﷺ ئامۆژگاری ئەکردن و هەڕەشـەی لەناوچوونی لێکـردوون، ئـەوان زیاتر سـووربوون لەسـەر ئـەوکردەوە ناشـیرینە، وەخـوای گـەورە ژمارەیـەك فریشـتـەی نـارد بـۆ لـەناو بردنـی ئـەوان و کـاولکردنی شـوێنگەیان، بۆیـە فریشـتـەکان لەشـێوەی ئادەمیـدا هاتبوون بووبوون بەمیوانی پێغەمبەر (لوط) ﷺ، کەخەڵکەکە بەمەیان زانی بەپەلە هـاتن بـۆلای مـاڵی (لـــوط)و داوای ئەنجامدانی کـاری بەدرەوشـتیان کـرد لەگـەڵ میوانەکانیدا چونکە، لەوەوپێش، هەر رێبواری رێگـەی بکەوتایەتە ناویـان ئەبوایە ئەم رەفتارە ناشیرینانەیان لەگەڵدا بنوندایە، جا لەبەرئەوە (لـــوط) لە سـەرەتاوە نەیزانی بوو کە میوانەکانی فریشـتـەن و بـۆ وێرانکـردن نێـردراون، زۆر لەخەڵکەکە پاڕایـەوە کـەدەربارەی میوانـەکانی رسـوای نەکـەن، هـیچ سـوودی نـەبوو ، تـا فریشتەکان خۆیان ئاشکرا کرد لە (لوط) پێغەمبەرو، وتیان خەفەت لەمانە مەخۆو مەترسە، ئێمە خوای گەورە بۆ لەناوبردنیانی ناردووین.

زانایانی فقهی ئیسلامی جیاوازن لە سزادانی ئەو کەسەی کاری لەو جۆرە ئەنجام ئەدات:

کە ئایا هەردوولا وەکو زینا کردن و دزی (حد) یان بۆ هەیە؟

یاخود هەردوولایان ئەکوژێن ؟

و ئایا بە چ ئالییەتێك ئەکوژرێن ؟

بە شمشێر ؟ یاخود بە ئاگر ؟

یاخود لەسەر دیوارێکی بەرزەوە هەڵ ئەدرێتە خوارەوە ؟

ئـەم توونديیـە لەبڕیاردانـدا ئەشـێت پێودانگێـك بێـت بـۆ پاککردنـەوەی کۆمەڵگـەی ئیسلامی لـەم ڤایرۆسە خراپـە زیانمەنـدە، کەجگـە لەتیاچوون و نگـرۆ بوون ، ئاکامێکی تری لێوە لەدایك نابێ.

## حوكمی ئاوهێنانەوە (الإستمناء) لە ئیسلامدا

هەندێ جار خوێنی ئارەزوو لەگەنجدا شۆڕشی هەڵەگیرسێنێ، بۆیە پەنا نەباتە بەردەستی خۆیی‌و ئاوی (منی) لەجەستەی دێتە دەرەوە، تاوەکو مێشکی پشوو بدات‌و شۆڕشی ئارەزووەکانی کپ بکاتەوە کە بەزاراوەی ئەمڕۆ بە (العادة السرية) ناو ئەبرێ.

وە زۆرینەی زانایان حەرامیان کردووە، پێشەوا مالیك بەڵگە بەم ئایەتە دێنێتەوە ﴿ وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ {٥} إِلَّا عَلَىٰ أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ {٦} فَمَنِ ابْتَغَى وَرَاءَ ذَٰلِكَ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْعَادُونَ {٧}﴾ المؤمنون.

دیارە ئەوانەش کە بەدەستی خۆیان ئاوی خۆیان دێننەوە، بەر ئەوانە ئەکەون کە لەسنوور دەرچوون.

لە پێشەوا (احمد بن حنبل)ە وە ئەگێڕنەوە، کە (منی) یاخود بڵێین ئەو ئاوەی بە زیادەیەك لە زیادەی جەستە لە قەڵەم داوەو دوورنیە دەربکرێت وەکو بەر بوونی خوێن، و ابن حزمیش پشتگیریی کردووە ، بەڵام زانایانی (حنبلی) دوو مەرجیان هەیە بۆ ڕێگەدان بەئاوهێنانەوەی مرۆڤ بەدەستی خۆی ئەوانیش:

١ ـ لەکاتێکدا ئەو کەسە ترسی زیناکردنی ببێ.

٢ ـ توانای هاوسەرداریی نەبێت.

ئەتوانین رای پێشەوا (احمدی کوڕی حنبل) وەربگرین لەکاتێکدا شۆڕشی ئارەزوو ورووژم دێنێ‌و مەترسی ئەبێت بۆ کەوتنە ناو حەرامەوە" وەکو گەنجێك کە ئەخوێنێ، یاخود بەناموٚیی و دوورە وڵاتی کارئەکات ، و هۆکارەکانی بزواندنی ئارەزووی زایەندی لەبەردەمیدا زۆربن ، وەلەوە ئەترسا کە نەتوانێ کۆنترۆڵی خۆی بکات ، بۆیە تاوان نییە بۆی لەم حاڵەتانەدا پەنا بەرێتە بەر ئەم میکانیزمە بۆ کوژاندنەوەی بڵێسەی ئارەزووەکانی ، بەمەرجێ زیادەڕۆیی تیا نەکات‌و نەیکاتە پیشەیەکی هەمیشەیی.

باشتر لەم چارەسەرە ئەوەیە کەپێغەمبەر ﷺ لاوانی موسوڵمانی پێ ڕێنمویی ئەکات لەدوای ئەوەی دەسەڵاتدار نەبوون بەسەر پێکەوەنانی کەژاوەی هاوسەرداری، ئەویش پشت بەستنە بە ڕۆژو گرتن کە ئیرادەو ویستی مرۆڤ پەروەردە ئەکات‌و ئارامگرتن‌و خۆراگربێ ئەبەخشێ‌و (مەلەکەی) پارێزگاری‌و چاودێری خوایی لەدەروونی موسوڵماناندا بەهێز ئەکات، ئەفەرمووێ: ( يا مَعْشَرَ الشَّبَابُ مَنْ إستطاع مِنْكُمُ البَاءَة فَلْيَتَزَوَجْ فإنَّهُ أغضُ لِلْبَصَر ، وأحْصَنُ لِلفَرْج ، وَمَن لَم

يَستَطيع فعَلَيه بالصَّوم فإنَّهُ لَهُ وجَـاء)[1] ، واتـه: ئـەی گرۆهـی گـەنجان هەرکـەس لـەئێوە توانای هاوسەرداریی هەیە با هاوسەری خۆی بهێنێ، چونکە هاوسـەرداریی باشتر فێری چاوو دامێن پاراستنیان ئەکات، ئەوکەسەشی دەستەڵاتی نەبوو لە رووی جەستەییەوە نەیتوانی ، با بە رۆژو بێت ، چونکە رۆژو پارێزگاری ئەکات.

## لە بواری هاوسـەرداریدا...

## گۆشـەگیری لە ئیسلامدا نییە

بەرنامەی ئیسلام رێگە نادات کەمرۆڤ جڵەو بۆ ئارەزووە سێکسییەکانی خۆی شل بکات، بەرەهایی‌و بێ‌سنوورو هەل‌ومەرجی تایبەتی خۆی کاری زایەندی ئەنجام بدات بۆ زیناکردنۆ پاشکۆکانی‌و هەرکارێکیش بەرەو زیناکردنی بەرێت قەدەغەکراوە.

لەگەڵ ئەمەشدا بەرەنگاری هەر ئایدیاو بۆچوونێك دەوەستێ کە دژی بێت ، بەو واتایەی ئارەزووی بەربەرەکانێی هەموو ئارەزوویەك و هەوڵی سەرکوت کردنی بدات بۆیە ئیسلام داوا ئەکات کە هەبێ، و رێگەشی گرتووە لە هەموو گۆشە گیری‌و دوورکەوتنەوە لەئافرەت‌و دونیا، گوایا بەمەبەستی بەندایەتی خوای گەورە .

بۆیـە رەوا نییـە بـۆ موسـوڵمان کـە خێـزان پێکـەوە نـەنێت، لەکاتێکـدا توانستیشی هـەبێ، بەناوی خۆیەکلایی کردنـەوەو بۆ پـەروەردگارو تـەرخانکردنی هەموو ژیان بۆ پەرستش‌و هەڵهاتن‌و بچڕاندن لەژیانی دونیا.

پێغەمبـەر ﷺ هەستی بـەوە کـردووە کەهەنـدێ لـە هـاوەڵانی خـەریکبوون ژیانی گۆشەگیری هەڵبژێرن و، رایگەیاندووە ئەم کارە لادانە لە بەرنامـەو میتـۆدی ئیسـلام‌و، رووبـەروو وەسـتان بەرامبـەر سـوننەتەکەی، بۆیـە ئـەم بیروبۆچـوونە ناپەسەندەی پیشەی گاورانی لەناو گەلانی موسوڵماندا وەدەرنا، لە ابی قلابەوە فەرمووی : ( خەڵکانێ لەهاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ ویستیان نەرێی ژیانی دونیا و واز لە خێزانداریی بهێنن و لە دونیا هەڵبێن، بۆیە پێغەمبـەر ﷺ زۆر گران‌و نارەحەت بوو بەلایەوە فـەرمووی: ( إنَّما هَلَكَ مَن كَان قَبلَكُم بالتَشْديد ، شَدَّدوا عَلى أنْفُسِهم فَشَـدَّدَ الله عليهم فأولئك في الأديارِ وَالصَّوامِع، فَاعبُدوا الله وَلا تُشرِكوا بِه، وَحجُوا وأعْتمروا وَأستَقيمُوا يُستَقِم بِكُـم )[2] . واتـە: ئەوانـەی پێش ئێوە بەوە تیاچوون کـە زۆر توندگیر بوون‌و لەگەڵ خۆیاندا توند بوون، خوای گەورەش توندبوو لەگەڵیاندا، ئەو جۆرە کەسانە

---

[1] / رواه البخاري . ت: ٢٠٦.
[2] / اخرجه عبدالرزاق وابن جرير وابن المنذر . ت: ٢٠٧.

پاشماوەی ناو دێرو کەنیسەکانن، خوای گەورە بپەرستن ، هاوبەشی بۆ بڕیار مەدەن، حەج و عومرە بەجێ بهێنن و جێگیرو دامەزراو بن، خوای گەورەش دامەزراوتان ئەکات، و ئەم ئایەتە پیرۆزە هاتە خوارەوە ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تُحَرِّمُواْ طَيِّبَاتِ مَا أَحَلَّ اللّهُ لَكُمْ وَلاَ تَعْتَدُواْ إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ {٨٧} ﴾ المائدة.

وە لە مجاهدەوە ئەفەرموێ: پیاوانێك لە عوسمانی کوڕی مظعون و عەبدوڵڵای کوڕی عمرو ویستیان لە دونیا دابڕێن ، بۆیە ئایەتەکەی پێشوو و ئایەتی دوای ئەویش هاتنە خوارەوە.

پێشەوا (البخاری) ئەگێڕێتەوە کە گرۆیەك لە هاوەڵان چوون بۆ ماڵەکانی پێغەمبەر ﷺ پرسیاریان لەخێزانە بەڕێزەکانی کرد دەربارەی بەندایەتییەکەی بە بۆچوونی خۆیان بە کەمیان دائەنا، پاشان فەرموویان ئێمە لەچاو پێغەمبەردا ﷺ لە کوێداین لەکاتێکدا خوای گەورە لەگوناهەکانی پێشوو ئایندەی خۆش بووە؟

**یەکێکیان** فەرمووی: من بەدرێژایی رۆژگار بەرۆژوو ئەبم و نایشکێنم ، وە **دووەمیان** فەرمووی: من بەدرێژایی شەوگار شەونوێژو خواپەرستی ئەکەم و هەرگیز ناخەوم ، وە **سێهەمیان** فەرمووی: منیش لە ئافرەت دوور دەکەومەوەو هەرگیز کۆشکی هاوسەرداری بونیاد نانێم، کاتێك ئەم هەواڵە گەیشتەوە بەپێغەمبەر ﷺ ئەو هەڵانەی تێی کەوتبوون و ئەو رێگە ناڕاستەی لەسەری بوون، بۆی روون کردنەوەو پێی فەرموون : ( إنَّما أنا أعْلَمُكُم باللهِ وَأَخْشاكُم لَهُ، وَلَكنّي أقوم وأنام ، وأصُوم وأفطَر وأتَزَوج النِّساء، فَمَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتي فَلَيْسَ منّي )[1]

واتە: ( بێگومان لەهەمووتان خواناسترم لەهەموو شتان زیاتر لەخوای گەورە ئەترسم، لەگەڵ ئەمانەشدا، هەڵئەستم و ئەشنووم، بەرۆژو ئەبم و هەندێ جاریش رۆژوو ئەگرم، وە ئافرەتانیش ئەکەمە خێزانم، بۆیە هەر کەسێ پشت لە سوونەتی من هەڵبکا ، ئەوا لە من نییە).

سەعدی کوڕی ابی وقاص ئەفەرمووێ: پێغەمبەری خوا ﷺ رێگەی لە عوسمانی کوڕی مظعون گرت بەدونیا دابڕێ، وە گەر رێگەی بە عوسمان بدایە، ئەوا ئێمەش چەشنی ئەو گۆشەگیریمان هەڵئەبژارد ) .

هەروەها بانگەوازەکەی ئاڕاستەی لاوان کردووە بەگشتی و ئەفەرموێ: (يا مَعْشَرَ الشَّباب مَنْ إستَطاعَ منْكُمُ الباءَة فَليَتَزَوَج، فإنَّهُ أَغَضُّ للْبَصَر وَأَحْصَنُ للْفَرْج )[2].

---

[1] ت: ٢٠٨.

[2] البخاري، ت: ٢٠٩.

واته: گرۆهی لاوان ئەوەتان لە توانایدایە با هاوسەری ژیانی هەڵبژێرێ، چونکە بەهۆیەوە چاوەکان و دامێنیش پارێزراو تر ئەبن.

لەبەر ئەوە هەندێ لەزانایان فەرموویانە هاوسەرگیری پێویستەکە لەسەر موسوڵمان و دروست نییە لێی دابڕێ مادام لەوباریەوە تەوانا بێت. وەهەندێکی تر لە زانایان وا ئامارەی پێ ئەکەن گەر یەکێك ئارەزووی لێی بێت، وەیاخود مەترسی لێ بکرێ ، ئەو کات واجب ئەبێت.

موسوڵمانان شایستەی ئەوەنییە کە دەروونی خۆی راو بکات لە هاوسەر گیری و لە ترسی ژیوارو گرانی لێپرسراوی، بەڵکو پێویستە بکۆشێت و چاوەڕێی فەزڵ و پشتیوانی خوای گەورە بکات، ئەو پشتیوانیەی کەخوای گەورە بەڵێنی بەهاوسەرداران داوە بەوانەی مەبەستیان پاداشتی چاوو دامێنیانە، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَأَنكِحُوا الْأَيَامَى مِنكُمْ وَالصَّالِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَائِكُمْ إِن يَكُونُوا فُقَرَاء يُغْنِهِمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ﴾ النور : ٣٢. هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (ثلاثة حَقٌ عَلَى الله عَوْنُهُم : الناكِحُ الذي يُريدُ العَفاف، وَالْمُكاتِبْ الذي يُريدُ الأداء، وَالغازي في سَبيلِ الله)[1] واتە: سێ دەستە خەڵك هەن خوای گەورە پێویستی کردووە لەسەر خۆی کە یارمەتیدەرو پشتیوانیان بێت ،

- ئەو کەسەی هاوسەری ژیانی دەست نیشان ئەکات بەمەبەستی دامێن پاکی.
- ئەو بەندەیەی کە ئەیەوێت خۆی ئازاد بکات ، بۆ ئەم مەبەستە هەوڵ ئەدات بڕێك پارە سەرف بکات و خاوەنەکەی لەسەری ئەنوسێ .
- هەروەها ئەو کەسەی لەپێناوی خوای گەورەدا ئەجەنگێت .

---

[1] / احمد والنسائي والترمذي وابن ماجه والحاكم ، ت: ٢١٠.

# تێڕوانـین بۆ دەستگـیران

هەر موسـوڵمانێ ئارەزووی هاوسـەرداری کردو نییـەتی ئاڕاسـتەی خواستنی ئـافرەتێکی دیـاریکراو ئاڕاسـتە کـرد، دروسـتە کـە بـۆ ئـەو ئافرەتـە بڕوانـێ بـەر لـە دەسـتپێکردنی قۆناغـەکانی تـری هاوسـەرداریەکە، بـۆ ئـەوەی بەئاشـکراو بەرچـاو ڕوونییەوە دەست پـێ بکات، نەوەك بەبێ هـیچ تێڕوانینێك ئەم کارە ئەنجام بدات ، تا وەکو نەکەوێتە هەڵەوەو دووچاری ئەو هەڵوێستە نەبێتەوە کە ئارەزووی ناکات .

ئەمەش لەبەرئەوەی، دیدگای مرۆڤ نێراوی دڵە، چونکە هەندێ جار ئاوێتـە بـوون و بەیـەك گەیشـتنی نیگـای چـاوان، ئەبێتـە فاکتـەری وابەسـتبوونی دڵ و ڕۆحەکان.

پێشەوا مسلم لە (ابی هریرە)ە وە ئەگێڕێتەوە" من لای پێغەمبەر ﷺ بووم ، پیاوێك هاتـە خزمـەتی وپێـی ڕاگەیاند کـە ئـافرەتێکی پشـتیوانەکانی (الانصـار)ی خواستووە، بۆیە پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: ( أنظرت إلَيها؟ فقال: لا، قَالَ : فأذهب فَانْظُر إلَيها ، فإنَّ في أعين الأَنصار شيئاً )[1]. واتە: ئایا تەماشات کردووە؟

پیاوەکە فەرمووی: نەخێر، پاشان فەرمووی: بڕۆ تەماشای بکە ، چونکە بێگومان لەچاوی پشتیوانەکاندا شتێك هەیە .

هـەروەها (المغیرە بن شعبە) ئەگێڕێتـەوە، کـە داوای ئـافرەتێکی کـردووە، و پێغەمبەر ﷺ پێـی فـەرموو: (أنظر إليها، فإنَّهُ أحرَى أنْ يُؤوم بَيْنَكُمـا)[2]، واتـە: تەماشـای بکە، چونکە ئەو تێڕوانینە باشترە بۆ ئەوەی بسازێن و بەیەکتری ڕەزامەندبن، ئـەویش چوو بۆلای دایك و بـاوکی ئـافرەت پۆشراوەکەو گوێبیستی ئەمەبوو فەرمووی: گەر پێغەمبـەری خـوا ﷺ فـەرمانی پێکـردووی کـە بـۆم بڕوانیـت ، ئـەوا تەماشـام بکـە:... موغیرە ئەفەرموێ: بۆیە، سەیرم کردوو، پاشان بوو بەهاوسەرم )[3].

پێغەمبـەری خـوا ﷺ نـە بـۆ مـوغیرەو نـە بـۆ هـیچ پیـاوێکی تـری دیـاری نەکردووە کە بڕی ئـەو ئەندامانـەی جەسـتەی ئـافرەت تـا چ ئاسـتێکن، کـە دروسـتە پیاو بۆیان بڕوانێ لەکاتی نییـەتی خواسـتنیدا، هەنـدێ لـەزانایان ئەفـەرموون: ئـەو ئەندامانە دەم و چاوو دەستەکانن، بـەڵام ڕووخسـارو دەسـتەکان لـەکاتی ئاسـاییداو بەبێ ئارەزوو دروستە پیاوی بێگانە بیان بینێت.

---

[1] ت: ٢١١

[2] بەرقەراربوونی ڕێکەوتنو مەیل دان بەلای یەکتریدا.

[3] احمد وابن ماجه والترمذي وابن حبان والدارمي ، ت: ٢١٢.

بەلاّم لەبەر ئەوەی دۆخەکە دۆخێکی جیاو تایبەتە بۆیە پێویستە لەکاتی نییەتی خواستنیدا جێگەی زیاتری ئەو ئافرەتە ببینیّ وەك لەکاتی ئاسایی تردا، هەر بۆیە فەرموودەیەك لەو بارەیەوە هاتووە: ( إذا خطَبَ أحَدَكُم المرأة أنْ يَنْظُرَ منها بَعضَ ما يدعُوه الى نكاحِها فَليَفْعَل )[1]

واتە: گەر یەکێك لەئێوە نیازی خواستنی ئافرەتێکی هەبوو، ئەوا ئەتوانێت بەبڕێك بۆی بوانێت کە رووەو خواستنی ببیات و پێی رازی بێت، هەندیّ لە زانایان زیادەڕەوییان نواندووە لەئاستی ئەو ئەندازەیەی جەستەی ئافرەت کە دروستە لەپێش دەست پێکردنی هەنگاوەکانی هاوسەرداریدا داواکار بۆی بڕوانێت، وە هەندێکی تر لە زانایان توندیی و تەسکییان لەم بارەیەوە نواندووە، و باشترینیان رێبازی میانەڕەویی نێوەندگیرییە.

هەروەك هەندیّ لە لێکۆڵەران دیارییان کردووە بۆ داواکار لەسەردەمی ئەمڕۆماندا ئەویش ئەوەیە کە بەو جل و بەرگەوە داواکارەکە ببینێت کە دروستە باوك و براو کەسی مەحرەمی خۆی بیبینیّ، ئەفەرمویّ: بۆی هەیە ـ لە بازنەی ئەو فەرموودەیەی پێشووەوە ـ کە هاوڕێیەتی بکات لەگەڵ باوکیدا یاخود مەحرەمێکی تری ئافرەتەکە – بە بەرگی شەرعی خۆیەوە – بۆ ئەو شوێنانەی ئاساییە بۆیان بچن لە سەردان و شوێنێکی دروست ، تاوەکو ئاستی ژیریی و ناسکی لە هەست و هەڵبژاردنیدا بۆ دەرکەویّ و دەرك بەئاستی هێز لەکەسایەتییەکەیدا بکات، چونکە ئەمە ئەچێتە چوارچێوەی چەمکی (البعضیة) کە فەرموودەکە ئاماژەی پێکردووە ئەتوانیّ تا ئەو رادەیە بۆی بڕوانێت کە بەرەو خواستنی ببیات و رەزامەندی بکات ) .

هەروەك بۆی هەیە بڕوانێتە ئاستی زانستی خۆی و خێزان و کەس وکاری یاخود بەبیّ ئاگاداری خۆی و کەس و کاری تەماشای بکات و بۆی بڕوانێت، مادام مەبەستەکە پاك بێت و بۆ خێزانداریی بێت .

جابری کوڕی عەبدوڵلاّ لەبارەی خێزانەکەیەوە ئەفەرمویّ : خۆم لە ژێر درەختێکدا ئەشاردەوە هەتاوەکو بەنهێنی بۆی بڕوانم .

وە لە فەرموودەکەی (المغيرة)وە ، کە ئاماژەمان پێکرد ، بۆمان روون ئەبێتەوە کە دروست نییە باوکی موسوڵمان یاساغی بکات لەداواکارانی کچەکەی کە بەنیازێکی بێگەردوو راستەوە بۆی بڕوانن، بەناوی داب و نەرتەوە، چونکە پێویستە داب و نەریت سەرنەوی بکات لە ئاستی بەرنامەی ئیسلامدا ، نەك بە پێچەوانەوە.

---

[1] رواه ابوداود ، ت: ٢١٣

هەروەك دروست نییە بۆ باوك و داواكارو كچەكەشی كەلەم بارەیەوە زۆر - بەناوی دەستگیرانیەوە- بۆ بارو سەیرانگاو بازارەكان بەبێ ئامادەبوونی مەحرەمێك ، هەروەك ئەوانەی كە عاشقانی ژیاری رۆژئاوا لەداب و نەریتی رۆژ ئاوا ئەنجامی ئەدەن.

بێگومان لادان - چ بەلای راستو چ بەلای چەپداو لەم بارەیەوە - كارێكە ئیسلام پشتی لێكردووە.

## خوازبێنی نادروست

موسوڵمان دروست نییە كە ژنی تەڵاقدراو یاخود ژنی هاوسەر مردوو بخوازێ لەپێش تەواو بوونی (عیدە)كەیدا، چونكە لەكاتی (عدە)دا حەرامە لەسەر هاوسەرداریيەكەی پێشووی ، بۆیە دروست نییە دەست درێژی بۆ ئەو سنوورە بكرێ . وە بۆی هەیە كە تێبگات كە ئەو ئافرەتەی هاوسەرەكەی كۆچی دوایی كردووە - لەكاتێكدا لە (عدە)دایە - ئارەزووی خواستنی بكات بە شێوەیەكی ناڕاستەوخۆ ، نەك بە ئاشكراو راشكاوانە خوای گەورە ئەفەرموێ : ﴿وَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا عَرَّضْتُم بِهِ مِنْ خِطْبَةِ النِّسَاء﴾ البقرة: ٢٣٥.

هەروەك بۆی یاساغە كە خوازبێنی بەسەر خوزراوی برای موسوڵمانییەوە بكات، گەر گەیشتبوونە رێكەوتن و گونجان لەگەڵ بەرامبەردا، ئەمەش لەبەر ئەوەیە كە خوازبێنیكاری پێشوو مافێكی دەست كەوتووە كە ئەبێت پارێزگاری لێ بكرێ ، بۆ چاودێری پەیوەندییەكەو جوانی خۆشەویستی نێوەند مرۆڤەكان، با مرۆڤی موسوڵمان خۆی بەدوور بگرێ لەهەر رەوشتێك كە نەرێی باش دارشتەكردنی كەسایەتییەكەی بكات، چونكە ئەم جۆرە هەڵوێستانە لەكارێكی دوژمنایەتیو دەست درێژی ئەكەن.

هەركات خوازبێنی كاری یەكەم گەڕایەوە لەخوازبێنیەكەی، یاخود خودی خۆی رێگەی بەخوازبێنیكاری دووەمدا، ئەوا دروستەو هیچ گرفتێك لەم بارەیەوە نییە.

پێشەوا مسلم ئەگێڕێتەوە كەپێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (المُؤمن أخُ المُؤمن فَلا يَحِل لِلمُؤمِنِ أن يَبتاعَ عَلى بَيعِ أخيهِ، لا يَخْطُب عَلى خِطبَةِ أخيه)[1]. واتە: موسوڵمان برای موسوڵمانە، بۆیە رەوانییە بۆ موسوڵمان كە فرۆشتن لەسەر فرۆشتنی براكەی و خوازبێنی لەسەر خوازبێنی براكەی بكات.

---

[1] اخرجه مسلم ، ت: ٢١٤.

هەروەها (البخاري) ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( لا يَخْطُـب الرَّجُلُ علَى خُطبَة الرَّجُل حَتَى يَترُكَ الخاطِبُ قَبْلَهُ أو يَأْذَنُ لَهُ )[1] واتە: باپیاو خوازبێنی لەسەر خوازبێنی پیاوێکی تر نەکات، هەتاوەکو خوازبێنی کاری پێشوو واز لە داوا کردنەکەی دێنێ، یاخود خۆی ڕێگەی پێ ئەدات.

## کچان پرسیان پێئەکرێ و زۆریان لێناکرێ

کچ خۆی خاوەنی بەکەمە لە شووکردنیدا، بۆیە دروست نییە نە بۆ باوکی و نە بۆ براو نە بۆ کەسێکی تر کە رای خۆی ـ واتە رای کچەکە پشتگوێ بخات و نەڕوانێتە ڕەزامەندی کچەکەی ـ پێغەمبەر ئەفەرموێ: ( الثيبُ أَحَقُّ بِنَفسِها مِن وَلِيِّها والبِكرُ تستأذَن فِي نفسِها ، وإذنُها صَمْتُها )[2].

واتە: بێوەژن مافی بەدەست خۆیەتی لەشووکردنیداو کچ پرسی پێ ئەکرێ ، لە وەڵامدا " بێدەنگ بوونی ماکی ڕەزامەندییەتی.

کچێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ وپێی راگەیاند کە باوکی داویەتی بە برازاکەی خۆی ، وەکچەکەش بەم هاوسەرداریە رازی نییە ، بۆیە پێغەمبەر ﷺ کارەکەی بۆ خوودی کچەکە گەڕاندەوەو کچەکە وتی: من ڕەزامەندم بەرامبەر ئەوەی باوکم ئەنجامی داوە، بەڵام تەنها ویستم ئەو راستییە بۆ ئافرەتان بەرجەستە بکەم کە باوکان لەم بارەیەوە بۆیان نییە دەست بخەنە کاریانەوە ـ واتە بە مەبەستی زۆر لێکردن ـ [3].

دروست نییە باوك شووکردنی کچەکەی دوابخات کاتێك توانستێکی خاوەن ئایین و ڕەوشت داوای کرد، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ( ثَـلاثٌ لا يُـؤَخَرون، الصَّلاة إذا أَتت ، وَالجَنازَةُ إِذا حَضَرَت، والأَيِّمُ إِذا وَجَدَت لَها كُفءاً )[4] .

واتە: سێ شت هەلە نابێ دوابخرێت، نوێژ کەکاتی هات، ناشتنی مردوو دوای ئامادەبوونی، شووکردنی کچێك کەکەسێکی هاوشانی هاتە داوای.

هەروەها ئەفەرموێ: ( اذا أتاكم من ترضَون دِينَهُ وخُلُقَهُ فزَوجُوهُ إلاّ تفعَلوهُ تَكُن فِتنَةٌ في الأَرضِ وَفَسادٌ كَبير )[5]. واتە: ئەگەر کەسێك هات بۆ خوازبێنی و ڕەزامەند بوون لەئایین و ڕەوشتی ، ئەوا هاوسەرێکی بدەنێ، گەر وانەکەن ئەبێتە هۆی پێکهاتنی خراپەو لادانێکی گەورە لەسەر زەوی.

---

[1] أخرجه البخاري، ت: ٢١٥.
[2] متفق عليه ، ت: ٢١٦.
[3] ابن ماجه ، ت: ٢١٨.
[4] الترمذي ، ت: ٢١٨.
[5] رواه الترمذي ، ت: ٢١٩.

## ئەو ئافرەتانەی خوازبێنیان نادروستە

## یاساغو نادروستە کە موسڵمان یەکێك لەم ئافرەتانە بخوازێ:

١. خێزانی باوك – گەر لێی جیابووبێتەوە یان باوکی مردبێ – ئەم جۆرە هاوسەرگیرییە لەسەردەمی نەفامیا رێگە پێدراو بوو، ئیسلام لەناوی برد چونکە خێزانی باوك لەجێگەی دایکدایە لەدوای شوکردنی بەباوکی، وەفەلسەفەو حیکمەتی حەرامگردنی ئەم جۆرە هاوسەر گیرییە، پاراستنو مانەوەی رێزە بۆ باوك.

هەروەها حەرامکردنیشی هەتا هەتاییە ، تاکو هیچ لایەکیان بە مەبەستەوە نەڕوانێتە بەرامبەر، بەمەش پەیوەندییەکان لەسەر بنەمای رێزو سەنگینی ئەمێنێتەوە.

٢. دایك، و هاوچەشنی لە داپیرە (نەنك) گەر بەرەو سەروتریش بڕۆین لەپێش دایك یاخود باوکەوە.

٣. کچو کچی جگەرگۆشەکانی، هەرچۆنێك لقەکان زۆربنو بەردەوام بن.

٤. خوشك: لەیەك دایكو باوك، یاخود تەنها لەباوك یاخود لەدایك.

٥. پوور خوشکی باوك یاخود دایك ئیتر لە یەك دایكو باوك بن یاخود لە یەکێکیان.

٦. کچی برا (برازا).

٧. کچی خوشك (خوشکەزا).

ئەم (٧) گرووپە لە ئافرەتانی نزیك، ئەوانەن، کە لە ئیسلامدا بە مەحرەمەکان ناوزەد ئەکرێن، چونکە مەحرەمەکان لە ئیسلامدا لە موسڵمان حەرامن بە هەتا هەتایيو بەهیچ جۆرێكو لەهیچ کاتێك لەکاتەکان بۆ موسوڵمان رەواو حەلاڵ نییەو نابێت، بەهەمان شێوەشە بەنیسبەت پیاوەو بەوانەی پێی ئەوترێ مەحرەم.

فەلسەفەو حیکمەتی حەرامکردنی هاوسەرگرتن لەو ئافرەتانەی پێشتر باسمان کردن:

١. مرۆۋ سروشتی لەسەر ئەوە دروست بووە کەپشت هەڵکات لە بزاوندنی ئارەزووە سێکسییەکان بەرامبەر دایكو خوشكو ئەم جۆرە کەسانەی نەك تەنها مرۆۋ بەڵکو ئاژەڵیش ئاگاداری ئەم خاڵە گرنگە ئەکات، بەهەمان شێوە

هەستی مرۆڤ بەرامبەر پووری (خوشکی دایك . باوك) چەشنی ئەو هەستەیە کە بەرامبەر دایکی هەیەتی، هەروەك بۆ مام و خاڵیش بەهەمان شێوە لەجێگەی باوکن.

٢. گەر ئایینی ئیسلام ئەم جۆرە هاوسەرگیرییانەی قەدەغە نەکردایە، ئەوا مەترسییەکی چاوەڕوان کراو رووبەڕووی پەیوەندییەکانی نێوەند پیاو ئەم ئافرەتانە ئەبووەوە، دیارە ئەمەش بەهۆی تەنیاییان پێکەوە یاخود زێدە تێکەڵاوی لەنێوەندیاندا.

٣. بێگومان لەنێوان پیاوو ئەم ئافرەتانەدا کە نزیکن سۆزێك کە لەسەر بناغەیەکی جێگیر وەستاوە خۆی لە رێزو خۆشەویستیو سۆزو ئەم وشە پیرۆزانەدا ئەبینێتەوە. بۆیە یەکەمیان سۆزی خۆی ئاڕاستەی بێگانە ئەکات لە رێگەی خوازبێنییەوە (نەك مەحرەمەکانی) بۆیە پەیوەندیی نوێ پێك بەست ئەبێتو بازنەی خۆشەویستی و رێز لەنێوەند ئادەمیزاددا فراوان ئەبێت : ﴿وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً﴾ الروم : ٢١ .

٤. ئەم سۆزە فیترییەی کە لەنێوان پیاوو ئافرەتە خزمەکانیدا هەیە لەسەر بناغەی نەرمیو ناسکی دامەزراوە پێویستە بەو گەرمو گوڕییە بمێنێتەوە، تابێتە پەیوەندیەکی هەمیشەییو بنەڕەتیو تۆکمەدار بۆ ئەوەیە ببێتە ستوونی راگیر کردی پشتو پەنایی خۆشەویستیو لەگەڵ یەك بوون ئەگەر ئەم خۆشەویستییە بخرێتە قاڵبی هاوسەرگیرییەوە ئەوا بەهۆی دروست بوونی ئاژاوەو پشێویو ناخی نێوانیان کە دروست ببێت ئەشێت سەربکێشێ بۆ جیابوونەوەو لەیەك بچڕاندنیان کە ئەویش بە پێچەوانەی بەردەوامی ئەو خۆشەویستیو پەیوەندییەی نێوانیانە.

٥. منداڵی ئەم جۆرە ئافرەتانە زۆربەی جار لاواز ئەبن، ئەگەر ناتەواویەکی جەستەیی یاخود ژیری لەو کەسەدا بەدی کرا ئەوا لەوانەیە کاریگەری هەبێت بۆ سەر نەوەکانیشیو لەواندا رەنگ بداتەوە.

٦. ئافرەت پێویستی بەکەسێك هەیە کەپارێزگاری لێ بکاتو بەرژەوەندیەکانی لەسایەی هاوسەرەکەیدا بپارێزێ، بەپێچەوانەوە گەر ئاستەنگو ناخۆشی هاتە رێیان، لەکوێی بێنێ ئەو پەنایەی تێیدا ئارام و دڵشاد دەبێت؟

## ئەو ئافرەتــانەی بەهۆی شیرخواردنەوە حــەرامــن

٧. حەرامە بۆ پیاو ئەو ئافرەتە بێنێ کە لەمنداڵیدا شیری دەداتێ، چونکە بەهۆی ئەو شیرەوە ئافرەتەکە چۆتە ریزی دایکی‌یەوەو کاری کردووە لە دروست بوونی گۆشتی جەستەیی‌و پێگەیشتنی ئێسکی، وە ئالیەتێکە بۆ بەرجەستە بوونی سۆزی کورو دایکایەتی لەنێوانیاندا هەرکاتێ بێت ئەو سۆزو خۆشەویستی‌یە پەنها دەبێ‌و لە (اللاشعور)دا دەمێنێتەوەو هەر کاتێ بێت هەستی پێ دەکرێت، وەئەبێت ئەو شیرخواردنە لەتەمەنێکدا بێت دوو ساڵی تەواو نەکردبێت، چونکە تەمەنێکە کەخواردنی سەرەکی تەنها شیری دایکیەتی وە ئەبێت پێنج جار بەتێری لەو شیرە بخوات تێرخواردن واتە منداڵەکە ئەوەندە بخوات کەخۆی واز لە شیر خواردنەکە بێنێت.

دیاری کردنی پێنج جار یان کەمتر بۆ شیر پێدان لەکۆی فەرموودەکانی پێغەمبەرەوە وەرگیراوە.

٨. خوشــکایەتی لــە ریێ شــیرخواردنەوە، هــەروەك لــەریێ شــیرپێدانەوە مەکانەتی ئافرەتێکی تر دەبێتە دایك، ئاوهاش کچەکانی ئەو ئافرەتە دەبنە خوشك‌و خوشکی ئافرەتەکەش دەبێتە پووری ئەو کەسەی شیرەکەی خواردووە، بەهەمان شێوە ئەو کاریگەری‌یە بۆ خزمانی دی کەش دەبێت، وەك حەزرەت ﷺ فەرموویەتی: ( ويحرم من الرضاع مايحرم مــن النســب)[1].

هــەروەکو لــە نەســەبدا پووری دایك و پووری باوکی‌و برازاو خوشــکەزا حەرامن بەهەمان شێوە لەریێ شیرخواردنیشەوە حەرامن.

## حەرامی زاواو خەسوو

٩. ئیسلام دایکی هاوسەری حەرام کردووە، لەوساتەوە کەئەو (عەقد\ی زەواج)ە یان پەیمانی هاوسەرێنی‌یە لەنێوان کورو کچدا دەبەسترێت، هەرچەندە نەشچووبێتە لای چونکە دەبێتە دایکی کورەکە.

١٠. الربيبة: واتە کچی ئافرەتێ کەپیاوەکە چووبێتە لای، وە ئەگەر نەچووبێتە لای ئەوا ئەتوانێت کچەکە مارەبکات.

١١. بووك ـ واتە ژنی کوڕ ـ کوڕی نەسەب نەك بەخێەکراو.

---

[1] متفق عليه، ت: ٣٢.

## کۆکردنەوەی نێوان دوو خوشك

١٢. هەرچەند لەچەرخی نەفامی (الجاهلیە)دا مارەکردنی دوو خوشك باو بووە بەڵام ئاینی پیرۆزی ئیسلام ئەم بەندو باوەی لەسەر موسوڵمانان حەرام کرد، چونکە ئیسلام سوورە لەسەر مانەوەی ئەو پەیوەندی‌یە خۆشەویستی‌یەی نێوان خوشك، بێگومان ئەو پەیوەندی‌یە تووشی دارمان دەبێت گەر ببنە خێزانی یەك هاوسەر، دەقی قورئان ئەم حاڵەتەی حەرام کردووە پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێت : ( لا يُجمع بَين إمرَأة وَعَمَّتها وَلا بَين المرأة وَخالَتها ) (صحيحين) واتە رەوانیە کۆکردنەوەی ئافرەتێك و پوورەکەی وە فەرموودەیەکی (إنَّكُم إن فَعَلتُم ذلك قَطَعْتُم أرحَامَكُم )[1] واتە ئێوە ئەگەر شتی وابکەن ئەوە پەیوەندی خزمایەتیتان بچراندووە لەگەڵ ئەمەشدا ئیسلام جەخت لەسەر پتەوکردنی پەیوەندی خزمایەتی دەکات ، چ جای ئەوەی لەناوی بەرێت .

## ژنی مارەکراو

ئەو ئافرەتانەی کە هاوسەریان هەیە بۆیان نیە شوو بەکەسێکی تر بکەن ، بۆ ئەوەی شوو بکاتەوە پێویستی بە دوو مەرج هەیە:

**یەکەم/** بەهۆی مردن یان تەڵاقدان مافی هاوسەرەکەی بەسەرەوە نەمێنێ.

**دووەم/** ئەو ماوەی (العدة)یە تەواو بکات کەخوا فەرمانی پێکردووە، تاوەك وەفاو پەرژینێك بۆ هاوسەرەکەی دەربرێت، یان ئەگەر دووگیان بوو لەو ماوەیەدا منداڵەکەی ببێت جادرێژە بخایەنێت یان نا، وەبۆ ئافرەتی مێرد مردوو چوار مانگ و دە شەوە، وە بۆ تەڵاق دراویش تێپەڕبوونی سێ عادەی شەهریە وەبۆیە سێ جار دانراوە تا ئاشکرا ببێت ئەو ئافرەتە دووگیانە یان نا.

ئەبێت ئەو دووربینی‌یە بکرێت لەبەر تێکەڵ نەبوونی نەژاد جێی خۆیەی بڵێین ئەم سیستمانە ئافرەتی نابالغ و پیرەژنی بەساڵاچوو ناگرێتەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلاَثَةَ قُرُوَءٍ وَلاَ يَحِلُّ لَهُنَّ أَن يَكْتُمْنَ مَا خَلَقَ اللَّهُ فِي أَرْحَامِهِنَّ إِن كُنَّ يُؤْمِنَّ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ﴾ البقرة : ٢٢٨.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَاللَّائِي يَئِسْنَ مِنَ الْمَحِيضِ مِن نِّسَائِكُمْ إِنِ ارْتَبْتُمْ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَاثَةُ أَشْهُرٍ وَاللَّائِي لَمْ يَحِضْنَ وَأُوْلَاتُ الْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ﴾ الطلاق: ٤.

---

[1] ابن حبان ، ت: ٢٢١

وه دەفەرمویێت: ﴿ وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا ﴾ البقرة: ٢٣٤.

ئەم (١٥) پانزە تاقمەی ژنان کە حەرامن مارە بکرێن قورئانی پیرۆز لە سوورەتی (نساء)دا لە سێ ئایەتدا باسی لێوە کردووەو دەفەرموێ:

﴿ وَلاَ تَنكِحُواْ مَا نَكَحَ آبَاؤُكُم مِّنَ النِّسَاءِ إِلاَّ مَا قَدْ سَلَفَ إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَمَقْتًا وَسَاءَ سَبِيلاً {٢٢}﴾ النساء: ٢٢، واتە: ئەو ئافرەتانە مارە مەکەن کە باوو باپیرتان مارەیان کردوون جگە لەوانەی چەرخی پێش ئیسلام بەڕاستی کارێکی ناپەسەندە و هۆی خەشم و قینی خوای گەورەیە ﴿ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَاتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَاتُكُمْ وَعَمَّاتُكُمْ وَخَالاَتُكُمْ وَبَنَاتُ الأَخِ وَبَنَاتُ الأُخْتِ وَأُمَّهَاتُكُمُ اللاَّتِي أَرْضَعْنَكُمْ وَأَخَوَاتُكُم مِّنَ الرَّضَاعَةِ وَأُمَّهَاتُ نِسَآئِكُمْ وَرَبَائِبُكُمُ اللاَّتِي فِي حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ اللاَّتِي دَخَلْتُم بِهِنَّ فَإِن لَّمْ تَكُونُواْ دَخَلْتُم بِهِنَّ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ وَحَلاَئِلُ أَبْنَائِكُمُ الَّذِينَ مِنْ أَصْلاَبِكُمْ وَأَن تَجْمَعُواْ بَيْنَ الأُخْتَيْنِ إَلاَّ مَا قَدْ سَلَفَ إِنَّ اللّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا {٢٣} وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ النِّسَاءِ﴾ النساء: ٢٢/٢٤

## ئافرەتانی مشرك ( هاوەڵ دانەر بۆ خوا )

## ئافرەتانی بێ باوەڕ

یەکێکی‌تر لەو ئافرەتانەی حەرامە مارە بکرێن، ئافرەتانی هاوەڵ دانەرن بۆ خوا جا عەرەب بن یان غەیری عەرەب. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلاَ تَنكِحُواْ الْمُشْرِكَاتِ حَتَّى يُؤْمِنَّ وَلأَمَةٌ مُّؤْمِنَةٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكَةٍ وَلَوْ أَعْجَبَتْكُمْ وَلاَ تُنكِحُواْ الْمُشِرِكِينَ حَتَّى يُؤْمِنُواْ وَلَعَبْدٌ مُّؤْمِنٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكٍ وَلَوْ أَعْجَبَكُمْ أُوْلَـئِكَ يَدْعُونَ إِلَى النَّارِ وَاللّهُ يَدْعُوَ إِلَى الْجَنَّةِ وَالْمَغْفِرَةِ بِإِذْنِهِ ﴾ البقرة: ٢٢١ ، لە ڕۆشنایی ئەم ئایەتە پیرۆزەوە بۆمان دەرئەکەوێن کە موسڵمان نابێت ئافرەتی مشرك، لەبەر فراوانی ئەو مەودایەی لەنێوان هەردوو ئایندا هەیە ، ئەوان بانگەشە بۆ ئاگرەکەن بەڵام ئەمان بۆ بەهەشت ئەوان باوەڕیان بەخواو ڕۆژی دوایی نیە، بەڵام موسڵمانان باوەڕیان پێیەتی‌و کاری بۆ دەکەن . هاوسەرداریش خۆشەویستی‌و ئارامی‌یە نەك دژایەتی‌و دووری مەودای نێوانیان.

# ئـافرەتـانی خـاوەن پەیـام

قورئـان ڕێگـەی داوە بـە مـارەکردنی ئافرەتـانی گـاور یـان جوولەکـە، بـە سیفەتی خاوەن ئاین‌و پەیامی ئاسمانین، هەرچەندە زیادەڕەوی و گۆڕینیان تێدا کردبێت، وەك خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وَطَعَامُ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ حِلٌّ لَّكُمْ وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَّهُمْ وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ الْمُؤْمِنَاتِ وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ مِن قَبْلِكُمْ إِذَا آتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ مُحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَافِحِينَ وَلاَ مُتَّخِذِي أَخْدَانٍ ﴾ المائدة :٥.

خـۆراکی خـاوەن پـەیام بۆئێـوە حەلاڵـەو هـی ئێوەشـە بـۆ ئـەوان حەلاڵـە ، وەبۆتان ڕەوایـە ژنـی داوێـن پاکیـان لێ بهێـنن بەمەرجێ مارەیـان بکـەن و مارەی‌یـان بدەنێ نەك لە ڕێی کاری بەدرەوشتی‌یەوەو بەئاشکرا یان نهێنی.

ئەمە جۆرێکە لە چاوپۆشینی ئیسلام کەزۆر کەم وێنەیە لەئاینەکانی تردا، لەگەڵ ئەوەشدا ئیسلام جولەکەو گاور بەکافر دائەنێ ڕێگەی داوە کە موسوڵمان ژنیان لێ بێنی‌و ببێتە خانمی ماڵ‌و دایکی مناڵی‌و جێی رازو نیازی و لەسەر ئاینی خۆشی بمێنێتەوە، وەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً﴾ الروم:٢١، واتە: ژنهێنان مایەی سرەوتی دڵ‌و ئارامی دەروونەو خۆشەویستی‌و بەزەیی‌یە لەنێوان ژن‌و مێردا، ئـەوەش بـزانن کـەئافرەتێکی موسـوڵمانی لـەخواترس باشـترە لـەئافرەتێ کەتـەنها بەناسـنامە موسوڵمان بێت، پێغمبـەر ﷺ دەفەرموێت: (إظفَر بذاتِ الدِين تَرِبَت يَـداك)[1]. واتـە : ئافرەتی خواناس بهێنە، لەمەوە بۆمان روون دەبێتەوە کە ئافرەتی موسوڵمان هەر چۆنێ بێت لەئافرەتی گاورو جولەکە باشترە ، وە ئەگەر موسڵمانێك لە مارەکردنی ئافرەتی ناموسڵماندا مەترسی بیروباوەڕو ڕەوشتی منداڵەکانی هەبووە پێویستە مارەی نەکات .

هەرکاتێکیش ژمارەی موسوڵمانان کەم بوو لەشارێکدا وەکو (الجالية) ئـەوا حەرامـە پیـاوی موسـوڵمان ئـافرەتی ناموسـوڵمان بێنـێ لەکاتێکـدا ئاسـتەنگێکی گـەورە لەبـەردەم ئافرەتـە موسـڵمانەکاندا هەیـە ئـەویش شـوو نەکردنیانـە بـەپیاوی ناموسـوڵمان ئەگـەر پیـاوان شـوێن ئـەم دەسـتوورە نەکـەوتن ئـەو کاتـە ئافرەتـان‌و کچـانی خوانـاس تووشـی زیـان‌و ناخۆشـی لادان دەبـن، ئـەم لادانـەش هـەروا ڕاناوەستێت بـەڵکو بـەرەو کۆمەڵگـەی ئیسـلامی هـەنگاو دەنێـت و تووشـی زیـانی

---

[1] البخاري ، ت: ٢٣٢

دنيایی‌و قیامەتی دەبن بۆ روونەدانی ئەم لادانانە حەرامە لەسەر پیاوی موسوڵمان لەم حاڵەتەدا لەئافرەتی ناموسوڵمان بهێنێ.

## شوو کردنی ئافرەتی ناموسڵمان بە پیاوی ناموسوڵمان

دروست نیە بۆ ئافرەتانی خواناس بەهیچ شێوەو لەهیچ حاڵەتێکدا شوو بکات بەپیاوی ناموسوڵمان ئەو پیاوە خاوەن پەیام بێت یان نا، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلاَ تُنكِحُواْ الْمُشِرِكِينَ حَتَّى يُؤْمِنُواْ ﴾ البقرة : ٢٢١ وە دەربارەی ئافرەتە موسوڵمانە کۆچەرییەکانی مەککە فەرموویەتی: ﴿ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَاتٍ فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى الْكُفَّارِ لَا هُنَّ حِلٌّ لَّهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ ﴾ الممتحنة : ١٠ واتە: ئەگەر زانیتان باوەڕدارن مەیانگێڕنەوە بۆ لای هاوسەرە بێباوەڕەکانیان چونکە بەیەکتر حەلاڵ نین، دەقە قورئانیەکە خاوەن پەیامە ئاسمانیەکانی جیا نەکردۆتەوە، بۆیە هەموو موسوڵمانان دەگرێتەوە.

ئیسلام رێگەی داوە بەپیاوی موسوڵمان کەئافرەتانی یەهودی یان گاور بهێنن بەلاّم رێی نەداوە بەئافرەتانی موسوڵمان کە شوو بەهیچیان بکات، چونکە ئیسلام لەو چوارچێوەی هاوسەرێتی موسوڵماندا ئافرەتی ناموسڵمان دەپارێزێت وەك ئافرەتای موسوڵمان هەق‌و مافی بۆ دیاریی کراوەو زامنی پاراستنی سەربەستی بیروڕایەتی ، بەلاّم ئاینەکانی‌تر سەربەستی بیروڕا ناخوێننەوەو مافەکانی ناپارێزن ، کەواتە چۆن ئاینی پیرۆزی ئیسلام پاشەڕۆژی کچانی دەخاتە مەترسی‌یەوە...! چۆن دەیانخاتە ناودەستی کەسێ کە نە خزمایەتی و نە عەهدو پەیمان بەلایانەوە گرنگە؟ بناغەی ئەم پرۆسەیە ئەوەیە کە هاوسەرە رێزەی بیرو بۆچوونی خێزانەکەی بگرێت تاببێتە ئالیەتێك بۆ جوانترین و باشترین هەڵس و کەوت لەنێوانیاندا.

ئیسلام بەچاو داخستن لەو گۆڕانکاری‌یانەی بەسەر ئاینەکاندا هاتووە باوەڕی وایە کە تەورات‌و ئینجیل دوو کتێبی ئاسمانین ، وەباوەڕی بە موسی‌و عیسی هەیەو یەکێکن لە (اولوا العزم).

بۆیە ئافرەتی ناموسوڵمان لای هاوسەری خواناسیی بەدڵنیایی‌یەوە ژیان بەسەر دەبات چونکە رێزی عەقیدەو بیرو باوەڕەکەی دەگرێت، بەلاّم یەهوودی و گاور بەهیچ شێوەیەك دان بەبوونی ئیسلامدا نانێن و باوەڕ بە پێغەمبەرایەتی محمد ناکەن، ئیتر چۆن ئافرەتی موسوڵمان لەسایەی بیروڕایەکی ئاوهادا دەتوانێت

پەرستش و دروشمە ئاینییەکانی خۆی پراکتیزە بکات، هەندێ شتی لەسەر حەرام و هەندێکی تریشی لەسەر حەلاڵ بێت؟ کەواتە مەحاڵە ئافرەتی موسوڵمان عەقیدەو بیرو باوەڕەکەی بەبێ گۆڕان بمێنێتەوە لەکاتێکدا پیاو بالادەستە بەسەر هەموو هەڵس و کەوتێکیدا.

لەمەوە بۆمان روون دەبێتەوە کە ئیسلام ئاینێکی منطقییە، بەپیاوی موسوڵمان دەڵێت حەرامە ئافرەتی (مشرکە) بهێنێت، بیروڕای ئیسلام و بێ باوەڕیی دوو هێڵی دژ بەیەکن، کە بە هەردووکیان ئەتوانن دوو هێڵی راست و چەپ بهێنن بەسەر شاکاری خۆشەویستی و سۆزو بەزەیی کە خوای گەورە بانگێشتی بۆ دەکات:

وەك شاعیرێکی کۆنی عەرەب دەڵێت:

أيها المُنكِحُ الثُريّا سُهيلاً　عَمَّرَكَ الله ، كَيفَ يلتقيان ؟

هي شامِيَّة إذا ما إستَقَلَّت　وَسهيل إذا اُستَقَلَّ يمانى !

## ئافرەتانی داوێن پیس (الزانيات)

١٧ ـ مەبەست لەداوێن پیس لێرەدا ئەو ئافرەتانەن کە کاری بەدڕەوشتی دەکەن و پارەی پێ پەیدا ئەکەن ئەگێڕنەوە لە (مرثد)ی کوڕی (مرثد) کە داوای مۆڵەتی لە پێغەمبەر ﷺ کرد کە ئافرەتێك بهێنێت کە لە سەردەمی نەفامیدا پەیوەندی لەگەڵدا هەبووەو ناوی (عناق)ە ، پێغەمبەر ﷺ وەڵامی نەدایەوە تا ئەم ئایەتە خوارەوە ﴿ الزَّانِي لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَالزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَا إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ وَحُرِّمَ ذَٰلِكَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ {٣} ﴾ النور: ٣.

پێغەمبەر ﷺ ئەم ئایەتەی بۆ خوێندەوەو فەرمووی (مارەی مەکە)[1] خوای گەورە ڕێی داوە بە مارەکردنی ئافرەتانی (موسوڵمان – گاور – جولەکە)ی داوێن پاك . لە بەرامبەر ئەمەشدا پیاوەکە دەبێ داوێن پاك و رەوشت بەرز بێت ﴿ مُحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَافِحِينَ ﴾ النساء: ٢٤، هەرکەسێ ئەم سیستەم و دەستوورە پراکتیزە نەکات ئەوەی (مشرك)ە رازی نابێت بە مارەکردنی کەسێك مەگەر وەك خۆی مشرك بێت ئەو کاتە دەچێتە ریزی بەد رەوشتانەوە.

ئەم دەقە قورئانیە راستەوخۆ دوای ئەو ئایەتە هاتووە کە باسی لێدانی (جلد) دەکات و دەفەرموێت: ﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا مِئَةَ جَلْدَةٍ...﴾

---

[1] القصة عند ابي داود والنسائي والترمذي ، ت: ٢٢٣

النـــور : ٢ ، ئەمـە وەك سـزايەكى جەسـتەيى، بـەلأم ئـەو دەقـەى پێشـتر لێـى دوايـن ئەتوانين بلێين سزايەكى دەروونىو پەروەردەيىيە، چونكە حەرام كردنى پرۆسـەى هاوسـەرێتى لەگەڵ بەدرەوشتاندا وەك ئـەوە وايە كـە لـە بازنـەى رەوشـت بـەرزى و هاونيشـتمانيەت كـەنارگير بكرێن، يـان دارمـانى لايـەنى زايەندىو بێبەش كردنـە لەمافەكانيان بەپێى سيستمە نوێگەريەكان.

(ابن قيم)(خوا لێى رازى بێت) دەفەرموێ: دواى ئەوەى راڤەى ئـەم ئايەتـەم بۆ روون بۆوە: (ئەم حوكم و ياسايە قورئان بەلايەنێكى باشوئيجابى و هـەڵقولأوى فيترەتى دائەنێن عەقڵو ژيريش پەسـەندى دەكـەن، خـواى گـەورە حـەرامى كـردووە لەسـەر بەنـدەكانى كـە هاوسـەرى بەدرەوشـتێك بـن، و لەگـەڵ فـيترەت و سروشـتى مرۆڤدا دروستى كردوە، ئـەوەى زيـاتر ئـەم حـەرام بوونـە روون دەكاتـەوە، ئـافرەتى بەدرەوشت دەبێتە مايەى بەدناوى هاوسەرى و تێكچوونى نـەژاد كـە خـواى گـەورە كردوويەتيە مايەى بەرژەوەندى خەڵك .

( ئەوەى ئەم حەرامكردنە روون ئەكاتەوە ئەوەيە كە ئەم تاوانە ئەبێتە هۆى تێكچوونى نێوەند ئافرەتو پياوو وەچەو نەوەكان ئاوێتە ئەبن، كە خواى گەورە بە تـەواوى لـە بەرژەوەنـدى مرۆڤـەكانى گێڕاوەو بەيـەكێك لەريزبەنـدى بەخششـەكانى خۆى لەسەر بەندەكانى گێڕاوە، چونكە زينا ئەبێتـە هـۆى تێكـەلأوبوونى نـەوەكانو گومـان دروسـت كـردوون لـەم رووەوە، بۆيـە لـەخاڵى جياكـارى ئـەم ئيسـلامە حـەرام كردنى خواستنى ئافرەتى بەدرەوشتە ، هـەتاوەكو ئـەو كاتـەى تەوبـە ئـەكاتو پـاك ئەبێتــەوە ( واتــە: پــاكى منداڵــدانى دەربكــەوێت، كــە بەلايــەنى كەمــەوە ئــەبێت سووڕێكى مانگانە بەرێتە سەر) .

ئافرەتى بەدڕەوشت ناپاكە، خواى گەورەش نيكـاحى كردووەتـە ئاليـەتى خۆشەويستىو سۆزو (مودة) ، (مودة) واتە : كرۆكى خۆشەويستىيەكى پاك، ئيتر چۆن ناپاكێك دەبێتە هاوسەرى پياوێكى رەوشتى بەرز؟

(زوج) واتە : دواى لەيـەك چـوو، كـە ئەگـەر لـەرووى رەوشـتو ئايـدۆلۆژياو بۆچـوونەوە ئـەوا ئـەو (زواج)ە پراكيـزە نـابێ خـواى گـەورە راسـتى فـەرمووە: ﴿الْخَبِيثَاتُ لِلْخَبِيثِينَ وَالْخَبِيثُونَ لِلْخَبِيثَاتِ وَالطَّيِّبَاتُ لِلطَّيِّبِينَ وَالطَّيِّبُونَ لِلطَّيِّبَاتِ﴾ نور : ٢٦.

## هاوسـەرایەتی بۆ رابواردن و چێژ وەرگرتن
## کە لـەزاراوەی شـەرعیدا پێی ئـەوترێت ( زَواج المُتعَة )

هاوسـەرداری لـە ئیسـلامدا (عقـد) پـەیمانێکی بـەتین‌و تۆکمەیـەو لەسـەر بناغەیەکی هەمیشەیی بونیاد نراوە، بۆ بەرجەستەبونی ئەو خۆشویستی‌و سۆزە لەنێوان هـەردوولادا کـەخوای گـەورە تیشـکی خسـتۆتە سـەر ، وەمانـەوەی نـەژادو بەردەوام بـوونی ژیـان ﴿ وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا وَجَعَلَ لَكُم مِّنْ أَزْوَاجِكُم بَنِينَ وَحَفَدَةً ﴾ النحل : ٧٢.

بەلاّم (زواج المتعة) پەیوەندی کاتیە کە ژن‌و پیاو خۆیان دیاری دەکـەن و ئـەو مەبەسـتەی ئیسـلام دەیـەوێت لـەم حالّەتـەدا نـاپێکرێ، پـێش ئـەوەی حوکمـە شەرعی‌یەکان جێگیر ببن پێغەمبەر ﷺ رێی پێدراوە لە گەشت‌و شەڕەکاندا، پاشان بە تەواوەتی حەرامی کرد.

نهێنـی ئـەم رێپێدانـە لەسـەرەتادا ئـەوەبوو کـە کۆمەڵگـەی ئیسـلامی لـە قۆنـاغی گواسـتنەوەدا بـوون (فـترة الانتقـال) لـە نەفامی‌یـەوە بـۆ کۆشـکی ئیسـلام، بەدرەوشـتی لەسـەردەمی نەفامیـدا رێ پێـدراو بلاّوبـووە، کـاتێکیش ئیسـلام بـۆ بانگەوازەکـەی سـەفەریان دەکـردو دەچـوون بـۆ شـەڕ موسـوڵمانەکان دووری ئافرەتەکانیان تێدا بەدی دەکرد، بێگومان لەو کەسانەدا کە ئیمانەکەیان لاواز بوو، مەترسـی ئـەوەیان لێ ئـەکرا کـە تووشـی ئـەوکارە ناشـیرینە بـبن، بـەلاّم بـاوەڕ دامـەزراوەکان دانیـان بەخۆیانـدا ئـەگرت وەك (ابـن مسـعود) دەفـەرموێت: ( لەگـەڵ پێغەمبەردا دەجەنگاین‌و ئافرەتمان لەگەڵدا نەبوو ، فقلنا ألا نَستَخصِي ؟ پێغەمبەر ﷺ رێی پێنەداین و فەرمووی ئەتوانن ئافرەتان مارە بکەن بۆ کاتێکی دیاریکراو[1].

بەم شێوەیە (زواج المتعة) بویـە فاکتـەرێکی چارەسـەری گرفتـی هـەردوولا وە دائەنرێت بەداینەمۆیەك کە بۆ بزاوتنی هەنگاو بەرەو پێکەوەنانی خێزان فراوان بوونی بازنەی تایفەگەری.

هەروەك ئیسلام پلەپلە مەی و سوودی حەرام کرد، ئەم قۆناغ بەندیـەش لـە حـەرامکردنی بەدرەوشـتیدا بـەدی دەکرێـت لـەکاتی پێویسـتی‌دا متعـەی حـەلاڵ کـردووە پاشانیش لـە (زواج)دا حـەرامی کـردووە، هـەروەکو لـە حـەزرەتی عـەلی[2] و

---

[1] متفق علیە ، ت: ٢٢٤.
[2] ت: ٢٢٥.

کۆمەڵێ هاوەڵانی پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕنەوە : ﴿ إنَّهُ غزا مَع النَبّي ﷺ في فَتحِ المكـةِ، فأذنَ لَهُم في مِتعة النِساء، قال فلم يَمزج حتى حرَّمَها الرَّسول ﷺ وفي لفظ من حديثه : ( وإن الله حَرَّم ذلك الى يَومِ القيامَة ) .

جێی خۆیەتی ئەم پرسیارە بکەین ئایا ئەم حەرامە دەچێتە قاڵبی حەرام بوونی مارەکردنی دایكو خوشكو کچ یان وەك خواردنی مردوو خوێنو بەراز، کە هەندێ جار لەکاتی پێویستیدا ڕێی پێ ئەدرێت؟

بەپێی بۆچوونی هەموو هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بە تەواوەتی (هەتا هەتایە حەرام کراوە دوای چەسپاندنی شەرعیەتی خوای گەورە) .

تەنها (ابن عباس) ڕاجیاواز بوو لەکاتی زەرورەتدا ڕێی پێدا[1] ، بەڵام دوایی بۆی دەرکەوت کە لەحاڵەتی پێویستی دەرئەچێتو سنوور ئەشکێنێ بۆیە لە بۆچوونەکەی خۆی پەشیمان بوویەوە[2] .

## مارەکردنی زیاد لە ئافرەتێك واتە (فرە ژنی)

ئیسلام ئاینێکە لەگەڵ واقعو سروشتی مرۆڤدا دەگونجێت، ئەیپالێوێت لە لادانو ڕۆچوون، وەك لەحاڵەتی (تعدد الزوجات)دا دەبینین، کە وەك ماهیەتێکی مرۆڤایەتی تاك بێت یان کۆ بۆی دەڕوانێت، ڕێی داوە بەموسوڵمان کە زیاد لە ئافرەتێك بخوازێت.

زۆر لەکۆمەڵگاکانی پێش ئیسلام بۆیان هەبووە ژمارەیەکی بێ کۆتا ژن بهێنن وەك ئەڵێن گەشتۆتە (١٠٠) ژن بەبێ بوونی هیچ مەرجێك، بۆیە کە ئیسلام هات مەرجو خاڵی تایبەتی بۆ ئەم خاڵە دانا، ئەو ئاستەنگو مەرجانەی کە دانراوە ئەوەیە کە لە چوار هاوسەر تێنەپەڕێت وەك (غيلان الثقفي) موسوڵمان بوو (١٠) هاوسەری هەبوو پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ( إختَر مِنهُنَ أربَعاً وَفارِق سائِرَهُن)[3] هەروەها موسوڵمان هەبوو (٨) یان (٥) هاوسەری هەبووە پێغەمبەر ﷺ ڕێی پێداوە تەنها (٤) هاوسەریان هەڵبژێرێت.

بەڵام کە پێغەمبەر ﷺ (٩) هاوسەری هەبووە، ئەمە حاڵەتێکی تایبەتە بۆ پێویستی بانگەواز پێویستی کۆمەڵگەیە پێیان پاش وەفاتی حەزرەت .

---

1 / البخاري ، ت: ١/٢٢٥.

2 / زاد المعاد ج٤ ص٧ ط صحيح اخرجه البهقي ، ت: ١/٢٢٦.

3 / الشافعي ، احمد الترمذي وابن ابي شيبة والدارقطني والبيهقي.

## داد پەروەریی مەرجێکە بۆ ڕێگەدان بە فرەژنی

ئەو مەرجەی کە ئیسلام بۆ تعددی هاوسەری دانەوە ئەوەیە کەموسڵمان بڕواو متمانەی بەخۆی هەبێت کە بتوانێت دادپەروەرییەکی تەواو لە بواری خواردن و پۆشاك نیشتەجێ بوون نەفەقە پراکتیزە بکات، بۆیە ئەو کەسەی کە خۆی ئەناسێت و پێی وایە ناتوانێت ئەم مافانە جێبەجێ بکات، بەیەکسانی و دادپەروەیی ئەوە حەرامە کە لە یەك هاوسەر زیاتر بخوازێت وەك خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ تَعْدِلُواْ فَوَاحِدَةً ﴾ النساء : ٣

هەروەها حەزرەت دەفەرموێت: ( من كانت لَهُ إمرأتان يَميل لأحداهُما عَلى الأُخرى جاءَ يَومَ القِيامَة يَجُرُ أحَدَ شقَّيه سـاقِطاً أو مـائلا ) واتە: هەر کەسێك دوو ژنی هەبێت و جیاوازیان بکات ئەوا لە ڕۆژی دوایدا لەسەر یەکلا حەشر دەکرێت، لەم فەرموودەیەدا باس لەجیاوازی ئەرك و مافەکانیان دەکات نەك جیاوازی دڵ و خۆشەویستی . وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَن تَسْتَطِيعُواْ أَن تَعْدِلُواْ بَيْنَ النِّسَاء وَلَوْ حَرَصْتُمْ فَلاَ تَمِيلُواْ كُلَّ الْمَيْلِ ﴾ النساء : ١٢٩، بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: ( اللهّم هَذا قَسمي فيما أمْلك ، فَلا تُؤاخِذني فيما تَملك وَلا أملك) مەبەست خۆشەویستی دڵە کە ناتوانرێ یەکسان بکرێت، بۆیە هەرکاتێك حەزرەت سەفەرێکی بکردایە تیرو پشکی بۆ دەکردن و کامیان دەرچوایە دەیبرد لەگەڵ خۆی بۆ ئەوەی کەسیان دڵی گەرد نەگرێ.

## ڕەچاوکردنی دانایی لە فرە ژنیدا

ئیسلام دوا فەرمایشتی خوای گەورەیە کە کۆتایی بە هەموو پەیامە ئاسمانیەکان هێنا، بەکۆمەڵێ حوکم و شەرعیەتی نوێگەری و نەمرەوە پانتایی هەموو کۆمەڵگەو سەدەیەك دادەپۆشێ، ساردی یان گەرمی کۆن یا، نوێ لە بەرنامەکەیدا ناخوێنرێتەوە.

بەڵکو ئیسلام تەقدیری تاك و کۆمەڵ و پێویستی و بەرژوەندییەکانیان لەبەرچاو دەگرێ، کەسانێك هەن حەز بە منداڵ و نەوەی زۆر دەکەن، لەگەڵ ئەوەشدا هاوسەرێکی هەیە کە بە هەر هۆیەك بێت منداڵی نابێ، باشتر نیە کە خێزانێك بهێنێ ئەو حەزەی بۆ جێبەجێ بێت ؟

پیاوی وا هەیە کە ئارەزووی زایەندی زۆرە، پێچەوانەوە هاوسەرەکەی کەم ئارەزووە یان نەخۆشە یان ماوەی عادەی شەهرییەکەی زۆر دەخایەنێت...

پیاوەکە ناتوانێ ئارام بگرێت لەسەر ئەم حاڵەتە، لێرەدا دوو رێگە هەیە بۆ پراکتیزەکردنی ئارەزووەکەی یان رێگەی بەدرەوشتی دەگرێتە بەر یان بە شێوازێکی حەڵاڵ هاوسەرێکی تر بێنێت.

ئەشێ بەهۆی جەنگو کوشتارەوە ژمارەی ئافرەتان زیاتر بن لەپیاوانو گەنجان لێرەدا لەبەر بەرژەوەندی کۆمەڵگەو خودی ئافرەتان خۆشیان تا بێبەش نەبن لە ژیانی هاوسەرێتی و ئەو خۆشەویستیو سکونەتەی بەهۆیەوە دەستگیریان دەبێت.

سێ رێگا هەیە بۆ ئەو ئافرەتانەی کە ژمارەیان لەپیاوان زیاترە:

١. یان هەموو تەمەنیان بێبەش بێت لەژیانی هاوسەرێتی.

٢. یان ببنە میکانیزمی تێرکردنی حەزو ئارەزووی پیاوانی بەدڕەوشت.

٣. یان رێگەیان پێ بدرێت کە شوو بکەن بەپیاوێك کە توانای چاکەو بەخێو کردنی هەبێت بۆیان گومانی تێدا نیە کە رێگەی سێهەم چارەسەرێکی داد پەروەرەو گونجاوە، و ئەوەشە کە ئیسلام فەرمانی پێکردووە : ﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ {٥٠} ﴾ المائدة.

ئەمە ئەو تەعەددیە کە مەسیحییە رۆژئاواییەکان نکوڵی لێ دەکەنو بە یاسایەکی نەشیاوی لە قەڵەم دەدەن، لەهەمان کاتدا خۆیان تەعددی عاشقو دۆستان پراکتیزە دەکەن بەبێ هیچ مەرجێكو پابەند بوونێك بەهیچ یاساو دەستورێك لە بەرامبەر ئافرەتو ئەو منداڵانەی دێنە دنیاوە، کەواتە کام لەم دوو کۆمەڵە راسترین رێگەو باشترین چارەسەری هەڵبژاردووە؟

## پەیوەندی نێوان ژن و مێرد

قورئانی پیرۆز گرنگیەکی زۆری داوە بەدەرخستنی مەبەستە روحیەکان هاوسەرێتی و کردوویەتی بەچەند بنەماو پایەیەك کە کۆشکی هاوسەرێتی لەسەر بونیاد دەنێن... وەفراوان کردنی بوعدی خۆشەویستی و لێك نزیك بوونەوەیە لەنێو دوو عەشرەتدا... وەتەواوکاری سۆزو بەزەیی مرۆڤایەتییە وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ {٢١}﴾ الروم

## لە پەیوەندیە هەست پێکراوەکانی هاوسەرێتی

لەگەڵ ئەمەشدا قورئان لایەنی هەستو پەیوەندیە جەستەیەکانی نێوان ژنو مێردی فەرامۆش نەکردووە... بەڵکو باشترین ڕێی هەڵبژاردوە کە مافی فیترەت و ئارەزووەکان پێشێل نەکرێت، وەخۆی دوور ئەگرێت لەلادانی بێ سنوور.

ئەگێڕنەوە کە جولەکەو بتپەرستەکان زیادەڕەویەکی یەکجاریان کردووە لە دورکەوتنەوەی ئافرەتەکانیان لەکاتی (عادەی شەهری)دا، بەڵام گاورەکان بە پێچەوانەوە بەهیچ شێوەیەك سنووریان بۆ ئەو حاڵەتە نەدەهێشتەوە، هەروەها لە سەردەمی نەفامیشدا کاتێك ئافرەت لەم حاڵەتەدا بووایە نە خواردن و خواردنەوەی دەستیان دەخوارد، نە لێیان نزیك دەبوونەوە... تەنانەت لەو ماڵەشدا نەدەمانەوە کە ئەو ئافرەتەی لێ بوایە وەك جولەکەو بت پەرستەکان.

موسوڵمانەکان دەربارەی (عادەی شەهری)و چی حەرامو حەلاڵە بۆیان چەند پرسیارێکیان ئاراستەی پێغەمبەر کردو ﷺ خوای گەورەش ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە، ﴿ وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى فَاعْتَزِلُواْ النِّسَاء فِي الْمَحِيضِ وَلاَ تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىَ يَطْهُرْنَ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللّهُ إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ {٢٢٢} ﴾ البقرة.

هەندێ لەعەرەبە دەشتەکی یەکان وا تێگەیشتبوون کە مانای (فَاعْتَزِلُواْ النِّسَاء) واتە لێیان دوور بکەونەوەو لەشوێنانەش مەمێننەوە کە ئەو ئافرەتانەی لێ بێت.

پێغەمبەر ﷺ زیاتر تیشکی خستە سەرو فەرمووی دوورەپەرێزی واتە نەچنە لایان نەك لە ماڵەکانی خۆتان دووریان بخەنەوە، کە جولەکە ئەمەیان بیست وتیان: ئەم پیاوە هیچ شتێك ناکات مەگەر پێچەوانەی ئێمە نەبێت [1].

کەواتە موسوڵمانان بۆی هەیە لەگەڵ خێزانی خۆیدا بێت جگە لە کاتی (عادەی شەهری) نەبێت، بەم شێوە دەبینین ئیسلام ئاستێکی مامناوەندی پیادە کردووە لەم حاڵەتانەدا.

پزیشکی نوێ ئاشکرای کردووە کە لە ڕژێنەکانی سووڕی مانگانەدا چەند ماددەیەکی ژەهراوی هەیە گەر لە لەشدا بمێنێتەوە زیانی پێدەگەیەنێت ، هەروەها نهێنی ئەو دوورە پەرێزییەی دەرخستووە لەو کاتەدا چونکە ئەندامەکانی زاوزێ لە

---

[1] بڕوانە تەفسیری الرازی ج٦، لا: ٦٦ ، ت: ٢٢٢.

حاڵەتێکی نائاسایی‌دایە، هەروەها لایەنی دەروونی ئەو ئافرەتە بەهۆی چەند رژێنێکی ناوەکی‌یەوە نائارامە بۆیە ئەو مومارەسە زایەندی‌یە زیانی پێدەگەیەنێ‌و پێئەچێ رێ لەحاڵەتە ئاساییەکەی بگرێت یان هۆکارێك بێت بۆ ئیلتهابی ئەندامی زاوزێ[1].

## خۆپاراستن لە پاش (إتقاء الدُبر)

خوای گەوە دەفەرموێت: ﴿ نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ وَقَدِّمُواْ لأَنفُسِكُمْ وَاتَّقُواْ اللّهَ وَاعْلَمُواْ أَنَّكُم مُّلاَقُوهُ وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ {٢٢٣} ﴾ البقرة.

هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە بێ سوودو حیکمەت نیە وەك زانای هند (ولی الله الدهلوی) دەڵێت: جوولەکەکان شێوەی چوونە لای ژنەکانیان زۆر تەسك کردبووەوە، هەر بۆیە یەهودی‌یەکانیش هەمان رێ وشوێنی ئەوانیان گرتبوو، جولەکەکان دەیانوت: هەرکەسێ لەپێشەوە بچێتە لای خێزانەکەی ئەو منداڵەکانیان خێل دەردەچێت، بۆیە ئایەتی ﴿ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ ﴾ هاتە خوارەوە، کە لەپێشەوە بێت یان پشتەوە گرنگ ئەوەیە جێی ئەو مومارەسە بە شوێنی منداڵ بوون بێت، ئەمەش لەبەرئەوەیە کەهیچ بەرژەوەندییەکی شارستانی بوون یاخود گەلی تیادا نابینرێتەوە، وە مرۆڤ خۆی زاناترە بە بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆیەوە، وەبێگومان ئەمە جۆرێکە لەرۆچوونی جوولەکە، کە پێویستە بسڕدرێنەوە[2].

چونکە بێگومان ئەمە کاری ئایین نییە کە هەستێت بەدیارکردنی چۆنێتی مامەڵەی سێکسی، بەڵکو ئەوەی لەلای ئایین جێی گرنگی پێدانە ئەوەیە کە پیاوەکە لەخوا بترسێت‌و بزانێت کە چی ئەکات، وە بەجۆرێك ئەو مامەڵەیە بکات کەخوای گەورە داوای کردووە کەبریتیە لەبەکارهێنانی پێشەوەی ئافرەت بۆ ئەو مامەڵە سێکسییە، چونکە بەکارهێنانی بەشی دواوە جێگەی ئازارو پیسیەو خاڵی لێکچوونیشە بە گەلی (لوط) ﷵ کە ئەم کارەیان کردبووە پیشە، بۆیە ئایین مافی خۆیەتی کە هەستێت بە نەرێ کردنی ئەم کارە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ( لا تأتوا النساءَ في أدبارِهن )[3] واتە: لەدواوە مەچنە لای خێزانەکانتان.

---

[1] / بڕوانە کتێبی (الاسلام والطب الحديث) کەنووسینی خوالێخۆشبوو ( د. عبدالعزيز اسماعيل)ە.
[2] / حجة الله البالغة ج٢ ، لا: ١٣٤.
[3] / احمد والترمذي والنسائي وابن ماجه ، ت: ٢٣٢.

وەسەبارەت بەوەی کە لەدواوە ئەچێتە لای خێزانەکەی ئەفەرموێ: (هي اللوطية الصغرى)[1]. واتە: ئەو کارە لوطییەکی بچووکە ، واتە جۆرێکە لەو کارانەی گەلی لوط ئەنجامیانداوە .

وە ئافرەتێکی ئەنصاری پرسیاری لێکرد سەبارەت بەمامەڵەی سێکسی نێوەند ژن و مێرد لەپێشەوەدا لە رێگەی دواوە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ ئەم ئایەتەی بەسەردا خوێندەوە: ﴿ نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ ﴾[2] و عومەر لێی پرسی: تیاچووم ئەی پێغەمبەری خوا ! فەرمووی چی وای لێ کردیت ؟

فەرمووی: (حولت رحلي البارحة) کە کینایەیە بۆ ئەوەی لەئاڕاستەی دواوە بۆ پێشەوە چووەتە لای خێزانەکەی ، بۆیە پێغەمبەر ﷺ بەرپەرچی نەدایەوە هەتا ئەم ئایەتەی پێشوو دابەزی، پاشان پێی فەرموو: بچۆرە لای خێزانت لەئاڕاستەی پێشەوە یان دواوە، بەڵام خۆت بپارێزە لەوەی کە لەکاتی سوڕی مانگانەی ئافرەتەکەدا بێت یاخود دواوە بەکاربهێنی .

## پاراستنی نهێنییەکانی هاوسەرێتی

قورئان بەم شێوەیە وەسفی هاوسەری چاك دەکات کە ﴿ قَانِتَاتٌ حَافِظَاتٌ لِّلْغَيْبِ بِمَا حَفِظَ اللّهُ ﴾ النساء ٣٤.

یەکێك لەو شتە گرنگانەی کە پێویستە بشاردرێتەوە ، پەیوەندی تایبەتی نێوان هەردوو هاوسەرو خێزانەکەیەتی، وە بەڕاست نازانرێ کە ئەو جۆرە بابەتانە بکرێتە سەرباس و لێکۆڵینەوەی نێو کۆڕو کۆمەڵی هاوڕێ و دۆستان وەك لەفەرموودەیەکدا هاتووە کە دەفەرموێت: ( إنَّ من شَرِ الناس مَنزِلَةً عندَ الله يَومَ القيامَة الرَّجُل يُفضِي الى المرأة وتُفضِي اليه ثُم يَنشُر سِرَّها )[3].

واتە: هەر هاوسەرێك نهێنی خۆی و خێزانەکەی ئاشکرا بکات لە ڕۆژی دواییدا زۆر تاوانبار دەبن.

هەروەها (إبن هريرە) دەفەرموێت: ( صَلَى بنا رَسوُلُ الله فَلَما سَلَّمَ أقبَلَ عَلَينا بوَجْهِه فَقال: مَجالسُكُم، هَل منْكُم الرَّجُل إذا أتى أهْلَهُ أغلَقَ بابَهُ وأرخى سترَهُ ، ثُم يَخرُجُ فَيُحَدِثُ فَيَقول: فَعَلْتُ بأهلي كَذا ؟ فَسَكَتوا ... ناهيكَ عَلى النِّساء فَقال: هَل مِنْكُنَّ مَن تُحَدِّث ؟ فَجَثت قَتادة كعاب عَلى إحدَى رُكبَتَيها وَتطَاوَلَت لِيَراها رَسُول ﷺ وَيَسمَعُ كَلامَها

[1] / احمد والنسائي ، ت: ٢٣٤.
[2] / احمد ، ت: ٢٣٥.
[3] / مسلم وابوداود ، ت: ٢٣٧.

فَقالَت : أي والله ... إنَّهُم يَتَحَدَثون ، وإنَهُن لَيَتَحَدَثن فَقال عليه السلام : هَل تدرُون ما مثل مَن فَعَل ذلك؟ إنَّ مَثَل مَن فَعَلَ ذلك مثل شَيطان وَ شَيطانَة لَقيَ أَحَدَهُما صاحِبَهُ بالسِّكَة فَقضى حاجَتَهُ منها وَالناس يَنظُرون إلَيه )[1] .

واتـه پێغەمبـەر ﷺ پـێش نوێـژی بـۆ دەکـرێن پـاش سـڵاودانەوە رووی تـێ کـردین‌و فـەرمووی: لەشـوێنی خۆتـان دانیشـن، لەناوتانـدا کەسـێك هەیـە کاتێـك دەچێتە لای خێزانەکەی دەرگا دادەخات و پەردە دائەداتـەوەو پاشان کە لە ماڵ چووە دەرەوە لـەناو دۆسـتو هاوڕێکانی‌دا دەڵێت وام کـردو وام کـرد؟ هـەموو بـێ دەنـگ بـوون، ئینجـا رووی کـردە ئافرەتـەکان و فـەرمووی کـەس لـەئێوە شـتی‌وا دەکات؟ کچێکی تازە پێگەیشتوو هەڵستایە سەر ئەژنۆیـەکی ملـی بـەرز کردەوە تـا پێغەمبەر بیبینـی‌و گوێی لـەدەنگی بـێ وتـی: سوێند بەخوا پیاوانیش‌و ژنانیش بەم کارە هەڵدەستن، ئینجا حەزرەت فەرمووی : ئەزانن ئەوەی ئەوە بکات وەکو کـێ وایە؟ وەکو شەیتانێکی نێرو مێ وایە کە هەموو کەسی چاوی لێیـان بێت. هێنـدە بەسـە بـۆ موسوڵمان کە کاری وا ناشیرین بکـات چونکە موسوڵمان هـەرگیز رازی نابێت کە ببێتە شەیتان! یان وەك شەیتانی لێ بێت !

## رێکخستنی منداڵ بوون

بێگومـــان مانـــەوەو بـــەردەوامی مرۆڤايـــەتی مەبەســـتی ســـەرەکی هاوسەرێتی‌یە ، کە بەبۆنەی منداڵ بوونەوە بەردەوام دەبێت، ئیسلام زۆری کوڕ کچ بـە پـیرۆز دەگرێـت، لەگـەڵ ئەوەشـدا رێـی بەموسـوڵمان داوە کـە رێـز بەنـدی‌و جوانکاری لەکارەکانیدا بەدی بکرێت، بۆ نموونـە لـەکاتی پێویسـت‌و گونجـاودا بـۆ موسـوڵمان هەیـە ژمـارەی منـداڵ دیـاری بکـات، لـە سـەردەمی پێغەمبـەر ﷺ بـۆ رێکسختنی ئەم دیارەدەیە شێوازی (عزل)یان بەکار هێنـاوە (واتـە فڕێدانی ئاوەکە لە دەرەوەی رەحمی ئافرەتەکە هەرکاتێك هەستی بەهاتنە خوارەوەی کرد).

زۆر لەیارانی پێغەمبەر ﷺ بەم پرۆسەیە هەستاون ، وەك لـە (صـحیح)دا لـە جابرەوە گێڕدراوەتەوە: (كُنَا نَعزِل عَلى عَهدِ رَسُولِ اللهِ وَالقُران يَنزِل) واتە لەسەردەمی پێغەمبـەردا ئـەم رێگەیـەمان بـەکار ئـەهێناو بەپێغەمبـەرش گەیشـتەوەو رێگـەی لێ نەگرتین[2] .

---

[1] / احمد وابوداود والبزار ، ت: ٢٣٨.
[2] / ت : ٢٣٩.

پیاوێك هاتەلای پێغەمبەرو وتی: من کەنزەکێکم هەیە عەزلی لەگەڵدا بەکار دێنم و نامەوێ منداڵی ببێت، جا یەهودییەکان دەڵێن ئەم کارە زیندە بەچاڵ کردنی بچووکە، حەزرەت فەرمووی: یەهوود درۆی کرد، خوای گەورە گەر بیەوێت دروستی دەکات، بەبێ ئەوەی پیاوەکەو ژنەکەش ئاگایان لێی بێت[1].

لەکۆڕێکی عومەردا ﷺ باس لەکاری عەزل کرا، پیاوێك وتی: ئەوان بە زیندە بەچاڵکردنی بچووکی دادەنێن، عەلی فەرمووی: هەتا حەوت قۆناغی بەسەردا تێ نەپەڕێت نابێتە زیندەبەچاڵ کردن تانەبێتە (پارچەیەك) و پاشان ببێتە (دڵۆپێك) دواتر (عەلەقە) و (مضغە) و پاشان (گۆشت بۆ ئێسکەکانی دروست نەکرێ) . حەزرەتی عومەر فەرمووی: راست دەکەی، خوا تەمەن درێژت بکات.

## پاساوەکانی رێکخستنی منداڵ بوون

یەکێك لەگرنگترین هۆکارەکان : پاراستنی ژیانو تەندروستی دایکەکەیە لە مەترسی سك پڕی و منداڵ بووندا، ئەویش بەهۆی شارەزایی پێشتر یا، لە ڕێی پزیشکێکی باوەڕ پێکراوەوەو، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَلا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ ﴾ البقرة :١٩٥ ﴿ وَلا تَقْتُلُوا أَنْفُسَكُمْ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيماً ﴾ النساء : ٢٩.

یەکێکیتر لەو هۆکرانە کەمکردنەوەی تووش بوونە بەگوناهی دنیا کە سەر دەکێشێ بۆ لاوازی باوەڕو تووشی حەرام دەبێت، لەپێناو منداڵەکانیدا خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلا يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ ﴾ البقرة :١٨٥ ﴿ مَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُمْ مِنْ حَرَجٍ ﴾ المائدة : ٦.

یەکێکیتر لەو مەترسییانە ئەوەیە کە منداڵەکانیان تووشی تەندروستی خراپو کەمتەرخەمی لە پرۆسەی پەروەردە کردن ببنەوە، لە (صحيحى مسلم)دا (اسامەی کوڕی زەید) گێڕایەوە کە پیاوێك هاتەلای پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من شێوەی عەزل لەگەڵ خێزانەکەمدا بەکاردەهێنم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بۆچی ؟ پیاوەکە وتی: لەبەر مناڵەکەی ، یان مناڵەکانی .

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ئەگەر زەرەمەند بوایە ئەوا زیانی بە دەوڵەتی فارسو رۆم دەگەیاند[2]. پێغەمبەر ﷺ وای بۆچووە کە ئەم کارە تایبەتە بەتاك و زیان بەکۆمەڵ ناگەیەنێت بەسیفەتێ کە زیانی گەلی فارس و رۆمی ئەو سەردەمە نەکردووە.

---

1 / اصحاب السنن ، ت: ٢٤٠.
2 / مسلم دەریهێناوە ، ت: ٢٤١.

وەیەکێکی تر لەو پێویستییە لەبەرچاوگیراوەکان لەم رووەوە مەترسی شیردانە لە سك پڕو بوونێکی تازەو کۆرپەیەکی نوێ ، بۆیە پێغەمبەر ﷺ ئەو مامەڵە سێکسیەی لەنێوان پیاو ژنی شیردەردا روو دەدات ناوی بردووە بە (الغیل) یان (الغیلة) واتە فێڵ‌و ناڕاستی، چونکە ئەم جۆرە مامەڵەیە سك پڕ بوونێکی لەسەر بونیاد دەنرێ کە شیری ئافرەتەکە ناهێڵێت‌و کۆرپە شیرە خۆرەکەشی لاواز ئەکات، بۆیە بەناڕاستی‌و فێڵ ناوی بردووە، چونکە تاوانێکی شاراوەیەو بەرامبەرە شیرەخۆرەکە ئەنجام ئەدرێت، وە لەم رووەوە لە کوشتنێکی نهێنی ئەچێ.

پێغەمبەر ﷺ هەمیشە هەوڵ‌و کۆششی بۆ گەلەکەی بووە، و هەرچی لە بەرژەوەندی‌یاندا بووبێت ئەمری پێدەکردن، داوای دوورکەوتنەوەشی لەوکارانە دەکرد کە بەرەو هەڵدێریان دەبات. وەك دەفەرموێت: ( لا تقتُلُوا أولادَكُم سِـرّاً فـإن الغَيلَ يُدرِكُ الفَارِسَ فَيُدَعثِرُهُ )[١].

واتە: بەنهێنی منداڵەکانتان مەکوژن، چونکە (غیل) سوار لەسەر زین دێنێتە خوارەوە، بەڵام رێ پێنەدانەکەی نەگایاندۆتە پلەی حەرام کردن چونکە لە سەردەمی خۆیدا چەندین گەلی بەهێز ئەم رێکخستنەیان ئەنجامداوەو زیانیشی پێ نەگەیاندوون ، وەکاتی شیردان دووساڵی تەواوە هەرکەس بیەوێت بەو کارە هەستێت. ( لَقَد هَمَمْتُ أن أَنهى عَن الغيلة ثُم رأيت فارِسَ والرُّومَ يَفعَلونه وَلا يَضُرُّ أولادَهُم شَيئاً) [٢] واتە: سەرەتا ویستم نەرێ لە (الغیله) بکەم، پاشان بۆم دەرکەوت فارس و رۆم ئەنجامی ئەدەن‌و کۆرپەکانیشیان دووچاری هیچ جۆرە زیانێك نابن).

(ابن القیم) (خوا لێی رازی بێت) لەبارەی پەیوەندی ئەم فەرموودەیەو ئەوی پێشتر باسمان کرد ( وَلا تَقتُلـوا أولادَكُـم ) لەدوو رووەوە تیشکی دەخاتە سەرو دەفەرموێت :

حەزرەت فەرمووی کە منداڵ لەدوای منداڵ بێ تەواوکردنی ماوەی شیر خواردنی منداڵی یەکەم ، کار لەسەر تەندروستی دەکات بەڵام کوشتنی راستەقینەی منداڵەکە نیە ، بەڵام دەفەرموێت: باشتر وایە دووساڵی شیر خواردنەکە تەواو بکات . ئەمە لەلایەك لەلایەکی ترەوە گەر زانرا کار لەپەیوەندی نێوان هاوسەرو خێزانەکە دەکات‌و ئەوا ماوە زۆرە دەبێتە تووش بوون بەخراپە باشتر وایە کە منداڵێکی تر لە دایك بێت.

---

[١] ابوداود ، ت: ٢٤٢.

[٢] مسلم ، ت: ٢٤٣١.

لەم سەدە نوێیەدا چەندین ئالیەتو هۆکاری مۆدێرن هاتوونەتە کایەوە بۆ ڕێ گرتن لەمنداڵ بوون کە نە زیان بەمنداڵەکە دەگەیەنێتو نە ڕێ لە پیاوەکەش دەگرێ کە بچێتە لای هاوسەرەکەی، وە لەبەر تیشکی ئەم فەرموودانەدا بۆمان دەرکەوت کە باشترین ماوە لەنێوان دوو منداڵدا سێ یان سی و سێ مانگە بۆ هەرکەسێ بیەوێت ماوەی شیردانەکە تەواو بکات .

وەکاتێك ئەم کارە ڕێ پێدراوە کە ڕەزامەندی ژنەکەی لەسەر بێت چونکە مافی بەسەر منداڵەکەو هاوسەرەکەشییەوە هەیە ، عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ بەبێ ڕەزامەندی هیچ هاوسەرێك ڕێی بە پرۆسەی (عزل) نەداوە. ئەمەش ڕوئیایەکە لە ڕوئیاکانی ئیسلام بەرامبەر ئافرەت لە سەردەمێکدا هیچ مافێکیان پێ نەئەدرا.

## منداڵ لەبــار بــردن

هەرچەندە کە ئیسلام ڕێی داوە کە پرۆسەی منداڵ بوون لەکاتی پێویستی دا ڕێك بخرێت، بەڵام پاش دروست بوونی ئەو کۆرپەلەیە، بەهیچ شێوەیەك ڕێی بە کەناربردنی نەداوە.

زانایانی بواری (فقە) یەك ڕاو بۆچوونن دەربارەی لەناونەبردنی پاش ئەوەی ڕۆحی کرا بەبەردا، چونکە حەرام و تاوانەو بەزیندەوەرێکی تەواو لە قەڵەم دەدرێ دەڵێن: ئەگەر ئافرەتێك شتی وابکات دەبێ خوێنی ئەو منداڵە بدات بە تایبەت ئەگەر بەزیندوویی لەدایك بێتو پاشان لەناوی بەرێت، بەڵام گەر لە سکی دایکیدا لەناوی بەرێت ئەوا خوێن دانەکەی کەمتر دەبێت.

وە ئەگەر لە سەرچاوەیەکی باوەڕ پێکراوەوە دەرکەوت کە مانەوەی ئەو منداڵە لە سکیدا دەبێتە هۆی مردنی دایکەکە هاتۆتە دنیاوە، چونکە دایکەکە ڕەهەندی دروست بوونو بناغەی بوونی منداڵەکەیەو کیانو بوونی تایبەتی لەناو کۆمەڵدا هەیەو کۆڵەکەی خێزانە ئەمە لەلایەن لەلایەکی ترەوە ئەو کۆرپەلەیە هێشتا نەهاتۆتە دنیاوەو هیچ ئەركو مافێکی لەسەر شان نیە[1].

پێشەوا غەزالی دەفەرموێت: جیاوازی لەنێوان منداڵ نەبوونو منداڵ لەبار بردندا هەیە، ڕێگرتن لەمنداڵ بوون وەك لەباربردن وایە چونکە تاوانێکە بەرامبەر کائینێك کە دێتە بوون هاتنە بوون چەند قۆناغێککی هەیە وەیەکەم هەنگاو تێکەڵ بوونی ئاوی پیاو ئافرەتەکەیە لەمنداڵدانی دایکداو ئامادە دەبێت بۆ پێشوازی ئەو

---

[1] لە بۆچوونەکانی (الفتاوی) شێخ شلتوت : ٢٦٤.

ژیانە بۆیە هەوڵدان بۆ لەناوبردنی تاوانە، وەکاتێك بوو بەپارچە گۆشتێك تاوانەکەی زیاترەو گەر گەشتە قۆناغی رۆح بەبەردا کردن ئەوا تاوانەکەی بەرەو قورستر دەچێت، تادەگاتە گەورەترین تاوان ئەویش لەناو بردنیەتی پاش لەدایك بوونی[1].

## مافەکانی هاوسەرێتی بەرامبەر بە یەك

هاوسەرێتی پەیمانێکی تۆکمەو متمانە پێکراوە کە خوای گەورە کردوویەتی بەئالیەتی لێك نزیکبوونەوەی ژن و پیاو، کەدوایی ئەم پەیمانە هەریەکەیان لەتەنیایی‌یەوە دەبنە دوان و بە (زوج) ناودەبرێن، چونکە هەریەکەیان تەواوکاری ئەوی تریانەو هەموو هەم و غەم و هیوایەکیان پێکەوەیە.

قورئانی پیرۆز کاری لەسەر ئەو پەیوەندیە بەهێزە کردووەو دەفەرموێت : ﴿ هُنَّ لِبَاسٌ لَكُمْ وَأَنْتُمْ لِبَاسٌ لَهُنَّ ﴾ البقرة : ١٨٧. ئەم دەربڕینە قورئانییە واتە لێك نزیك بوونەوەو داپۆشین و پاراستن و جوانی کە هەریەکەیان بۆ ئەوی دیکەی فەراهەم دێنێ.

لەبەرئەوە هەردووکیان مافی تایبەتیان بەسەریەکەوە هەیەو پێویستە پراکتیزە بکرێت و نابێت بەهیچ شێوەیەك فەرامۆش بکرێت، ئەم مافانەش سروشتین و لەگەڵ فطرەیاندا دەگونجێت وەك قورئان دەفەرمووێت : ﴿ وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ ﴾ البقرة : ٢٢٨. بێگومان ئەو پلەیەش لێپرسراوی چاودێری‌یە کە لەگەڵ پێکهاتە سروشتی پیاواندا دەگونجێت.

پیاوێك لە حەزرەتی پرسی ﷺ خێزانەکانمان مافێکیان بەسەرمانەوەیە؟

فەرمووی: ( ان تطعمها اذا اطعمت، وتكسوها اذا اكتست، ولا تضرب الوجه، ولا تقبح، ولا تهجر الا في البيت )[2].

کەواتە هاوسەر نەفەقەو بژێوی خێزانەکەی پشتگوێ بخات، وەك فەرموویەتی ( كفى بالمرء اثما ان يضيع من يعوت )[3] وە نابێت پیاو بەشێوەیەك لە خێزانەکەی بدات کە بەدەم و چاوی بکەوێت، چونکە ئەمە دەست درێژی‌یە بۆ رێزو کەسێتی ئەو ئافرەتە ئەمە لەلایەك لەلایەکی ترەوە جوانی جەستەی لە دەم و چاوی‌دا بەدەردەکەوێت.

---

(١) الاحياء، ربع العادات كتاب النكاح، ٤٧.

(٢) ابوداود وابن حبان له صحيحه‌كه‌يدا، ت: ٢٤٤.

(٣) ابوداود والنسائي والحاكم، ت: ٢٤٥.

هەرچەندە ئیسلام بواری بۆ پیاوان ڕەخساندووە گەر خێزانەکەی ڕەوشت نزم یان جۆرە هەڵسوکەوتێکی نەشیاوی هەبوو، هەوڵی چاککاری بدات ، بەمەرجێ نابێت ئازاری بدات یان شوێن لێدانەکەی بەر دەم و چاوی بکەوێت ، هەروەها لەلایەنی دەروونیشەوە پێویستە وریا بێت و بەقسەی ناشرین هەستی بریندار نەکات .

ئنجا بابێینە سەر مافەکانی پیاو لەلایەن خێزانەکەیەوە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ : نابێت ژن ڕێ بەکەسێك بدا بچێتە ماڵی گەر هاوسەرەکەی پێی ناخۆش بوو، و بەبێ ڕەزامەندی ئەو ئەچێتە دەرەوەو لەکاتی نوستندا لە هاوسەرەکەی جیا نەبێتەوەو گەر لەو بەهێزتر بوو نابێت لێی بدات[1] .

## ئارام گرتن مافێکی تری هاوسەرێتی‌یە

گەر موسڵمان هەندێ هەڵس‌وکەوتی خێزانەکەی بەدڵ نەبوو پێویستە لەسەری کە بەئارام و خۆگر بێت، لەپاڵ ئەمەدا ڕەفتارداو هەڵسوکەوتە جوانەکانی بێنێتەوە یاد ... وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ( لایضرب أي لا یبغض مؤمن مؤمنة ان سخط منها خلقا رضي منها غیره)[2] .

واتە: باهیچ پیاوێکی باوەڕدار لە خێزانە باوەڕدارەکەی تووڕە نەبێ، چونکە گەر لە ڕەفتارێکی ڕازی نەبوو، ئەشێ هەڵس‌وکەوتی تری هەبێت و بەدڵی بێت، قورئانی پیرۆزیش دەمرموێت: ﴿ وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ فَإِنْ كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئاً وَيَجْعَلَ اللَّهُ فِيهِ خَيْراً كَثِيراً ﴾ النساء : ١٩.

هەروەك چۆن خوای گەورە ئارامیی لەسەر هاوسەر پێویست کردووە بەرامبەر خێزانەکەی بەهەمان شێوە لەسەر ژنیش پێویستە کەکار لەسەر ڕەزامەندی هاوسەرە – کەی بکات و زۆر ووریابێت لەوەی نەکا ڕۆژ بکاتەوەو هاوسەرەکەی لێی تورە بێت.

وەك لەفەرمووودەیەکدا هاتووە: ( ثلاثة لا تُرفعُ صَلاقُم فوق رُؤوسهِم شبراً رَجُل أمَّ قَوماً وَهُم لَهُ كارِهُون ، وإمرأة باتت وَزَوجُها عليها ساخط ، وَأَخوان مُتَصارِمان (متخاصمان)[3].

واتە: سێ دەستە لە موسوڵمانان یەك بست لە سەریان بەرز نابێتەوە

- ئیمامێك پێش نوێژی بۆ گەلێك دەکات و خۆشیان نەوێ ،
- ژنێکیش ڕۆژ کاتەوەو هاوسەرەکەی لێی زوویر بێت ،
- وە دووبراش کە قسە لەگەڵ یەکتردا نەکەن.

---

[1] الحاکم ، ت : ٢٤٦.
[2] مسلم ، ت : ٢٤٧.
[3] ابن ماجه وابن حبان له صحیحەکەی‌یدا، ت: ٢٤٨.

## کاتێ ناکۆکی دەکەوێتە نێوان هاوسەرانەوە

بەسیفەتێ پیاو سەرۆك و بەرێوەبەری دەزگای خێزانە، بەپێی ئەو پێکهاتە ئامادەیی یە جەستەیی یەی بۆ کاری ژیان و و ئەو مارەیی و نەفەقەیەی لەسەر شانێتی نابێت ئافرەت لەژێر فەرمان و قسەی هاوسەرەکەی دەرچێت، چونکە دەزگا خێزانی یەکە بەرەو دارمان دەچێت.

گەر هاوسەرێك هەندێ رەفتارو قسەی خێزانەکەی پەسەند نەکرد، ئەوا دەبێت بەجوانترین شێوەو بەباشترین ئامۆژگاری و قسەی جوان هەوڵی چاککاری بدات . گەر سوودی نەبوو ئەوا لەکاتی نووستندا لێی جیا بێتەوە تا لەو رووەوە کاری تێ بکات، ئەگەر هەر کاریگەری نەبوو ئینجا رێگای لێدان بگرێتە بەر بەلاَم بە بێ ئازاردانی دەم وچاو ، ئەمەش رێگاچارەیە بۆ هەندێ ئافرەت لە هەندێ حاڵەتی تایبەتی دا، لێدانیش مانای ئەوە نیە کە دار یان قامچی بکاتە هۆکارێك بۆ ئازاردانی خێزانەکەی، بەڵکو بەشێوەیەك بێت کە ببێتە مایەی شەرمەزاری.

خزمەتکارێك حەزرەتی تورە کردبوو، پێغەمبەریش ﷺ : ( لَولا القصاصُ يَومَ القِيامَة لأوجَعتُكَ بهذا السَّواك)[1] . واتە گەر لەبەر وەستانی قیامەت نەبوایە بەم سیواکە ئێشم پێ دەگەیاندیت).

پێغەمبەر ﷺ خۆی دوورگرتووە لەلێدان و دەفەرموێت: ( عَلام يَضرِبُ أَحَدَكُم إمرَأتَهُ ضَربَ العَبدِ وَلَعَلَهُ أَن يُجامعَها فِي آخرِ اليَوم )[2] . وەسەبارەت بەو پیاوانەی کە لە خێزانەکانیان ئەدەن دەفەرموێت: ( لا تجِدُون أولئكَ خِيارَكُم )[3] . واتە: ئەو پیاوانەی کە لەخێزانەکانیان ئەدەن باش نین.

پێشەوا حافظ بن الحجر: لە فەرموودەکەی پێغەمبەرەوە کەدەفەرموێت:(لَن يَضرِبَ خِيارُكُم) دەفەرموێت: لەهەندێ حاڵەتدا لێدان دروستە بۆ راستکردنەوەی هەڵەو کەموکوورییەکان، ئەگەر بەئامۆژگاری و هەڕەشەکردن سوودی نەبوو ئینجا ئەم رێگایە بەکاربێنێت، چونکە ئەم کردارە زیاتر دەبێتە دوور کەوتنەوەیان لە یەکتر.

حەزرەتی عائیشە (رەزای خوای لێبێ) فەرموویەتی: ( ما ضَرَبَ رَسُولُ الله إمرَأةً لَهُ وَلا خادماً قَطُّ، وَلا ضَرَبَ بِيَدِه شَيئاً قَطُّ إلاّ في سَبيلِ الله أَو تُنتَهك حُرُماتِ الله فَيَنتَقِمَ

---

[1] / ابن سعد لەکتیبی (الطبقات)دا ، ت: ٢٤٩.
[2] / احمد، و لە بخاری دا نزیکە لێوەی ، ت: ٢٥٠.
[3] / الفتح دا واحمد وابی داود والنسائي وابن حبان والحاکم لەفەرموودەی : ایاس بن عبدالله بن ابی زیابدا بە ڕاستیان داناوە ت : ٢٥١.

ﷲ)[1]. واته: هەرگیز پێغەمبەر ﷺ لەخێزانی خۆی یان خزمەتکارەکەی نەداوە ، وە بەدەستی لەهیچ شتێکی نەداوە مەگەر لەبەر خوا یان بێ فەرمانییەك کرابێ‌و تۆڵەی لێ کردبێتەوە.

ئەگەر ئەمانە هیچی سوودی نەبوو، وەمەترسی فراوان بوونی کێشەکەی لێ کرا لەنێوان هەردوو هاوسەردا، با پیاوچاکان، بەیارمەتی یەکێك لەکەسی پیاوەکەو کەسێکی‌تر لەخزمی ژنەکە هەوڵی چاککاری‌و یەکخستنەوەیان بدەن.

قورئان پیرۆز دەفەرمویێت: ﴿ وَاللَّاتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ وَاضْرِبُوهُنَّ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلا تَبْغُوا عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيّاً كَبِيراً ، وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُوا حَكَماً مِنْ أَهْلِهِ وَحَكَماً مِنْ أَهْلِهَا إِنْ يُرِيدَا إِصْلاحاً يُوَفِّقِ اللَّهُ بَيْنَهُمَا إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيماً خَبِيراً ﴾ النساء: ٣٤ - ٣٥ .

## تەنها لێرەدا جیابوونەوە درووستە

پاش ئەوەی هەموو هەوڵ‌و کۆششەکان بێ سوود بوون و گشت رێگا چارەکان بەهەدەر چوون، هاوسەر ئەتوانێ پەنا بۆ چارەسەرێکی تر بەرێت کە خوای گەورە شەرعیەتی بۆ داناوە چوونە بەدەم ئەو واقعەی تێیدا دەژین، تا ببێتە مایەی کردنەوەی ئەو گرێ کوێرانەی کە بەم شێوازە نەبێت ناکرێتەوە، کە ئەو هۆکارەش (جیابونەوە)یە.

ئیسلام رێی داوە بۆ پەنابردن بەم رێگایە، هەرچەندە بەباشی نازانێت مەگەر بۆ حاڵەتی زۆر پێویست نەبێت، وەك فەرموویەتی ﷺ ( أبغَضُ الحَلالِ إلى الله الطَّلاق )[2] واتە: ناخۆشترین حەلاڵ لای خوای گەورە (جیابوونەوە)یە.

ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کەحەلاڵێکە لای خوای گەورە لەحاڵەتی پێویستیدا رووخسەتی شەرعیەتدانی دراوە، لەکاتێکدا کە مامەڵەو هەڵس‌وکەوت تێکدەچێ، و دژایەتی کۆنترۆڵی نێوانیان دەکات، و نەتوانن سنووری خوای گەورە بپارێزن وەك وتراوە ( إن لَم يَكُن وِفاقٌ فَفِراق ) واتە یان رێکەوتن یان جیابوونەوە، وەخوای گەورە دەفەرمویێت : ﴿ وَإِنْ يَتَفَرَّقَا يُغْنِ اللَّهُ كُلّاً مِنْ سَعَتِهِ ﴾ نساء: ١٣٠.

---

(١) فتح الباري ، ج٩ ، لا : ٢٤٩ ، ت: ٢٥٢ .
(٢) ابوداود ، ت: ٢٥٣.

## جیابوونەوە لە پێش ئیسلامدا

ئیسلام تەنها ئاین نیە کە ڕێگەی بەپرۆسەی جیابوونەوە دابێ، چونکە ئەم دیاردەیە لەناو هەموو گەلێکدا هەبووە جگە لەچەند گەلێك نەبێت، گەر پیاوێك رقی لە ژنەکەی هەستایە لە مامەڵەی دەری دەکرد هەق بووایە یا نا، بە بێ ئەوەی ئافرەتەکە هیچ هەق و پێویستی یەکی خۆی بدرێتێ بۆیە کاتێك یۆنانیەکان وەك شارستانیەتێك دەرکەوتن ، دیاردەی جیابوونەوە وەك دیاردەیەك بەدی دەکرا، بەبێ بوونی هیچ مەرج و مافێك لەو کارەدا . ڕۆمانیەکان دیاردەی جیابوونەوەیان بەبەشێ لە مارەکردن دادەنا، گەر ئەم مەرجە لەپرۆسەی ژن هێنانەکەدا تۆمار نەکرایە ئەوا قازی کارەکەی هەڵدەوەشاندەوە .

جیلە کۆنەکانی ڕۆمانیەکان جیابوونەوەیان حەرام دەکرد، لەهەمان کاتدا هاوسەر دەسەلاتێکی بێ سنووری هەبوو. بەڕادەیەك کەدەیتوانی خێزانەکەی بکوژێت، پاشان جیابوونەوە گەڕایەوە ناویان هەروەك لەیاسا مەدەنیەکاندا هەبوو.

## جیابوونەوە لای جوولەکە

سەبارەت بەئاینی جوولەکە، ئافرەت لە کەش وهەوایەکی باشدا دەژیا، بەلاّم بەشێوەیەکی بەرفراوان ڕێی بۆ جیابوونەوە خۆش کردبوو، بۆ نموونە گەر پیاوێك بەکاری بەدرەوشتی خێزانەکەی تاوانبار بکرایە، هاوسەرەکەشی لێی خۆش ببوایە، ئەوا لەلایەن شەرعەوە بەزۆر لێی جیا دەکرایەوە، یان گەر دوای (٢٠) ساڵ ژیانی هاوسەرێتی منداڵی نەبوایە لەم کاتەدا شەرع بەزۆر لێکی جیا دەکردنەوە [١].

## جیابوونەوە لە ئاینی مەسیحیدا

ئاینی مەسیحی بەدەر لەئاینەکانی تر حاڵەتێکی شازی لەخۆ گرتووە، وە مەودایەکی فراوان لەنێوان ئەم و ئاینی جوولەکەدا بەدی دەکرێ، لە ئینجیلدا لە زمانی حەزرەتی عیساوە جیابوونەوەی حەرام کردوە یان ژن هێنانی تەلاّق دراویان شووکردن بەپیاوێك کە لەخێزانەکەی جیابووبێتەوە حەرام کردووە، لە ئینجیلی متی (٥) : لا ٣١-٣٢ ( قَد قِيلَ مَن طَلّقَ إمرَأته فَلْيَدفَع إليها كتاب طَلاق. أما أنا فأقولُ لَكُم : مَنْ طَلّقَ إمرَأتَهُ إلاَ لعلة الزنى فقد جعلها زانية، وَمَن تَزَوَجَ مُطَلّقَة فَقَد زنى ) واتە : وتراوە هەر کەسێ لەخێزانەکەی جیابوویەوە با تەلاّق نامەی بداتێ، بەلاّم من پێتان ئەڵێم،

---

[١] لەکتێبی (الاسلام دين عام خالد) لەدانانی خوالێخۆشبوو فريد وجدی لا ١٧٢ .

**هەرکەسێ لە ژنەکەی جیابوویەوە، (مەگەر لەبەر داوێن پیسی نەبێ) ئەوا ژنەکەی تووشی کاری بەدڕەوشتی کردووە، وە هەرکەسێ ژنێك بێنێ کە لەهاوسەرەکەی جیا بوو بێتەوە ئەوا کاری بەدڕەوشتی لەگەڵدا دەکات، وە لە ئینجیلی مرقس: ١٠: ١١ ، ١٢ ( مَن طَلَّق إمرَأتَهُ وَتزَوّجَ بأُخرَى يَزني عَلَيها، وإذا طَلَّقت المرأة زَوجَها وَتزَوّجَت بآخر إرتكَبَت جَريمة الزنى ) .**

**ئینجیل لەسەر بنەمای ئەم وتەیە جیابوونەوەی حەرام کردووە ( ما جَمَعَهُ الله لا يَصحّ أن يُفرِّقَهُ الإنسان )[1] واتە: ئەوەی کە خوای گەورە کۆیان دەکاتەوە بۆ مرۆڤ نیە کە لێکیان دوور بخاتەوە ، ئەم رستەیە لە رووی واتاوە تەواوە، بەڵام نەك بکرێتە هۆی حەرام بوونی جیابوونەوە، وە کەخوای گەورە هاوسەرانی کۆ کردۆتەوە واتە شەرعیەتی بەپرۆسەی مارەکردن داوە، راستە کۆکردنەوەیان لەلایەن خوای گەورەوەیە بەڵام مرۆڤەکان خۆیان پێی هەڵدەستن بەهەمان شێوەشە لێك جیابوونەوە کە لەلایەن خوای گەورەوەیەو مرۆڤەکان جێ بەجێی دەکەن ، ئایا بەهۆی بەدرەوشتی‌یەوە خوا لێکیان جیاناکاتەوە؟ ئیتر بۆچی لەبەر چەندین هۆی تر لێك جیا نەبنەوە؟**

## راجیایی رێبازە مەسیحیەکان لەبارەی جیابوونەوەوە

**لەگەڵ ئەوەی ئینجیل لەحاڵەتی بەدڕەوشتی‌دا نەبێت جیابوونەوەی حەرام کردووە، بەڵام شوێنکەوتوانی رێبازی کاثولیکی دەڵێن: ئەمە ئەوەی ناگەیەنێ کە بۆ هەموو یاسایەك حاڵەتی شاز هەبێت، واتە لەچەند کاتێکدا رێ بەم کارە بدرێت، بەڵکو جیابوونەوە بەهەموو شێوەیەك لەئایینی مەسیحی‌دا حەرامە، مەگەر هەر لە کاتی مارەکردنەکەدا هیچ بنەمایەك نەبێت کەئەم حاڵەتەش بەکارێکی بەدڕەوشتی دائەنرێ، لەم کاتەدا پیاو ئەتوانێ‌و بەڵکو پێویستە کە لەو ئافرەتە جیا بێتەوە[2] .**

**شوێنکەوتووانی رێبازی پرۆتستانتی رێیان بەجیابوونەوە داوە لەچەند حاڵەتێکدا وەك کاتێك ئافرەتەکە بەدڕەوشتی بکات یان چەند هۆیەکی‌تر کە بۆ خۆی لەدەقەکانی ئینجیلدا نەهاتووە ، دەبینین رێیان بەحاڵەتی جیابوونەوە داوە بەڵام بەهیچ شێوەیەك ئافرەتەکەیان پیاوەکە بۆی نیە جارێکی تر ژیانی هاوسەرێتی بونیاد بنێن.**

---

[1] / بڕوانە انجیلی میتا ١٩ : ٦ ومرقس ١٠ :٩.

[2] / لە شەرمی بەشێك لە باسە ئایینییەکان لە پەیمانگای القبطي الکاثولیکی لە انجیلی متی لا: ٢٩.

بەلام شوێنكەوتوانی ئەرثوذسكی رێیان بەجیابوونەوە داوە لەبەر كاری داوێن پیسی، یان منداڵ نەبوون بۆ ماوەی سێ ساڵ، یان نەخۆشی درێژخایەن، یان ناكۆكیو نەگونجانی نێوانیان، كە ئەم هۆیانە هیچیان لەدەقی ئنجیلدا نەهاتوون.

لەبەرئەوە (المحافظون) پارێزكاران لەپیاوانی ئەم رێبازە بەهەموو شێوەیەك نكوڵیان لەجیابوونەوە كردووە هەروەك رێیان بەژیانی هاوسەرێتی نەداوەتەوە دوای ئەم حاڵەتە بۆیە دادگای میصری سكالای ئەو ژنە مەسیحییان رەتكردەوە كەداوای جیابوونەوەی لە هاوسەرەكەی دەكرد لەبەر هەژاری ، ئەو دادگایە لە حوكمەكەیدا وتی: سەیرە كە هەندێ لەپیاوانی ئاینی كەنیسە لەگەڵ پێشكەوتنی رۆژگاردا مل بۆ لاوازی ئیمانیان كەچ دەكەنو رێ بەكارێك ئەدەن كە لەئینجیلدا باس نەكراوە، وەشەریعەتی مەسیحی بەهەموو شێوەیەك حاڵەتی جیا بوونەوەی حەرام كردووە مەگەر لەكاتی بەدڕەوشتیدا نەبێ )[1].

## ئەنجامی ئەم را جیاوازییە

لەئەنجامی ئەم یاسایانەدا نائومێدیو بێ ئەنجامییەك لەم ئاینەدا دەركەوت سەبارەت بەجیابوونەوە (الطَّلاق) وەسروشتی مرۆڤو چالاكییەكانی لە دەستدا كە ئەشێ لەئەنجامی ئەو جیابوونەوەیەدا بەدەست بهاتایە لە بەرەنجامی ئەم لادانە بێسنوورەدا مەسیحییەكان لە ئاینو دەقە ئینجیلیەكانیان دەرچوون ، هەروەك تیر لەكەوان دەردەچێت ، جگە لەجیاكردنەوەی ئەوەی خوا كۆی كردبووە هیچی تریان نەكرد.

بۆیە مەسیحییەكان هەستان بەدانانی چەند یاسایەكی مەدەنی بۆ رزگار بوون لەو زیندانە ئەبەدییەی تێدابوون، زۆربەیان ئەو ئەمریكییانەن كە لەبواری جیابوونەوە (طلاق)دا زیادەڕەوییەكی ئێجگاریان تێداكرد بوو وەك ئەوەی بڵێن بەربەرەكانی ئینجیل دەكەن بۆیە لەبەر ساناترین و سادەترین هۆ لەخێزانەكانیان جیادەبوونەوە، هەربۆیە مرۆڤە پیرەكانیان سكالایان لەسەر ئەم هێرشە دەكرد بۆ ئەو پەیوەندییە پیرۆزەی نێوان ژنو مێردو دەزگا خێزانییەكان، تا یەكێك لە قازییە بەناوبانگەكان لەو بوارەدا رایگەیاند كە ژیانی هاوسەرێتی بەرەو داڕمان دەچێتو بەكەمترین ماوە بەدڕەوشتی و لادان جێی دەگرێتەوە لەنێوان پیاوانو

---

[1] / رۆژنامەی(الاهرام) بەرواری ١٩٥٦/٣/١.

ژناندا، و ئەو کارگە بازرگانی‌یە یەکێك لەهاوپشتەکانی لەبەر بچووکترین هۆ لەکار دەکەون، ئەوکاتە بەپێچەوانەی هەموو بیروباوەڕو ئاینەکانەوە نەخۆشەویستی و نە ڕێزو نە ئاین پێکیانەوە نابەستێ بەڵکو ئارەزووپەرستی جێی ئەو ئامانجە پیرۆزانە دەگرێتەوە.

## کوفریش بەشێکی خۆی هەیە

ئەم دیاردەیە واتە هەنگاونان بەپێی یاسای مەدەنی لەبواری (ئەحوالی شەخصیدا) کە جیایە لەبنەما ئاینی‌یەکان، بڕوا مەکە جگە لەگەلانی رۆژئاواو مەسیحیەت هیچ شوێنێکی دی کە هەبێت ئەم کارە بکات، تەنانەت ( بەراهیمەو بوزی و بتپەرست و مەجووسی‌یەکانیش ) لەبواری ئەحوالی شەخصیدا بەپێی رێنموویی ئاینەکەیان کار دەکەن.

ئەشێ هەبێت لە ئەحوالی (عینی)دا یاسایەکی مەدەنی دروست بکاتو پەیڕەوی بکات، بەلاّم هەرگیز لەبواری ژن هێنانو جیابوونەوەدا یاسای مەدەنی پراکتیزە ناکەن.

مەسیحی‌یەکان تەنیا ئاینن لەبواری ئەحوالی شەخصیدا بەتایبەت (جیا بوونەوە) رۆچوونو رێنموویی‌یە ئاینی‌یەکانیان بەهەموو شێوەیەك رەت کردۆتەوە، چونکە هەر خۆیان بۆیان دەرکەوت کە رێنمووی‌یە ئاینی‌یەکان لەگەلّ واقع و سروشتی مرۆڤایەتی‌دا ناگونجێت و بەکەڵکی پەیکەڵ کردن نایەت لە ژیاندا [1].

## مەسیحیەت چارەسەرێکی کاتی‌یە نەك پەیامێکی گشتی

ئەگەر ئەوەی لەبارەی جیابوونەوە(طلاق)ەوە لەئینجیلدا هاتبیّو هیچ گۆڕانکاری‌یەکی بەسەردا نەهاتبێت، بۆمان دەرئەکەوێت کەحەزرەتی مەسیح ﷺ مەبەستی دانانی شەرعیەتێکی گشتی نەبووە بۆ سەرجەم مرۆڤایەتی، بەڵکو بۆ دەستانی ئەو سنوور بڕینەیە کە جولەکەکان دەیانکرد لە بازنەی فرمانی خوادا (هەروەك لەبواری جیابوونەوەدا دەیانکرد).

لەبەشی نۆزدەهەمی ئینجیلی متی دا هاتووە: کاتێك حەزرەتی مەسیح لە (جلیل)ە وە رۆیشتووە بۆ ناوچەی جولەکەکان لە ئەردەن، (الفریستون) هاتن بۆ لای و چەند پرسیارێکیان ئاراستەکرد کە ئایا مرۆڤ بۆی هەیە لەخێزانەکەی جیا ببێتەوە لەبەر هەرهۆیەك بێت؟

---

[1] لەکتێبی(حقوق الانسان فی الاسلام) د. علی عبدالواحد وافی ، لا: ٨٨.

ئەویش لەوەلآمدا وتی: ئایا نەتانخوێندۆتەوەو نازانن کە لە سەرەتادا ئەوەی مرۆڤی دروست کردووە لە هەروو ڕەگەزی نێرو مێ دروستی کردووە؟

لەبەرئەوەی ئەو پیاوە دەست لەدایك و باوكی هەڵدەگرێ و پابەند دەبێ بەئافرەتێکەوەو ئەبنە یەك جەستەو گیان، وەئەوەی خوای گەورە کۆی کردۆتەوە مرۆڤ ناتوانێ لێکیان جیابکاتەوە، وتیان: ئەی بۆچی حەزرەتی موسی ﷺ دەیفەرموو هەرکاتێك لەخێزانەکانتان جیابوونەوە (طلاق نامە) یان بدەنێ ئینجا وازیان لێ بهێنن؟

ئەویش فەرمووی: موسی لەبەر دڵ ڕەقیو دەروون ڕەشی ئێوە ڕێگەی پێداون کە لەخێزانەکانتان جیاببنەوەو لەسەرەتادا شتیوا نەبووە، من پێتان دەڵێم: هەرکەسێ جگە لەهۆی (بەدڕەوشتی) لەخێزانەکەی جیاببێتەوەو ژنێکی تر بێنێ ئەوا تووشی کاری بەدڕەوشتی بووە ، هەرکەسێ ئافرەتێکی تەلآقدراو بێنێ تووشی هەمان تاوان بووە، ئینجا قوتابیەکان وتیان: گەر ئەوە سەرەنجام و حاڵی پیاو بێت لەگەڵ ژندا باشتر وایە هەر ژن نەهێنێ ( متی ١٩ : ١-١٠).

لەم گفتوگۆیەدا بۆمان دەرئەکەوێت کە حەزرەتی عیسا وەك سزایەك جیا بوونەوەی حەرام کردووە کە جولەکە لە سەردەمی موسادا ﷺ زیادەڕەویەکی بێ سنووریان تێیدا کردبوو، مەگەر ئافرەتێکی بەدڕەوشتی کرد بێت، ئەمەش وەك چارەسەرێکی کاتی تا بەرنامە نەمرەکەی محمد ﷺ دێت و شوێنی دەگرێتەوە.

بۆیە قوتابیەکان ئەم حوکمەیان بەشتێکی قورس داناو وتیان: گەر ئەمە حاڵی پیاوێك بێت لەگەڵ هاوسەرەکەیدا باشتر وایە هەر ژن نەهێنێ چونکە هەر بە مارەکردنی هەر ئافرەتێك دەبێتە کۆسپی ڕێگایو هەرگیز لێی ڕزگار نابێت هەرچەند خۆشی ئەویو پێکیشەوە نەگونجێن.

پێشینان وتوویانە// گەورەترین بەلآ هاوڕێیەتی کەسێکە کە نەگونجێن و لێشت جیانەبێتەوە!

شاعیرێکی عەرەبیش دەڵێت:

وَمِنْ نكَدِ الدُنيا عَلَى الحُرَّ أنْ يَرَى     عَدُواً لَـهُ مَـا مِنْ صَداقَتِه بُدُّ

## ئەو سـنوورانەی ئیسلام بۆجیابوونەوەی داناوە

ئاینی پیرۆزی ئیسلام چەندین ئاستەنگی بۆ مەسەلەی جیابوونەوە داناوە تا لە بچووکترین بازنەدا نەبیٚ پراکتیزە نەکریٚ، وەبەبیٚ بەکارهیٚنانی ئەو ئالیەتانە ئیسلام ئەم کارەی حەرامو قەدەغەکردووە، هەروەك هەندیٚ لە فەقیهەکان دەڵێن: زیانێکە هاوسەرەکە بەخۆی و خێزانەکەشی دەگەیەنێت ، کەواتە گەر هۆکارێکی پێویست و پاراستنی بەرژەوەندی هەردوولا نەبووە هۆی روودانی ئەم کارە ئەوا وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویٚت: ( لا ضَرَرَ وَلا ضِرار )[1].

هەروەها خوای گەورەو پێغەمبەریش ﷺ ئەو کەسانەیان خۆش ناویٚت کە زوو زوو ژن دیٚنن، بەبیٚ هۆ لیٚیان جیادەبنەوە وەك دەفەرمویٚت: ( لا أحبُ الـذَوّاقين مِنَ الرِّجال وَالذَوّاقات مِنَ النِّساء )[2] یان ( إنَّ الله لا يُحبُ الذَوّاقينَ وَلا الذَوّاقات )[3].

هەروەها عەبدوڵڵای کوڕی عەباس دەفەرمویٚت: ( إنَّما الطَّلاق عَن وَطَر ).

## تەڵاقدانی ئافرەت لەکاتی سووڕی مانگانەی ئافرەتەکەدا

هەرکاتێك پیاویٚ ناچاربوو لەخێزانەکەی جیاببێتەوە، ئەوە دروست نییە پەلەی تێدا بکاتو هەرکاتیٚ ویستی جیٚبەجیٚ بکات بەڵکو دەبیٚ چاوەڕیٚی کاتێکی گونجاو بکات، ئەو کاتانەش کە شەریعەتی ئیسلام دیاری کردووە، دەبێت ئافرەتەکە لە حاڵەتێکی ئاسایی‌دا پاك دابێت و لەوکاتەدا نەچووبێتە لای ، مەگەر بە ئاشکرا پیٚوەی دیاربێت کە دووگیانە چونکە لەوانەیە لەکاتی (عادەی شەهری) یان زەیستاندا کە لە ئافرەتەکە دوورە ، هاندەرێك بێت بۆ جیابوونەوە، بۆیە ئەبێت چاوەڕیٚ بکات تا پاك دەبێتەوەو، پێش ئەوەی بچێتە لای بڕیاری جیابوونەوەکە بدات ، چونکە ئەشیٚ دووگیان ببێتو پاشان کەپیٚی زانی دوور نییە پەشیمان نەبێتەوە.

گەر دوای پاك بوونەوەی نەچووەلای یان دەرکەوت کە دووگیانە ئەوکاتە بۆی هەیە لیٚی جیاببێتەوە ، چونکە بڕیارێکی یەکجاری‌یەو بیٚ‌هۆ نیە.

لە (صحیح)دا هاتووە کە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر لەخێزانەکەی جیا بوویەوەو لەحاڵەتی (عادەی شەهری)دا بوو، حەزرەتی عومەر ﷺ دەربارەی پرسیاری لەپێغەمبەری خوا ﷺ کرد، ئەویش فەرمووی: پیٚی بڵیٚ کە بیگێڕێتەوە بۆ

---

[1] المغني ابن قدامة ج٧/ ل٧٧٢ و فەرموودەکەش ابن ماجەو الدارقطني گێراویانەتەوەو چەند ڕێگەیەکی هەیە. ت: ٢٥٤
[2] الطبراني والدارقطني ، ت: ٢٥٥.
[3] الطرباني لە(الكبير) بەسەنەدێکی حسن : ت: ٢٥٦.

لای خۆی و پاش پاکبوونەوەی بەبێ ئەوەی نزیکی بێتەوە ئەتوانێت تەلاقی بدات ، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾.

لەگێڕانەوەیەکی تردا دەفەرموێت: (مُرهُ فَلْيُراجِعْها ثُم لِيُطَلِّقَها طَاهِراً أوحَاملاً)[1]

بەلاَم ئایا ئەو بڕیارە لەوکاتەدا دەکەوێت یان نا؟

ئەو رایەی کە بلاَوە ئەوەیە کە دەکەوێت بەلاَم تاوانە .

وەهەندێ لە زانایانی فەقیە دەڵێن: تەلاَقەکە ناکەوێت، چونکە لە شەرعی خوای گەورە بەدەرەوە ئیتر چۆن بەراست دائەنرێ؟.

لە (ابو داود)ە وە بە سەنەدێکی راست دەگێڕێتەوە کە لە عەبدوڵلاَی کوڕی عمری پرسی: سەبارەت بە پیاوێك کە خێزانەکەی لەو حاڵەتە نائاسایی‌یەدا تەلاَق بدات؟

ئەویش بەسەرهاتەکەی خۆی بۆ گێڕایەوە کەچۆن پێغەمبەر ﷺ خێزانەکەی پێگێراوەتەوە[2] .

## سـوێند خواردن بە تـەلاَق حەرامـە

دروست نییە موسوڵمان سوێند بە تەلاَق بخوات کە فلاَن ئیش ئەکات یان وازی لێ دێنێت، یان هەڕەشە لە ژنەکەی بکات و بڵێت گەر وانەکەیت و وابکەیت ئەوا تۆ تەلاَق دراوی . سوێند خواردن لە ئیسلامدا سنووری تایبەتی خۆی هەیەو پێویستە بپارێزرێ ئەویش سوێند خواردنە تەنها بە ( اللّٰه ) ، حەزرەت ﷺ فەرمووی : ( من حلف بغير الله فقد كفر أو اشرك )[3] .

واتە: هەرکەسێ جگە لەخوا سوێند بە هەرشتێ بخوات ئەوا هاوەڵی بۆ خوا داناوە، یان دەفەرموێت: ( مَن كَانَ حَالفاً فَلْيَحْلِفَنَ بالله أَو لِيَصْمُت )[4] .

ئەوەی سوێند دەخوا یان سوێند بەخوا بخوات یان بێ‌دەنگ بێت.

---

1 / ت: ٢٥٧.

2 / ت: ٢٥٨.

3 / مسلم / ت: ٢٦٠.

4 / ابوداود والترمذي والحاكم ، ت: ٢٥٩.

## پێویسته ئافرەت تا تەواو بوونی (العدة)
## له ماڵی هاوسەرەکەیدا بمێنێتەوە

بەپێی بەرنامەی ئیسلام پێویسته ئەو ئافرەتەی کە لە هاوسەرەکەی جیا بۆتەوە لە ماڵی مێردەکەی‌دا بمێنێتەوە تا کاتی (عادەی شەهری) تەواو دەبێت ، وە حەرامە لەماڵ بچێتە دەرەوە یان هاوسەرەکەی بێ هەق لەماڵەکەی بیکاتە دەرەوە ، چونکە ئەگەر لەماوەی تەڵاقی یەکەم‌و دووەمدا بوو ئەشێ بەو ماوە دوور و درێژە جارێکی تر بیگەڕێنێتەوە ناو بازنەی هاوسەرێتی‌و بیرێکی نوێ لە پاشەڕۆژیان بکەنەوەو پاڵپشتێکە بۆ مافی هاوسەرەکەو رێزێکیشە بۆ خێزانەکەی و ئەشێ ببێتە مایەی گۆڕانی دڵ‌و نەمانی رق دامرکاننەوەی تووڕیی‌و لەجێیاندا خۆشەویستی‌و رێزو بیرێکی نوێ بڕوێتەوەو گەشە بکات.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَاتَّقُوا اللَّهَ رَبَّكُمْ لا تُخْرِجُوهُنَّ مِنْ بُيُوتِهِنَّ وَلا يَخْرُجْنَ إِلَّا أَنْ يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ لا تَدْرِي لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَلِكَ أَمْراً ﴾ سورة الطلاق: ١

ئەگەر بڕیاری جیابوونەوەکە درا پێویستە هەردوولا بەشێوەیەکی جوان‌و دوور لە ئازارو قسەی ناشیرین‌و پێشێل کردنی ماف کۆتایی پێ بهێنرێ خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ ﴾ الطلاق: ٢ واتە: بەشێوازێکی جوان مامەڵەیان لەگەڵ بکەن و بەجوانی وازیان لێ بهێنن .

هەروەها فەرموویەتی ﴿ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ ﴾ البقرة:٢٢٩ ﴿وَلِلْمُطَلَّقَاتِ مَتَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ حَقّاً عَلَى الْمُتَّقِينَ ﴾ البقرة: ٢٤١.

## باش ئەوەیە جیابووەنەوە قۆناغ دوای قۆناغ بێت

ئاینی پیرۆزی ئیسلام سێ قۆناغی جیابوونەوەی بۆ موسوڵمان داناوە لە سێ کاتدا ، تا هەرکاتێك لەکاتی پاکی ژنەکەی‌دا تەڵاقی بدات بەمەرجێ لەو پاکی‌یەدا نەچووبێتە لای ، پاشان وازی لێ بهێنێ تا عیدەکەی تەواو دەکات ، جا ئەگەر بە باشی زانی ئەتوانێ بیهێڵێتەوە ، وەئەگەر نەیگێڕایەوە لای خۆی و ماوەی عیدەکە تەواوبوو ئەوا بۆی هەیە بە مارەکردنێکی نوێ بیهێنێتەوە، بەڵام ئەگەر نەیویست ئەوا بۆ ئافرەتەکە هەیە شوو بکات بە پیاوێکی دیکە.

جا ئەگەر هێنایەوە بۆلای خۆی لەپاش تەڵاقی یەکەم‌و جارێکی تر ئاژاوەو ناکۆکی کەوتە نێوانیان و هیچ رێگەیەك نەما بۆ ئاشتبوونەوەیان ، ئەتوانێ تەڵاقی

دووەمی بدات ، ئەمجارەش گەر پەشیمان بووەوەو بەهەمان ڕێگەی پێشوو بیگێڕێتەوە بۆلای خۆی، ئنجا ئەگەر جیابوونەوەکە بەقۆناغی سیٚهەمدا تێپەری کرد ئەوە بەڵگەیەکی ئاشکرایە لەسەر نەگونجان‌و ڕێنەکەوتنیان.

لەبەرئەوە پاش جیابوونەوەی سیٚهەم بۆی نیە جارێکی‌تر بیگێڕێتەوە بۆ لای خۆی‌و مارەی بکاتەوە، هەتا ئەو ژنە بە ڕێگەیەکی شەرعی شوو بەپیاوێکی تر نەکات‌و بەشێوەیەکی مەبەست مارە نەکرێ، نەك مەبەست تیایدا حەلاڵ کردنی بێ بۆ مێردە کۆنەکەی : لێرەدا بۆمان روون دەبێتەوە هەرکەسێك هەرسێ تەلاقەکەی بە یەکجار بدات ئەوا دژی بەرنامەی ئیسلامە، هەواڵیان بۆ پێغەمبەر هێنا ﷺ کە پیاوێك بە یەکجار هەر سێ تەلاقی خێزانەکەی داوە، حەزرەتیش تووڕە بوو هەستایە سەر پێ‌و فەرمووی: ( أَيَلْعَبُ بِكتابِ الله وَأَنا بَينَ أَظهُرِكُم ! ) واتە: گاڵتە بە قورئان دەکات‌و منیش لەناوتاندام؟

هەتا یەکێك هەستایە سەرپێ‌و وتی: ئەی پێغەمبەر ئایا نەیکوژم ؟[1].

## هێشتنەوە یان جیابوونەوە بەشێوەیەکی جوان

گەر هاوسەرێك بڕیاری جیابوونەوەی لەخێزانەکەی داو گەشتە ئەوکاتەی بەعەمەلی جیٚبەجیٚ بکرێت ، ئەوا پێویستە لەسەر هاوسەر یەکێك لەم دوو کارە بکات: یان بەشێوەیەکی باش بیهێڵێتەوە لای خۆی ... واتە بەمەبەستی چاکە کاری لەگەڵیدا نەك زیان گەیاندن‌و تۆڵە سەندنەوە.

وەیان بەشێوازێکی جوان دەستی لیٚ هەڵبگرێ‌و لێی جیا ببێتەوە، واتە وازی لیٚ بێنیٚ تا عیددەکەی تەواو دەبێت‌و بە یەکجاری لێك جیادەبنەوە بەبیٚ ئازاردان‌و زیان پێگەیاندنی.

هەروەها دروست نیە بە مەبەستی زیان پێگەیاندن پێش تەواو بوونی عیددەکەی لای خۆی بیهێڵێتەوە یان بیەوێت دوورو درێژ بمێنێتەوەو نەهێڵێت شوو بەپیاوێکی تر بکات ، ئەمانە خەسڵەتێکن لە ئاکاری سەردەمی نەفامیدا بەرجەستە دەبوون .

وەخوای گەورە لە قورئاندا ئەم کارەی حەرام کردووەو دەفەرموێت : ﴿ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ سَرِّحُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَلا تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَاراً لِتَعْتَدُوا وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ وَلا تَتَّخِذُوا آيَاتِ اللَّهِ هُزُواً وَاذْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَمَا أَنْزَلَ عَلَيْكُمْ مِنَ الْكِتَابِ وَالْحِكْمَةِ يَعِظُكُمْ بِهِ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ البقرة: ٢٣١.

---

[1] النسائي: ت: ٢٦١.

واته: کاتێك لەخێزانەکانتان جیابوونەوەو گەیشتن بەکۆتای عیددەکە، یان بەشێوەیەکی جوان بیهێڵنەوە یان لێی جیاببنەوە، وەئازاریان مەدەن، بێگومان هەر کەس ئەوکارە بکات ئەوە ستەمی لەخۆی کردووە، وەگاڵتە بە فەرموودەکانی پەروەردگار مەکەن... وەبیر لەچاکەکانی خوای گەورە بکەنەوە کە رشتوویەتی بە سەرتاندا لە قورئان و فەرموودەی بەجێ... لەخوا بترسن و بزانن کەخوای گەورە ئاگاداری هەمووشتێکە.

گەر بەووردی سەرنجی ئەم ئایەتە پیرۆزە بدەین و لێی وورد ببینەوە، دەبینین لە حەوت قۆناغ پێکهاتووە، ترساندن لە پاشان ترساندن ، یادخستنەوە دوای یاد خستنەوە ... هەڕەشە پاش هەڕەشە ، ئەمانە بەسە بۆ کەسێك خاوەن دڵێکی هۆشیار یان بە بیروهۆشەوە گوێ بیستی بێت.

## کە ژنێك تەلاَق درا دروست نیە رێی شووکردنی لێ بگیرێ

هەرکاتێك ئافرەتی تەلاَق دراو ماوەی عیددەکەی تەواوبوو بۆ کەس لە هاوسەرو کەسوکاری نیە کە رێی شووکردنی لێ بگیرێ، وەنابێت ئاستەنگ بخرێتە رێگای مادام ئەو کەسەی بەپێی بەرنامەو عورفێکی شەرعی هەڵبژاردووە، بێگومان کە هەندێك پیاو لە خێزانەکەی جیابۆتەوەو پاشان بەشێوەیەکی زۆرەملێ هەڕەشە لە ئافرەتەکەو کەس و کاریشی دەکات کەنابێت دوای ئەو رازی بێت بەهیچ هاوسەرێکی تر ، ئەوە لە بەرنامەی ئیسلام بەدەرەو لەسەردەمی نەفامی‌دا پیادە کراوە.

هەروەها گەر ئافرەتەکە لەگەڵ هاوسەرەکەی ئاشتبووەوەو ناکۆکی لە نێوانیاندا نەما، حەزی دەکرد بەشێوەیەکی یاسایی بگەڕێتەوە بۆلای هاوسەرەکەی ، لەو کاتەدا دروست نیە کەسوکارەکەی رێی لێ بگرن، بەڵکو وەك چاکەکارییەکی خێرو باش بەشداری بکەن، وەك خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿ وَإِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلا تَعْضُلُوهُنَّ أَنْ يَنْكِحْنَ أَزْوَاجَهُنَّ إِذَا تَرَاضَوْا بَيْنَهُمْ بِالْمَعْرُوفِ ذَلِكَ يُوعَظُ بِهِ مَنْ كَانَ مِنْكُمْ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ذَلِكُمْ أَزْكَى لَكُمْ وَأَطْهَرُ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنْتُمْ لا تَعْلَمُونَ ﴾ البقرة: ٢٣٢.

واتە: کاتێك ژنەکانتان تەلاَق درا گەشتن بەکۆتای عیدەکەیان، ئەگەر ویستان بچنەوە لای هاوسەرەکانیان رێی شوو کردنیان لێ مەگرن، ئەمە جێی ئامۆژگاری‌یە بۆ کەسێك لە ئێوە کە بڕوای بە خواو رۆژی دوای هەبێت، ئەم پەندە پاکترین و چاکترین شتە بۆ ئێوە خوای گەورە زاناو دانایەو ئێوە نایزانن.

## مافـی ئەو ژنـەی مێردەکەی ناوێت

بۆ ژن هەیە گەر مێردەکەی نەویست و مامەڵەی باش نەبوو لەگەڵیدا، ئەوا خۆی رزگار بکات و سەربەستی خۆی بکرێتەوە، ئەوەش بەگەڕانەوەی ئەوەی بۆی سەرف کراوە لە مارەیی و دیاری ئیتر زۆرتر یان کەمتر بێت، بەگوێرەی رەزامەندی هەردووکیان ، وەباشتر وایە بۆ پیاوەکە کە زیاتر لەوە وەرنەگرێت کە بۆی سەرف کردووە پێشتر خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَلا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ ﴾ البقرة: ٢٢٩.

خێزانەکەی ثابتی کوی قەیس هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا!

ثابتی کوڕی قەیس نە لە ئایین و نە لە رەوشتدا کەم و کوڕی نییە ، بەڵام خۆشم ناوێت، پاشان پێغەمبەر ﷺ پرسیاری ئەوەی لێکرد کە لە (قەیس)ی وەرگرتووە، ئەویش وتی: باخێکم لێ وەرگرتووە ، پێی فەرموو: ئایا باخەکەی بۆ ئەگێڕیتەوە؟

وتی: بەڵێ ، بۆیە پێغەمبەرﷺ فەرمووی بە ثابت باخەکە وەربگرەوەو تەڵاقی بدە [1].

ژن بۆی نییە داوای بەپەلەی تەڵاق لە هاوسەرەکەی بکات بەبێ هیچ هۆیەك ، یان بەبێ شتێك کە پێویستی جیابوونەوەیان بکات ، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: (إيما امرأة سألت زوجها الطلاق من غير ما بأس فحرام عليها رائحة الجنة)[2].

واتە: هەر ژنێك بەبێ هۆیەك داوای تەڵاق و جیابوونەوە لە مێردەکەی بکات ، ئەوا بۆنی بەهەشتی لەسەر حەرامە .

## ئـازاردانی خێزان حـەرامـە

دروست نییە کە پیاو ئازاری خێزانەکەی بدات و مامەڵەی خراپی لەگەڵدا بکات، تا ناچاری بکا داوای جیابوونەوەی لێ بکات، بۆ گێڕانەوەی هەندێك یان هەموو ئەو پارەیەی بۆی خەرج کردووە، بێ ئەوەی هیچ سیفەتێك یان کارێکی نەشیاوی لێ بەدی بکرێت، چونکە قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: ﴿ وَلا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُوا بِبَعْضِ مَا آتَيْتُمُوهُنَّ إِلَّا أَنْ يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ ﴾ النساء: ١٩

---

[1] البخاري والنسائي گێراویانەتەوە، ت: ٢٦٢.
[2] ابوداود ، ت: ٢٦٣.

واتە: ڕێگەی ژیانی هاوسەرێتی‌یان لێمەگرن بۆ ئەوەی ناچاریان بکەن دەست لە مارەیی‌یەکەیان هەڵبگرن، مەگەر بۆتان ئاشکرا بێت کە بەدڕەوشتن ، ئەو کاتە بۆتان هەیە لەسەر مارەیی‌و شتی تر تەڵاق وەربگرن.

وەئەگەر پیاوەکە ژنەکەی نەئەویست‌و حەزی لە مارەکردنی ئافرەتێکی تر بوو ئەوا، حەرامە ئەوەی پێی بەخشراوە لێی وەربگرێتەوە، وەك قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: ﴿ وَإِنْ أَرَدْتُمُ اسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَكَانَ زَوْجٍ وَآتَيْتُمْ إِحْدَاهُنَّ قِنْطَاراً فَلا تَأْخُذُوا مِنْهُ شَيْئاً أَتَأْخُذُونَهُ بُهْتَاناً وَإِثْماً مُبِيناً وَكَيْفَ تَأْخُذُونَهُ وَقَدْ أَفْضَى بَعْضُكُمْ إِلَى بَعْضٍ وَأَخَذْنَ مِنْكُمْ مِيثَاقاً غَلِيظاً ﴾ النساء: ٢٠ ــ ٢١.

ئەگەر ویستتان لەخێزانەکانتان جیاببنەوەو ئافرەتێکی‌تر بهێنن، وسامانی زۆرتان پێ بەخشبوون لەمارەیی‌دا، هیچیان لێ مەسەننەوە، ئایا لێیان دەسەننەوە کەدەبێتە هۆی گوناه لەسەرتان؟ چۆن شتی وادەکەن کەچوونەتە لایان‌و بەهۆیەوە مارەی‌یەکەیان بۆتە ماڵ بەسەرتانەوە لەکاتێکدا پەیمانێکی پتەو توندیان لێ وەرگرتووە کە لەگەڵیاندا باش بن.

## سوێند خواردن لەسەر نەچوونە لای ژن حەرامە

یەکێکی‌تر لەخەسڵەتە جوان‌و بەرزەکانی ئیسلام لەبواری گرنگیدان بە ئافرەت ، ئەوەیە کە حەرامە پیاو لەخێزانەکەی تووڕە بێت و پاشان سوێند بخوا بە جیاکردنەوەی جێگە لێی. بەشێوەیەك ئەوەندە بخایەنێت کە ببێتە مایەی بێ تاقەتی خێزانەکەی، وە هەرکاتێك پیاو سوێندی خوارد کە نەچێتە لای تەنها چوار مانگ مۆڵەتی هەیە، بەڵکو لەو ماوەیەدا باری دەروونی هێمن ببێتەوەو بیرێکی لێ بکاتەوەو پەشیمان ببێتەوە، جا ئەگەر پێش تەواوبوونی ئەو ماوەیە هاتەوە سەر باری ئاسایی خۆی، ئەوا خوای گەورە لێی خۆش دەبێت‌و هەمیشە دەرگای لێخۆشبوون والایە، وەپێویستە کە کەفارەتی سوێندەکەی بدات.

بەڵام ئەگەر لەو ماوەیەدا پەشیمان نەبوویەوەو سووربوو لەسەر بڕیارەکەی جا هەندێ لە زانایانی بواری (فقە) رایان وایە لەگەڵ بەسەرچوونی ئەو ماوەیەدا زۆر بەئاسانی تەڵاقی خێزانەکەی دەکەوێت، بەبێ پەنابردن بۆ قازی یان حاکمێکی دادوەر.

هەندێکیان مەرجیان داناوە کە دوای تێپەڕبوونی ماوەکە حاکم ئاگادار بکرێتەوە پاشان حاکمەکە خۆی دوو ڕێگا لەبەردەم هاوسەرەکەدا دادەنێ، یان

خێزانەکەی ئاشت بکاتـەوە یان لێـی جیاببێتـەوە، کامیـان بەباش دەزانـێ ئـەوەیان ئەنجام بدات.

لە بەرنامەی ئیسلامدا بەم جۆرە سوێند خواردنە دەوترێت (الایـلاء) وەك خوای گەورە دەفـەرموێت: ﴿ لِلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِنْ نِسَائِهِمْ - أي يحلفون على البعد عنـــهن - تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ فَإِنْ فَاءُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ وَإِنْ عَزَمُوا الطَّلَاقَ فَإِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾ البقرة: ٢٢٦ -٢٢٧.

بۆیە ئەو ماوەیە بە چوار مانگ مەزەنـدە کراوە تا هـەلێکی لەبارو گونجاو بێت بۆ ئەو پیاوەی کە بیر بکاتـەوەو بتوانێ پەشیمان ببێتـەوە، وەئافرەتیش تا چـوارمانگ ئـەتوانێ لـەو رووەوە ئـارام بگرێـت ، هەنـدێ لـە راقـە کـارانی قورئـان سەرگوزشتەی عمری کوڕی خەتتاب دەگێڕنـەوە ﷺ کاتێك لـە شـەودا بـەناو شـاردا دەگەڕا گوێی لە دەنگی ئافرەتێك بوو ئەم شیعرەی دەوت:

لقد طال هذا الليل واسود جانبه     وارقني الا خليل الاعبه

فو الله، لولا الله نخشى عواقبه     لحرك من هذا السرير جوانبه

بـەم شـێوەیە ئافرەتەکـە سـکاڵای حـاڵی خـۆی دەکـرد کـە هاوسـەرەکەی ماوەیـەکی زۆرە لێـی دوور کەوتووەتـەوە، حـەزرەتی عومـەر ﷺ بـۆی دەرکـەوت کـە هاوسـەرەکەی ماوەیـەکی دوورو درێـژە چـووە بـۆ غـەزا، ئینجـا لـە حفصـەی کچـی پرسی: زۆرترین ماوە چەندە کە ئافرەت بتوانێت لە هاوسەرەکەی دوور بێت ؟

وتی: چوار مانگ ، ئینجا خەلیفەی موسـوڵمانان بڕیاری دەکـرد کـە نابێـت هاوسەر لە چوار مانگ زیاتر لە خێزانەکەی بەدوور بێت.

## لەنێوان دایكو باوكو جگەرگۆشەکاندا

## ئاینی پیرۆزی ئیسلام وەچە دەپارێزێ

منداڵ نهێنی باوكو هەڵگری تایبەتمەندییەکانیـەتی، وەرووناکی و نـوری چلاوی دایكو باوکە لەژیاندا، وەپاش مردنیشی درێـژە بـەرەوەوەی بونیـان دەدات. وەمنداڵ دایكو باوك و دایكوباوکیشی منداڵەکانی خۆی بناسێت.

بۆیە مارەکردن میکانیزمێکە بەهۆیەوە ئافرەت تایبەت دەبێت بەوپیاوەوەو حەرامە خیانـەتی لێبکات، یان باخەکەی بـەئاوی کەسێکیتر ئـاو بـدات بۆیـە ئـەو ئافرەتـە هـەر منداڵێکی دەبێـت ئەوپیاوە دەبێتـە بـاوکی بێئەوەی پێویسـت بـەدان پیانانو بانگەواز بکات وەك پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: ( فالولد للفراش)[1].

---

[1] متفق عليه ، ت: ٢٦٤.

## نابێت باوك نكوولّی له وەچـه ( منداڵ ) ی خۆی بكات

كەواته هاوسەر نابێت نكولّی لەو وەچەیەی خۆی بكات كه له خێزانەكەی له دایك بووه واته كه لەحالّەتێكی شەرعیدا بەیەكگەشتوون، چونكه نكولّی له كارێكی ئاوها زیانێكی زۆری لەدواوەیەو پەڵەیەكی رەش بەسەر رووی دایكو منداڵەكەدا بەجێ دێڵێ وەنابێت باوەڕ بەهیچ هەواڵێكی نادروستو بێبناغه بكات.

بەلاّم ئەگەر بەهۆی هەندێ بەڵگەی باوەڕ پێكراوەوه بۆی دەركەوت كه خێزانەكەی ناپاكی لەگەڵدا دەكاتو نەیتوانی لەخۆی دووربخاتەوه، ئەوكاته یاسای پیرۆزی ئیسلام رازی نابێت كه منداڵێك پەروەرده بكات كه لەسەر بنەمای گومان ژیان بەسەر بەرێت و ببێته میرات گرێك كه هیچ مافێكی بەسەرەوه نیه یان هیچ نەبێت بەدرێژایی ژیانی لەگێژاوی گوماندا بژی، بۆیه یاسای ئیسلام دەروازەیەكی بۆ كردۆتەوه بەناوی (اللعـــان) كه لەكاتێكدا واگومانی دەبرد كه خێزانەكەی كارێكی ناشیرینی كردووەو ئەو منداڵه هی خۆی نییه، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ بەڵگەیەكی ئاشكرایی بەدەستەوه نەبوو، ئەتوانێ داواكارییەكەی بخاته بەردەستی دادوەره، دادوەریش پرۆسەی (اللعان) نەفرەت كردن، ئەنجام بدات، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُن لَّهُمْ شُهَدَاء إِلَّا أَنفُسُهُمْ فَشَهَادَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ {٦} وَالْخَامِسَةُ أَنَّ لَعْنَتَ اللَّهِ عَلَيْهِ إِن كَانَ مِنَ الْكَاذِبِينَ وَيَدْرَأُ {٧} عَنْهَا الْعَذَابَ أَنْ تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الْكَاذِبِينَ {٨} وَالْخَامِسَةَ أَنَّ غَضَبَ اللَّهِ عَلَيْهَا إِن كَانَ مِنَ الصَّادِقِينَ {٩}﴾ النور: ٧-٩، پاشان تا ئەبەد به یەكیان جیا دەكاتەوەو منداڵەكەش دەدرێت به دایكەكه.

واته هاوسەرەكه لای دادوەر چوارجار ئەڵێت من شایەتی ئەدەم بەخوا كه هەر قسەیەك دەكەم راستم وتووه، وه له پێنجەمین جاردا بڵێت ئەگەر له كۆمەڵی راستگۆیان نەبم نەفرەتی خوای گەورەم لێ بێت ، وه بۆ ئەوەی ژنەكەش لەداری حەد بەدوور بێت چوارجار بڵێت ئەو پیاوه راست ناكات، وه ئەگەر راستیش دەكات خوا خەشمی خۆی بەسەرمدا برژێنێ.

## لەئیسلامدا منداڵ كردن به رۆڵەی خۆ حەرامـه

لەبەرئەوەی باوك بۆی نییه نكوولّی له وەچەی خۆی بكات، ئاوهاش بۆی رەوا نییه كه منداڵی كەسێكی تر بكات بەمنداڵی خۆی، عەرەبەكان لەسەردەمی نەفامیدا وەكو زۆرێك لەگەلانی دی كه هەر منداڵێكیان بویستایه دەیانكرده منداڵ

و ئەندامی خێزانەکەی خۆیان لەرێی (التبني) بەخێوکردنەوە ، بەشێوەیەك هەموو مافێکی ئەو خێزانە بۆ ئەوانیش رەوا دەبوو، وەئەگەر دایك و باوکەکەش بیانزانیایە نەدەبوونە رێگر لەبەردەم ئەم کارەدا.

کاتێك ئاینی پیرۆزی ئیسلام هات بینی ئەم کارە وەك یاسایەك لەناو گەلی عەرەبدا بەشێوەیەکی ئاشکرا پیادە دەکرێ، تەنانەت پێغەمبەریش ﷺ لەسەردەمی پێش ئیسلامدا زەیدی کوڕی حارثەی کردبوو بە کوڕی خۆی، زەید لەکاتی جەنگدا گیرابوو حەکیمی کوڕی حزام بۆ خەدیجەی پووری کڕی، دوای ئەوەی بووە خێزانی پێغەمبەر ﷺ بەخشی بە حەزرەت.

وە کاتێك دایك و باوکی شوێنەکەیان زانی داوایان کردەوە، حەزرەتیش ﷺ ئارەزووی هەڵبژاردنی دایەدەست زەید، زەیدیش بە ویستی خۆی لای پێغەمبەر ﷺ مایەوەو لەگەڵ ئەواندا نەرۆیشتەوە، پاشان پێغەمبەریش ئازادی کردو کردی بە کوڕی خۆی، هەر لەو کاتە بەدواوە بە زەیدی کوڕی محمد ناسرابوو وەیەکەم کەس بوو لەنێو بەندەکاندا کە باوەڕی بەپێغەمبەر ﷺ هێناوە.

## بۆچوونی ئیسلام چۆن بوو دەربارەی ئەم یاسایە؟

ئیسلام پێی وایە (تبني) گۆڕینی سروشت و واقعەو کارێکە کەسێکی نامۆ دەخاتە بازنەی خێزانێکەوەو دەیکاتە ئەندام تێیدا، لەهەمان کاتدا زۆرجار تووشی حاڵەتی خەڵوەت و تەنیایی دەبن، چونکە ژنی پیاوەکە نە دایکیەتی ، نە خوشکیەتی ، نە پووریەتی ، بەڵکو هەموویان بێگانەیە، ئەو کوڕە کە لەلایەن ژن و پیاوێکەوە دەبێتە کوڕیان مافی میراتگرە راستەقینەکان پێشێل دەکات کە زۆرجار ئەو رق و کینەیە ئاگری ناکۆکی لەنێوانیاندا بەرپا دەگات و پەیوەندی خزمایەتی دەپچڕێنێ ، هەربۆیە قورئانی پیرۆز بۆ هەتا هەتایە قەدەغەی کردووە، وەك دەفەرموێت: ﴿وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَاءَكُمْ أَبْنَاءَكُمْ ذَلِكُمْ قَوْلُكُمْ بِأَفْوَاهِكُمْ وَاللَّهُ يَقُولُ الْحَقَّ وَهُوَ يَهْدِي السَّبِيلَ ادْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِنْدَ اللَّهِ فَإِنْ لَمْ تَعْلَمُوا آبَاءَهُمْ فَإِخْوَانُكُمْ فِي الدِّينِ وَمَوَالِيكُمْ﴾ الاحزاب: ٤ - ٥.

ئێستا بابیر لەم ئایەتە بکەینەوە کە دەفەرموێت: ﴿وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَاءَكُمْ أَبْنَاءَكُمْ ذَلِكُمْ قَوْلُكُمْ بِأَفْوَاهِكُمْ﴾ واتە قسەکردن بەتەنها ناتوانێت حەقیقەتەکان بگۆڕێ، وەبێگانەیەك ناکاتە کەسێکی نزیك... هەروەها لەناخی بەخێوکاردا هەستی باوکایەتی و لەدڵی منداڵەکەش دڵسۆزی جگەرگۆشەیی ناچێنێ، وەنابێتە

هەڵگری تایبەتمەندییە چاکەکانی و مەلامحە جەستەییو ژیری و دەروونیە خێزانیەکەی ، ئاینی پیرۆزی ئیسلام هەموو ئاسەوارەکانی ئەم یاسایەی سڕیوەتەوە لەبواری میراتو حەرام کردنی ژن هێنان بۆ ئەو منداڵەی کردوویەتی بە کوڕی خۆی.

لەقورئانی پیرۆزدا جگە لەخزمایەتیو پەیوەندی هاوسەرێتی هیچ کەسێکی دیکەی نەکردۆتە میراتگر وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأُولُوا الْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَى بِبَعْضٍ فِي كِتَابِ اللَّهِ﴾ الانفال: ٧٥ واتە: ئەوانەی کە میرات لەیەك وەردەگرن دەبێت خزمایەتی لەنێوانیاندا هەبێت، وە دەربارەی مارەکردن قورئان دەفەرموێت، کە بووك (واتە: ژنی کوڕی نەسەب) لە مرۆڤ قەدەغەیە نەك ژنی بە کوڕ کراو.

﴿وَحَلَائِلُ أَبْنَائِكُمُ الَّذِينَ مِنْ أَصْلَابِكُمْ﴾ النساء: ٢٤ واتە: پیاو دەتوانێت ژنی بە کوڕ کراو بهێنێتەوە ، هەرکاتێك هاوسەرەکەی مرد یا خۆی تەڵاق دا، چونکە ژنی پیاوێکی بێگانەیە.

## نەهێشتنی یاسای ( تبني ) لە شێوازی ووتارەوە بۆ شێوازی پراکتیکی

ئەم کارە شتێکی هێند ئاسان نەبوو بەلای خەڵکییەوە، چونکە ببوە دەستوورێکی کۆمەڵایەتی و ریشەیەکی قووڵی داکوتابوو لەژیانی عەرەبدا، ویستی خوای گەورەبوو کە تەنها بەقسەو گوفتار نەبێت، بەڵکو خستیە بازنەی پراکتیزە بوونەوە.

کارەکانی پەروەردگار ووردبینانەو حەکیمانەن، بۆیە بۆ ئەم گۆڕانکارییە گرانە خودی پێغەمبەری (هەڵبژارد تاهیچ گومانێکی تێدا نەمێنێ و هیچ نەنگییەك روونەکاتە موسوڵمانان و یەقینیان بۆ دروست بێت کە حەڵاڵ ئەوەیە کە خوای گەورە رێی پێداوەو حەرام ئەوەیە پەروەردگار نەهی لێکردوە).

زەیدی کوڕی حاریسە بە (زەیدی کوڕی محمد) ناسرابوو، زەینەب کچی جەحشی مارە کردبوو ، زەینەب کچی پووری پێغەمبەر ﷺ بوو، هەمیشە لەگەڵ زەید ناکۆکیان بوو، زۆرجار زەید سکاڵای دەبردە لای پێغەمبەر ﷺ خوای گەورە خستبوویە دڵی پێغەمبەرەوە کە زەید لە زەینەب جیا دەبێتەوەو ئەم مارەی دەکات . بەڵام سیفەتی لاوازی زۆرجار بەسەر مرۆڤدا زاڵ دەبێت، دەبینین پێغەمبەر ﷺ لەبەر لۆمەی خەڵکی نەیدەتوانی بە زەید بڵێ لە زەینەب جیابەرەوە، بۆیە هەر ئامۆژگاری دەکردو دەیووت لەخوا بترسە.

لێرەدا خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا سەرزەنشتی پێغەمبەر ﷺ دەکات و لەهەمان کاتدا پشتگیری دەکات لە رووبەڕووبوونەوەی کۆمەڵگەکەی لە پێناو دارمانی ئەو یاسا کۆن و بێ نرخە وەك دەفەرموێت: ﴿ وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِي أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِ (بالإيمان) وَأَنْعَمْتَ (بالعتق) عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَاتَّقِ اللَّهَ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى النَّاسَ وَاللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَاهُ فَلَمَّا قَضَى زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَاكَهَا لِكَيْ لَا يَكُونَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِي أَزْوَاجِ أَدْعِيَائِهِمْ إِذَا قَضَوْا مِنْهُنَّ وَطَرًا وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ مَفْعُولًا {٣٧} ﴾ الاحزاب: ٣٧.

واتە: کاتێك بە زەید ئەڵێیت خێزانەکەت بهێڵەرەوەو لەخوا بترسە، و لە لۆمەو قسەی خەڵکی ئەترسی ، خوای گەورە دەفەرموێت لەقسەی خەڵك مەترسە بەڵکو لەخوا بترسە ، وەکاتێ زەید لە زەینەبی جیابوویەوەو عیددەی بەسەرچوو، خوای گەورە فەرمووی وا زەینەبمان لێ مارە کردی تا خەڵکی هیچ دوودڵی و تەنگی‌یەك روویان تێ نەکات لە مارەکردنی ژنی بەکوڕکراویان.

هەروەها قورئانی پیرۆز بۆ پێغەمبەر ﷺ روون دەکاتەوە کە مارەکردنی ژنی (تبنی) رێی پێدراوەو زیانی تێدانیە، ﴿ مَّا كَانَ عَلَى النَّبِيِّ مِنْ حَرَجٍ فِيمَا فَرَضَ اللَّهُ لَهُ سُنَّةَ اللَّهِ فِي الَّذِينَ خَلَوْا مِن قَبْلُ وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ قَدَرًا مَّقْدُورًا {٣٨} الَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَالَاتِ اللَّهِ وَيَخْشَوْنَهُ وَلَا يَخْشَوْنَ أَحَدًا إِلَّا اللَّهَ وَكَفَى بِاللَّهِ حَسِيبًا {٣٩} مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَكِن رَّسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ وَكَانَ اللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا {٤٠}﴾ الاحزاب: ٣٨ ــ ٤٠.

واتە: هیچ تانەو لۆمەیەك لەسەر پێغەمبەر ﷺ نیە لە بەجێهێنانی هەر فەرمانێك کەخوای گەورە بۆی داناوە کە تەواوکاری رێچکەی پێغەمبەرانی پێش خۆیەتی، ئەبێ فەرمانی خوای گەورە جێبەجێ بکرێت، پێغەمبەران پەیام و بەرنامەکانی خوای گەورەیان راگەیاندوو جگە لەخوا لەکەسی دیکە نەدەترسان، وە محمد ﷺ باوکی راستەقینەی کەستان نەبووە، و دوایەمین نێردراوی خوای گەورە وەخوای گەورە ئاگاداری هەمووشتێکە.

## ( تبني ) بە مانای سەرپەرشتی و پەروەردە کردن

ئەوەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام حەرامی کردبوو، ئەوەیە کە پیاوێکە منداڵێك دەگرێتە خۆی، کەباش بزانێت منداڵی کەسێکی ترە لەگەڵ ئەوەشدا دەیکات بەکوڕی خۆی دەبێتە ئەندامێکی خێزانەکەی، و هەموو حوکمێکی کوڕێتی لە بواری تێکەلاوی و میرات و حەرامکردنی مارەی ژنەکەی بەسەردا جێبەجێ دەکات.

بەلاّم جۆرێكی تر پەروەردەو گرنگی پێدان هەیە كەخەڵكی دەیخەنە بازنەی (تبنّي)یەوە، بۆ نموونە پیاوێك منداڵێكی بێ باوك یان فڕێدراو پەروەردە بكات، و بیخاتە ژێر سۆزو چاودێری خۆیەوەو لەباوەشی بگرێ و خواردنو پۆشاكو پێویستییەكانی بۆ دابین بكات و وەك كوڕێكی خۆی مامەڵەی لەگەڵدا بكات، بەلاّم لەگەڵ ئەمانەشدا مافی منداڵەكانی بەسەردا پەیكەڵ ناكات لەو بوارانەی كە پێشتر باسمان كرد، كەواتە ئەم جۆرە پەروەردە كردنە كارێكی جوانە لەئاینی پیرۆزی ئیسلامداو ئەو كەسە شایەنی بەهەشت دەبێت وەك پێغەمبەری ئازیز ﷺ دەفەرموێت: ( أنا وَكافِلُ اليَتِيم في الجَنَّة كَهاتَين هَكذا وأَشارَ بالسبابَة وَالوُسْــطَى وَفَرَّجَ بَيْنَهُمَــا)[1]، واتە: من و بەخێوكاری بێ باوك لە بەهەشتدا ئاوهاین و پاشان ئیشارەتی بۆ پەنجەی شایەتمانو ناوەڕاست كرد.

منداڵی فڕێ دراویش هەمان پاداشتی منداڵی بێ باوكی هەیە ، وەباشتر وایە ناوی (إبن السبيل) لێ بنرێ. وە ئەگەر ئەو پیاوە خاوەنی منداڵ نەبوو، ئەتوانێ هەندێ لەو دارایییەی خۆی ببەخشێ بەو منداڵە لەژیانیدا، وەئەتوانێ بۆ دوای مردنیشی سێ یەكی سەروەتو سامانەكەی پێ ببەخشێ لە ڕێی وەسیەتەوە.

## پیتاندنی دەستكرد ( التلقيح الصناعي )

گەر ئیسلام نەوەكان و ڕەچەڵەكەكان بپارێزێت لە ڕێگەی حەرام كردنی داوێن پیسیو بەدڕەوشتییەوەو، یان لەڕێگەی حەرامكردنی منداڵانی تر بەڕۆڵەی خۆ ، بەم جۆرە خێزان پاڵفتە ئەبێت لەهەموو ڕەگەزێكی نامۆ بەو خێزانە، هەر بۆیە ئەو كارەشی بەپیتاندنی دەستكرد ناوی دەركردووە، بەمەرجێ ئەو پیتاندنە بە جگە لە تۆوی پیاوەكەی خۆی بێت، لەم حاڵەتەدا هەروەك مامۆستای گەورە (**شێخ شلتوت**) ئەفەرموێ:

تاوانێكی ناڕەواو خراپەیەكی گەورەیە، لەم ڕووەوە لەیەك چوارچێوەدا بە زینا ئەگاتەوە، و جەوهەری هەردوو كردارەكە یەكێكە، هەروەك دەرەنجامەكەش یەكێكە، كە بریتییە لەدانانی ئاوی پیاوێكی بێگانە لە منداڵانی ئافرەتێكدا بەمەبەستی منداڵ كەوتنەوە، كە جۆرێك لە پەیوەندی لەنێوان ئەو ژنو پیاوەدا نییە كەمنداڵەكە بكاتە نەوەیەكی شەرعیو یاسا سروشتییەكە بێتە سابات بۆی وەگەر كەمو كوڕییەك نەبێت لە وێنەی تاواندا، ئەوا حوكمی ئەم جۆرە پیناندنە ،

---

[1] البخاري وابوداود والترمذي ، ت: ٢٦٥.

هەمان حوكمی زینای ئەبوو كە پەیامە ئاسمانییەكان دیاریان كردووەو و پەڕاوی ئاسمانی لەسەر دابەزیووە.

وە ئەگەر ئەو پیتاندنە بەئاوێك پێك بێت جگە لە مێردی ئەو ئافرەتەی پیتاندنەكەی بۆ ئەنجام ئەدرێت ، ئەوا بێگومان تاوانەكە زۆر گەورەترە، و لە بە رۆڵە كردن (التبنی) توندتر نەرێی لێكراوە... چونكە گەر ئەو پیتاندنە رۆڵەی دروست كرد ، ئەوا دەرەنجامی بەرۆڵەكردنی ناوبراو كۆئەكاتەوە، كە بریتییە لەدانانی رەگەزێكی نامۆ لە رەچەڵەكدا ، ئەمە لەلایەك، وەلەلایەكی ترەوە یەك گرتنەوەیەتی لەگەڵ زینادا ، كە ئەویش دابەزینی مەزنی مرۆڤە بۆ ئاستێكی ئاژەڵی كەهیچ جۆرە هەستێكی تیادا نییە سەبارەت بەوابەستە بوونی كۆمەڵگەكان ) [1].

## ( إنتساب الولد الی غیر أبیه یوجب اللعنة )

## گەڕانەوەی بنچینەی منداڵ بۆ جگە لە باوكی خۆی ، جێگەی نەفرین كردنە

هەروەك چۆن ئیسلام حەرامی كردووە كە باوك بەبێ هۆ نكوڵی لەكوڕی خۆی بكات، ئاوهاش حەرامی كردووە كە منداڵ پشت لە نەسەبی خۆی بكاتو كەسێكی تر بكاتە باوكی، پێغەمبەر ﷺ ئەم كارە بەگوناهێكی گەورە لەقەڵەم دەدات كە دەچێتە قاڵبی نەفرینو سەرزەنشتەوەو ، جارێكیان عەلی ﷺ لە مینبەرەوە قسەی بۆ خەڵكی دەكردو پارچەیەك كاغەزی لەبەردەستا بوو كە تێیدا نووسرابوو پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( من إدَّعی الی غَیرِ أبیهِ ، أو إدَّعی الی غَیرِ مُوالیه فَعَلَیه لَعنَةُ الله والمَلائكة وَالناس أَجْمَعِین ، لا یَقبَلُ الله منهُ یَومَ القیامَة صَرْفاً وَلا عَدلاً ) [1].

هەروەها سەعدی كوڕی ئەبی وەقاص دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ( من إدَّعی الی غَیرِ أَبیهِ وَهُوَ یَعْلَمُ إنَهُ غَیر أبیه فالجَنَّةُ علیه حَرام)[2]. واتە: هەر كەسێ مرۆڤێكی تر بكاتە باوكی و بشزانێت كە باوكی نیە ئەوا بەهەشت لێی حەرام دەبێت.

## منداڵەكانتان مەكوژن

پاش ئەوەی ئایینی پیرۆزی ئیسلام پاراستنی وەچەو نەوەكان لە ئەستۆ دەگرێ، لەهەمان كاتدا بۆ هەریەك لە منداڵو دایكو باوك مافی تایبەتیان بۆ دانراوە، و چەند سنوورێكی بۆ داناون كە دەبێتە پاراستنی ئەو مافانە.

---

[1] بڕوانە بۆچوونەكانی (الفتاوی) ی شێخشلتوت ، لا: ٣٠٠.
[1] متفق علیه ، ت: ٢٦٦.
[2] متفق علیه ، ت: ٢٦٧.

یەكێك لە مافەكانی منداڵ ژیانە، كەواتە بۆ هیچ كام لەدایك وباوك نیە كە دەست درێژی بكەنە سەر ژیانی ئەو منداڵە بەكوشتن بێت یان زیندە بەچاڵ كردن ، هەروەك هەندێ لەعەرەبەكانی سەردەمی نەفامی دەیانكرد، ئەبێ ئەوەش بزانین كە كوڕو كچ لەو مافانەدا یەكسانن، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلاَ تَقْتُلُواْ أَوْلادَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلاقٍ نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُم إنَّ قَتْلَهُمْ كَانَ خِطْءًا كَبِيرًا {٣١}﴾ الاسراء.

واتە: منداڵەكانتان مەكوژن لەترسی هەژاری ئێمە رۆزی ئەوان و ئێوەش دابین دەكەین، بەراستی كوشتنیان تاوانێكی گەورەیە، هەروەها ئەفەرموێت: ﴿وَإِذَا الْمَوْؤُودَةُ سُئِلَتْ {٨} بِأَيِّ ذَنبٍ قُتِلَتْ {٩}﴾ التكویر. واتە: كاتێ پرسیار لەوانە ئەكرێت كە زیندە بەچاڵ كراون ئایا تاوانیان چیبووە؟ پاڵنەری ئەم تاوانە هەرشتێك بێت ئیسلام زۆر بەتوندی رێ لەم جۆرە كارانە دەگرێت، جا ئایا باری ئابووری بێت یان لەبەر عەیبە یان ئەگەر كچ بێت. چونكە دەچێتە چوارچێوەی كوشتنەوەو دەست درێژیيە بۆ سەر نەفسێكی لاوازو بێ دەسەلات، بۆیە كاتێك پرسیار لەپێغەمبەر ﷺ كرا: أيُ الذَنْب أعْظَم ؟ فَقَالَ:أَنْ تَجْعَل لله نداً وَهُوَ خَلَقَك، قيلَ: ثُم أيُّ ؟ قَالَ أن تقتُل وَلَدَكَ مَخافَةَ أنْ يُطعم مَعَك )[1]. واتە پرسیاكرا : چ گوناهێك گەورەیە؟ لەوەلامدا فەرمووی: هاوبەش بۆخوای گەورە دابنێیت كە دروستی كردوویت، وترا: چی تر؟ فەرمووی: منداڵی خۆت بكوژی لەترسی هەژاریو لەوەی كە خواردنت لەگەڵ بخوات .

پێغەمبەر ﷺ هەروەك پیاوان پەیمانی لە ژنان وەرگرت لەسەرجەم حەرام كردنی ئەم تاوانە: ﴿ أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِاللَّهِ شَيْئًا وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَادَهُنَّ ﴾ الممتحنـــة :١٢واتە: هاوبەش بۆ خوا دانەنێن ، دزی نەكەن و بەدڕەوشتی نەكەن و منداڵەكانیان مەكوژن.

یەكێك لە مافەكانی منداڵ بەسەر باوكیيەوە ئەوەیە كە ناوێكی جوان شیاوی بۆ هەڵبژێرێ، تا لەكاتی گەورەبوونیدا نەبێتە ئازارو ناخۆشی بۆ سەر دەروونی منداڵەكە وەنابێ جگە لەعەبدی خوا بەعەبدی هیچ شتێكیتر بانگ بكرێت وەك (عَبدَ النَبّي) (عَبدَ المَسيح) هەروەها منداڵ مافی پەروەردەو بەخێو كردنی هەیەو نابێت لەلایەن دایكو باوكەوە بخرێتە پەراوێزەوە.

پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: (كُلكُم راعٍ وكُلكُم مَسؤولٌ عَن رَعِيتهِ)[2] واتە: هەمووتان شوانن و بەرپرسن لە ژێردەستەكانتان .

---

[1] / متفق علیه ، ت: ٢٦٨.
[2] / متفق علیه ، ت: ٢٦٩.

( كَفي بالمرأ أَن يُضَيعَ مَن يَقــوت )[1] . واتـه: هێنـده خراپـه بۆ مـرۆڤ بەسـه کـه ئەوەی بژێوی دابین ئەکات لەدەستی بدات .

( إنَّ الله سائل كُل راعٍ عما إسترعاهُ ، حَفظَ أَم ضيَّعَ ، حَتى يُسأل الرَّجل عَن أهل بَيته)[2] .

واته: خوای گەوره ئەپرسێتەوه لەهەموو شوانێك لەوەی کە له ژێردەستیدا پـەروەردەیان ئـەکات، بپـارێزێ یـان لەدەسـتی بـدات تەنانـەت مـرۆڤ لەئەنـدامانی خێزانەکەی لێی ئەپرسێتەوە..

## داد پـەروەری له بەخشینـدا

پێویسته لەسەر باوك کە بە یەکسانی مامەڵەی بەخشین لەگەڵ منداڵـەکانی بکـات، وەحەرامـە جیـاوازی بخاتـه نێوانیانـەوەو ئـاگری رقو کینـه هەڵگیرسـێنێ بەهەمان شێوه دایکیش دەبێت هەمان رێگای پەروەردەکردن هەڵبژێرێ.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ( إعدلوا بَين أبنائكم ، إعدلوا بَين أبنائكُم ، أعدلوا بَينَ أبنـــــائكم )[3] واتـه: سـێجار فـەرمووی دادپـەوەربن لـەنێوان منداڵەکانتانـدا ئـەم فەرموودەیـه بـەو هۆیـەوه وتـراوه کـه خێزانـی بەشـیری کـوڕی سـەعدی ئەنصـاری داوای له بەشیر کرد کە بەشێکی تایبەتی له ماڵەکەی بۆ نعمانی کوڕی دابین بکات، لەباخ یان بەندەیەکی بداتێ، ئەویش بۆ زیاتر دڵنیابوون داوای لێ کرد کە پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا خێزانەکەم کە فلانی کچی فلانه کە بەندەیەك بدەم بە کوڕەکـەی، پاشـان پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: أَلَهُ إخوَة؟ ئایـا برای هەیـە؟ وتـی: بـەڵێ، حەزرەت فـەرمووی: (كُلهُم أعطيت مثلَ ما أعطَيتهُ، واتـه وەکـو ئـەو بەشـی هـەموویانت داوه؟ قال : لا وتی: نـەخێر ، بۆیـه فـەرمووی : أَفَلَيس يَصلُح هذا وإنني لا أشهَدُ إلاّ عَلَى حَق )[4] . واته: شتیوا رەوانیەو منیش لەسەر هەق نەبێت شایەتی نادەم.

( أَن تشهِدَنِي عَلى جَور ، إنَّ لَبنَيكَ عَلَيكَ حَقٌ أن تَعدل بَينهم كَما لَكَ عَلَيهم مـــن الحَق أَن يَبرُرك)[5] . واته: مەمکه بە شایەت لەسـەر شـتی ناهەق ، بێگومـان کوڕەکانت هەقیان بەسەرتەوه کە دادپەوەر بیت لەگەڵیاندا، هەروەك تۆش هەقت بەسەریانەوه هەیە کە چاك بن لەگەڵتدا ).

---

[1] / ابوداود والنسائي و الحاكم ، ت: ٢٧٠.
[2] / ابن حبان (صحيح)ه ت: ٢٧١.
[3] / احمد والنسائي وابو داود. ت: ٢٧٢.
[4] / مسلم واحمد وابو داود، ت: ٢٧٣.
[5] / گێرانەوەی (ابو داود) ، ت:٢٧٤.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ( إتقوا الله وأعدلوُا في أَولادكُم )[1] واتە: لە خوا بترسن و دادپەوەربن بەپێی رای ئیمامی احمد دروستە بەشی زیاتر بدرێت بە برایەکیان ئەگەر هۆیەکی گونجاو لەگەڵ هەبوو، بۆ نموونە : ئەگەر تووشی نەخۆشییەکی قورس هاتبوو وەك ئیفلیجی[2] .

## بەخشینی میرات لە سنووری خوای گەورەدا

سەبارەت بەمیراتیش بەهەمان شێوە نابێت باوك هەندێ لە منداڵەکانی بێ بەش بکات. یان کچەکانی پشتگوێ بخات، یان منداڵی ئەو ژنەی کەلای خۆی نیە، تەنانەت نابێت خزمێکیشی لێ بێبەش بکات، چونکە میرات دەستوورێکە خوای گەورە بەدادو حەکیمی خۆی بڕیاری لەسەرداوەو هەرکەسێك بەپێچەوانەی ئەم دەستوورە مامەڵەی کرد ئەوا تووشی تاوانێکی گەورەبووە.

خوای گەورە لەسێ شوێندا باسی میراتی کردووە، وەك دەفەرمووێت: ﴿آبَآؤُكُمْ وَأَبناؤُكُمْ لاَ تَدْرُونَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ لَكُمْ نَفْعاً فَرِيضَةً مِّنَ اللّهِ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلِيما حَكِيمًا {١١}﴾ النساء.

هەروەها لەکۆتای ئایەتی دووەمدا دەفەرموێت: (غَيْرَ مُضَآرٍّ وَصِيَّةً مِّنَ اللّهِ وَاللّهُ عَلِيمٌ حَلِيمٌ تِلْكَ حُدُودُ اللّهِ وَمَن يُطِعِ اللّهَ وَرَسُولَهُ يُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ {١٣} وَمَن يَعْصِ اللّهَ وَرَسُولَهُ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُ يُدْخِلْهُ نَارًا خَالِدًا فِيهَا وَلَهُ عَذَابٌ مُّهِينٌ {١٤}﴾ النساء.

وە لەکۆتایی ئایەتی سێیەمدا دەفەرموێت: ﴿يُبَيِّنُ اللّهُ لَكُمْ أَنْ تَضِلُّوا وَاللّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴾ النساء : ١٧٦

کەواتە هەرکەسێك لەوبڕیارە دەرچێت کەخوای گەورە لەمیراتدا دیاری کردووە، ئەوا لەسنووری خوا چۆتە دەرەوەو باچاوەڕێی ئەو هەڕەشەیە بێت کە دەفەرموێ ﴿ نَاراً خَالِداً فِيهَا وَلَهُ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴾ النساء : ١٤.

---

[1] / الشیخان ، ت: ٢٧٥.

[2] / لە (المغنی) ئەفەرمووێ: گەر هەندێك بۆ مانایەك تایبەتیان کرد، کە پێویست بەو تایبەت بوونە بکات یان بۆ سەردەمێك یان زیادی خێزانو یان سەرقاڵبوونی بەزانستەوە یان هەرکارێکی تری لەم جۆرە ، یان نەدانی بژێوی و رۆژانەی رۆڵەکەی بەهۆی فاسیق بوون یان بیدعەکانییەوە. یاخود لەبەرئەوەبێت کەپشت ببەستێ بەوەی لەسەرپێچی خوای گەورەدا، پەیدای ئەکات یاخود لەو رێگەیەدا سەرفی ئەکات وە لە أحمدەوە گێڕاوەتەوە کە ئەمە دروستە. لەبەرئەوەی هەندێکیان تایبەتی ئەکەن بە (وەقف)ەوە : قەیناکات گەر لەبەر پێویستی بێت یاخود ئەیەوێت و زۆری لێکرا ..) ج٥ ، لا: ٦٠٥.

# ئازاردانی دڵی دایكو باوك لەتاوانە گەورەكانە

دایكو باوك مافی تایبەتیان هەیە بەسەر منداڵەكانیانەوە لەچاكەو گوێڕایەڵی و ڕێزگرتن، كە بێگومان چەند سیفەتێكن سروشتی مرۆڤ دەیخوازێت، لە بەجێهێنانی ئەم مافانەشدا دایك دەبێتە تەوەرەی سەرەكی ، چونكە زۆر ئازارو ناسۆری دەچێژێ لەقۆناغی سكپڕیو منداڵبوونو شیردانو پەروەردەكردندا .

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَوَصَّيْنَا الْأِنْسَانَ بِوَالِدَيْهِ إِحْسَاناً حَمَلَتْهُ أُمُّهُ كُرْهاً وَوَضَعَتْهُ كُرْهاً وَحَمْلُهُ وَفِصَالُهُ ثَلاثُونَ شَهْراً﴾ الأحقاف : ١٥ واتە: ئامۆژگاری مرۆڤمان كردووەكە باش بێت لەگەڵ دایكوباوكیدا بەتایبەت لەگەڵ دایكیدا كەبەپێستی سك هەڵی گرتووەو بەئازارەوە داینـاوەو پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ و فەرمووی : ( مَنْ أَحَقُّ الناس بِحُسْنِ صحابَتِي ) واتە: نزیكترین كەس كێیە كە شایەنی چاكە كردن بێت لەگەڵیدا؟ قال : أُمك قال: ثم مَن ؟ قَالَ : أُمك ، قَالَ ثُمَ مَن قَال : أُمك قَالَ : ثُمَ مَن ؟ قَالَ : أبـوك )[1] واتە: سێ جار فەرمووی دایكت، لەجاری چوارەمدا فەرمووی: باوكت.

بۆیە هەر لەدوای هاوەڵ دانان بۆ خوای گەورەوە، سەرپێچی دایەو باوكی بە گەورەترین تاوان داناوە، لە(صحیحین)دا هاتووە كە دەفەرمووێت: ( الا أُنَبِـئكُم بِـأَكبَر الكَبائر ثَلاثاً، قالوا: بَلى يا رسُولَ الله ، قَالَ : الإشراكُ بالله، وَعُقوق الوَالِدَين ، وَكان مُتكِئاً فَجَلَسَ فقال : أَلا وَقَولُ الزُور ألا وَشَهادَةُ الزُور)[2] .

واتە: ئایا گەورەترین گوناهتان پێ بڵێم؟

سێ جار ئەمەی دووبارە كردەوە، وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هاوبەش دانان بۆ خوا، ئازاردانی دایكو باوك، لەو كاتەدا پاڵی دابوویەوە پاشان دانیشتو فەرمووی: شایەتی دانی درۆ.

هەروەها فەرموویەتی : ﴿ ثلاثة لا يَدْخُلون الجَنَّة ، العَاقُ لِوالِدَيـهِ ، وَالـدَيوث ، والرَجلة (المشـية بالرجال)[3] .

واتە: سێ كۆمەڵ ناچنە بەهەشتەوە، ئازاردەری دایكو باوك، وەكەسێك كە خەڵكی بەژنو كچەكانی فێرئەكات، ئافرەتێكیش خۆی بشوبهێنێ بە پیاو لە هەڵسو كەوتو و جلو بەرگدا.

---

[1] / متفق علیه ت: ٢٧٦.
[2] / ت : ٢٧٧.
[3] / النسائي والبزار واسناده جید والحاكم ت: ٢٧٨.

هەروەها پێغەمبەری نازدارﷺ فەرمووی: ( كُل الذُنوب يُؤخر الله منها ما شاءَ الى يَوم القيامَة ، إلاّ عُقوقُ الوَالدَين ، فإنَّ الله يُعَجِّلُهُ لصاحبه في الحَياة قَبْلَ المَمَات )[1].

واتە: خوای گەورە تۆڵەی هەموو تاوانێك دوا ئەخات بۆ ڕۆژی دوایی، جگە لە ئازاردانی دایكو باوك نەبێت، كەخوای گەورە هەر لەدنیادا سزایان ئەدات.

خوای گەورە جەخت لەسەر ئەوە دەكاتەوە كەدەبێت زیاتر گرنگی و بایەخ بە دایكو باوك بدرێت، بەتایبەت لەكاتی پیریی‌و بێ‌هێزییاندا وەدەبێت دڵنەوایی بكرێن وەك دەفەرموێت: ﴿ وَقَضَى رَبُّكَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلاَهُمَا فَلاَ تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلاَ تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلاً كَرِيمًا {٢٣} وَاخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ الذُّلِّ مِنَ الرَّحْمَةِ وَقُل رَّبِّ ارْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرًا {٢٤}﴾ الأسراء.

خوای گەورە دەفەرموێت: وەفەرمانمان پێ‌ دەكات كە چاكە لەگەڵ دایكو باوكدا بكەین‌و پیایاندا هەڵنەشاخێین ، وە وشەی ئۆفیان بەرامبەر بەكار نەهێنن و لەگەڵیاندا بەسۆزو میهرەبین‌و داوا لەخوای گەورە بكەین كە ڕەحمیان پێ‌ بكات هەروەكو چۆن ئەوان لەكاتی منداڵیدا ڕەحمیان پێ‌ كردیوون.

زانایان فەرموویانە ( ئەگەر خوای گەورە بیزانیایە لە وشەی ئۆف كەمترو بچووكتر هەیە ئەوا حەرامو قەدەغەی دەكرد).

## بوونە هۆی قسەوتن بە دایكو باوك لەتاوانە گەورەكانە

ئەگەر دایكو باوك بەهۆی منداڵەكانیانەوە لەعنەتیان لێبكرێت یان قسەی نابەجێیان پێ‌ بووترێت، ئەوا بەیەكێك لەتاوانە گەورەكان دەژمێردرێت، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ( إنَّ مِن أكْبَر الكَبائر أنْ يَلْعَنَ الرَّجُلُ والدَيه ) بەلاّم هۆزەكەی بەلایانەوە سەیربوو كەچۆن مرۆڤی ژیرو موسوڵمان لەعنەت لەدایكو باوكی دەكات یان قسەیان پێ‌دەڵێن ! كە تاكە سەرچاوەی بوون و ژیانیانە ، بۆیە وتیان: ( وَكَيف يَلْعَنُ الرَّجُلُ والدَيه ؟ ) واتە: چۆن پیاو قسە بەدایكو باوكی دەڵێت؟ فەرمووی: يَسُبُ أَبَا الرَّجُلُ فَيَسُبَ أَبَاهُ ، وَيَسُبَ أُمه فَيَسُبَ أَمَهُ[2] واتە كەسێك قسە بە باوكی كەسێكی تر دەدات ئەویش قسەكە بەباوكی ئەم ئەداتەوە، یان قسە بە دایكی كەسێك ئەدات ئەویش قسە بەدایكی ئەم دەڵێتەوە.

كەواتە ئەبێ‌ حاڵی ئەو كەسە چۆن بێت كە ڕووبەڕوو قسەیان پێ‌دەڵێن ؟!

---

[1] / الحاكم وصحح اسناده ، ت: ٢٧٩.
[2] / متفق عليه ، ت: ٢٨٠.

## خۆبەخشین بۆ جیهاد بێ مۆڵەتی دایكو باوك دروست نیە

هەرچەندە پایەی جیهاد لەپێناوی خوای گەورەدا لە پرۆگرامی ئیسلامدا مەكانەتێكی بەرزو تایبەتی هەیە كەبەنرخترە لەشەونوێژی شەوو رۆژووی كەسێك كە بە رۆژوو دەبێت، لەگەڵ ئەوەشدا رێگە نادات كە منداڵ بەبێ رەزامەندی دایكو باوك بچێت بۆ جیهاد، عەبدوڵلای كوڕی عەمری كوڕی عاص، ئەڵێت: ( جَاءَ رَجُلٌ الى النَّبي ﷺ فأستأذَنهُ في الجِهاد فقالَ: أحَيٌّ والِدَاكَ ؟ قَالَ: نَعَم ، قَالَ فَفيهما فجاهد)[1] .

واتە: پیاوێك هاتە خزمەت پێغمبەر ﷺ داوای مۆڵەتی لێ كرد كە بچێت بۆ غەزا ئەویش فەرمووی: دایكو وباوكت ماون؟ وتی: بەڵێ: فەرمووی: كەواتە مەیدانی تێكۆشانت بكە بە خزمەتو چاكە لەگەڵیاندا.

لە ریوایەتێكیتردا دەفەرموێت: ( أقبل رَجُلٌ الى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَقال: أبايعُك علـى الهجرَة والجهاد أبتَغي الأجرَ مِنَ الله، قَال لَهُ فَهَلْ مِن والدَيكَ أحَدٌ حَيٌّ ؟ قَالَ: نَعَم، بَل كلاهُما حَيّ ، قَال أفَتَبتغي الأجرَ مِنَ اللهِ؟ قَالَ : نعَم، فقَال: فَارجَع الى والدَك فأَحسن صَحبَهُما)[2] .

واتە: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتی: پەیمانت ئەدەمێ لەسەر كۆچ كردنو غەزا لەپێناوی خوای گەورەدا ئەویش وتی: دایكو باوكت لەژیاندان ؟ وتی" بەڵێ هەردووكیان ماوون ، ئینجا فەرمووی: لەبەر رەزامەندی خوای گەورە هەوڵ ئەدەیت؟ وتی: بەڵێ فەرمووی: دە بگەڕێرەوە بۆ لایان و چاكەیان لەگەڵدا بكە.

هەروەها دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ( جَاء رَجُلٌ الى الرَسول ﷺ فقال : جئت أُبايِعُكَ عَلى الهجْرَة – وتركْتُ أبَوَيَ يَبْكيان فقَالَ: إرْجعْ إليهما فأضْحكْهُما كَما أبْكَيْتَهُما )[3] .

واتە: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەرو وتی: هاتووم پەیمانی كۆچو غەزات بدەمێ، بەڵام كە دایكو باوكم بەجێهێشت هەر دەگریان، حەزرەت فەرمووی: بچۆرەوە بۆ لایان و بیانهێننەوە پێكەنین وەك چۆن كردوتنەتە گریان.

ئەبو سەعید ﷺ دەگێڕێتەوە كە پیاوێكی یەمەنی هاتە خزمەت حەزرەت ﷺ حەزرەت لێی پرسی كەست لە یەمەن هەیە؟ وتی: بەڵێ دایكو باوكم لە یەمەنە ، فەرمووی: ئایا مۆڵەتیان داویتی؟ وتی: نەخێر، ئەویش فەرمووی: دەبگەڕێرەوە بۆ

---

[1] / متفق علیه، ت: ٢٨١

[2] / مسلم ، ت: ٢٨١.

[3] / البخاري تخریجي كردووە.

لایانو مۆڵەتیان لێ وەربگرەو گەر ڕێگەیان دایت غەزا بکە، وەگەرنا خزمەتی ئەوان بکەو چاکەیان لەگەڵدا بکە[1].

## دایكو باوكی هاوەڵ بڕیاردەر بۆ خوای گەورە

جوانترین و بەرزترین یاسای ئیسلام دەربارەی دایكو باوك ئەوەیە کە حەرامە بە هەرشێوەیەك ئازار بدرێن هەرچەند بێ باوەڕو بت پەرستیش بن ، یان هەوڵیش بدەن کە کوڕەکەیان بێ باوەڕ بکەن، وەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِيرُ وَإِنْ جَاهَدَاكَ عَلَى أَنْ تُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلا تُطِعْهُمَا وَصَاحِبْهُمَا فِي الدُّنْيَا مَعْرُوفاً وَاتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَيَّ ثُمَّ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُمْ بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ لقمان ١٤- ١٥.

خوای گەورە فەرمانمان پێدەکات گەر دایكو باوك هەوڵی بێباوەڕی کردنیان دا بەقسەیان نەکرێت، چونکە ( لا طاعَةَ لِمَخلُوقٍ في مَعصيَةِ الخَالِق ) واتە: مل کەچی بۆ هیچ دروستکراوێك نییە لەسەرپێچی کردنی دروستکاردا کە خوای گەورەیە ، وە چ سەرپێچیو تاوانێك لە هاوەڵ دانان گەورەترە، لەگەڵ ئەوەشدا فەرمانمان پێ دەکات کە بەچاکترینو جوانترین شێوە مامەڵەیان لەگەڵدا بکەین، و ڕێگەو ڕێبازی چاکەکاران بگرینو پرۆسەی بیروباوەڕ حەواڵەی خوای دادپەروەر بکەین بۆ ئەو ڕۆژەی کە ﴿ لا يَجْزِي وَالِدٌ عَنْ وَلَدِهِ وَلا مَوْلُودٌ هُوَ جَازٍ عَنْ وَالِدِهِ شَيْئاً ﴾ بێگومان کە ئەمەش بە لوتکەی چاوپۆشی و لێبوردن دادەنرێت لە پرۆگرامی ئیسلامدا کە لەهیچ ئاینو بەرنامەیەکی تردا بەدی ناکرێت.

---

[1] / ابوداود ، ت: ٢٨٢.

# حەڵاڵ و حەرام لە ژیانی گشتی موسوڵماندا

- لەسەر بۆچوون و نەریتەکاندا
- لەخۆشی و کات بەسەر بردن
- لە پەیوەندی موسوڵمان بەناموسوڵمان
- لە مامەڵە کردندا
- لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا
- سەبارەت بەبیروباوەڕو بەندوباوەکان

عەقیدەو بیروباوەڕی پارێزراو بناغەی بونیادنانی کۆمەڵگەی ئیسلامی یە، کە یەکتاپەرستی بە جەوهەری ئەم بیروباوەرە بگرە بە رۆح و خرۆشانی هەموو ئیسلام دائەنرێت . بۆیە پاراستنی ئەو بیروباوەڕو یەکتاپەرستی یە پاکە ، یەکەم شتێکە کەئاینی پیرۆزی ئیسلام جەختی لەسەر دەکاتەوەو هەوڵی بە شەرعیەتدان ورێنمایی کردنی دەدات . لەهەمان کاتدا بەئاخێزو رابوونێك دائەنرێت دژی هەموو بیروباوەڕە کۆن و نەفامی یەکان، هەوڵێکیشە کە پێویستە هەبێت بۆ پاك کردنەوەی کۆمەڵگەی ئیسلامی لەهەموو خەوشێکی هاوەڵ دانان و گشت گومڕایەك .

## رێزگرتنی یاساکانی پەروەردگار لە گەردووندا

یەکەم بیروباوەڕێك کە ئیسلام لەنێو دڵ و دەروونی موسڵماناندا چەسپاندوویەتی ئەوەیە" ئەم گەردوونە کە ئێمەی مرۆڤ لەسەر زەویەکەی و لە سایەی ئاسمانەکەی‌دا هەناسەی ژین هەڵدەکێشین، بەهەوانتەو بێ‌هۆ دروست نەکراوە، یاخود لەژێر کۆنترۆڵ و ئارەزووی دروستکراوێکدا ناڕوات بەڕێوە چونکە ئارەزووەکان وەك یەك نین بەڵکو زۆرجاریش بوعدێکی فراوانیش لەنێوانیاندا بەدی دەکرێت ﴿ وَلَوِ اتَّبَعَ الْحَقُّ أَهْوَاءَهُمْ لَفَسَدَتِ السَّمَاوَاتُ وَالْأَرْضُ وَمَنْ فِيهِنَّ ﴾ المؤمنون : ٧١.

واتە: ئەگەر خوای گەورە شوێن ئارەزووی خەڵکی بکەوتایە ئەوکاتە ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی لەناوی‌دایە لەناو دەچوون.

بەڵام ئەم گەردوونە پەیوەستە بەسیستمێکی جێگیرەوە کە گۆڕانکاری بەسەردا نایەت وەك قورئانی پیرۆز لەچەندین ئایەتدا ئاماژەی پێ‌کردووەو دەفەرموێت: ﴿ وَلَنْ تَجِدَ لِسُنَّتِ اللَّهِ تَحْوِيلاً ﴾ فاطر : ٤٣.

موسوڵمانان لە قورئانە پیرۆزەکەی پەروەردگارو فەرموودە شیرینەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ فێربوون کە رێز لەم یاسا گەردوونیانە بگرن، و داوای هۆکاری رووداوەکانی لە پەروەردگار بکەن، وە لەو کەسانە دوور بکەنەوە کە بازرگانی بە ئاینەوە دەکەن .

## بەرەنگار بوونەوەی وەهم و خەیاڵ و ( الخرافيات )

پێغەمبەر ﷺ کۆمەڵێکی لەناو هۆزەکەی‌دا بەدی کردبوو کە بە (الكهان) یان (العرافين) ناسرابوون، ئەم کۆمەڵە بانگەشەی زانینی غەیبی رابردووو داهاتوویان دەکرد ، لەرێگەی پەیوەندی کردنیان بەجنۆکەوە دەبێت یان هەرشێوازێکی تر. بۆیە پێغەمبەر ﷺ جەنگی دژی ئەم کۆمەڵە راگەیاند کە پێشبینیەکانیان یان

بۆچوونەکانیان لەسەر هیچ بناغەیەکی ڕاست یان کتێب و سەرچاوەیەکی حەقیقەتەوە بونیاد نەنراوە، چونکە هەرشتێك بەنیگاو سروش بۆ پێغەمبەر ﷺ بهاتایە ، دەیخوێند بەسەریاندا ﴿ قُلْ لا يَعْلَمُ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ الْغَيْبَ إِلَّا اللَّهُ ﴾ النمل : ٦٥.

واتە: ئەوەی لە زەوی ئاسمانەکاندا بەغەیب نازانن، نە فریشتەو نە پەریو نە مرۆڤیش غەیب نازانن جگە لەخوای گەورە .

وە پێغەمبەریش ﷺ بەفەرمانی خوای گەورە پێی ڕاگەیاندوین ﴿ وَلَوْ كُنْتُ أَعْلَمُ الْغَيْبَ لَاسْتَكْثَرْتُ مِنَ الْخَيْرِ وَمَا مَسَّنِيَ السُّوءُ إِنْ أَنَا إِلَّا نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴾ واتە : ئەگەر من غەیبم بزانیایە هەوڵم ئەدا کە چاکەی زۆرتر بکەم، و هەرگیز تووشی ناڕەحەتی نەئەبووم ، من غەیب زان نیم، تەنها وەك مژدەدەرو ترسێنەرێك بۆ قەومەکەم نێرراوم.

تەنانەت خوای گەورە دەفەرموێت: جنۆکەکانی سلێمانیش ﷺ غەیبیان نەزانیوە ﴿ أَنْ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ الْغَيْبَ مَا لَبِثُوا فِي الْعَذَابِ الْمُهِينِ ﴾ سبأ: ١٤.

کەواتە هەرکەسێك بانگەشەی زانینی غەیب بکات ئەوانە لەگەڵ خوای گەورەداو نە بەرامبەر حەقیقەتو لەگەڵ خەڵکیدا ڕاستگۆ نیە.

کۆمەڵێك نێردراو هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و خۆیان بەغەیب زان لە قەڵەمدا، شتێکیان لەدەستیان شاردەوەو، وتیان: ئەمە چی‌یە لە دەستماندا حەزرەتیش زۆر ڕاشکاوانە فەرمووی: من کاهن نیم، چونکە ئەوەی ئەوکارە دەکاتە جێگەی ئاگرە[1].

## باوەڕ بوون بە( کاهن ) بێ باوەڕی‌یە بە پەروەردگار

ئاینی پیرۆزی ئیسلام تەنها کاهنو جادووگەرو سیحربازەکان بە تاوانبار نازانێت بەڵکو ئەو کەسانەشی کە دەچن بۆلایان و پرسیاریان لێ دەکەن و بڕوایشیان پێدەکەن بەشدار ئەبن لەو تاوانەدا، حەزرەت ﷺ دەفەرموێت: ( مَن أَتى عرافاً فسأَلَهُ من شَيءٍ فَصَّدَقَهُ بما قَالَ: لَم تُقبل لَهُ الصَّلاة أربَعين يومًا )[2].

واتە: هەر کەسێك بچێتە لای جادووگەرێك و پرسیارێکی ئاڕاستە بکات و بڕوای پێ بکات ، ئەوا ماوەی چل ڕۆژ نوێژی لێ وەرناگیرێت.

لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت: ( من أتى كاهناً فصدقه بما قال ، فَقد كَفَرَ بما أُنزِل عَلى مُحَمَّد )[3] چونکە هەر بە سروشو نیگا هاتووە بۆ پێغەمبەر ﷺ .

---

1/ ت . ٢٨٣.

2/ مسلم . ت : ٢٨٤

3/ البزار بەئیسنادێکی باش و بەهێز ، ت: ٢٨٥.

﴿ قُلْ لا أَقُولُ لَكُمْ عِنْدِي خَزَائِنُ اللَّهِ وَلا أَعْلَمُ الْغَيْبَ وَلا أَقُولُ لَكُمْ إِنِّي مَلَكٌ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَى إِلَيَّ ﴾ الانعام : ٥٠.

واته: ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ من ناڵێم هەواڵ و زانیاری هەموو گەنجینەکانی خوای گەورەم لایە، وە من فریشتە نیم، من تەنها ئەوە دەکەم و دەڵێم کە لەلایەن خوای گەورە نیگام بۆ دێت.

کەواتە کەموسوڵمانان بەراشکاوانە ئەم حەقیقەتەیان لەقورئانەوە وەرگرت وەپاشان بڕوایان وابێت لەهەندێك لە دروستکراوەکان، نهێنی‌یە شاراوەکانی قەدەر دەزانن مانای وایە کە بڕوایان بەو نیگایانە نی‌یە کە بۆ محمد ﷺ هاتۆتە خوارەوە.

## (الإستسقام بالأزلام) راوکردن بە تیر

ازلام: قەداحیشی پێ ئەڵێن کەپێکهاتووە لە سێ تیر لەناو گەلی عەرەبدا بەکار دەهات، لە یەکەمیان نوسرابوو : خواکەم فەرمانی پێکردووم،

وە لە دووەمیان نوسرابوو : خواکەم نەهی لێکردووم

وە لە تیری سێهەمیان : هیچ نەنوسرابوو، بۆیە هەرکاتێك بچوونایە بۆ گەشتێك یان نیازی ژن هێنانیان هەبوایە یان هەر ئیشێکی‌تر ، ئەهاتن بۆ شوێنی ئەو بتانەی کە تیرەکانی لێ بوو، وەداوای زانیاریان دەکرد دەربارەی ئەو ئیشەی دەیانویست جێ‌بەجێ بکەن،

ئەگەر تیری یەکەمیان بوایە ئەوا کارەکەیان ئەنجام ئەدا ،

وەگەر تیری دووەمیان بوایە کارەکەیان جێ‌بەجێ نەدەکرد،

بەلأم گەر سێیەمیان بوایە، ئەوا چەند جارێکی‌تر دووبارەیان دەکردەوە بۆ ئەوەی تیری یەکەم یان دووەم بێت، بێگومان ئەم پرۆسەیە لەکتێب و قاوە گرتنەوە دەچێت.

کە لەکۆمەڵگای خۆماندا باوەو هیچیان لەنێو بازنەی ئیسلامدا جێیان نابێتەوە وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَأَنْ تَسْتَقْسِمُوا بِالْأَزْلامِ ذَلِكُمْ فِسْقٌ ﴾ هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ( لاينال الدرجات العلى من تكهن او استسقم بالازلام )[٢].

واتە: ئەوەی خۆی بەغەیب زان دابنێ یاخود ئەزلام بەکاربهێنێ هەرگیز پلەی بەرزی خوای گەورە بەدەست ناهێنێ.

---

[٢] النسائي: ت: ٢٨٦.

# سيحر (چاوبەست)

ئايينى پيرۆزى ئيسلام هەميشە دژى جادوو چاوبەست بووە وەك دەفەرموێت : ﴿وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلاَ يَنْفَعُهُمْ﴾ واتە: فێرى شتێك دەبن كە زيانيان پێدەگەيەنێت و سوودى لێ نابينن .

حەزرەت ﷺ چاوبەستى بەگەورەترين تاوان داناوە كە سەرجەمى مرۆڤايەتى بەرەو لەناوچوونو رمان دەبات وەك دەفەرموێت:

( اجتنبوا السبع الموبقات ) خۆتان بپارێزن لەو حەوت تاوانەى كە مرۆڤ بەرەو تياچوون دەبات ، قالوا: يارسول الله وما هي ؟ ئەو حەوت تاوانە چين ئەى پێغەمبەرى خوا ﷺ ، قال: الشِّرك بالله، والسِّحر وقتل النفسِ التي حَرَّمَ الله إلاَّ بالحق، وأَكْلِ الرِّبا، وأَكْلِ مال اليتيم والتولي يوم الزَّحف ، وقذف المحصنات المؤمنات )[1]

فەرمووى : هاوبەش دانان بۆ خواى گەورە، چاوبەست ، كوشتنى ناهەق ، سوو خواردن ، دەست درێژى بۆ سەرماڵى هەتيوو، راكردن لەرۆژى دوايى، بوهتان كردن بۆ ئافرەتانى داوێن پاك ) .

بۆيە هەندێك لە زانايانى ئيسلام چاوبەستيان بە كوفرو بێباوەڕى داناوە، وەهەندێكى تريان دەفەرموون كە پێويستە بكوژرێت، تا كۆمەڵ پاك ببێتەوە لە تەپو تۆزى خراپەو دواكەوتوويى.

قورئانى پيرۆز فەرمانمان پێدەكات كە پەنا بگرين لە تاوان و خراپەى چاوبەست : ﴿وَمِنْ شَرِّ النَّفَّاثَاتِ فِي الْعُقَدِ﴾ الفلق : ٤ ئەو جۆرە فوو بەگرێ كردنەدا جۆرێكە لە شێوازى چاوبەست و پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ( مَن نفثَ في عُقدَةٍ فَقد سَحَرَ وَمن سَحَرَ فَقد أشرَك)[2].

هەروەكو چۆن ئاينى پيرۆزى ئيسلام رۆشتنى بۆلاى عەرافەكان حەرام كردووە، بەهەمان شێوە پەنابردن بۆ كەسانى چاوبەست بەمەبەستى چارەسەرى نەخۆشى و گيروگرفت قەدەغە كردووە چونكە ئەمانە شتانێكن كە پێغەمبەرى خوا ﷺ خۆى لێ بێ بەرى كردوون وەك دەفەرموێ: ( ليسَ منا من تَطيَّرَ أو تُطيِّرَ لَهُ ، أو تَكهَّنَ أوْ تُكهِّنَ لَهُ ، أو سَحَرَ أو سُحِّرَ لَهُ )[3].

---

[1] / متفق عليه ، ت: ٢٨٧.
[2] / الطبراني باسنادين وراوه احد ثقات ، ت: ٢٨٨.
[3] / البزار باسناد جيد، ت: ٢٨٩.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ( لاَيَدخُل الجَنَّة مُدمِن خَمرٍ، وَلا مُؤمِنٌ بِسِحْرٍ ، وَلا قَاطِعُ رَحِم )[1]. واتە: ناچێتە بەهەشتەوە کەسێك هەمیشە مەی بخواتەوە ، یان باوەڕی بە چاوبەست هەبێت ، و پەیوەندی خزمایەتی بپچڕێت.

لێرەدا ئەو کەسەی چاوبەستەکە ئەنجام دەدات بەتەنها تاوانبار نییە بەڵکو ئەو کەسەشی باوەڕی پێی هەیەو هانی ئەدات و ئەچێت بۆ لای تاوانبارە خۆ ئەگەر چاوبەستەکە بۆ مەبەستێکی حەرام بەکارهات وەك ئاژاوەنانەوە لەنێوان ژن و مێرددا یان زیان گەیاندن بەجەستەی کەسێك یان هەرشتێکی تر ئەوا زیاتر حەرام دەبێت و تاوانەکەی گەورەترە.

وە لەسەر بیروڕای دانەر پەنابردن بۆئەو چاوبەستانە بەمەبەستی چارەسەر کردنی نەخۆشی یان پاراستنی لەگیروگرفت حەرامە، جێی سەرنجە تا ئێستاش لەسەدەی بیست ویەکدا بەردەوامن خەڵکی شوێن ئەم بەندوباوە دواکەوتووانە دەکەون لەزۆربەی شوێنی ولاَتاندا نەزان و ساویلکەکانی پێ هەڵئەخەڵەتێنن.

ئاینی پیرۆزی ئیسلام بۆ چارەسەری ئەم کێشە کۆمەلاّیەتی یە ڕێگەی گونجاوی داناوە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ( تداوَوا فإنَّ الذي خَلَقَ الداءَ خَلَقَ الدَّواء) واتە: هۆکار بەکاربهێنن چونکە ئەوکەسەی نەخۆشی داناوە لەهەمان کاتدا چارەسەری بۆ داناوە وەك دەفەرموێت: ( إن كان في شيء من أدوِيتكُم خَير، فَفي هَذه الثَلاثَة ، شَربَة العَسَل ، أو شرطة محجم ، أو كَيّة بنار).

کە ئەتوانرێ لەڕێگەی دەم یاخود نەشتەرگەی یان داخ کردن یاخود چارەسەر کردن بەکارەبا ئەنجام بدرێت، بەڵام مووروو لەدەست کردن و خوێندنی هەندێ دوعای تەلیسمکاری چارەسەرێکی نەفامی یەو دەرچوونە لەبازنەی یەکتا پەرستی.

عقبەی کوڕی عامر دەگێڕێتەوە دە کەس هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ پەیمانی لەگەڵ نۆ کەسیاندا مۆر کرد تەنها کەسێکیان نەبێت، هۆکەیان لێ پرسی ئەویش فەرمووی : ( ان في عَضُده تَمِيمَة! موورویەکی لەدەستدایە بەمەبەستی سێ چاوەزار ئەویش مووروەکەی لەدەستدا بچڕاندو پاشان پەیمانی لەگەڵ دابەست و فەرمووی: ( من علق فقد اشرك ) واتە: ئەوەی هەڵی بگرێ هاوبەشی بۆ خوا داناوە، وە لە عمران کوڕی حصینەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ چاوی بە ئەڵقەیەك کەوت

[1] / ابن حبان في صحيحه، ت: ٢٩١.

له قۆڵی پیاوێکداو پێی فەرموو: ( ویحك ؟ انبذها منك عنك فانك لو مت وهي عليك ما افلحت ابداً ) واتە: ئەوە ترس‌و نەخۆشت زیاتر دەکات، فرێی‌بە لەدەستت چونکە ئەگەر بمریت و ئەوەن لەدەست دابێ هەرگیز لە سزا رزگارت نابێت.

بێگومان ئەم رێنماییی‌یانە کاریگەری‌یەکی راستەوخۆیان هەبوو لەسەر هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ و خۆیان لێ‌دوورخستەوەو هەرگیز باوەڕیان پێی نەئەهێنا.

عیسی کوڕی حمزە دەفەرموێ: چووم بۆلای عەبدوڵلای کوڕی حەکیم بینیم سوور هەڵگەڕاوە پێم وت: (تمیمة) هەڵبگرە باچاکت بکاتەوە، وتی: پەنا بەخوا ئەگرم لەوەی باسی دەکەیت ، لە ریوایەتێکی تردا دەفەرموێت مردن لەوە نزیکترە.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ( من علق شيئاً وكل اليه ) واتە: هەرکەسێك شتێك لەوانە هەڵبگرێت ئەخرێتە پاڵ ئەوەوە .

(ابن مسعود) چووە ماڵەوە بینی خێزانەکەی شتێکی گرێ دراوی لە ملدایە ، ئەویش لەملی راکێشاو بچڕاندی‌و وتی: ( لقد أصبح ال عبدالله اغنياء ان يشركوا بالله مالم ينزل به سلطاناً) واتە: بەرەی عەبدوڵلا پێویستیان بەوە نیە کە هاوبەش بۆ خوا پەیدا بکەن، پاشان وتی: بیستوومە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( إنَّ الرُّقى والتَلائم والتَولَة شِرك . قَالُوا: يا أباعبدالرحمن هذه الرُّقى والتَلائم قَد عَرفناها فَما التَولَة ؟ قَالَ: شيء تصنَعُهُ النِّساء يَتَحَببن الى أَزواجِهِن ) واتە: ( الرُّقى والتَلائم والتَولة ) هاوەڵ بۆ خوا دانانە ، وتیان (الرقي والتلائم) دەزانین بەلام (التولة) چی‌یە؟

فەرمووی التولة: ژنان دروستی‌ئەکەن خۆشەویستبن لەلای هاوسەرەکانیان.

زانایان دەڵێن: ئەوەی کەلە (الرقى) دوعادا حەرامە ئەوەیە بەزمانی عەرەبی نەبێت، و نەزانرێت چی نوسراوە ، بەلام گەر زانرا چی نوسراوەو ناوی گەورەی تێدابوو ئەوا رێی پێدراوە.

ئەگێڕنەوە کە (ابن مسعود) ﷺ رێی ئەم جۆرە دوعایانەی لەخێزانەکەی گرتووە، جارێکیان وتی: چوومە دەرەوە فلان کەس کردمی بەچاوەوە، و ئێستایش چاوم ئاوی پێدا دێتە خوارەوە، کە ئەو روقیەی بۆ ئەکەم فرمێسکەکەی دەوەستێتەوە کەلای دەبەم دووبارە وەك خۆری لێدێتەوە.

(ابن مسعود) ﷺ وتی: ئەوە شەیتانە کە بەقسەی ئەکەیت وازت لێ‌دێنێ ، وە کە لەقسەی دەردەچی، پەنجە ئەکات بەچاوتا، بەلام گەر وەکو پێغەمبەر بکەیت ﷺ ئەوا بۆ تۆ چاکترە، ئاو لەچاوەکانت بپرژێنەو ئەم نزایە بخوێنە ( اذهب البأس

رب الناس، إشف أنت الشافي ، لاشفاء الا شفاؤك شفاء لا يغادر سقماً ) ئەی پەروەردگاری سەرجەم مرۆڤایەتی، ئەم نەخۆشی‌یە لابەرەو چاکم بکەرەوە، هەر تۆ شیفاو چارەسەری بۆ نەخۆشی دەنێری شیفایەك کە هیچ ئازارم نەمێنیٚ ) .

## هەڵواسینی کوژەکە و ئەو جۆرە شتانە

لەم دەروازەیەدا" هەڵواسینی کوژەکەو نوشتەو ئەوجۆرە شتانەی، بەو بیروباوەڕەی کە شیفای نەخۆشییەکان ئەدات یاخود مرۆڤ لە نەخۆشی ئەپارێزێت، وە تائێستاو بەداخەوە لەسەدەی بیستدا خەڵکانێك هەن کە ناڵی ولاغو ئەسپ بە بەر دەرگای ماڵدا هەڵئەواسن و بەردەوام خەڵکانێك هەن تائێستا خەریکی نووسینی نوشتەو ئەو جۆرە شتانەن‌و کەسانی سادەیان پیٚ هەڵخەڵەتاندووە، و لەناو نوشتەکانیاندا جۆرەها خەتی ناڕێك‌و سەر بەرو خواروی تیادایە، وائەزانن کە هەڵگری ئەم نووشتانە خاوەنەکەی لە دەست وەشاندنی جنۆکەکان ئەپارێزێت، یاخود لەچاوی پیس‌و ...

وە بۆ خۆپاراستن‌و چارەسەرکردن چەند ڕێگەیەکی ناسراو هەیە کە ئیسلام دیاری کردووە، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمویٚ: ( تداووا فان الذي خلق الداء ، خلق الدواء)[1] . واتە: دەرمان بەکاربهێنن، چونکە ئەوەی کە نەخۆشی دروست کردووە هەر ئەوەیش دەرمانی بۆ ناردووە، وە فەرموویەتی ( اذا كان في شيء من ادويتكم خير، ففي هذه الثلاثة شربة عسل، او شرطة محجم، اوكية نار)[2].

ئەم سیٚ جۆرە ئەتوانین لەسەردەمی ئەمڕۆماندا بەم جۆرە لێکیان بدەینەوە ، کەئەو دەرمانانەیە بەدەم ئەخورێنەوە، یان ئەو چارەسەرانەی لە ڕێگەی نەشتەرگەرییەوە ئەنجام ئەدرێت، وە چارەسەر بەبەکارهێنانی تەزووی کارەبایە.

بەڵام هەڵواسینی کوژەکەو نووشتەو ئەو جۆرە شتانە، بەمەبەستی پاراستن‌و چارەسەرکردن ، ئەوا گومڕایی‌و نەزانینەو ڕووبەڕووبوونەوەیە لەگەڵ سوننەتی خوای گەورەداو نەریٚ کردنی یەکتاناسییەتی.

لە عقبەی کوڕی عامرەوە کە هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و(١٠) ولاغی پیٚ بوو ، وە (٩) ولاغیانی فرۆشت دانەیەکیان مایەوە ، وتیان ، ئەوە بۆ بەو جۆرە

---

[1] احمد ، ت: ٢٩٢.
[2] متفق عليه، ت: ٢٩٣.

مایەوە؟ وتی: کوژەکەیەکی پێوە بوو یان نوشتەیەك پاشان بڕی و پێغەمبەریش ﷺ و پاشان فەرمووی: ( من علق فقد أشرك )[١].

لە عیسای کوڕی حەمزەوە فەرمووی: چووم بۆلای عەبدوڵڵای کوڕی حەکیم (وبە حُمْرة) وتم: ئەوە بۆ کوژەکە هەڵناواسی؟ فەرمووی: پەنا بەخوای گەورە لەم کارە لەگێڕانەوەیەکی تردا مردن لەمە نزیکترە.

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ: (من علق شيئاً وكل اليه)[٢]. واتە: هەرکەسێ شتێك هەڵواسێ ئەوا پشتی پێ بەستووە.

وە لە (ابن مسعود)ەوە ئەگێڕنەوە کە خێزانەکەی بینی شتێکی لەو جۆرە لەملیدا بوو ، پاشان رایکێشاو بچڕاندنیو ، پاشان فەرمووی: ئالی عەبدوڵڵا دەوڵەمەندن لەهاوبەشی بڕیارداندا بۆ خوا مادام دەستەڵات بەسەریاندا نەبێت، و پێویستیشیان پێی نیە ، پاشان فەرمووی: گوێم لێ بوو پێغەمبەر ﷺ ئەیفەرمو: (ان الرقى والتمائم والتولة شرك) وتیان ئەی ابو عبدالرحمن ، ئەمانە لە نەریتماندا هەن بەڵام (التولة) چییە؟ فەرمووی : شتێکە ئافرەتان دروستی دەکەن بۆ ئەوەی لای هاوسەرەکانیان خۆشەویست بن[٣] – کە جۆرێکە لە سیحر–.

زانایان ئەفەرموون: ئەوەی کە نەرێی لێکراوە لە (الرقى) ئەوەیە کە بەجگە لە زمانی عەرەبی بێت، کە نازانرێ ئەوە چییە، وە رەنگە جۆرێك لە سیحر یان کوفری تیادا بێ، بەڵام ئەگەر ماناکەی زانرابوو، وەیادی خوای تێدابوو ئەوا دروستە، وەنوشتەش لەو کاتەدا تکاو پاڕانەوەیە لەخوای گەورە نەك چارەسەرو دەرمان . وەنوشتەی خەڵکانی سەردەمی نەفامی ئاوێتە بوو بە سیحرو بێ باوەڕی و ئەو جۆرە شتانە کە مانایەکی مەبەستدارو زانراوی نەبوو.

وەئەگێڕنەوە کە (ابن مسعود) ﷺ نەرێی کردووە لە بەکارهێنانی ئەو جۆرە نووشتانەی سەردەمی نەفامی کاتێك خێزانەکەی بەکار هێناوەو فەرموویەتی : رۆژێك چوومە دەرەوەو فلان کەس بینیمیو لەچاوی بردم و چاوم ئاوی کردو کاتێك بەکارم ئەهێنا فرمێسکەکە نەئەماو کەلام ئەبرد فرمێسکەکان دەستیان پێ ئەکردەوەو ، پاشان (ابن مسعود) پێی فەرموو: ئەوە شەیتانە گەر گوێڕایەڵی بکەیت بڵی و گەر سەرپێچی بکەیت بەپەنەجانی تانە ئەداتە چاوانت و، بەڵام گەر

---

[١] احمد والحاكم واللفظ له واه ثقات ، ت: ٢٩٤.
[٢] احمد وابو يعلى باسناد جيد ، والحاكم وصححه، ت: ٢٩٥.
[٣] ابن حبان في صحيحه والحاكم والبيهقي، وەئەڵێت : ئیسنادێکی صەحیحی هەیە ، ت: ٢٩٨.

لەم رووەوە هەمان کرداری پێغەمبەر ﷺ ئەنجام بدەیت، ئەوا باشترە بۆ تۆ، و زووتر شیفات بۆدێت: ئاو ئەکەیت بەچاوەکانتداو ئەڵێت: إذهَب البأس رب الناس ، إشف أنت الشافي ، لا شفاء إلاّ شفاؤك لا يغارد سقماً )[1].

## ( التشاؤم ) ڕەش بینی

ڕەشبینی بەرامبەر هەندێك شت یان شوێن یان کات یاخود هەندێك کەس یان وەهمو خەیاڵی پڕ نائومێدی، کۆمەڵە شتانێکن کەتا ئێستاش لای تاك‌و کۆ بازاڕیان لەبرەودایە، لەکۆندا هۆزەکەی پێغەمبەر صالح ﷺ وتیان: ﴿اطَّيَّرْنَا بِكَ وَبِمَنْ مَعَكَ﴾ النمل:٤٧ واتە: تۆو ئەوەشی لەگەڵتایە هۆی نەگبەتی‌و کاولکاری ئێمەن؟

یان فیرعەون‌و قەومەکەی ناسۆری‌و ناخۆشی‌یەکیان بەسەر بهاتایە دەیان ووت ﴿ يَطَّيَّرُوا بِمُوسَى وَمَنْ مَعَهُ ﴾ واتە : هۆی ئەو نەهامەتیانەیان دەخستە پاڵ موسی و ئەوەی لەگەڵیەتی.

هەروەها بێ باوەڕەکان هەرکاتێ ناخۆشی‌یان بەسەر بهاتایە بە پێغەمبەرەکانیان ئەوت: ﴿ إِنَّا تَطَيَّرْنَا بِكُمْ ﴾ وەلاّمی ئەو پێغەمبەرانەش ئەمە بوو ﴿قَالُوا طَائِرُكُمْ مَعَكُمْ﴾ واتە: نەگبەتیەکانتان لەگەڵ خۆتاندایە، کە دەرچوونە لە فەرمانی خوای گەورە .

عەرەبەکان لەسەردەمی نەزانین یان زۆر لە بواری سیحرو جادودا ڕۆچوو بوون ، هەتا نوری ئیسلام پەلی هاویشت‌و گشت دڵەکانی ڕۆشن کردەوەو ئەقڵی بەرەو پرۆگرامە ڕاستەقینەکەی خۆی گەڕاندەوە.

ئاینی ئیسلام ڕەشبینی وەك سیحرو جادوو سەیردەکات وەك دەفەرموێت: (ليس منا من تَطيَّرَ أو تُطُيِّرَ لَهُ ، أَو تَكَهَّنَ أَوْ تُكهِّنَ لَهُ ، أَو سَحَرَ أَو سُحِّرَ لَهُ )[2].

وەپێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( العيافة والطيرة والطرق من الجبت)[3].

العِيَافَة : کێشانی چەند هێڵێکە لەسەر ڕووی لم ، وەجۆرێکە لە (تکهن) و تا ئێستاش هەر باوە .

الطَّرْق: کێشانی چەند بەردێکە بەشوێنێکدا، ئەمەیش هەر جۆرێکە لە (تکهن) .

---

[1] / ابن ماجه واللفظ له، وابوداود باختصار، والحاكم اخصر منهما ،ت: ٢٩٩.
[2] / الطبراني عن ابن عباس باسناد حسن، ت: ٣٠٠.
[3] / ابوداود والنسائي وابن حبان في(صحيحه) ، ت: ٣٠١.

الجِبْت : پەرستراوێکە جگە لەخوای گەورە هەروەها ڕەشبینی کارێکە هیچ بونیادێکی ڕاستو دروستی نیی بەڵکو ملکەچ کردنە بۆ وەهمو خەیاڵێکی بێ ئەنجام و نادیار، چونکە کەی ژێری مرۆڤ لەئاستێکدایە کە بڕوای وابێت بەهۆی کەسێك یان شوێنێکی دیاریکراو یان پژمینێك یان دەنگی خوێندنی باڵندەیەك دووچاری ناخۆشیو نەهامەتی دەبێتەوە؟

وەئەگەر لەناخی مرۆڤدا خاڵێکی لاواز هەبێتو ببێتە ئالیەتو پاڵنەرێك کەببێتە کەسێکی ڕەشبین، پێویستە هەروا بەئاسانی ملکەچی نەبێت و دەستە وەستان ڕانەمێنێ لەبەردەستیدا بەتایبەت گەر هەستی کرد گەشتۆتە قۆناغی جێ بەجێ کردنو لەواقعیدا ڕەنگ دەداتەوە.

لەم بارەیەوە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ( ثلاثة لا يسلم منهن احد، الظن، و الطيرة ، والحسد ، فاذا ظننت فلا تحقق ، واذا تطيرت فلا ترجع، واذا حسدت فلا تبع)[1].

واتە : سێ شت هەن هیچ مرۆڤێکیان لێ بێوەی نابێت، گومانی خراپ، ڕەشبینی، ئێرەیی بەخەڵك بردن، ئەگەر گومانی خراپت بە کەسێ برد جێبەجێی مەکە، وەگەر ڕەشبینیت بەرامبەر شتێك هەبوو لەکردنی کارێکدا لێی پەشیمان مەبەرەوە، وە ئەگەر ئێرەیت بەکەسێك برد ستەمی لێ مەکەو دەری مەبڕە.

گەر بەو شێوەیە بکرێت ئەو سێ سیفەتەی کە باسمان کرد لەچەند خەیاڵێکی کاتی تێناپەڕن و لە هەڵسو کەوتداو ڕەنگ نادەنەوەو لای خوای گەورەش بەرپرسیار نابێت (ابن مسعود) دەڵێت ﷺ : الطِيرة شِرك ، الطِيرة شِرك ، الطِيرة شِرك ، سێجار فەرمووی ڕەشبینی هاوەڵ دانانە بۆ خوای گەورە.

ابن مسعود دەڵێت: وما منا الا .... ولكن يذهبه الله بالتوكل[2].

واتە: کەس نیە بۆ تەنیا جارێکیش بێت تووشی حاڵەتی ڕەشبینی نەبێت، بەڵام پەروەردگار لەدڵیدا لادەبات بەمەرجێ پشت بەخوای گەورە ببەستێت.

## جەنگاندن بەرامبەر بەندو باوەکانی نەفامی

ئاینی پیرۆزی ئیسلام هەردەم دژی باوو نەریتی سەردەمی نەفامی بووە، چونکە کاریگەریەکی سامناکی لەسەر ژیریی و هەڵسوکەوتی مرۆڤ هەیە، هەروەها ئەم پەیامە نەمرە کۆمەڵێك سیفەتو ڕەوشتی ناپەسەندی تری ڕەتکردتەوە وەك ڕەگەز پەرستیو خۆشەویستیو خۆ بە زل زانین.

---

[1] / الطبراني، ت: ٣٠٢.
[2] / ابو داود والترمذي ، ت: ٣٠٣.

# رەگـەزپەرستی لە ئیسلامدا نی‌یە

یەکەم شتێك کەئاینی پیرۆزی ئیسلام هەستا بەئەنجامدانی هەڵوەشاندنەوەی یاسای رەگەزپەرستی بوو، بەهەموو شێوەکانی‌یەوە لەسەر موسوڵمانانی حەرام کردووەو ئەو کەسانەی لەئاینەکەی بێبەری کردووە کەهەوڵی زیندووکردنەوەی دەدەن.

(لیس منّا مَن دَعا الی عَصَبِیّة ، وَلیسَ منّا مَن قَاتَل عَلی عَصَبِیّة ، وَلَیسَ منّا مَن مَاتَ عَلَی عَصَبِیّة)[1]، واتە: لەئێمە نیە گەر کەسێك بانگەشەی رەگەزپەستی بکات یان لەپێناو تیرەو هۆزەکەی‌دا خوێن بڕێژێ یان لەپێناو رەگەزپەرستی گیانی لەدەست بدات هیچ رەنگێك یان رەگەزێك لە رەگەزەکان پلەیەکی بەرزترو تایبەتی پێ نەبەخشراوەو لەوانی‌تر جیانەکراونەتەوە ، نابێت موسوڵمانی وشیارو تێگەیشتوو رەنگێك بەسەر رەنگێك یان هۆزێك بەسەر هۆزێکی‌تر یان ولآتێك بەسەر ولآتێکی تردا بالآدەست بکات، وە بۆ هیچ خاوەن باوەڕێك دروست نیە کە هەوڵی سەرکەوتنی هۆزەکەی بدات چ لەپێناو هەقدا بێت یان نا !

لە (واثلةی کوڕی الاسقع)ەوە دەگێڕنەوە کە ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ : (العصبیة) رەگەزپەرستی ئەوەیە یارمەتی سەرکەوتنی هۆزەکەت بدەیت لە ستەمکاری‌دا ( أن تعین قومك علی الظلم)[2].

خوای گەورەش دەفەرمونێت: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوَّامِينَ بِالْقِسْطِ شُهَدَاءَ لِلَّهِ وَلَوْ عَلَى أَنْفُسِكُمْ أَوِ الْوَالِدَيْنِ وَالْأَقْرَبِينَ ﴾ النساء: ١٣٥ واتە: ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان بە ئاینی پیرۆزی ئیسلام هێناوە شایەتی هەق بدەن بەخوای گەورە هەرچەند ئەو شایەتی‌یە لەسەر خۆتان و دایكو باوکتانو کەس و کارتان بێت.

جارێکی‌تر خوای گەورە دەفەرمونێت: ﴿ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلَّا تَعْدِلُوا﴾ المائدة:٨ پێغەمبەر ﷺ مەفهومو چەمکی ئەم وشە بلآوەی نەهێشتو ئەفەرمونێت : ( أنصُر أخاك ظالمًا أو مظلوما ) واتە: یارمەتی براکەت بدە ستەمکار بێت یان ستەم لێکراو، هاوەڵآن سەرسامی ئەم فەرموودەیە بوون وتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئەوەی ستەم لێکراوە یارمەتی ئەدەینو ئەو ستەمەی لێ دوور ئەخەینەوە، بەڵآم ئەی مانای ستەمکار مانای چی‌یە؟ فەرمووی: یارمەتی ستەمکار ئەوەیە کە نەیەڵن ئەو ستەمە بکات[3].

---

1 / ابو داود ت: ٣٠٤.
2 / ابوداود ، ت: ٣٠٥.
3 / البخاري ، ت: ٣٠٦.

لێرەدا تێگەیشتن کەهەر بانگەوازێ لەناو موسوڵماناندا لەبەر ڕەگەز پەرستی بێت ، کە بێگومان بانگەشەیەکی نەفامیيە لەپەیامی ئیسلام بەدەرە.

ئاینی پیرۆزی ئیسلام دان نانێت بەهیچ جۆرە وەلائێکدا جگە لەعەقیدەو بیرو باوەڕەکەی خۆی، یان هیچ پێوەندیيەك جگە لەو برایەتیيەی کە لەسەر بونیادێکی ئاینی بینا بکرێت.

وەدان نانێت بەهیچ جۆرە جیاکارییەکدا کە جیاوازی دەخاتە نێوان خەڵکییەوە جگە لەباوەڕو کوفر، کەواتە بێباوەڕێك کە دژی بەرنامەی ئیسلامە لە هەمان کاتدا دژی موسوڵمانانە دراوسێشی بێت یان برای خۆش بێت.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ لا تَجِدُ قَوْماً يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ ﴾ المجادلة : ٢٢.

واتە: هۆزێکت دەست ناکەوێت کە باوەڕی بەخواو ڕۆژی دوایی هەبێت خۆشەویستیان ببێت لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە دوژمنایەتی ئەکەن لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەیدا هەرچەند باوو باپیریشیان بن یان کوڕو هۆزو تیرەیان بن.

وەفەرموویەتی: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَتَّخِذُوا آبَاءَكُمْ وَإِخْوَانَكُمْ أَوْلِيَاءَ إِنِ اسْتَحَبُّوا الْكُفْرَ عَلَى الْإِيمَانِ ﴾ التوبة : ٢٣.

واتە: ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان بەخوا هێناوە کەسوکارو باوك‌و برای خۆتان مەکەنە دۆست ئەگەر ڕێگای بێباوەڕیان هەڵبژارد.

## ڕەگ و ڕەچەڵەك بناغەی ڕێزدانان نیيە

بوخاری لە ئەبوزەر و بیلالەوە دەگێڕێتەوە ﷺ کە جارێکیان لە یەك تووڕە بوون‌و قسەی نادروستیان بەیەك دەوت، ئەبو زەر بە بیلالی ووت: (یا ابن السوداء) ئەی کوڕی ژنە ڕەشەکە، بیلالی حەبەشیش سکاڵای بردەلای حەزرەت ﷺ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئایا بەدایکی تەشەری لێ ئەدەیت؟ بەڕاستی تۆ هێشتا سیفەتی نەفامیت تێدایە[1].

هەروەها لە ئەبو زەرەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ( انظر فأنك لست بخير من أحمر ولا أسود إلاّ أن تفضله بتقوى الله)[2]. سەرنج بدە تۆ نە لە ڕەش پێستیت و نە لە سپی پێست چاکترینت مەگەر بەهۆی تەقواو نزیکیت لەخوای گەورەوە.

---

[1] / البخاري، ت: ٣٠٧.
[2] / احمد ،ت: ٣٠٨.

**وه فەرموویەتی( كُلُكُم بني آدم وآدَمُ خُلِقَ مِــن تُــراب )[1] . واتـه: هـەمووتان نـەوەی ئـادەمن، ئـادەمیش لـه قـوڕ دروسـت كـراوه، ئـا لـەم گۆشـەنیگایەوه ئـاینی پیرۆزی ئیسلام حەرامی كردووه لەسەر موسڵمانان كه فەخرو شانازی بكات به ڕەچەڵەك یان پلەوپایه یان باوكو باپیرو بڵێت من كوڕی فلان كەسم یا، له نەوەی فلان كەسمو تۆش له فلان تیرەو هۆزی.**

**كەواته: نرخی ڕەچەڵەكو هۆز چی‌یه كه مرۆڤ بەگشتی بدرێته پاڵ نەوەی یەك دایكو باوك گریمان ڕەچەڵەك نرخی هەبوو، ئەو مرۆڤه پایەدارەو مرۆڤێكی‌تر پلەو پایەی نزمه لێرەدا ئەو مرۆڤه چ تاوانێكی هەیه كه لەو باوكو دایكه هاتۆته دنیاوه؟**

**پێغەمبەر ﷺ** ( إنَ أنسابَكُم هَذه لَيسَت بَمسبَة عَلى أحَدكُم كُلُكُم بنــو آدم ... ليس لأحد على الاحد فضل إلاّ بِدين أو تقوى )[2].

**واته: باوەڕدار گەورەتره له بێباوەڕ، خواناس پایەدارتره له كەسێك كه دوور لەخوا بێت** ( الناس لادم وحواء... ان الله لايسألكم عن احسابكم ولا انسابكم يوم القيامة ، ان اكرمكم عند الله اتقاكم )[3].

**له ڕۆژی دوایی‌دا ڕەچەڵەك هیچ نرخێكی نی‌یه بەڵكو ڕێز ئەوەیه كه زیاتر لەخوا بترسێت. وەپێغەمبەرﷺ لەچەند وشەیەكی دڵ تەزێندا جامی تووڕەیی خۆی ئەرژێنێ بەسەر ئەوانەدا كه شانازی به باوكو كوڕەوه دەكەنو ئەفەرمووێ:** ( لينتهن أقوام يفتخرون بابائهم الذين ماتوا انما هم فحم جهنم ، اوليكونن أهون على الله من الجُعــل الذي يدهده الخرء بانفه، ان الله أذهب عنكم عُبسة الجاهلية وفخرها بالاباء، انما هو مؤمن تقي شقي، الناس بنو ادم وادم خلق من تراب)[4].

**واته ئەوانەی كه شانازی به باوو باپیرانەوه دەكەنو لەگەڵ ئەوەشدا كه مردوون با واز لەو سیفەته ناشیرینه بێنن، چونكه ئەوانه خەڵوزی ئاگری دۆزەخن یان لای خوای گەوره له قالۆنچه بێ نرخترن، و ئەم كارەی لەسەر موسوڵمانان حەرام كردووه، مرۆڤایەتی یان باوەڕدار یان بێباوەڕ، هەموو خەڵكی له ئادەمن و ئادەمیش له خۆڵه.**

---

[1] / البزار ، ت: ٣٠٩.
[2] / احمد ، ت: ٣١٠.
[3] / ابن جرير، ت: ٣١١.
[4] / ابوداود والترمذي واللفظ له ، قال: حديث حسن، والبيهقي باسناد جيد حسن ، ايضا كما قال المنذري والجعل: دويبة ارضية ويدهده: يدحرج . العيبة الكبر والفخر ، ت: ٣١٢.

پێغەمبەر ﷺ لە (حجه الوداع)دا کە بەهەزاران موسوڵمان و خواناس گوێ بیستی بوون لەرۆژەکانی جەژنی قوربانـدا لەمەککـە وتـارێکی پێشـکەش بـە خۆشەویستەکانی کردو فەرمووی: ( یا أیها الناس إنَّ رَبَّکُم واحد، ألا لا فضْلَ لِعَرَبـيٍّ عَلى أعْجَمِيٍّ وَلا لأعجَمِيِّ عَلَى عَرَبِيِّ إلاّ بالتَقْوى )[1].

واتە: ئەی خەڵکینە یەك پەروەردگارتان هەیە ، جیاوازی لەنێوان عەرەبو عەجەمی یان رەش پێستو سوور پێست دا نییە، مەگەر بەتەقواو خواپەرستی نەبێت، بەراستی بەرێزترینتان لای خوای گەورە ئەو کەسەیە کە زیاتر لەخوا ترس و پارێزکارە.

## شیوەنو گریان لەسەر مردوو

یەکێکی تر لەو باوە کۆنو نەفامی‌یانەی کە ئاینی پیرۆزی ئیسلام هەوڵی لەناو بردنو بنەبڕ کردنی داوە ئەو هەڵسوکەوتە نەشیاوانەیە کە بەرامبەر مردوو دەکرێت وەك شینو گریانی بێ سنوورو لەخۆدانو لاڵانەوە، ئاینی پیرۆزی ئیسلام موسوڵمانان بەوە وشیارو ئاگادار دەکاتەوە کە پرۆسەی مردن گەشتێکە لە ماڵێکەوە بۆ ماڵێکی ترو لەناوچوونێکی یەکجاری نیە گریانو هاواریش هیچ مردوویەك زیندوو ناکاتەوە وەئەوەی پەروەردگار بڕیاری لەسەرداوە ئەبێت ببێت.

بۆیە پێویستە لەسەر موسوڵمان کە پێشوازی لە مردن بکات هەروەك چۆن پێشوازی هەموو ناخۆشیو ناسۆری‌یەکانی تری ژیانی دەکات و ئارام دەبێت لە سایەی‌داو پەندو وانەی لێ وەربگرێ و بەهیوای بەیەکگەیشتنی بەماڵی هەمیشەیی وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ( إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْـــهِ رَاجِعُـــونَ ) بەڵام ئەو دابو نەیتە نەفامی‌یەی کە نەزانان دروستیان کردووە لەلایەن پێغەمبەرو پەیامە پیرۆزەکەیەوە حەرام کراوە کاتێك دەفەرموێت: ( لیس منا من لطم الخدود، وشـــق الجيـــوب ، ودعـــا بدعوى الجاهلية)[2]. واتە لەئێمە نیە کەسێك لەناخۆشیدا روومەتی ئەڕنێتو ئێخەی خۆی دائەڕنیێو بانگەشەی نەفامی دەکات.

هەروەها دروست نیە کە موسوڵمان کارێك بکات کە نیشانەو رەمزی پرسەی پێوە دیار بێت وەك رەشپۆشیو وازهێنان لە خۆرازاندنەوەو ئەو ئیشو کارانەی کە پێشتر ئەنجامی ئەدان تەنها ژن بۆی هەیە دوای کۆچکردنی هاوسەرەکەی بۆ ماوەی چوارمانگ و دە رۆژ، وەك وەفایەك بۆ ئەو پەیوەندی‌یە

---

[1] / البيهقي : ت: ٣١٣.
[2] / البخاري گێڕاویەتیەوە، ت: ٣١٤.

پیرۆزەی بەوەی کە بەرگی جوان لەبەر نەکات و زۆر خۆی نەڕازێنێتەوە لەپێناو تەواوبوونی ئەو ماوەیەی کە ئاینی پیرۆزی ئیسلام بۆی دیاری کردووەو تا وەك پەرژینێك لەو ماوەیەدا پارێزراو بێت و دووربێت لە مەسەلەی داواکردن و، چونکە پەیامی ئیسلام ئەو ماوەیە بەدرێژەدانی ژیانی هاوسەرێتی دادەنێ لەگەڵ مافدا تا بەسەرچوونی عیددەی دیاریکراو، وەئەگەر مردووەکە هاوسەر نەبێت بەڵکو کوڕ یان باوك یان ئەوا نابێت ئافرەت لە سێ رۆژ زیاتر پرسە دابنێت.

بوخاری لە زەینەبی کچی ابو مسلمەوە ئەگێڕێتەوە، ئەویش لەدایکی موسوڵمانان ام حبیبەی خێزانی پێغەمبەرەوە ریوایەتی کردووە کاتێ باوکی ابو سفیانی کوڕی حرب کۆچی دوایی کرد، وە لە زەینەبەی کچی جەحش براکەی مرد ، هەردووکیان عەترو بۆنی خۆشیان بەکارهێناو فەرمووی ( والله مالي بالطيب من حاجة غير اني سمعت رسول الله يقول: لا يحل لأمرته تؤمن بالله واليوم الاخران تحو على ميت فوق ثلاث ليال الا على زوج اربعة اشهر وعشرا)[1].

دروست نییە هیچ ئافرەتێك کنیشانەو رەمزی پرسەی پێوەدیار بێت زیاد لە سێ شەو جگە لە هاوسەر کەچوار مانگ و دەشەوە ، ئافرەتێك هاتەلای پێغەمبەر ﷺ وتی: کچەکەت مێردەکەی مردووەو چاوی هاتە ژان ئایا ئەتوانێت بە کل بیرێژێت ؟ پێغەمبەر ﷺ دووجار یان فەرمووی : نا ... نا ...[2].

ئەمەش ئاماژەیە بۆئەوەی گەر ئەوماوەیە بەسەر نەچێت کە ژنێك هاوسەرەکەی مردبێت خۆی جوان بکات، لەگەڵ ئەوەشدا خەفەتباری و غەم و خواردن بەبێ شین و دەنگ بەرزکردنەوە شتێکی سروشتییە، عومەری کوڕی خەتاب بینی هەندێ ئافرەتان بۆ خالیدی کوڕی وەلید ئەگرین ویستیان رێیان لێ بگرن، عومەر فەرمووی وازیان لێ بێنن بابگرین بەسەر ابو سلیمان بەمەرجێ دەنگ بەرز نەکەوەو خۆڵ نەکەن بەسەر خۆیاندا.

## پرۆسەی مامەڵە کردن

خوای گەورە بەشێوەیەك ئادەمیزادی هێناوەتە بوون کە هەردەم پێویستیان بەیەکتر بێت چونکە کەس ناتوانێت هەموو پێویستیەکانی خۆی جێ بەجێ بکات . کۆمەڵێك کەس هەندێ شتیان هەیەو کۆمەڵێکیتر هەندێ شتی تریان هەیەو هەریەك پێویستی بەوەی تر دەبێت، بۆیە خوای گەورە بەجۆرێك

---

[1] البخاري گێراویەتیەوە لە پەڕاوی (الجنائز)دا لە صحیحەکەیدا . : ٢١٥

[2] البخاري گێراویەتیەوە لەپەڕاوی (الطلاق) دا، و لەفزەکەی لە گێراوەیەکی (ام حبیبە)وەیە . وە لەفزی زەینەبە. ت: ٣١٦.

بواری بۆ مرۆڤەکان رەخساندووە کە کەرەستەو پێویستی‌یەکانیان لەسەر بناغەی کڕین‌و فرۆشتن‌و سوود گەیاندن ئاڵوگۆڕ بکەن‌و بچنە بازنە مامەڵە کردنەوە تا ئەم ژیانە وەك خۆری رابیگرێت.

کاتێك محمد بوو بەپێغەمبەر ﷺ گەلێك کڕین‌و فرۆشتن لەنێو گەلی عەرەبدا بلاوبوو، هەندێکیانی وەك خۆی هێشتەوەو ئەوانەشی لەگەڵ مەبدەئی ئەم پەیامەدا نەدەگونجان هەستا بەنەهێشتنی، ئەم کارەش خۆی بۆ خۆی چەند هۆیەکی هەبوو لەوانە دوورکەوتنەوە لەگوناهو ستەمو پێشێل نەکردنی مافی یەکتری.

## فرۆشتنی کەرەستەی حەرام ... حەرامە

هەرشتێك ببێتە ئالیەتی چوونە نێو تاوانەوە ئیسلامی پیرۆز حەرامی کردووە، یان هەر سوودو قازانجێك لە رێیەکی ناشەرعی‌یەوە دەست بکەوێت ئەوا کڕین‌و فرۆشتن لەو کاتەدا حەرام دەبێت وەك بەراز خواردن‌و خواردنەوە بە شێوەیەکی گشتی یان وەك بت‌و صلیب‌و پەیکەرو هاووێنەکانی، بەلام کاتێك رێگەی کڕین‌و فرۆشتنیان لێ گیرا ئەوکاتە رێژەیەکی زۆر لەخەڵکی لەو تاوانە دوور دەکەونەوە.

بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی ( ان الله ورسوله حرم بيع الخمر والميتة والخنزير والأصنام )[1] واتە: خواو پێغەمبەر ﷺ فرۆشتنی خواردنەوەو مردو بەرازو بتیان قەدەغە کردووە ، وە فەرموویەتی: ( ان الله اذا حرّم شيئاً حرّم ثمنــه)[2]. واتە: ئەوەی خوای گەورە حەرامی کردووە بەهاکەشی حەرام کردووە.

## فرۆشتنی کەرەستەی نەزانراو دروست نی‌یە

هەر عەقدێکی فرۆشتن کەلێنێکی تێدابێت‌و ببێتە هۆی ململانێ بەهۆی نەزانینی فرۆشراوەکەوە یان زیانی بۆلایەکیان هەبێت ئەوا پێغەمبەر ﷺ بەهەموو شێوەیەك بەرهەڵستی کردووە تائەبێتە هۆی تووشبوونی بە تاوان ، وەك رێگرتن لە فرۆشتنی ئەوەی لە سکی گیاندارو باڵندە یاخود ماسی لەئاودا [3]، پێغەمبەر ﷺ دەرکی بەوە کردووە کە خەڵك بەرهەمی باخ‌و زەوی‌و زاریان دەفرۆشن پێش ئەوەی بەرهەمەکەی هاتبێتە بەرهەم پاش ئەوەی کە عەقدەکەیان ئەکرد، زۆرجار نەخۆشی‌یەك ئەهات بەسەریاو بەرهەمەکەی لەناو ئەبرد، پاشان فرۆشیارو کڕیار

---

[1] متفق عليه ٢ت : ٣١٧.

[2] احمد وابوداود ، ت: ٣١٨.

[3] النهي عن القرر في(صحيح) مسلم وغيره ، ت: ٣١٩.

ناخۆشی دەکەوتە نێوانیانەوە فرۆشیار ئەیووت من بەتۆم فرۆشتووەو ماڵی خۆتە، کڕیاریش دەڵێت: من لەپێناو بەرهەمەکەی کڕیوومەو ئێستا هیچی نەماوە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ بەرگری لە فرۆشتنی بەرهەمی باخ و کشت وکاڵ کرد هەتا بەتەواوی بەرهەمەکەی دەرئەکەوێت و هەڵناوەری[1].

مەگەر کڕیار بڵێت کت وپڕ بەرهەمەکەی دەبڕمەوە، هەروەها بەرگری کرد لەفرۆشتنی دانەوێڵە لەگوڵەکەی‌دا تا سپی دەبێت و بەدوور دەبێت لەتووش بوونی بە نەخۆشی[2] وەفەرمووی: ( ارأيت اذا منع الله الثمرة ثم يستحل احدكم مـال اخيـه )[3] ئەبینی کاتێ خوای گەورە ڕێی لەوبەرهەمە گرت کە خواردنی ماڵی براکەی بە حەڵاڵ بزانێت.

هەموو کڕین و فرۆشتنێکی نەزانراو حەرام نیە، بۆ نموونە خانوو کە دەکڕدرێت ناتوانین ئاگاداری چۆنیەتی بونیادنانی بناغەکەی بیت، بەڵام جۆرە فرۆشتنێکی نەزانراو حەرامە کە سەربکێشێ بۆ ململانێ و ناخۆشی لەنێوان ئەو کەسانەدا کە هەستاون بەم پرۆسەیە.

وەکاتێك ئەمکارە بەپێی باوو نەریتێك شتە نادیارەکانی ژێرزەوی وەك گێزەرو توورو پیاز... وەبەلای مەزهەبی پێشەوا ئەحمەدەوە روایە کە مرۆڤ ئەو شتانە بفرۆشێت کە پێویستی پێیەتی[4].

## یاری کردن بە بەهای کاڵاکان

ئاینی پیرۆزی ئیسلام پێی باشە کە سەربەستیەك بەرجەستە بکات لە پرۆسەی کڕین و فرۆشتندا، وە وازی لێبهێنرێ کە یاسا سروشتی‌یەکان کاریگەری سەرەتایی‌یان تێدا هەبێت لەبەرئەوەی لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ نرخی شتەکان گران بوو خەڵك پێشنیاریان کرد کەنرخی شتەکانیان بۆ دابنێنت ، ئەویش فەرمووی: ( ان الله هو المسعر القابض الباسط الرازق وأني لارجو ان القى الله وليس احـد منكم يطالبني بمظلة في دم ولا مال)[5]. واتە: بەڕاستی خوای گەورە کەم یان زۆرکردنی بەهای شتەکان دیاری دەکات و هەرئەویش ڕۆزی بەخشە، هیوادارم کەبچمە

---

[1] / الشيخان گێراویانەتەوە ، ت: ٣٢.
[2] / البخاري وغيره، ت: ٣٢١.
[3] / البخاري وغيره ، ت: ٣٢٢.
[4] ابن تيمية:ئەفەرموێ لە (القواعد النورانية) ئوصولی مالیك لە فرۆشتندا باشترە لەجگە لەخۆی وەئەمەی لە سەعیدی کوڕی الحسيب وەرگرتووە هەروەك ئەڵێت: شارەزاتر نیە لەفرۆشتندا لە (البيوع لا: ١١٨) و ڕێبازی (احمد) یش لێوەی نزیکە.
[5] / احمد وابوداود والترمذي وابن ماجه والدارمي وابي يعلى ، ت: ٣٢٣.

حزوری پەروەردگارو هیچ کەس لەئێوە داوایەکی نەبێت دەربارەی خوێن یان سامانەوە.

پێغەمبەر ﷺ لە روانگەی ئەم فەرموودەیەوە پێمان رادەگەیەنێت کە دەست خستنە نێو کاروباری خەڵکی بەبێ پێویست ستەمەو پێی خۆشە کاتێك کۆچی دوایی دەکات هیچی لەو بارەیەوە لا نەبێت . بەڵام گەر شتی ناسروشتی کەوتە نێو پرۆسەی کڕینو فرۆشتنەوە، وەك شاردنەوەی شتومەك و گران کردنی نرخو بەهاکەی لێرەدا بەرژەوەندی گشتی لەپێش سەربەستی تاکە کەسەوەیە بۆیە لەو کاتەدا نرخ دانان دروستە لەپێناو پاراستنی کەلوپەل لەدەست چاوچنۆکان ، کەواتە لەسەر رای زانایان هەموو نرخ دانانێك حەرام نیە، هەر نرخ دانانێك بەشێوەیەکی ناهەق ستەم لەخەڵکەکە بکات ئەوکاتە حەرامە ، بەڵام گەر بووە هۆی بونیادنانی دادپەروەری لەنێو خەڵکیدا ئەوە نەك هەر دروستە بەڵکو پێویستە[1].

## ئەوانەی کاڵا ئەشارنەوە نەفرین لێکراون

بەڵێ ، هەرچەند ئەم پەیامە پیرۆزە سەربەستی لە کڕینو فرۆشتندا فەراهەم هێناوە، بەڵام بەرەنگاری ئەو سیفەتانە دەبێتەوە وەك خۆپەرستیو خۆ ویستی و خۆ دەوڵەمەند کردن لەسەر بەرژەوەندی مافی کەسانی تر، وەك دەفەرموێت: ( من احتكر الطعام اربعين ليلة فقد بريء الله منه )[2].

ئەو کەسەی ماوەی چل شەو خۆراك بشارێتەوە خوای گەورە لێی بێبەریە ، هەروەها فەرموویەتی (لا يَحتَكِرُ الاّ خـــاطيء)[3]. واتە: کەس گران فرۆشی ناکات جگە لەکەسێکی تاوانبار (خاطيء) وشەیەکی ئاسان نیە، چونکە وشەیەکە زۆرداران و ستەمکاران پێ بالاپۆش کراوە وەك فیرعەونو هامانو سەربازەکانیان ﴿ إِنَّ فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَجُنُودَهُمَا كَانُوا خَاطِئِينَ ﴾ القصص: ٨.

پێغەمبەر ﷺ زۆر جوان دەروونو بۆچوونی ئەو کەسانەی روون کردۆتەوە و فەرموویەتی ( بئس عبدالمحتكر ان يتمتع برخص سائه وان تسمع بغلاء فــرح)[4] کەسێك نرخی شتومەك گران دەکات مرۆڤێکی خۆویستە چونکە گەر ببیستێ نرخی

---

[1] / بگەڕێرەوە بۆ (رسالة الحسبة) هى شيخ الإسلام ابن تيمية ، و (الطرق الحكمية) هى ابن القيم (لا : ٢١٤) و بابەتەکانی دوایی ، چ – السنة المحمدية – القاهرة .

[2] / احمد والحاكم وابن ابي شيبة والبزار، ت: ٣٢٤.

[3] / مسلم ، ت: ٣٢٥.

[4] / ذكر زين في جامعه ، ت: ٣٢٦.

کەل‌وپەل هەرزان بووە پێی ناخۆشەو بەبیستنی گران بوونی نرخەکەی دڵخۆش دەبێت، وەفەرموویەتی: ( الجالب مرزوق والمحتكر ملعون )[1].

واتە: بازرگان بەیەکێك لەم دوو ڕێگەیەوە ،

یان کەل‌و پەلەکەی دەخاتە گەنجینەوەو ئەیهێڵێتەوە تا گران دەبێت لەکاتێکدا کە ئەو جۆرە کەل‌وپەلە لەنێو خەڵکیدا کەمەو هەوڵی کڕینی ئەدەن با بە نرخێکی گرانیش بێت ، یان شت‌ومەك دێنێ‌و بەقازانجێکی کەم دەفرۆشێت پاشان ئەم کارە چەند بارە دەکاتەوەو زوو زوو شتەکانی دەفرۆشێت، ئەم قازانجە کەمە بەرەکەتی زیاترە، وەك پێغەمبەر ﷺ مژدەی داوەتیێ ( معقل کوڕی یەسار) دەگێڕێتەوە کاتێك کە نەخۆش بوو ، عەبدوڵڵای کوڕی زیاد هاتەلای و هەواڵی پرسی‌و پێی وت ئایا ئەزانیت کە من خوێنێکی حەرامم ڕشتووە؟

ئەویش وتی: نازانم، وتی ئەی زانیوتە کە من دەستم خستۆتە شتی موسڵمانانەوە؟

ئەویش وتی: نەخێر، ئینجا معقل وتی: هەڵم بستێنە پاشان وتی: گوێ ڕاگرە ئەی عەبدوڵڵا با قسەیەکت بۆ بکەم کە لە پێغەمبەرم بیستووە، دووجار یان یەك جار فەرمووی: ( من دخل في شيء من اسعار المسلمين ليغليه عليهم كان حقاً على الله تبارك و تعالى ان يقعده يعظم من النار يوم القيامة ) قال انت سمعت من رسول الله؟ فقال: غير مرة ولا مرتين[2].

واتە: هەرکەسێ دەست بخاتە نرخی شت‌ومەکی موسوڵمانان بەمەبەستی گران بوونی نرخەکەی خوای گەورە پێویستی کردووە لەسەر خۆی کە سزای بدات.

لەدەقی ئەم فەرموودەیەوەو زانایان ئەوەیان لێ وەرگرتووە کە سیفەتی (احتکار) بەدوو مەرج دێتەدی :

یەکەم : لەکاتێکدا کە لە وڵاتەدا ئەم کارە زیانیان پێبگەیەنێت ،

دووەم : یان مەبەستی گرانکردنی لەپێناو قازانجێکی زۆردا بێت.

---

[1] / ابن ماجه والحاكم ، ت: ٣٢٧.

[2] / احمد والطبراني ، ت: ٣٢٨.

## دەست تێوەردانی کاریگەرانە لە سەربەستی بازاڕەکاندا

ئەوەی لەدوای (احتکار)ەوە پێغەمبەر ﷺ رێی لێگرتووە ئەوەیە کە شارنشینێك شت بەکەسێکی لادێ نشین بفرۆشێ، بۆ نموونە: کەسێك لادێ نشین شمەکێك دێنێ بۆ شار کە پێویستە بۆ بەکارهێنان، دانیشتوویەکی شار دێتە لای و پێی دەڵێت: لای من دابنێ تا بە زیاتر بۆت بفرۆشم، ئەگەر لادێ نشینەکە خۆی هەستێت بەکرداری فرۆشتنەکە بەنرخێکی هەرزان دەیفرۆشێ و سوودی زیاتریشی دەبێت بۆ شارییەکان. ئەم جۆرە فرۆشتنە زۆر باو بووە لەنێو کۆمەڵانی ئەو سەردەمەدا، ئەنەس ئەفەرموێت: رێمان لێگیراوە کە کەسێکی شارنشین کەل وپەل بۆ لادێ نشینێك بفرۆشێت ( نهينا أن يبيع حاضر لباد ، ولو كان اخاه لأبيه وامه )[1] تەنانەت ئەگەری برای باوك و دایکی بێت.

لەمەوە بۆمان روون دەبێتەوە کەبەرژەوەندی گشتی لەسەروی پەیوەندییە تایبەتییەکانەوەیە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: ( لا بيع حاضر لباد دعوا الناس يرزق الله بعضهم بعضاً )[2] ئەم دەربڕینەی پێغەمبەر ﷺی ئازیز زۆر جوانە کە دەفەرموێ: واز لە بازاڕو نرخ و ئاڵ و گۆڕەکان بهێنرێ بۆ ململانێ سروشتییەکان، پرسیارکرا لە (ابن عباس) لەمانای فەرموودەکە ، ئەویش فەرمووی: واتە نەبێتە دەلاڵ بۆی (لا يكون له سمساراً )[3] .

کەواتە: ئەگەر فرۆشیارەکە رێنموویی کرد دەربارەی نرخی رۆژو دڵسۆز بوو لەگەڵیدا ئەو کاتە هیچ ئیشکالێکی تێدا نامێنێ چاکەکاری هەموو بوعدەکانی ئەم پەیامەی رووپۆش کردووە ، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (الدين نصيحة)[4] یاخود (اذا استمع احدكم أخاه فليصنع له)[5].

## دەلاڵی رەوایە

دەلاڵی لەنێوەندی ئەو بازنەیە هیچ ئیشکالیەتی لەسەر نیە، چونکە جۆرێکە لەدەلاڵی وەئالیەتێکە لەنێوان کڕیارو فرۆشیاردا، گەلێك جار ئەبێتە هۆکاری سوود پێگەیاندن بەیەکێکیان، یان هەردوولایان و برەو بەمامەڵەکەیان

---

[1] متفق عليه ، ت : ٣٢٩.
[2] مسلم ، ت : ٣٣٠.
[3] البخاري ، ت : ٣٣١.
[4] مسلم ، ت : ٣٣٢.
[5] احمد ، ت : ٣٣٣

ئەدات، بەتایبەت لەسەردەمی ئەمڕۆماندا، دەورێکی کاریگەری هەیە لە پرۆسەی بازرگانی بەکۆمەڵو تاکدا وەئەتوانرێ پارەش وەربگیرێت لەم کارەدا.

ئیمامی بوخاری لە صەحیحی خۆیدا وتویەتی: ( لم یر ابن سیرین و عطاء ابراهیم والحسن بأجر السمسار بأساً ) واتە: هیچ بەڕێزێك لەم خواناسانە کرێ دەڵاڵیان بە خراپ دانەناوە.

وە (ابن عباس) فەرموویەتی: ( لا بأس بان یقول : مع هذا الثوب فما زاد علی کذا وکذا فهو لك ) واتە خراپ نیە بڵێت ئەوە بفرۆشە بەو نرخەو هەرچی لەوە زیاتربوو بۆ خۆت.

وە (ابن سیرین) وتویەتی: ( اذا قال بعه بکذا فما کان من ربح فهو لك او بیني وبینك فلا بأس به) ئەگەر بڵێت بەوەندە بیفرۆشەو قازانجەکەشی هەڵبگرە بۆ خۆت یان بۆ هەردووکمان ئەوکاتە هیچ ئیشکالیەتێکی تێدانیە، وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : المسلمون عند شروطهم[1]. واتە: موسڵمانان ئەتوانن بەپێی مەرجو ڕێکەوتنیان مامەڵە بکەن.

## فێڵ و چاوبەستی لە بازرگانیدا حەرامە

بۆ ئەوەی کەس دەست نەخاتە مامەڵەی هیچ کەسێکی ترەوە پێغەمبەر ﷺ نەهی کردووە لە (نجش)[2] کە بریتی‌یە لە زەم کردنی بەبێ ئەوەی خۆی کڕیار بێت تا خەڵکی تریش چاوی لێ بکەن و نرخی فرۆشراوەکە بەرز بکەنەوە، زۆرجاریش بۆ هەڵخەڵەتاندنی خەڵکی لەگەڵ فرۆشیارەکەدا ڕێك دەکەونو لەبەر ئەوەی مامەڵە دوور بێ لەهەموو چەشنەکانی فێڵ کردن، وە لەبواری بازرگانیدا پێغەمبەر ﷺ نەهی کردووە لە (تلقي السلع) واتە: کڕینی شمەکێك لە دەرەوەی شار ، و دیاری کردنی نرخەکەی پێش ئەوەی بگاتە بازاڕ[3] ، وە ماوە ناهێڵێتەوە کە ئەو شمەکە بەنرخی گونجاو بفرۆشێ، ئەو خاوەنەی کە نرخی بازاڕ نازانێت تووشی زەرەو زیان دەبێت بۆیە پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی پەشیمان بوونەوەی پێدا کاتێ هاتە بازاڕو زانی زەرەی کردووە[4].

---

[1] ذکره البخاري معلقا ، ورواه احمد واوداود والحاکم وغیرهم موصولا ت: ٣٣٤.
[2] متفق علیه ، ت: ٣٣٥.
[3] مسلم واحمد وابن ماجه / ت: ٣٣٦.
[4] مسلم ، ت: ٣٣٧.

## ئەوەی غەشمان لێ بکات لەئێمە نىیە

لەئاینی پیرۆزی ئیسلامدا هەموو شێوەکانی دەست بڕین و هەڵخەڵەتاندن حەرامە، لەکڕین و فرۆشتن و مامەڵەکانی تردا، وەموسوڵمانیش دەبێت راستگۆبێت لە هەڵس وکەوتیدا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( البیعان بالخیار ما لم یتفرقا فأن صدقاً و بیّنا بورك لهما في بیعهما، وان كذباً وكتما مُحقت بركة بیعهما )[1].

پەشیمان بوونەوە بۆ کڕیارو فرۆشیار هەیە تائەو کاتەی لەیەك جیا نەبوونەوە، ئەگەر راستیان کردو کەم و کووڕی فرۆشراوەکەیان دەرخست، خوای گەورە بەرەکەت دەخاتە مامەڵەکەیان بەلاّم گەر بە پێچەوانەوە بوو هیچ بەرەکەتی تێدا نامێنێ.

هەروەها فەرموویەتی: ( لا یحل لأحد بیع بیعاً الا بین مافیه ولا یحل لمن یعلم ذلك الا بینه )[2] واتە: حەلاڵ نیە هیچ شتێك بفرۆشرێ گەر کەم و کووڕیەکی تێدا بێت و نەزانرێ جارێك پێغەمبەر ﷺ بەلای فرۆشیارێکدا تێپەڕی دانەوێڵەی دەفرۆشت، حەزی لێکردو دەستی خستە نێو دانەوێڵەکەوە هەستی بە تەڕییەك کرد تێیدا ، پاشان فەرمووی: (ما هذا یا صاحب الطعام ؟ ئەم تەڕیە چیە؟ خاوەنەکەی وت: باران لێیداوە ئینجا حەزرەت فەرمووی: ئەی بۆچی تەڕەکەت دەرنەخستووە تا خەڵکی ببینن ئەوەی فێڵ بکات لە ئێمە نیە )[3].

لەگێڕانەوەیەکدا : بەلای کۆمەڵێك خوارندا رۆیشت کە خاوەنەکەی رازاندبوویەوە پاشان دەستی کردە خواردنەکەوە بینی خراپ بووە، و فەرمووی: (بع هذا على حده، وهذا على حده، من غشنا فلیس منا)[4]. واتە: ئەمە بەجیا بفرۆشە ئەوەش بەجیا بفرۆشە، ئەوەی ناپاکی بکات لەئێمە نیە.

موسوڵمانان بەم شێوەیە مامەڵەیان کردووە هەر کورتیەك لە فرۆشراوەکەیاندا هەبووایە ئاشکرایان کردووە، راستگۆو دڵسۆزبوون، (ابن سیرین) مەڕێکی ئەفرۆشت فەرمووی: عەیبێکی هەیە کە ئاڵف ژێر پێی دەخات .

وەحەسەنی کوڕی صالح کەنیزەکێکی فرۆشت و بەکڕیارەکەی وت: جارێك خوێن بە چڵمەکەیەوە بوو.

---

(1) البخاري، ت: ٣٣٨.
(2) الحاكم والبیهقي، ت: ٣٣٩.
(3) مسلم، ت: ٣٤٠.
(4) احمد ، ت: ٣٤١.

## بەکارهێنانی سوێندی زۆر

ئەگەر لەسەر فێڵو غەشەکەی سوێندی خوارد ئەوا ئاستی تاوانەکەی زۆرتر دەبێت، وە پێغەمبەر ﷺ داوای کردووە کە بازرگانەکان سوێندی زۆر نەخۆن و فەرموویەتی: ( الحلف منفعة للسلعة ممحقة للبركة )[1]. واتە: سوێند برەو ئەدا بە فرۆشتنی شمەکەکە بەڵام پیت و بەرەکەتی تێدا ناهێڵێ، خواردنی سوێندی زۆر دروست نیە چونکە بۆنی هەڵخەڵەتاندنی لێ دێ و گەورەیی ناوی خوای گەورە لە دڵدا لادەبات.

## فێڵ کردن لەکێشانەو پێوانەدا

یەکێکیتر لەو فێڵانەی کە فرۆشیار هەندێ جار پەنای بۆ دەبات غەش کردنە لەکێشانەو پێوانەدا، قورئانی پیرۆز زۆر بایەخی داوە بەم جۆرە مامەڵەیە (ئەوەتا لەشێوەی ئامۆژگاری لەکۆتای سوورەتی (انعام)دا دەفەرموێت:

﴿ وَأَوْفُوا الْكَيْلَ وَالْمِيزَانَ بِالْقِسْطِ لا نُكَلِّفُ نَفْساً إِلَّا وُسْعَهَا ﴾ الأنعام:١٥٢ خوای گەورە فەرمانمان پێدەکات کە کێشانەو پێوانەمان راست بێتو فێڵیان تێدا نەکەین، وەفەرموویەتی: ﴿ وَأَوْفُوا الْكَيْلَ إِذَا كِلْتُمْ وَزِنُوا بِالْقِسْطَاسِ الْمُسْتَقِيمِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلاً ﴾ الاسراء: ٣٥ یاخود ﴿ وَيْلٌ لِلْمُطَفِّفِينَ الَّذِينَ إِذَا اكْتَالُوا عَلَى النَّاسِ يَسْتَوْفُونَ وَإِذَا كَالُوهُمْ أَوْ وَزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ أَلا يَظُنُّ أُولَئِكَ أَنَّهُمْ مَبْعُوثُونَ لِيَوْمٍ عَظِيمٍ يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ ﴾ واتە: وای بۆ تەرازووبازان ئەوانەی کە پێوانە دەکەن لەسەر ماڵی خەڵك بە تەواوی وەری دەگرن، وەکاتێك بۆیان کێشانە دەکەن کەمیان ئەدەنێ، ئایا نازانن کە زیندوو دەکرێنەوە لە رۆژێکی گەورەو ترسناندا، رۆژێك کە خەڵکی لە ژێر بارەگای پەروەردگاری جیهانیاندا رادەوەستن.

کەواتە پێویستە لەسەر موسڵمان هەتا ئەتوانێن لەپێوانەو کێشانەدا ووردبینو دادپەروەر بێت.

وەخوای گەورە دوای فەرمان کردن بەدادوەری ئەفەرموێ: هیچ کارێك ناخەینە سەرشانی موسڵمان بەپێی توانای خۆی نەبێت . پەروەردگار باسی قەومێك دەکات کە ناهەقیان لەم پرۆسەیەدا کردووەو زیانیان بەخەڵکی دەگەیاند، خوای گەورەش شوعەیب پێغەمبەری بۆ ناردن ﷺ تا بیانخاتە سەر رێگای راست

---

[1] البخاري ، ت: ٢٤٢.

﴿ أَوْفُوا الْكَيْلَ وَلا تَكُونُوا مِنَ الْمُخْسِرِينَ وَزِنُوا بِالْقِسْطَاسِ الْمُسْتَقِيمِ وَلا تَبْخَسُوا النَّاسَ أَشْيَاءَهُمْ وَلا تَعْثَوْا فِي الْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴾ الشعراء:١٨١-١٨٢ واته: به ووردی کاری کێشانه ئەنجام بدەنو لەکۆمەڵی خەسارەتمەندان مەبن، وزیان بە خەڵك مەگەیەنن، کەواتە پێویستە لەسەر موسوڵمانان کە ئەم نمونەیە لە هەموو قۆناغەکانی ژیانیدا رەنگ بداتەوە وەنابێت دوو کێشانە بەکار بهێنێ یەکێکیان تایبەتیو ئەوی دی گشتی، یەك بۆ خۆشەویستانیو ئەوی تر بۆ خەڵکی.

## کڕینی شمەکی تالاَنو براو هاوبەشی تاوانبارەکانە

یەکێکی تر لەو ئالیەتانەی کە ئاینی پیرۆزی ئیسلام دژی تاوانباران بەکار دێنێ تا لەبچووکترین بازنە دابیهێڵێتەوە، ئەوەیە کە ڕێ نادات بەموسوڵمان بە کڕینی شتێكو بشزانێت کە براوە یان بەناهەق لەخاوەنەکەی سەندراوە، چونکە گەر بیکڕێت واتە پشتگیری ستەمکارەکە دەکات لە تاوانەکەیدا، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (ومن اشترى سرقة (أي مسروقا) وهو يعلم أنها سرقة فقد اشترك في اثمها و عارها) [1] . واتە کەسێك شتێکی براو بکڕێ و بیشزانێت کە براوە ئەوا هاوبەشی ئەوکەسەی کردووە لەتاوانەکەیدا، هەرچەند ئەو کارەش ماوەیەکی زۆری بەسەردا تێپەری بێت، چونکە لەئاینی ئیسلامدا ماوەی زۆر حەرام حەلاَڵ ناکات، وە هەر مافی خاوەنەکەیەتی وەك لەنێوەندی هەندێ لەیاسا دەستکردەکاندا بەدی دەکرێ.

## سوو ... حەرامە ...

ئاینی ئیسلام ڕێی بە قازانجی بازرگانیداوە، ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ إِلَّا أَنْ تَكُونَ تِجَارَةً عَنْ تَرَاضٍ مِنْكُمْ ﴾ النساء : ٢٩ ، واتە: ئەی موسوڵمانان لەناو خۆتاندا ماڵی یەکتری بەناهەق مەخۆن مەگەر بەرێگەی بازرگانی و ڕەزامەندی خۆتان نەبێت، خوای گەورە مەدحی ئەوانە دەکات کە بۆ بازرگانی بەملاو بەولادا دەڕۆن ﴿ يَضْرِبُونَ فِي الْأَرْضِ يَبْتَغُونَ مِنْ فَضْلِ اللَّهِ ﴾ المزمل:٢٠ بە ولاَتاندا دەڕۆن بۆ بازرگانی.

بەلاَم ئیسلامی پیرۆز کەم تازۆر قازانجی حەرام کردووە لە ڕێگەی (سوو)ە وە زۆر بەتوندی دژی جولەکەکان بووە کەئەم کارەیان حەلاَڵکردووە لەگەڵ ئەوەشدا کە لە (تەورات)دا لەسەریان حەرام کرابوو وەدوا ئایەت کە لە سوورەتی (بقرة)دا بۆ پێغەمبەر ﷺ هاتە خوارەوە، ئەفەرموێ: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللَّهَ وَذَرُواْ مَا بَقِيَ مِنَ

[1] البيهقي، ت: ٣٤٣.

الرِّبَا إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ {٢٧٨} فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ فَأْذَنُواْ بِحَرْبٍ مِّنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُؤُوسُ أَمْوَالِكُمْ لاَ تَظْلِمُونَ وَلاَ تُظْلَمُونَ {٢٧٩} ﴾ البقرة ، **ئەی موسوڵمانان لەخوا بترسن‌و دەست لە سوو هەڵبگرن، ئەگەر فەرمانی خوا بشکێنن چاك بزانن كە خوای گەورە دژی ئەم مامەڵە نادروستەیە بەلاّم ئەگەر بگەڕێنەوە ئەو كاتە ئەتوانن بیّ زیادە سەرمایەكەتان وەربگرنەوە نە ستەم بكەن‌و نە بهێڵن ستەمتان لیّ بكریّ.**

**وە پێغەمبەر ﷺ جەنگی بڕیارداوە دژی سوو خۆران و مەترسی‌یەكەی لەسەر كۆمەڵگا روون كردوەتەوە وەك دەفەرموێت:** ( اذا ظهر الربا والزنى في قرية فقد احلوا بانفسهم عذاب الله)[1]. **واتە: كاتیّ لەشوێنێكدا سوو خۆری و بەدڕەوشتی بلاّو بوویەوە بزانن كە سزای خوای گەورەیان بۆ خۆیان پێویست كردووە.**

**وە نەبێت ئیسلام یەكەم ئاینێك بێت بەڵكو لەئاینی جولەكەشدا لەتەوراتدا دەفەرمویّ:** ( إذا إفتقر أخوك فاحمله لا تطلب منه ربا ولا منفعة ) **ئایەتی ٢٤ بەشی ٢٢ – سفر الخروج – واتە: ئەگەر براكەت هەژار كەوت یارمەتی بدەو قازانج‌و سووی لیّ مەسێنە.**

**هەروەها لەئاینی گاور لەئینجیلی لوقادا هاتووە:** ( افعلوا الخيرات ، وأقرضوا غير منتظرين عائدها وإذن يكون ثوابكم جزيلا ) **٢٤ – ٢٥ بەشی (٦) "**

**واتە: خێر بكەن و قەرز بدەن بەهەژارو چاوەڕوانی قازانجەكەی مەبن، بێگومان گەر واتان كرد پاداشتتان گەورە دەبێت.**

**بەلاّم بەداخەوە گۆڕانكاری تێداكراوە، ئەوەتا وشەی (اخوك) یان گۆڕیوە لە** سفر تثنيه الاشتراع (للأجنبي تقرض بربا، ولكن لأخيك لا تقرض بربا ) ٢٣ : ١٩

**واتە: سوو لە قەرزی بێگانە وەربگرە بەلاّم سوو لە برای خۆت وەرمەگرە.**

## حیكمەتی حەرام كردنی سوو

**مەبەستی ئیسلام لەحەرامكردنی ئەم پرۆسەیە، رەچاوكردنی بەرژەوەندی مرۆڤایەتی‌یە لەرووی خوورەوشت باری كۆمەلاّیەتی‌و ئابووری، زانایانی ئیسلام گەلێك هۆكاری حەرامكردنی ئەم كارەیان خستۆتەروو كەلێكۆڵینەوە نوێگەریەكانیش پشتگیری لێدەكەن، ئێمە تەنها ئەو روونكردنەوانەمان بەسە لە ئیمامی رازی لە تەفسیرەكەی‌دا نووسیویەتی :**

[1] رواه الحاكم ، وروي نحوه ابو يعلى باسناد جيد ، ت: ٣٤٤.

**یەکـەم/** سـوو خـواردن مـاڵی خەڵکی‌یـە بەبێ بـوونی هـیچ بریتی‌یـەك‌و لـە جیاتی دانانێك، سەروەتی خەڵك بۆ دابینکردنی پێویتسیەکانیەتی و نابێت بێ رێز سەیر بکرێت، وەك پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی (حرمة مال الانسان کحرمة دمه)[1]. واتە: چۆن خوێنی مرۆڤ حەرامەو کوشتنی دروست نیە بەهەمان شێوەشە دەست درێژی بۆ سەروەت‌و سامانی حەرامە.

**دووەم/** گـەر مـرۆڤ پشـتی بەسـوو خـواردن بەسـت واز لـە کاسـبی دێنـێ، چونکە خاوەن پارەکە بزانێت لە بەخشینی یەك دینار دینارێکی زیادە وەردەگرێ، بەنەقدی بێت یان بە قەرز لەوکاتەدا بایەخ نـادات بـەکارکردن بـۆ خێزانەکەی دیارە ئەمەش سەردەکێشێ بۆ نەمانی سوودو قازانجی مرۆڤ شتێکی بەڵگەو نەویستە کە بەرژەوەندی جیهان بەستراوە بەبازرگانی و پیشەسازی‌یەوە.

**سـێهەم /** سـوود خـواردن سەردەکێشـێ بـۆ نەهێشـتنی چـاکە لـە نێـوان مرۆڤەکاندا ، چونکە تەها لە رێی قەرزەوە یارمەتی یەکتریان ئەدا .

**چوارەم/** زۆربەی کات قەرز بەخش دەوڵەمەندەو بەرامبەرەکەی هـەژارە بۆیـە رێگەدان بەم کارە مانای وایە رێگە دراوە کە دەوڵەمەنـد زیـاد لـە هـەژار وەربگـرێ ، کە ئەم کارەش ناچێتە نێو قاڵبی بەزەیی پەروەردگارەوە[2] .

سووکاری واتە مژینی خوێنی هەژار لەپێناو بەرژەوەنـدی بەهێزەکانـدا، وە سەرەنجامەکەی زیاتر دەوڵەمەندکردنی دەوڵەمەندەکانەو هەژارخستنی هەژارەکانـە ، بـەم پێیـەش کۆمـەڵێك لەسـەر حسابی کۆمـەڵێکی تـر پارەیـەکی زۆریـان دەسـت دەکەوێت و رق‌و کینـە لەنێوانیانـدا بڵاودەبێتـەوە، بەپێی یاسا دانراوەکان مێژوو بۆمـان دەسـەلمێنێ کـە ئـەم کـارە چ بـەرەنجامێك سامناك‌و مەترسـیداری هەیـە لـە رووی بەڕێوەبردنی ناوخۆو دەرەوە بەگشتی.

## سـووخـۆرو نووسـەرەکـەی

سووخۆر : ئـەو کەسـەیە کـە خـاوەن پارەکەیـەو زیـادە وەرئـەگرێ، کـەلای خوای گەورەو مرۆڤیش نەفرین لێکراوە، کەئەم تەنها لە تاوانەکەی دانیە بەڵکو ئەو کەسەشی کە پارەکە وەردەگرێ بەشدارە.

---

[1] اخرجه ابو نعيم في الحلية، ت: ٣٤٥.

[2] تفسير فخر الرازي ج٧/٤٠٧ چاپی عبدالرحمن محمد ، بەکەمێك دەستکارییەوە.

تەنانـەت نووسەرەکەشـیو ئـەو شـایەتانەی لـەنێوان ئـەم دوو کەسـەدان پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ( لعن الله اكل الربا ومؤكله وشاهده وكاتبه )[1].

وەهەرکاتێك کەسێك لەپێناو دەستکەوتنی پێویستییەکی ژیانی ناچاربوو لەم حاڵەتەدا، تەنها خاوەن پارەکە گوناهبار دەبێت.

١) بەمـەرجێك ئـەو ناچـارییە، ناچـارییەکی راسـتەقینە بێـت، پوختـەی قسـە ئەوەیە کەپێویستی ئەوە بگرێتەوە کە مرۆڤ نەتوانێت بێ ئەو شتە بـژی وەك خواردن و پۆشاك.

٢) پێویسـتە هێنـدەی ئـەو شـتانەی دەیـەوێت قـەرز بکـات ، بـۆ نموونـە گـەر پێویستییەکەی بە (٩) دینار بێت نابێ (١٠) دینار وەربگرێت.

٣) ئەبێت هیچ دەروازەیەکیتر شك نەبات بۆ دابینکردنی پێویستییەکانی ، لەم کاتەدا ئەشێ ئەو کەسە گوناهبار نەبێت (خوا خاوەنی لێبوردنە).

٤) هەر کاتێك ئەم کارەی کرد دەبێت لەدڵدا پێی نـاخۆش بێـت، تـاخوای گـەورە دەرووی خێری لێ بکاتەوە.

## پێغەمبەر ﷺ پەنـای بەخوا گرتـووە لەقـەرز

یەکێك لە ئەحکامەکانی ئاین کە موسوڵمان ئەبێت بزانێت ئەوەیە کەدەبێت موسوڵمانان مامناوەند بن لە رووی ئـابووری ژیانیانـەوە ﴿ وَلا تُسْرِفُوا إِنَّهُ لا يُحِـبُّ الْمُسْرِفِينَ ﴾ الأنعام : ١٤١. ﴿وَلا تُبَذِّرْ تَبْذِيراً إِنَّ الْمُبَذِّرِينَ كَانُوا إِخْوَانَ الشَّيَاطِينِ ﴾ الاسـراء ٢٧، واتـە: لـە مـاڵ بەخشـیندا زیـادەڕەوی مەکـە چـونکە ئەوانـەی ئـەوکارە دەکـەن وەکو برای شەیتان وان.

بـەڵێ ئیسـلامی پـیرۆز هـانی بەخشـینمان ئـەدات بـەڵام نـەك بەبەخشـینی هەموو شتێك، چونکە ئەگەر مرۆڤ گەر مامناوەندییانە دەستگیرۆی هەژاران بکـات، پێوەی دیار نابێو پێویستی بەقەرز نابێت، لەکاتێکدا کە پێغەمبـەر ﷺ قـەرزکردنی بۆ موسـوڵمانان بـەباش دانـەناوە، چـونکە لای مرۆڤـی ژێـر دەبێتـە خەفـەتی شـەوو رۆژی ( اللهم اني اعوذ بك من غلبة الدين وقهر الرجال )[2].

واتە: خوایە گیان پەنات پێئەگرم لە قەرزی زۆرو ستەمی پیاوان ،

( وأعوذ بِكَ مِنَ الكُفْرِ وَالدَّين ) وەپەنات پێدەگرم لە بێباوەڕی و قەرزاری.

---

[1] / رواه احمد ، وابوداود، والترمذي وصححه، والنسائي، وابن ماجه، ت: ٣٤٦.
[2] / ابوداود ، ت: ٣٤٧.

پیاوێك پرسیاری كرد ( أيعدل الكفر بالدَّيْن يا رسُول الله ؟ فقال : نعم )[1].

واته ئەی پێغەمبەری خوا بێ باوەڕی دەخەیتە ریزی قەرزەوە؟

فەرمووی: بەڵێ.

وە لە نوێژەكانیدا زۆرجار ئەیفەرموو: ( اللهم اني اعوذبك مـن الاثم والمعـزم فقيل له انك تستعيذ من المغرم كثيراً يارسول الله فقال: ان الرجل اذ غرم (استدان) حـدث فكذب ووعد فاخلف) واتـە: خـوای گـەورە پـەنات پێئـەگرم لـەتاوان و قـەرزاری، پێـی وترا: بۆچ زۆر پەنا بە قەرز دەگری؟

فەرمووی: هەركەسێك قەرزار بوو قسە ئەكات و پاشان درۆ ئەكات ، و بـەڵێن ئەدات و بەجێشی ناهێنی)[2] كەواتە قەرز كردن كاریگەری هەیە بۆ سـەر خـوو ڕەوشت، وە پێغەمبەر ( نوێژی لەسەر مردوویەك نەدەكرد گەر بیزانیایە قەرزدارەو هیچـی بـەجێ نەهێشـتووە كـە قەرزەكـەی لێ بدرێتـەوە، بـۆ ترسـاندنی خـەڵك لـەوكارە، تـا دەوڵـەتی ئیسلام دەوڵەمەند بوو ئەوكاتە خۆی قەرزەكەی بۆ ئەدایەوە[3]، جابر ئەفەرموێت: خـوای گەورە لەهەموو تاوانێكی شەهید خۆش دەبێت جگە لە قەرز[4].

بەپێی ئەم فەرموودانـە پێویستە موسوڵمان بـۆ كـارێكی زۆر گـرنگ نـەبێت پـەنا بـۆ قـەرز نـەبات وەئەگـەر ناچاریش بـوو ئـەبێت هەمیشـە لەدڵیـدا بێـت، و هـەر كاتێك توانی بیداتـەوە، پێغەمبـەر ﷺ فەرمووی: (من أدان أموال الناس يريد أدائها أدى الله عنه ، ومن أخذها يريد إتلافها أتلَفَهُ الله )[5].

هەر كەسێك قەرز لە خەڵك بكات و بیەوێت بیداتەوە خوای گەورە بۆ ئاسـان دەكـات، وەكەسێك نەیـەوێت بیداتـەوە خـوای گـەورە دەست كـورتی دەكـات، مـادام موسوڵمان لەبەر پێویستی نەبێت قەرز ناكات ئیتر چۆن بە قـازانج و زیـادەوە قـەرز دەكات!

## فرۆشتن بۆ ماوەیەك لەگەڵ زیادكردنی بەها

بـاش وایـە لێرەدا باسـی ئـەوە بكـەم كـە موسـڵمان ئـەتوانێت لـەكاتی شـت كڕیندا بەهاكەی بە (نقد)ی بداتێ ، وە ئەشتوانێت بـە ڕەزامەنـدی هـەردوولایان دوا

---

[1] / النسائي والحاكم ، ت :٣٤٨.
[2] / البخاري ، ت:٣٤٩.
[3] / من حديث جابر وابي هريرة ، ت:٣٥٠.
[4] / مسلم ، ت: ٣٥١.
[5] / البخاري ، ت:٣٥١.

بخرێت بۆ کاتێکی دیاریکراو، چونکه پێغەمبەر ﷺ خواردنێکی بۆ خێزانەکەی کڕی تاماوەیەکی دیاریکراو زنجیرەکەی لە بری دانا[١].

وەهەر کاتێك فرۆشیارەکە لەگەڵ تێپەڕبونی کاتدا بەهاکەی زیادکرد، ئەوا بەپێی رای زۆرێك لە زانایان حەرامەو دەچێتە بابی سووەوە.

بەلاّم زۆربەی زانایان بەدروستیان داناوە چونکە چاوگی هەمووشتێك (اباحە) و دروستە وەهیچ دەقێك نیە کە حەرامی کردبێت، وە لەهەموو روویەکەوە لە (سوو) ناچێت، بەلاّم نابێت فرۆشیار لە سنووری خۆی بەهاکەی زیاد بکات ئەو کاتە حەرام دەبێت.

شەوکانی دەفەرموێت: ( زانایانی شافعی و حەنەفیو زەیدی کوڕی عەلی (مؤید باللە)و چەند کەسێکیتر بەڕەوای دادەنێن چونکە بەڵگەی زۆری لەسەرە)[٢].

## السَلَم

واتە موسوڵمان ئەتوانێت ڕێژەیەکی پارە بدات بەکەسێك تا لە بەرامبەردا ئەو شتەی دەیەوێت وەری بگرێت لەماوەیەکی دیاریکراودا، ئەم پرۆسەیەش پێی دەوترێت: (السَلَم) وە جۆرێکە لە مامەڵە کردن لەبواری کڕینو فرۆشتندا لەشاری مەدینەدا باو بووە ، بەلاّم پێغەمبەر ﷺ هەندێ گۆڕانکاری لەم کارەدا کردو چەند مەرجێکی بۆ دانا تابگاتە ئاستی ئەو مامەڵەیەی کە ئاینی پیرۆزی ئیسلام پەسەندی دەکات، (ابن عباس) دەڵێت کاتێك پێغەمبەرﷺ چوو بۆ شاری مەدینە ئەوەی بەدی کرد کە هەندێ کەس پێشەکی ئەدەن بۆ بەرهەمی ساڵێك یان دووساڵ یاخود ماڵیان ئەدا کە بەرهەمی ساڵێك یان دووساڵی باخەکە بۆ ئەوان بێت، ئینجا فەرمووی: ( من اسلف فليسلف في كيل معلوم ووزن معلوم الى اجل معلــوم )[٣]. ئەوەی مامەڵەی (سلم) دەکات با بەپێوانەیەکی دیاریکراو نیشانەو بەماوەیەکی دیاریکراو بێت.

چونکە بەم جۆرە دیاریکردنە ماوە نامێنێتەوەو بۆ ناخۆشی، هەروەها پارەیان بۆ بەرهەمی دارخورمای دیاری ئەدا، ئەم جۆرە مامەڵەیەش مەنع کرا، تا دوور بن لە زەرەرو زیان چونکە ئەشێ ئەو درەختە تووشی بەلاّیەك ببێتو

---

[١] البخاري، ت: ٣٥٣.

[٢] نيل الاوطار ج٥ ص: ١٥٣ الشوكاني دەفەرموێ: ( وقد جمعنا رسالة في هذه المسالة سميناها (شفا العلل في حكم زيادة الثمن لمجرد الاجل) وە بەجۆرێ کراوە کە پێشتر وەمانەکراوە.

[٣] رواه الجماعة ، ت: ٣٥٤.

بەرهەمەکەی بفەوتێ، باشترین و پاکترین شێوە بۆ ئەم مامەڵەیە ئەوەیە کە دارخورماکە یان گەنمەکە نەبێتە مەرج بەڵکو مەرج لەکێشانەو پێوانەدا بێت، وە ئەگەر لەلایەن خاوەن درەختەکەیان خاوەن زەوی‌یەکە ئەم چاوبەستە بەکار هێنراو ناچاریش بوو کەمامەڵەی پێ بکات، ئەو کاتە حەرامە.

## هەرەوەزی لە کارکردن و دەستمایەدا

رەنگە یەکێك بڵێت: خوای گەورە بەدەسەلاتی خۆی زیرەکی‌و وریایی دابەش کردووە لەنێوان خەڵکی‌دا ، زۆرجار دەبینین کە مرۆڤێك لەکارکانیدا زیرەکی و وریایی تێدا رەنگ دەداتەوەو ماڵو سامانێکی ئەوتۆی نیە بگاتە ئاستی وریایی‌یەکەی، وەهەیشە بەپێچەوانەوەیە .

بۆچی خاوەن ماڵە زۆرەکە ماڵەکەی نەدا بەکەسە شیاوەکەو قازانجێکی زۆر بکەن، ئەم سامانەکەی ئەویش بەلێهاتوویەکەی کە زۆرێك پرۆژە هەیە بە سامانێکی زۆر پەیکەڵ دەکرێت.

لە وەڵامدا دەڵێن ئاینی ئیسلام رێی لەکاری هەرەوەزی نەگرتووە کە لە نێوان سەرمایەدارو شارەزایاندا هەبێت بەڵام دەبێت ئەم پرۆسەیە لەسەر بناغەیەکی دادپەروەری و پتەو بونیاد بنرێت.

کەواتە هەرکارێك خاوەن سامان ویستی لەگەڵ کەسێکی‌تردا بە (شەریکی) کار بکەن ، پێویستە لێپرسراوێتی هەموو (شەریکی)یەکە لەئەستۆ بگرێت بە هەموو ئامانجێکی‌یەوە، بۆیە ئاینی پیرۆزی ئیسلام ئەم جۆرە مامەڵەیەدا، کە زانایان ناویان بردووە بە (مقارنه : فراض) وای بەباش داناوە کە هەردوولا لە قازانج و زەرەردا بەشدار بن، وەچەندێتی قازانج‌و زیانەکە بەپێی رێکەوتنی نێوانیانە، بۆیان هەیە کە بۆ یەکێکیان نیوەیان سێ‌یەك یان چواریەك یا کەمترو ئەوەش ماوەتەوە بۆ ئەوی تریان.

بەم شێوەیە هاوکاری و یارمەتی لەنێوانیاندا رەنگ ئەداتەوە، کەقازانجیان کرد بەپێی بڕیاری خۆیان بەشی دەکەن وەگەر زەرەریان کردن ئەوا زەرەکە لە قازانجەکە پڕدەکەنەوە، وەگەر ئەوەندە زۆربوو قازاجەکەو هەندێ لەسەرمایەکەشی گرتەوە ئەوا هێندەی زیادەکەی لەسەرمایەکە پڕدەکرێتەوە ئەمەش جێی سەر سوڕمان نیە کەخاوەن پارە هەندێك لەزیانەکەی کەوتۆتە ئەستۆ هەروەك بەرامبەرەکەی هەوڵو کۆشش بەفیڕۆ چووە.

بەڵام گەر وابڕیار بێت کە قازانجێکی دیاریکراو بۆ خاوەن سەروەتەکە بێت کەم تا زۆر هەرچەند قازانجەکە چەند قات یان زیانەکە زۆر گەورە بێت ئەوا ئەم کارە پێچەوانەی دادپەروەرییەو لە بەرژەوەندی خاوەن سەرمایەکەو دژی کارو پیشەکانە.

پێغەمبەر ﷺ رێگەی مامەڵەی (المزراعە)ی نەداوە کە بڕیار لەسەر رووبەرێکی دیاریکراوی زەوییەکە بدرێت[1] بەئەندازەیەکی دیاریکراو لەزەوییەکە بۆ یەکێکتان وەك ( قنطارێ یان دووان) چونکە دادەنرێت بەجۆرێك لەپرۆسەی سوو یا بە قومار، چونکە پێی ئەچێت ئەو زەوییە لەهیچ بەرهەمی نەبێت ئەو ساڵە ، ئەوکاتە سوودەکەی تەنها بۆ یەکێکیان دەبێتو زیانەکەش ئەکەوێتە ئەستۆی ئەوی تریانەوە.

بەرای من واتە – دانەر– ئەصڵ لەسەر یەك دەنگی زانایان دەربارەی ئەم بۆچوونە لە (المضاربة)ە وەیە کە نابێت بەشێکی دیاریکراو بۆ هیچ لایەکیان دابنرێت [2] لەبواری قازانج یان زەرەردا بێت، چونکە زیانەکە دەکەوێتە تەنها ئەستۆی یەکێکیان.

## بەشداری کردنی خاوەن سەرمایەکان

هەروەك تاکە کەس بۆی هەیە کە سامانەکەی بخاتە ئیشەوە، وە هەروەك ئەتوانێ کە ماڵ خۆی بداتە دەست هەرکەسێکی شارەزا کە حەزدەکات، لەرێگەی (مضاربة)ە وە ئاوهاش ئەتوانێت هاوبەشی کەسێك زیاتر بکات لە هەرئیشێکی رەوادا گەر بیەوێت، جا پیشەسازی یان بازرگانی بە هەر کارێکیتر، چونکە هەندێ ئیشوکار پێویستی بەزیاتر لەدەستێکی کارامەو شارەزا هەیە لەگەڵ سامانێکی زۆردا، ئەڵێن مرۆڤ بەتەنیا کەمە بەڵام لەگەڵ کەسانی تردا زۆرە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى﴾ المائدة : ٢ ، لەکارو ئیشی چاکەدا یارمەتی یەکتری بدەن.

ئاینی پیرۆزی ئیسلام نەك ئەم جۆرە کارانە هەر بەباش دەزانێت بەڵکو پیرۆزیشە لەلای بەمەرجێ لەبازنەی حەلاڵ دەرنەچێ، خوای گەورە بەڵێنی داوە کە

---

[1] اخرجه مسلم ، ت: ٣٥٥.

[2] دکتور محمد یوسف موسی (لەنامەی (الاسلام ومشکلاتنا الحاضرة) وەری گرتووە (الشیخ محمد عبده شێخ عبد الوهاب خلاف ئەم جۆرە مەرجدارییە لە (المضاربة)دا لای زانایان لەقورئانو سوونەتدا بەڵگەی لەسەر نییەو هەندێ مەیلی بەلای رایاندا هەبووە، بەڵام من پێم وایە ئەوەی لە (المزراعە)دا هاتووە بەسە بۆ ئەوەی بکرێتە بنەمای قیاس کردن لەسەری – وەخوای گەورەش زاناترە – .

لــه دنیــادا یارمــەتی بــدات و لەقیامتیشــدا پاداشــتی بداتــەوە، وەپێغەمبــەر ﷺ دەفەرموێت : ( يد الله على الشريكين ما لم يخن احدهما صاحبه فاذا خان احدهما رفعها عنها) [١] دیارە مەبەست لە دەستی خوا یارمەتی و سەرکەوتن و بەرەکەت داری کارەکەیە.

واتـە یارمەتیـدانی خـوای گـەورە لەگـەڵ دووکەسـدایە کـە خیانـەت لەگـەڵ یەکتردا نەکەن و بەپێچەوانەوە بەرەکەت لەوکارەدا نامێنێ پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ( أنا ثالث الشريكين مالم يخن احدهما صاحبه فاذا خان احدهما صاحبه فرجت من بينهما[٢] و جاء الشيطان). واتە: من سێیەم شـەریکی دوو شـەریکم گـەر دووڕوویـی لەنێوانیانـدا نەبێت وەگەرنا من لەنێوانیان نامێنم و شەیتان دێتە بەینەوە)[٣].

## بەشگـەکانی سپاردن

یەکێکی‌تر لەو مامەڵە تازانەی کە بەکار دێن (شركات التأمين) ە کە بۆ دابین کردنی ژیان و خواردن و رووداو ئەیکەن، ئایا ئـەم پرۆسـەیە حوکمی چۆنەو ئـاینی ئیسلام دانی پێدا ئەنێت؟

پێش ئەوەی وەڵام بدەینەوە دەڵێین سروشتی ئەو (الشركات)ە چی‌یە؟

وە ئایا پەیوەندی تاك بەو شەریکەوە چۆنە؟

بە واتایەکی‌تر : ئایا کەسی (مؤمن) لەلایەن دامەزراوە تأمینەکەوە دائەنرێ بە شەریکی هاوەڵەکانی؟

ئەگەر وابێت ئەبێت هـەموو کەسێکی تـأمین کـراو ملکەچی ئـەو دامـەزراوە بێت لە هەردوو بواری قازانج و زیاندا.

وە تـأمین دژی کارەسـاتەکان دەبێـت هــەموو سـاڵێك رێژەیـەك پـارە بـۆ دامەزراوەکە دابین بکات، لەحاڵەتێکدا گەر تأمین بۆکراوەکە بـێ زیـان بـوو (دوکـان، کارگـە، ئوتومبیـل ، یـان هەرشـتێکی تـر بێـت) کۆمپانیاکـە دەسـت ئـەگرێت بەسـەر هـەموو ئـەو پارەیـەی کە بـۆی دابین کـراوە، وە هـەر کـات کارەساتێکی بەسـەرهات باربۆی ئەکات بەو رێژەیەی لەسەری رێك کەوتوون، کە ئەم حاڵەتەش زۆر دوورە لە شێوازی بازرگانی (تضـامني) بـۆ نموونـە ئەگـەر ئەوەی تـأمینی ژیـانی کـردووە بـە (٢٠٠٠) دینـار، بەشـی یەکـەمی دفـع بکرێـت پاشـان لـەناو بچێت ئـەوا پێویسـتە (٢٠٠٠) دینارەکەی بۆ بگەڕێنرێتەوە بەبێ کەم و کووڕی، بەڵام ئەگەر لـە بەشـەکەی

---

[١] الدارقطني، ت: ٣٥٦.

[٢] ابوداود والحاكم وصححه ، ت: ٣٥٧.

[٣] ئەم زیادەیەشی خستووەتە سەر.

خۆی هیچی نەئەدرایەوە ئەو کەسە نەیتوانی قستە ساڵانەکەی بدا بەکۆمپانیاکە ، لە کاتێکدا کە هەندێکی داوەو نەیتوانیوە ئەوی تری بدا بەکۆمپانیاکە ئەبێت واز لەوە بهێنێ کە داویەتی یان دەست لە بەشێکی زۆری هەڵبگرێ.

هیچ نەبێ ئەم کارە بەمەرجێکی خراپ لەقەڵەم ئەدرێت، ئەبێت ئەوەش بزانین کە ئاگاداربوونی هەردوولا بەم پرۆسەیە هیچ نرخێکی نیە، چونکە مامەڵەی سوو قومار هەردوولا رازین و ئاگاداریشن ، بەلاَم لەبەرئەوەی مامەڵەکەیان لەسەر بناغەیەکی دادپەوەریی نیە ئەوا دەچێتە قاڵبی حەرامەوە، کەواتە پرۆسەی دادپەوەری بناغەیە بۆ (لا ضرر ولا ضرار).

## ئایا (سپاردن) دامەزراوەیەکی هەرەوەزییە؟

ئەگەر لە رێی بەڵگەیەکەوە بۆمان روون نەبووەوە کە پەیوەندی نێوان کەسەکەو کۆمپانیاکە پەیوەندیەکی هاوبەشانە نیە ، ئیتر چۆن بزانین پەیوەندیەکەیان لەسەر چ بناغەیەکە؟

ئایا پەیوەندییەکی هەرەوەزییە؟

وە ئەم کۆمەلاَنە لەدامەزاوەیەکی هەرەوەزی پێکهاتوون لەرێی هاوبەشی و هاوکاری کۆمەڵە کەسانێك بەهێزو شارەزایی و سامانیان لەپێناو سوود گەیاندن بۆ هەردوولایان.

بەلاَم لەپێناو بەرجەستەبوونی هەرەوەزیەکی راستو دروست لەنێوان هەر کۆمەڵێکدا لەکاتی تووشبوونیان بەهەرشتێك، پێویستە ئەو سامانەی کە کۆ دەکرێتەوە لەپێناو بەدیهێنانی مەبەستی کارەکان بێت:

(١) پێویستە هەرکەسێك لەبەشداربووان رێژەیەك پارە دفع بکات لەشێوەی بەخشین (تبرع) وە لەو پارە کۆکراوەیە، بەشی هەژارو نەدارانی لێ ئەدرێت.

(٢) هەرکاتێك ویستیان ئەو پارەیە بخەنە ئیشەوە دەبێت لەبواری کارێکی رەوادا بێت.

(٣) نابێت کەس (تبرع) بەشتێکەوە بکات کە لەسەر بناغەی ئەوەبێت کە بە رێژەیەکی دیاریکراو باربۆ بکرێت، بەلاَم لە سامانی ئەو کۆمەڵەی کە بەشداریان کردووە پارەکەی ئەدرێتێ بەپێی ئەو زیانەی کردوویەتی جا هەمووی بێت یان هەندێکی.

٤) (تبرع) بەخشینەو پەشیمان بونەوە لێی حەرامە ئەگەر شتیوا رووی‌دا دەبێت حوكمی ئیسلام تێیدا چاودێر بێت[١] .

وە هیچ كام لەم خاڵانە لەكۆمپانیا تەمینیەكاندا پەیكەڵ نابێت بەتایبەت تأمینی ژیان لەبەر چەند شتێك :

١) ئەوانەی كە تأمینیان بۆ كراوە، سامانەكەیان بەنیازی (تبرع) نابەخشن وە شتی ئاوهاش بەخەیاڵیاندا نایەت.

٢) كۆمپانیاكان ئەو پارەیە لە پرۆسەی (سوو)دا بەكاردێنن، شتێكی ئاشكراشە كە موسوڵمان نابێت لەهیچ پرۆسەیەكی حەرامدا بەكاری بهێنێ.

٣) ئەگەر ئەو ماوە دیاریكراوە كۆتایی هات ئەو تأمین بۆ كراوە هەموو (قسط)ەكان وەرئەگرێتەوە لەگەڵ هەندێ زیادەدا، ئایا ئەمە ناچێتە قاڵبی سوەوە؟ كە دەوڵەمەند زیاترو هەژار كەمتر وەردەگرێت، چونكە ئەو بەپارەیەكی زیاتر خێری تأمین كردووەو لەكاتی كارەساتدا زیاتر بۆ دابین ئەكرێت وە هەژارەكەش بەپێچەوانەوە.

٤) هەركەسێك پەشیمان بووەوە لە تأمینەكە بەشێك لەپارەكەی لای كۆمپانیاكەوە دەمێنێتەوە، كەهەرگیز لەگەڵ یاسا ئیسلامدا یەك ناگرنەوە [٢].

## چاكسازی

بە رای دانەر پرۆسەی (تأمین) ئەشێ لە دژی كارەساتەكان گۆڕانكاری بەسەردا بێت، كە لەگەڵ پرۆگرامی ئیسلامدا بگونجێت، گەر لەئاستێكی نزیكیش دابێت .

ئەویش (التبرع بشرط العوض) كەسی تأمین كراو پارەیەك ئەدات بە كۆمپانیاكە لەسەر ئەو بڕیارەی گەر تووشی كارەساتێك بوو یارمەتی بدرێت، لای هەندێك زانایان، ئەم جۆرە مامەڵەیە رەوایە، گەر بڕیارەكە دەستكاری بكرێ و لە سوود بەدوور بێت بەڵام تأمینی ژیان شتێكی مەحاڵەو لەپەیامی ئیسلام بەدوورە.

---

[١] لەكتێبی (الاسلام والمناهج الاشتراكية) وە نووسەر(محمد الغزالی) ، لا: ١٣١ چاپی دووەم.

[٢] بڕوانە بابەتی (التامین) الاسلام ومشكلاتنا الحاضرة) لا٦٤ د.یوسف موسی، والاسلام والمناهج الاشتراكية شيخ محمد الغزالي لا: ١٢٩٨، ودوو وتار لەگۆڤاری (نور الاسلام)ی خوالێخۆشبوو ابراهیم الجبالی، هەردوو ژمارەی (٦-٧) لە بەرگی یەكەم ١٣٤٩ هـ و فەتوایەكی شێخ ئەحمەد ابراهیم كەگۆڤاری (منبر الاسلام) بڵاوی كردووەتەوە.

## سیستمی سپاردنی ئیسلامی

لەکاتێکدا ئێمە دژی کۆمپانیا مسۆگەرکارەکان ئەدوێین، ئەوەناگەیەنێ کە ئیسلام لەگەڵ خودی مسۆگەرکردندا راجیاوازی هەبێت، نەخێر ... چونکە تەنها لە پرۆگرامو ئالیەتدا هەندێکی رەت دەکاتەوە، بەلاّم گەر ئالیەتێك خرایەگەڕ بۆ ئەو جۆرە مامەڵەیە کەلەگەڵ ئیسلامدا بگونجێ ئەوکاتە بە راشکاوانە پێشوازی لێ دەکرێ، چونکە بەرنامەی ئیسلام زامنی ژیانی ئەو تاکانەی کردووە کە لە سایەی دەوڵەتەکەیدا ژیان بەسەردەبەن لەرێگەی چەند یاسایەکی تایبەتیو دارێژراو، یان لە رێی یارمەتیو هاوکاری کۆمەڵێکیان بۆ کۆمەڵێکی تریان، یاخود لە رێی (بیت المال)ەوە چونکە دائەنرێت بەکۆمپانیایەکی مسۆگەری گشتی بۆ هەموو ئەو کەسانەی لەژێر سێبەری دەوڵەتی ئیسلامدان.

زامنکردنی ژیانی تاکەکەس لەشەریعەتی ئیسلامدا بەرجەستە دەبێت بۆ کەسێك کە سەروەتو سامانەکەی بەجارێك تیائەچێ رێگەی (سواڵکردن)ە پێدراوە ، کەواتە گەر هەرکەسێك ڕووداوێکی بەسەرهات بۆی هەیە کەداوا لەکار بەدەستانی دەوڵەت بکات کە یارمەتی بدەنو کەمێك بای سەرشانی سوك بکەن[1]، هەروەها زامنکردن بۆ میرات گرران هەیە وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (أنا أولى بكلِّ مُسْلِمٍ مِنْ نفسه، من تَرَكَ مالاً فلورثته، ومن ترك ديناً أو ضياعاً (أي اسرة أولاداً صغاراً) فإلَيَّ وَعَلَيَّ)[2]، من لەهەموو موسوڵمانێ لە نەفسی خۆی بۆی چاکترم هەر کەسێ سامانێك بە جێ بهێڵێ ئەوا بۆ منەو لای منە ، گەورەترین زامنێ کە ئیسلام بڕیاری لەسەرداوە بۆ موسوڵمانان بەشی (الغارمين)ە لەوانە کە زەکاتیان ئەدرێتێ، ئەوانەی کە مانای (اغارم) یان لێکداوەتەوە ئەڵێن ئەو کەسەیە کە ماڵی سووتابێ یان بەر لافاو کەوتبێ و بەهۆیەوە هیچی بەدەستەوە نەمابێ، هەندێ لە زانایان بە دروستیان داناوە کە لە زەکات ، بەشیان بدرێ تا ئەو حاڵەتەی بەسەریان هاتووە جێگەکەی پڕ بکەنەوە ، جا باربۆکە هەرچەندێك بێت.

---

[1] / بروانە (حديث قبيصة) لا ١٠٧ بەشی( الكسب والاحزان)

[2] / متفق عليه ، ت: ٣٥٨.

## بەکارهێنانی زەوی کشتوکاڵی

گەر موسڵمان زەویەکی کشتوکاڵی هەبوو پێویستە کەسوودی لێ وەر بگرێت یان درەختو رووەکی تیابچێنێت، چونکە بەپێی بەرنامەی ئیسلام باش نیە کە زەوی لە چاندنو کێلاّن بخرێت، کە دەبێتە بەفیڕۆچوونی نیعمەتو لەناو بردنی کشتوکاڵ پێغەمبەریش ﷺ (نهى عن اضاعة المال)[1] بەرگری لە بە زایەچوونی ماڵ کردوە.

## چۆنێتی کێلاّنی زەوی

١. **خاوەن کێڵگە کەخۆی هەستێت بەکیلاّنو چاندن لە زەویەکەدا**، کە هەر زیندەوەرێك لە ئادەمیزاد یان ئاژەڵ یان باڵندە لێی بخوات پاداشتی لای خوای گەورە دەبێت زۆربەی هاوەلاّنی پێغەمبەر کاری کشتوکاڵیان کردووە.

٢. **گەر خۆی بۆی نەکرا بابیدات بەکەسێکیترو هەستێت بەچاندنو خزمەت کردنیو هیچ لەو جوتیارە وەرنەگرێت**، کە بەڕاستی بەکارێکی زۆرجوان دائەنرێت (ابو هريره) ئەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: من كان له ارض فليزرعها أو ليمنحها اخاه [2] ئەوەی زەوی هەیە با خۆی بیکێڵێت یان بیدات، برایەکی خۆی جابر ئەڵێت: ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: (من كان له ارض فليزرعها، وليحرثها اخاه والا فليدعها )[3] هەندێ لەزانایان رایان وایە بەگوێرەی ئەم فەرموودەیە بەکارهێنانی زەوی لە دوو رێگەوە دەبێ یان خاوەنەکەی کشتوکاڵی تێدا بکات یا، بەبێ بەها بیداتە کەسێکی تر بەم شێوەیە زەوییەکە هی کەسێکەو بەرهەمەکەی بۆ کەسێکی تر.

(ابن حزم) لە (اوزاعی)یەوە دەگێڕێتەوە (عطاء) و (مکحول) و( مجاهد)و (حسنی بصری)دەیانفەرموو: ( لا تصلح الارض البيضاء بالدراهم ولا بالدنانير ولا معاملة الا ان يزرع الرجل ارضه او يمنحها ) واتە: نابێت زەوی نەکێڵراو بفرۆشرێت یاخود بەرێوە ناچێت بەدوو شێوە نەبێت : –

یان ئەبێت خاوەنەکەی بیکێڵێت

یان بیدات بەکەسێکیتر،

---

[1] ت : ٣٥٩.

[2] متفق عليه ، ت: ٣٦٠.

[3] احمد ومسلم ، ت: ٣٦١ المخابرة ئەوەیەکە بکێڵێت لەسەر بەشێکی والقصارە: ماوەیەی دەنکە گوڵ لەدوای دەوەر کردنی، وەمانای (یحرثها)واتە: ئەیکات کێڵگەی براکەی بەیێ قەرەبوویەك).

بەڵام عەبدوڵڵای کوڕی عباس پێی وایە کە ئەم فەرموودەیە پێویستی ناکات لەسەر خاوەن زەوی گەرخۆی نەیکێڵا کە بیدات بەکەسێکی تر . بەڵکو باشتر وایە یاخود کارێکی جوانە، بوخاری لە عەمری کوڕی دینارەوە دەگێڕێتەوە بە (تاووس) وت: کە گەورەترین هاوەڵی (ابن عباس) بوو واز لە پەیمانی (المخابرة) بێنە، چونکە وادەزانن گەر پێغەمبەر ﷺ نەهی نەکردووەو وتی: (لأن يمنح احــدكم اخاه (يعنى ارضه) خير من أن يأخذ عليها خراجاً معلوماً)[1] یەکێکیان زەویەکە بدات بە برایەکی باشترە لەوەی کە بەرامبەرێکی دیاریکراوی لێ وەربگرێ.

(عقدی مخابره) ئەوەیە کە زەوییەکە بداتە یەکێك کە خاوەنەکەی بە تۆوو شتی خۆی بیکێڵێت ، بە سێ یەك یان زیاتر یان کەمتر.

## کشتوکاڵ لە زەویدا

**٣ ـ ڕێگەی سێیەم : زەوییەکە بدات کەسێ بیکێڵێت بەتۆو پێداویستی خۆی بە ١٠ ، یەك یان زیاتر و کەمتر، لەبەرهەمی زەوییەکە،** بەپێی ڕێککەوتنی خۆیان، دروستیشە یارمەتی جوتیارە کە بدات، بەتۆو یان هەر شتێکی‌تر بەم جۆرە مامەڵەیە دەوترێت: ( المزارعة ، لە مسلم و بخاري)دا هەیە کە پێغەمبەر ﷺ مامەڵەی لەگەڵ خەڵکی خەیبەردا کردووە بەبەشێك لەبەرهەمی کشتوکاڵ و باخ[2].

ئەم فەرموودەیە ئیبن عومەرو ئیبن عەباس و جابری کوڕی عەبدوڵڵا ریوایەتیان کردووە.

ئەو زانایانەشی ئەم جۆرە کشتوکاڵەیان بەڕەوا داناوە ئەم فەرموودەیەیان کردووە بەبەڵگە. بێگومان دوای پێغەمبەر ﷺ خەلیفەکان پاشان کەس‌وکاریان هەستاون بەم کارە تەنانەت لەبەغدا کەس نەبووە کاری وانەکات، هەروەها خێزانەکانی پێغەمبەریش ﷺ لەپاش خۆی بەم مامەڵەیە هەستاون، وە کارێکی وانەبێت نەسخ بکرێتەوە چونکە ئەم پرۆسەیە تەنها لەسەردەمی پێغەمبەر خۆیدا دەبێت، ئەگەر نەسخەکە لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ ئەی بۆچی دوای کۆچی دوایی کاری پێکراوە؟

چۆن ئەو بەتاڵ بونەوەیە لە خەلیفەکان شاردراوەتەوە؟

ئەی ئەو کەسەی گێڕاویەتیەوە کێیە ؟[3].

---

[1] اخرجه البخاري، ت: ٣٦٢.

[2] ت: ٣٦٣.

[3] المغني، ابن قدامة، ج:٥ لا: ٣٨٤.

## کشتوکاڵی نادروست لەنێوان دووکەسدا

لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ جۆرە کشتوکاڵێك باوبووە، هەستا بە نەهێشتنی چونکە ژیانو چاوبەستیو نەزانینی تێدایەو ئەنجامەکەی نەگونجانە، وەزۆر دوورە لەو رۆحە دادپەروەرییەی کە ئیسلامی پیرۆز هانی خەڵکی کە رووبەرێکی دیارکراو لەزەوییە کە بەتەنیا بۆ خاوەنەکەی بێت بەپێوان یان، بە کێشان، ئەوەی دەمێنێتەوە بۆ جوتیارەکە یان بە نیوەیی بۆ هەردووکیان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دادپەوەریی ئەوەیە کەهەردوولا هاوبەش بن لە بەروبوومی زەوییەکەدا زۆر تا کەم، وەدروست نییە کە یەکێکیان ئەندازەیەکی دیاریکراو دابنێت، لەوانەیە بەرهەمی زەوییەك هەر ئەوەندە بێت، بەم شێوەیە بەرامبەرەکەی بێبەش دەبێت . بەلاّم ئەگەر زەوییەکە بەرهەمێکی باش هەبوو ئەوا هەردوولا بەرهەمێکی باشیان دەست دەکەوێ وەئەگەر ئەمیش بوو هەر یەکسان دەبن، بوخاری لە رافعی کوڕی خەدیجەوە ئەگێڕێتەوەو وتی، ( کنا اکثر اهل الارض ـــ أي في مدينة ـــ مزارع كنا نكرى الارض بالناحية منها تسعى لسيدا الارض ... فربما يصاب ذلك وتسلم الارض، وربما تصاب الارض ويسلم ذلك فنهينا ...)[1].

واتە: ئێمە لە مەدینەدا زەوی کشتوکاڵیمان لەهەموو خەڵکی ئەوێ زۆرتر بوو زەویەکەمان ئەدا بە کرێ، بەشێك لە زەوییەکە بڕیار ئەدرا بۆ خاوەنەکەی ، هەندێ جار ئەولایە بەر نەخۆشی ئەکەوت، یان بەپێچەوانەوە، بۆیە لەلایەن پێغەمبەرەوە نەهی لێکراوە، مسلم لە رافیعەوە ریوایەت ئەکات وتی: ( انما كان الناس يؤاجرون على عهد رسول الله ﷺ بما على الماذيانات (ما ينبت على حافة النهر ومسايل الماء) وإقبال الجداول (أوائل السواقي) وأشياء من الزرع (كذا أردباً مثلاً) فيهلك هذا ويسلم هذا ، ويسلم هذا ويهلك هذا، ولم يكن للناس كرى إلاّ هذا فلذلك زجر عنه) .

واتە: خەڵکی لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ کرێکاریان ئەکرد بەو تۆوەی کە لە قەراغی رووبارو جۆگەداو لە سەرەتای جۆگە ئاودا چەند شتێکی لەکشتوکاڵ وەك ئەوەندە کیلۆ یان چواریەك زیاتر یان کەمتر ، ئەوەبوو هەندێکیان ئەفەوتاو هەندێکیان ساغ دەرئەچوو ، یان بەپێچەوانەوە لەبەرئەوە پێغەمبەر ﷺ نەرێی لێ کرد.

---

[1] ت: ٣٦٤.

بوخاریش هەر لەوەو ریوایەت دەکات کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ما تصنعون بمحاقلكم) ؟ (مزارعكم) قالوا : نؤجرها على الربع وعلى الأوسق من التمر والشعير ، قال: لا تفعلوا )[1] فەرمووی: چی لە کشتوکاڵەکەتان ئەکەن؟

وتیان: ئەیاندەین بەچوار یەك، وە بەئەندازەیەکی لە خورماو جۆ ، فەرمووی وامەکەن.

مانای ئەوەیە خاوەن زەویەکان لە بەرهەمەکە پێوانەیەکی دیاریکراویان وەرئەگرت پاشان لەگەڵ جوتیارەکاندا ئەوی تریان بەش ئەکرد بەچواریەك یان زیاتر، لێرەدا بۆمان دەرئەکەوێت کە پێغەمبەر ﷺ چەندە جەختی لەسەر دادپەروەری کردۆتەوە لەکۆمەڵگای ئیسلامیدا.

زیدی کوڕی ثابت ریوایەتی کردووە کەدوو پیاو لەسەر زەوەی کشتو کاڵی ناخۆشی دەکەوێتە نێوانیانەوە، دەچنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ( ان كان هذه شأنكم فلا تكونوا المزارع)[2] ئەگەر ئەمە ئەنجامی کارتانە زەوی مەدەن بە کرێ ، پێویستە لەسەر خاوەن زەوی و کارەکە رۆحی لێبوردنیان، تێدا بێت بەرامبەر بەیەکتر، خاوەن زەوی داوای بەرهەمی زۆر نەکات، کارکەریش زەوییەکە بەهەدەر نەبات، بۆیە ابن عەباس لە پێغەمبەرەوە ﷺ : ( لم يحرم المزراعة ولكن أمر أن يرفق بعضهم ببعض)[3]. پێغەمبەر ﷺ کشتوکاڵی حەرام نەکردووە، بەلاّم فەرمانی کردووە کە لەگەڵ یەکتردا نەرمو لەسەر خۆبین.

بۆیە کاتێك بەتاووس وترا: ( يا ابا عبدالرحمن لو تركت هذه المخابرة فانهم يزعمون ان رسول الله نهى عنها، قال اني أعينهم وأعطيهم)[4].

جاری واهەبوو خاوەن زەوییەکان، زەوییەکانیان بەکێڵراوی ئەهێشتەوە تا کارکەران ناچاربن کە کرێی زیاتریان لێ وەربگرن، لەبەرئەوە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بەهەموو کاربەدەستەکانی خۆی راگەیاند، کە بە چوار یەك تا دە یەك زەوی بدەن بە کرێ، وزەوی بە بەتاڵی و وێرانی نەهێڵنەوە.

---

1 / ت: ٣٦٥.
2 / ابوداود ، ت : ٣٦٦.
3 / الترمذي وصحيحه ، ت : ٣٦٧.
4 / ابن ماجه، ت: ٣٦٨.

## بەکرێدانی زەوی بە پارە

**٤ ـ ڕێگەی چوارەم، ئەوەیە زەویەکەی بدا بەیەکێ بیکێڵێت بەڕێژەیەك پارە ،**

زۆر لەزانایان ڕێیان بەکرێداوە، هەندێکی تریایشیان ڕێیان پێنەداوە، بەڵگەشیان ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ نەهی لە بە کرێدانی زەوی کردووە .

شێخان بدریان، رافع بن خدیج ، جابر، ابو سعید ، ابو هورەیرە، ابن عمر، ئەم زانایانە هەموویان لە پێغەمبەرەوە نەهیان لە بەکرێدانی زەوی کردووە[1] .

لێرەدا شێوازی (المزارعە) لەم قاڵبە جیاکراوەتەوە، بەهۆی بەردەوام بوونی پێغەمبەر ﷺ لەلایەن مامەڵەکردنی لەم بوارەدا لەژیانیدا، پاشانیش بەردەوامی دوای کۆچی دوایی، گەر مرۆڤ وردبێتەوە لەپێشکەوتن و گۆڕانی یاساکانی ئەم مامەڵەیە بۆی روون دەبێتەوە کە (ابن حزم) چی وتووە ( ان النبي ﷺ قدم علیهم وهم یکرون مزارعهم کما روی رافع وغیره ، وقد کانت المزارع بلا شك تکری قبل رسول الله وبعد مبعثه) واتە: کاتێك پێغەمبەر ﷺ هاتە ناویان ئەوان زەویەکانیان ئەدا بە کرێ وەك رافیع و غەیری رافیع ریوایەتیان کردووە، بێگومان پێش هاتن و دوای هاتنی پێغەمبەری نازدار زەوی بە کرێ ئەدرا، ئەمە شتێکە هیچ ژێرییەك گومانی تێدانییە، پاشان لە ڕێی جابرو (ابو هریرة) و (ابو سعید) و (رافع) و (زوهری) (بدری)، یەکێکی تر لە بەدرییەکان و (ابن عمره)وە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ نهی لە بەکرێدانی زەوی کردووە چ بە پارە یان بەرهەمەکەی .

بەم شێوەیە مباحەکەی بێشك بەتاڵ کردەوە، وە هەرکەسێك وتی: بەتاڵ کراوەکە یاخود منسوخە کە (اباحة الکـراء)ە ئەوا راستی نەکردووە ، وە یەقین و بێگومانی نسخەکە بەتاڵ دەبێتەوە ، ئەوا لە راستی لایداوە و هیچ زانستێکی پێ نیە، ئەوا بەدەقی قورئان حەرامە، مەگەر بەڵگەیەك بهێنێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە تەنیا ئەوە نەبێ کە دروستە بە سێ یان چواریەك بدرێت، چونکە لە پێغەمبەرەوە دەگێڕنەوە کەپاش بەرگری لێکردنەکەی لە خەیبەردا کاری لەسەر کردووە تاکۆچی دوایی[2] ، کۆمەڵێك لە پێشووەکانی سلف ئەمەیان بەڕەوا داناوە.

---

[1] / بروانە (المحلی) ج ٨ لا ٢١٢ ، ت: ٣٦٩.

[2] / المحلی ، ج٨، لا٢٢٤.

ئیمامی تاووس زانای (فقیه)ی یەمەن و التابعی الجلیل حەزی نەکردووە کە زەوی بە پارە یان ئاڵتون و زیو بدات بە کرێ، بەڵام بەکرێدانی سێ یەك یان چواریەکی بەرهەمەکەی هیچ ئیشکالێکی تێدانیە، وەکاتێك هەندێ لەخەڵکی سەرزەنشتیان کرد لەم رێ لێگرتنەی حەزرەت، معازی کوڕی جبل هاتە یەمەن و زەوی بە سێ یەك و چوار یەك دا بە کرێ، ئێمەش لەوکاتەوە تا ئەمڕۆ بەم کارە هەڵدەستین ، واتە رەنگە تاووس نەهی‌یەکەی پێغەمبەری لە کرێدان بەپارە لێك دابێتەوە، بەڵام بە بەرهەم هیچی تێدانیە.

لەم نمونانە لە محمدی کوڕی سیرین و قاسمی کوڕی محمدی کوڕی ابوبکری صدیقەوە ریوایەت کراوە، کە زەوی بە کرێدانیان بەلاوە خراپ نەبووە بە سێ یەك یان بە دە یەك لە بەرهەمەکەی و هیچ مەسرەفی لەسەر نەبێ، لەگەڵ ئەمەشدا، لە کۆمەڵێ تابیعیەکانەوە ریوایەت کراوە کە بە کرێدانی زەوی بەهیچ شێوەیەك رەوا نیە، نە بە پارەو نە بەشتی تر، بەڵام بێگومان ئەوان بەڵگەیان لە دژیان هێناوەتەوە.

## قیاس یاساغ کردنی کرێی مۆڵ ئەخوازێ

## القیاس یقتضي منع الاجارة بالنقد

بەپێی قیاسێکی راست و لەسەر بونیادی اصولی ئیسلام و دەقە قورئانیەکان بەکرێدانی زەوی سپی بەپارە دروست نیە:

١ ـ پێغەمبەرﷺ نەهی کردووە لەوەی کە زەوی بەئەندازەیەکی دیاریکراو، بە بەروبوم بدات بەکرێ، بۆ نموونە (١) تەن یان (١٠) کیلۆ بۆ خاوەن زەوی‌یەکە بەو رێگەیە نەبێ کەپێشتر باسمان کردو بۆ ئەوەی هاوبەش بن لەوەدا کە دێتە بەرهەم و هیچی بەسەردا نەهاتووە، و لەزیانیشدا هاوبەش بن گەر بەڵای بەسەردا هات، بەڵام دیاریکردنی بەشی یەکێکیان کە هەرئەبێ قازانجی دەست بکەوی بە مسۆگەری، ئەگەرێکە جگە لە ماندووبوون و تیاچوون بۆ ئەوەی تریان شتێکی تیا نییە،و لێرەدا لە یاری و قومار ئەچێت، گەر وورد بینەوە لە بەکرێدانی زەویەکەدا بە مۆڵی لەسەر ئەم بنەمایەی باسمان کرد، ئیتر چ جۆرە جیاوازییەك هەیە لەنێوان ئەم و کشتوکاڵی نەهی کراودا ، چونکە خاوەن زەوی‌یەکە مسۆگەرە بۆ بەشە نقدەکەی، بەڵام بەکرێ گرەکە واتە زارعەکە قومار بە هیلاکی و ماندووبوونەکەیەوە دەکات نازانێت ئایا قازانج دەکات یان زەرەرە.

٢ ـ گەر کەسێك موڵکی خۆی بدات بە کرێ و شایانی کرێکە نەبێ بەرامبەر بە ئامادە کردنی موڵکەکەی بۆ بەکرێ گرەکە تاسوودی لێ ببینێ، یان ببێتە باربۆی ئەو زیانەی تووشی بەرهەمەکەی دەبێت، پێم بڵێ ئەو خاوەن زەوی‌یە بەچی هەستاوە لە ئامادەکردنی زەوی‌یەکە بۆ بەکرێ گرەکە؟

خوای گەورە ئامادەی کردووە بۆ سەوز بوون ، یان بەو کێڵانە چ زیانێك تووشی زەوی‌یەگە دەبێت؟ خۆ زەوی خۆی ناخواتەو خراپ نابێت.

٣ ـ مرۆڤ خانوو بەکرێ دەگرێ و راستەوخۆ سوودی لێ وەردەگرێت تیایدا ئەژی و هیچ رێی لێ ناگرێ، یاخود ئالیەت بەکرێ دەگرێ .... ، بەلاَم سوود وەرگرتن لە زەوی راستەوخۆ نیەو بگرە مسۆگەریش نیە، مرۆڤ هەوڵ ئەدا بە ئومێد سوود لێ وەرگتنی.

٤ ـ لە فەرموودەی صحیح دا هاتووە کە حەزرەت ﷺ بەرگری لە فرۆشتنی بەرهەمی باخ کردووە هەتا جوان دەرنەکەوێ ، کە لەناوناچێ [1] لەهۆی ئەمەدا فەرمووی: (ارأیتم إذا منع الله الثمرة، بم یستحل أحدکم مال أخیه)[2].

پێم بڵێن کاتێك خوای گەورە بەرهەمەکەی لەناوبرد بەچی ماڵی براکەتان حەلاَڵ دەکەن؟ ئەمە دەربارەی کەسێکە کە بەرهەمی باخەکەی دەرکەوتووە بەلاَم هێشتا مەترسی ئەوەی لێدەکرێ کە تووشی نەخۆشی ببێت دروست نیە بیفرۆشێ ، ئیتر چۆن دروستە زەویەکی سپیو وشك بدات بەکرێ کە پاچێکی لێ نەدابێ، باشتر نیە کە بووترێ ( أرأیت اذا منع الله الثمرة فبماذا تستحل مال أخیك )؟

من بەچاوی خۆم زەوی لۆکەم بینی کە کرم خواردی و لاسکە رەقەکەی نەبێ هیچی نەهێشتەوە، کەچی خاوەن زەوی‌یەکە هەر سوور بوو لەسەر داواکاری کرێکەی، وە بەکرێ گریش ناچاربوو مل بۆ زەبرو مامەڵەی ئەو عەقدە کەچ بکات. ئیتر ئەو دادپەروەری‌یە ئیسلام بەدوای‌دا وێڵە لەکوێدا رەنگ دەداتەوە گەر زیان یان قازانجی بۆ لایەنێکیان تیادا مسۆگەر بێت[3].

---

[1] / ت : ٣٧٠.
[2] / ت : ٣٧١.
[3] / لەم بابەتەدا بگەرێرەوە بۆ ئەوەی کە (ابن حزم) لە (المحلی)دا نووسیویەتی، ج(٨) ابن تیمیە (القواعد النورانیة) و مامۆستا ابوعلا المودودی لە نامەی (ملکیة الارض في الاسلام) مامۆستا محمود ابو السعود لەگۆڤاری (المسلمون) ساڵی یەکەم لەژێر ناوی (استغلال الارض في الاسلام) نووسیویانە.

بەڕاستی دادپەروەری بەدی نایەت لە (مزارعە)دا نەبێت، لەگەڵ ئەوەشدا کە شێخ الاسلام (ابن تیمیە) بەلایەوە ڕەوایە بە نقد بدرێ بەکرێ وتویەتی کە مزراعە لەگەڵ یاساو شەریعەتدا دەگونجێ.

ووتی/ ( المزارعة أصل من المؤاجرة وأقرب الى العدل والأصـــول ) بەکرێدانی زەوی بە نیسبەتێك لە بەرهەمەکەی چاکترە لەوەی کە بدرێت بە پارەو نزیکترە لە یاساو بناغەی شەریعەتی ئیسلام . چونکە هەردووکیان هاوبەش لە قازانج و زیاندا بەڵام لە (مؤاجرة)دا خاوەن زەوی کرێکەی مسۆگەرەو بەگرێ گریش دوو ڕێگای لە بەردەمدایە یان قازانج یان زیان[1].

ابن قیم دەربارەی ستەمی کاربەدەستەکان و سەربازەکانی چەرخی خۆی لە جوتیارەکان وتی: ئەگەر کاربەدەست و سەربازەکان لەگەڵ جوتیارەکاندا بەو یاسایانە بجوڵانایەتەوە کە خواو پێغەمبەر دایان ناوەو خەلیفەکان پێی هەڵساون، ئەوا خوای گەورە بەرەکەتی خۆی دەڕژاند بەسەریاندا، ئەوەی بەمامەڵەی (مزارعە) دەستیان ئەکەوت چەندقاتی ئەوە ئەبوو کە بەستەم و دەستدرێژی دەستیان کەوتووە ، بەڵام بەداخەوە بەهۆی نەزانینەوە لەو ڕێگەوە کاریان نەکردووە کەخوای گەورە پێی خۆشە ، گەر پرسیار بکرێ کامەیە یاسای خواو پێغەمبەر ﷺ ؟

لە وەڵامدا دەڵێم: مزارەعەی دادپەروەری ئەوەیە کەخاوەن زەوی و جوتیار یەکسانیەکیان لەقازانج و زەرەرەدا دەست بکەوێت.

کاتێك لەش بە حەرام پەروەردە بوو شایانی دۆزەخە، وە ئەو مزارعە دادپەریەی کە پیشەی موسوڵمانان بوو لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ و خەلیفەکاندا ، کاری ئالی ابی بکر ، ئالی عمرو ئالی عثمان و ئالي عليٌّ و کەسانی تریش لە کۆچکەران ، وەقسەی پیاوە گەورەکانە لەیارانی حەزرەت وەکو ئیبن مەسعودو ئوبەی کوڕی کەعب و زەیدی کوڕی سابت و...

وە مەزهەبی فقەهای فەرموودەش وەك: ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، اسحاق بن راهویە، محمد بن اسماعیل البخاری، داود بن علی، محمد بن اسحاق، ابن خزیمە، ابی بکر بن المنذر ، محمد بن نصر المروزی ، کە مەزهەبی هەموو موسوڵمانانە بەگشتی، وەك اللیث بن سعد، ابن ابی لیلی، ابی یوسف، محمد بن حسن ...

---

[1] / لە نامەی (الحسبة في الاسلام) ابن تیمیة ، لا: ٢١.

پێغەمبەر ﷺ مامەڵەی لەگەڵ ئەهلی خەیبەردا کرد بە بەشێ لە بەرهەمی باخەکانیان تاکۆچی دوایی، ئەم جۆرە مامەڵەیە کاری پێ دەکرا تا ئیمامی عمر لە خەیبەر دەری کرد، وەمەرجی ئەوەی لەگەڵ کردن کە ئاوەدانی بکەنەوە ، تۆویش لەسەر ئەوان بوو نەك پێغەمبەر ﷺ.

کەواتە فەرمایشی زاناکان راستە کە ئەشێ تۆوەکە لەلایەن کارکەر یان هەردوولا بێت.

بوخاری لە صحیحی خۆیدا فەرموویەتی عمری کوڕی خەتتاب بەم جۆرە لەگەڵ جوتیارەکاندا مامەڵەی ئەکرد، گەر تۆوەکە هی عمر بوو ئەوە بەرهەمەکە دەکرا بە دوو بەشەوە، وە ئەگەر تۆوەکە لەوانەوە بێت ئەوا نیوە زیاتر دەبێت، وە لە هەموو ئەو فەرموودانەی دەربارەی (المزارعە) هاتووە هیچ بەدی ناکرێت کە بەشی کارکەر لە نیوەی کەمتر بووبێت ، بەڵکو لەهەندێکیاندا زیاتریشە.

## هاوبەشی لەئاژەڵ بەخێوکردندا

لە وڵاتەکەماندا – دانەر – رەوشتێك زۆر باوە بەتایبەت لەدێهاتەکاندا یاخود لەنێو خێڵەکاندا، ئەویش هاوبەشی یە لەئاژەڵ بەخێوکردندا، لایەکیان پارەی ئاژەڵەکە دەفع دەکەن و بەرامبەرەکەشی هەڵئەسێت بەسەرپەرشتیو بەخێو کردنی و پاشان بەرهەمەکەی لەنێوان خۆیاندا بەش دەکەن.

١ ـ هاوبەشی یەکە بۆ مەبەستێکی بازرگانیە لەنێوان هەردوولادا وەکو هاوبەشی لەدابەستنی گوێرەکەو مەڕو بەرانو ...یان بەخێوکردنی مانگاو گامێش بۆ مەبەستی زاوزێ.

مفروض وایە لێرەدا کە لەلایەنی یەکەم هەستێت بەدابین کردنی پارەکەو بەرامبەریش هەڵئەسێت بە بەخێوکردنی هەرچی پێداویستیو خۆراكو خواردنەوەیە لەسەر هەردوولایە نەك یەکێکیان وەلەکاتی فرۆشتندا هەرچی تێچووی ئاژەڵەکە، لەنرخەکەی جیا دەکرێتەوە، وەئەوەشی لەقازانج مایەوە لە نێوان هەردووکیاندا بەشی دەکەن دادگەریی نیە کە مەسرەفی ئاژەڵەکە بخرێتە سەرشانی یەکێکیان و قازانجەکەش بۆ هەردوولا بێت.

٢ ـ هاوبەشی کردنە لەنێوانە دووکەسدا واتە یەکێکیان پارەکە ئەدا، ئەوی کەشیان بەخێوی دەکات، مەسرەفەکەشی بەرامبەر بەشیرەکەی یا، گەر ئیشکەر

---

[1] / الطرق الحکمیة ، ابن القیم ، ل: ٢٤٨ ، ٢٥٠.

بوو بەرامبەر ئیشەکەی وەردەگرێت، ئەم شێوەیە بەخراپ نازانم و شتێکی جوانیشە، ئەگەر ئاژەڵەکان گەورەبوو لەهەمان کاتدا سوودی هەبوو بە شیر یا کارەکەی ئاشکرایە لایەنی دووەم مەسرەفی دەکات ، ئەو سوودە من کە لە رێی شیر یان کارەکەی دەستی دەکەوێ ئاستی یەکسانیان نازانرێ وەجۆرێك لە غروری تێدایە، بەڵام ئێمە ئەمان بەجوان زانی کە دروست بێ‌و ئەو زیانە کە مامەڵەمان بە کەم دانا چونکە هاوچەشنی ئەوە لەشەریعەتدا هاتووە، لەفەرموودەیەکی صحیحدا دەربارەی (الزهد) هاتووە، گەر ئەوەی رەهن دەکرێت ئاژەڵ بێت ئەشێ بۆ گواستنەوەیان شیر بەکاربێ پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( الظهر يركب بنفقة اذا كان مرهوناً ، ولبن الدر يشرب بنفقته اذا كان مرهوناً وعلى الذي يركب ويشرب النفقة )[1].

ئاژەڵەکە بکێشێ، وە لەبری شیرەکەی ولاغەکە، بەخێو بکات، کاتێك ئەم رەهن رەوابێت و لەبەرئەوە کەپێویستی خەڵکن و متمانە لەنێوان یەکتردا دروست بکات، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ جار خەرجی ولاغەکە یان زیاتر یان کەمتر ئەبێت لە نرخی گواستنەوەو شیرەکە، بەخراپی نازانم کە بڵێم ئەوە لەهاوبەشی ئاژەڵیشدا دروستە، چونکە خەڵکی پێویستیان پێیەتی وەکو رەهنەکە، وەبزانن کە من لەم فەرموودەیە وەرم گرتووە رایەکی تایبەتی خۆمانە، بەو هیوایەی لەجێی خۆیدا بێ بەڵام هاوبەشی لەگوێرەکەی بچووکدا (ئەوانەی سوودیان نیە نە بە شیر بۆ گواستنەوە) لەسەر ئەو بڕیارەی کە پارەکە هی لایەکیان بێت‌و خەرجی‌یەکەشی لاکەی تریان ئەوە یاسای ئیسلام رێی لێدەگرێ، چونکە تەنیا ئەو کەسەی خەرجی دەکێشێ تووشی زیان دەبێت بەبێ ئەوەی سوودێکی دەست بکەوێ لە شیر یان کارکردن‌و بەرامبەرەکەشی سوود وەردەگرێت لەسەر شانی ئەوی تریان‌و هیچ دادپەروەری‌یەکی تێدا بەدی ناکرێت.

## لە خۆشی و یاریدا

ئیسلامی پیرۆز پەیامێکی واقعی‌یەو دوورە لە وەهم‌و خەیاڵ، بەڵام لەگەڵ مرۆڤدا لەسەر زەوی بەشێوەیەکی واقعی‌و دروست مامەڵەی لەگەڵدا دەکات، نەك وەك فریشتەیەکی سێ باڵ و چوار باڵ، بەڵکو وەك مرۆڤێك لەخواردن‌و خواردنەوە بخوات، لەبەرئەوە پێویست نەکراوە لەسەر مرۆڤ کە هەموو وتەیەکمان هەر زیکرو هەموو بێدەنگیەك بیرکردنەوەو هەموو بیستنێکمان قورئان‌و هەموو بۆشایی‌یەکی

[1] ت: ٣٧٢.

ژیانیان لەنێو مزگەوت بێت، بەڵکو دانی بەو غەریزە و فیترەتەدا ناوە کە دروستی کردووە، کە بەشێوەیەك دروستی کردوون کە دڵخۆش بنو پێبکەنن و یاری بکەن، هەروەك چۆن خواردن و خواردنەوە دەخۆن.

## کاتژمێرێكو کاتژمێرێك

بەرزیو پتەوی لایەنی رۆحی هەندێ یارانی پێغەمبەر ﷺ گەشتبووە ئاستێك کەوایان دەزانی، هەوڵی بەردەوامو دوورکەوتنەوەی هەمیەشی ئاینەکەیانەو دەبێت پشت بکەنە هەموو خۆشییەکانی ژیان، و هیچ شادیو سروودێك بەدی نەکەن بەڵکو هەموو بیروهۆشو روئیایەکیان تەنها بەرەو قیامەت بێت.

با گوێ بیستی فەرموودەی (حنظلة الاسدي) بگرین کە یەکێك بووە لە نووسەرانی پێغەمبەری خوا ﷺ کە باسی خۆی بۆ دەکردین:

ابو بکرم پێگەیشتو وتی: (حنظلة) چۆنی؟ وتم: حنظلة دووڕووە. وتی: پاکی و بێگەردی بۆخوا ، چی دەڵێت؟ وتم: کە لای پێغەمبەر دەبین باسی بەهەشت و دۆزەخمان بۆ دەکات کە واهەست دەکەین دەیبینین، بەلأم کەلای نامێنین و دەچینە نێو خێزانو منداڵەکانمان و باخەکانمان ، بیرمان دەچێتەوە. ابوبکر وتی: سوێند بەخوا منیش هەمان شتم بەسەرهاتووە. حنظلة وتی: من و أبوبکر رۆشتینە خزمەت پێغەمبەر ﷺ پێغەمبەری خوا فەرمووی: چیتانە ؟ وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، کاتێك لای جەنابت دەبینو باسی دۆزەخو بەهەشت دەکەین دەگاتە ئاستێك کە وەك وایە بیبینین، بەلأم کە لای تۆ رۆیشتین زۆرمان لەبیر دەچێتەوە . پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، ئەگەر بەو شێوەیەی کە لەلای منن بەردەوام بن ئەوا فریشتە تەوقەی لەگەڵ دەکردن لە رێگەوبان و ناو جێگەکانتاندا، بەلأم حنظلة کاتژمێرێك بۆ خواو کاتژمێرێك بۆ دنیا، ئەم وشەیەی سێ جار دووبارە کردەوە[1].

[1] / صحيح مسلم ، ت: ٢٧٣.

## پێغـەمبەر مـرۆڤـە

بەڕاستی ژیانی ﷺ ژیانێکی نموونەیی چاك بوو بۆ مرۆڤێکی متکامل‌و تەواو، لەکاتی خەڵوەتدا نوێژی دەکردو دەگریاو درێژەی بە خشوعەکەی دەداو تا درەنگ دەمایەوە تا پێیەکانی دەئاوسا، وە لەبواری هەقدا گوێی بە کەس نە ئەدا گەر لە ڕێی خوادا بووایە، بەڵام لەگەڵ ژیان‌و خەڵکیدا مرۆڤێکی ئاسایی‌و حەز بە چاکە بوو، ڕووخۆش‌و دەم بە زەردەخەنە بوو، گاڵتەی دەکرد، بەڵام هەرگیز لە بازنەی هەق نەئەچووە دەرەوە، پێغەمبەر ﷺ حەزی لەخۆشی و شادی بوو، ڕقیشی لە ناخۆشی بوو لەو هۆکارەشی بەرەو ناخۆشی دەبات، و پەنای بەخوا دەگرت لە خراپەی (اللهم اني اعوذبك من الهم والحزن)[1].

یەکێك لەو گاڵتانەی کە دەربارەی ڕیوایەت کراوە ئەوەیە کەژنێکی بەتەمەن پێی دەڵێت، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دوعام بۆ بکە کە بچمە بەهەشتەوە، پێی فەرموو: دایکی فلان کە بە تەمەنەکان ناچنە بەهەشتەوە ژنەکە ڕۆیی‌و پیێ ناخۆش بوو دەستی کرد بە گریان، کە حەزرەت ئاوهابینی فەرموودەکەی بۆ ڕوون کردەوەو واتە: بەپیری ناچیتە بەهەشتەوە بەڵکو گەنج دەبێتەوەو ئەم قورئانەی بۆ خوێندەوە ﴿ إِنَّا أَنْشَأْنَاهُنَّ إِنْشَاءً فَجَعَلْنَاهُنَّ أَبْكَاراً عُرُباً أَتْرَاباً ﴾[2].

## دڵەکان غـەمبـار دەبن

بەم جۆرە هاوەڵە باش‌و پاکەکانی ، گاڵتەیان دەکردو پێی پێدەکەنین و قسەی خۆش‌و یاریان دەکرد، لەبەر حەزو ئارەزووی دەروون (نفس) چونکە غەریزەیەکی سروشتی‌یەو بەشداری کردنی دڵە لەمافی خۆیدا، کە ئەو قسە خۆش‌و ڕەوایە وایان لێدەکات کە بتوانن درێژە بدەن بەو ڕێگە دوورو درێژەی کە گرتوویانەتە بەر.

عەلی کوڕی ئەبوتالیب دەڵێت: دڵەکان غەمبار دەبن هەروەك جەستە ماندوو غەمبار دەبێت .

هەروەها وتی: سات دوا سات پشوو بەدڵەکانتان بدەن چونکە دڵ کە غەمگین بوو کوێر دەبێت.

(ابو درداء) وتی: من دڵم خۆش ئەکەم بە شتێ بەتاڵ بێتەوە تا لەسەر هەق یارمەتیم بدات .

---

[1] / ابوداود ، ت: ٣٧٤.

[2] / اخرجه عبد بن حميد والترمذي ، ت: ٣٧٥.

کەواتە ئاسایی‌یە کە موسوڵمان دڵی بە شتێ خۆش بکات کە هەست بە پشوویەك بكات، وەهیچ ئیشكالێكی تێدا نیە كە نەفسی خۆی و هاوڕێكانیشی دڵخۆش بكات ، بەخۆشیەكی مباح ، بەڵام بەمەرجێ نەیكات بەرەوشتێكی هەمیشەیی لە هەموو كاتێكی‌دا ، و ببێتە پیشەی بەیانیان‌و ئێوارانی، و لە ئەركەكانی سەرشانی دووربخاتەوە، و هەموو كارێكی جدی لا بێ ئەهمیەت ببێت. بۆیە وتراوە ( اعط الكــلام من المزاح بقدر ما يعطي الطعام من الملح ) .

واتە: خۆراك چەند خوێی پێویستە قسەكردنیش هێندەی گاڵتە پێویستە وەنابێت موسوڵمان ڕێزو ماهیەتەكانی بخاتە ژێر كاریگەری گاڵتەكانی‌یەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا يَسْخَرْ قَوْمٌ مِنْ قَوْمٍ عَسَى أَنْ يَكُونُوا خَيْـراً مِــنْهُمْ﴾ الحجــرات: ١١ واتە: ئەی ئەوانەی كە باوەڕتان هێناوە باهیچ هۆزێك گاڵتە بەهیچ هۆزێكی‌تر نەكات، ئەشێ گاڵتە پێكراوەكان لەوانی‌تر چاكتربن، وەنابێت بەقسەی ناڕاست خەڵكی بێنێتە، پێكەنین ، پیغەمبەر ﷺ ترساندوینی كە ( ويل للذي يحدث بالحديث ليضحك منه القوم فيكذب ، ويل له! ويل لــه! ) وەیل بۆ ئەو كەسەی درۆ لە قسەكانیدا دەكات تاخەڵكی پێبكەنن دەوەیل بۆ ئەو كەسە، وەیل بۆ ئەو كەسە[1] .

## جۆرەكــانی ( اللهو الحلال )

چەندە شێوازی گاڵتەو خۆش هەیە، جۆرەها هونەری یاری كە پێغەمبەر ﷺ شەرعیەتی بۆ داناوە كە دەبێتە مایەی دڵخۆشیان و لەهەمان كاتیشدا نەفسیان ئارام دەكاتەوە بۆ زیاتر پەیكەڵكردنی خواپەرستیەكانیان، بەچالاكی‌و گوڕو تینێكی زیاترەوە، ئامادەییان دەكات بۆ جهاد لەپێناو خوای گەورەدا، لەوانەش "

## پێشبڕكێی ڕۆیشتن ( الجري على الأقدام )

هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ پێشبڕكێ‌یان دەكرد، و پێغمبەریش ﷺ ڕەزامەندبوو لەسەری ، ریوایەت دەكەن كە عەلی ﷺ لە ڕاكردندا زۆر بە توانا بووە.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ خۆیشی پێشبڕكێی لەگەڵ عائیشەی خێزانیدا دەكرد تا دڵخۆش بكات و هاوەڵانیش لێوەی فێربین.

عائیشە فەرمووی: پێغەمبەر ﷺ پێشبڕكێ لەگەڵ كردم لێم بردەوە ، پاش چەند ساڵێك (قەڵەویش بووم) لێی بردمەوەو فەرمووی: ئەم بردنەوەیە بەدر بە بردنەوەیەی پێشوو[2] .

---

[1] / الترمذي، ت: ٢٧٦.
[2] / احمد وابوداود ، ت: ٢٧٧

## زۆران بــازیی

پێغەمبەرﷺ زۆران بازیی لەگەڵ پیاوێکی ناسراودا کە ناوی (رکانە) بوو کە زیاد لەجارێك لەگەڵیدا ئەنجامداوە[1]. لە ریوایەتێکدا پێغەمبەر ﷺ زۆران بازیی لەگەڵدا کردم و زۆر بەهێز بوو وتی: مەڕێ بە مەڕێ[2]. بێگومان ئەم لەپێش حەرام کردنی قوماردا بوو، جارێکیتر لەگەڵ ئەنجامدایەوە وتی: با دووبارەی بکەینەوە، تا سێ جار ئەنجامیاندا هەر لێی بردەوە، پیاوە وتی: چی؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ( ماکنا لیجمع علیك ان نصرعك و نعزمك خذعنك ) بۆ ئەوە زۆرانمان لەگەڵ نەکردیت کە مەڕەکانت لێ وەربگرین، مەڕەکانت بەرەوە.

زانایان ئەوەیان لەم فەرموودانە وەرگرتوە کە پێشبڕکێ شەرعیەتی پێ دراوە چ لەنێوان پیاوان خۆیان یان پیاوو ژنی مەحرەم یان خێزانەکانیان دابێت، وەئەم جۆرە یاریانە زیان بەکەسێتی و شەرەف و زانست و گەورەییو زۆری تەمەن ناگەیەنن، پێغەمبەر ﷺ کاتێك پێشبڕکێی لەگەڵ عائیشەدا کرد لە سەرو پەنجاکانەوە بوو لە تەمەنیدا.

## یــاری تیر هاویشتن ( بیر ئەندازی )

یەکێکیتر لە هونەری یارییە کە مەشروعەکان نیشانە گرتنەوەیە:

پێغەمبەرﷺ بەلای هاوەڵەکانیدا دەڕوات ونیشانە دەگرنەوە لەگەڵ ئەوەشدا هانیان ئەداو دەڵێت ( إرموا وأنا معكم )[3] واتە: بیهاوێژن منیش لەگەڵتانم ئەوجۆرە یارییە تەنیا ئارەزوو خۆشییەك نیە بەتەنها بەڵکو جۆرێکە لەو هێزەی کەخوای گەورە فەرمانی پێکردووە ﴿ وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ ﴾ الأنفال : ٦٠، لە هەرجۆرە چەكو هێزێك لەتواناتان بۆیان ئامادەکەن، وە لەفەرموودەیەکدا ( الا ان القوة الرمي، ألا إنَّ القُوَّةَ الرَمي ألا أن القوة الرمي)[4] ، ( عليكم بالرمي فأن من خير لهوكم)[5].

لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەرﷺ ئاگاداری کردووین کە مریشك یا، هەر گیاندارێك بکەین بەنیشانە مەبەستی راهێنان و دیاری کردن، کە زۆرێك لە عەرەبەکان لەسەردەمی نەفامیدا راهاتبوون لەسەری.

---

[1] / ابوداود ، ت: ٣٧٨.
[2] / بێگومان ئەمەپێش حەرام کردنی قورمابووە ، وەگەرنا پێغەمبەر(ﷺ) ئەم قبوڵ ناکاو بۆیە ئەنجامیشی نەئەدا .
[3] / البخاري /ت: ٣٧٩.
[4] / مسلم ، ت: ٣٨٠.
[5] / البزار والطبراني باسناد جيد ، ت: ٣٨١.

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر بینی بەو شێوەیە نیشانەیان دەگرتەوە وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: نەفرین لەو کەسەی کە شتێك دەکاتە نیشانەکە زیندوو بێت[1]. چونکە ئازارو ئەشکەنجەی زۆری بۆ گیاندارەکە تێدایە لەگەڵ بەزایەچوونی پارەیەکی زۆرو نابێت مرۆڤ لەسەر حسابی گیاندارانی زیندوو خۆشی بەخۆی بگەیەنێت.

بۆیە پێغەمبەر ڕێی لە بەشەڕدانی گیانداران گرتووە[2]، لەنێوخۆیاندا کە هەندێکیان بەسەر هەندێکی تریاندا زاڵ بێت، لەناو عەرەبدا پیاوی واهەبوو کە دوو بەران یان گیانداری دەهێنایە مەیدانو بەشەڕی ئەدان، تا لەناوئەچوون یان نزیکی مردن ئەبوونەوە خەڵکیش لێیان کۆدەبوونەوە بۆ خۆشیو پێکەنین، زانایان وتوویانە: ئەم ڕێ لێگرتنە بۆیە واجب کراوە کە ئازاری بۆ گیاندارەکان تێدایەو دەبێتە ماندووبوونی بەبێ سوود.

## یاری کردن بەرم و ئەو جۆرە شتانە

## اللعب بالحراب ( الشيش )

پێغەمبەر ﷺ لە حەبەشە ڕێی پێداون کە لەنێو مزگەوتەکانیاندا یاری پێ بکەن، و عائیشەش سەیری کردوون و پێی دەوتن ( دونكم يا بَني أرفدة) بەم جۆرە بانگی حەبەشەییەکان دەکرا.

ئەشێ عمر (لەبەر توندی تەبیعەتی) خۆی حەزی لەم یارییە نەکردبێت، ویستویەتی کە ڕێیان لێ بگرێ، پێغەمبەر ﷺ نەهی لێکردووەو لە صحیحینەوە ابی هریرە دەگێڕێتەوە: لەکاتێکدا حەبەشەییەکان ئەم جۆرە یارییەیان دەکرد عمر چووە ناویان هەندێ وردە بەردی تێگرتن ئنجا حەزرەت فەرمووی : وازیان لێ بهێنە[3].

لە ڕاستیدا گەر ڕامێنین بەرامبەر بەو هەڵوێستەی پێغەمبەر بەرامبەر(عمر) بۆمان دەردەکەوێت کە حەزرەت ویستوویەتی ئاینو دنیا پێکەوە کۆبکاتەوە، وە مەنزڵگای کۆبوونەوەی موسوڵمانان بێت لەو یارییانەدا زانایان لەژێر سایەی ئەم فەرموودەیەدا وتویانە: مزگەوت بۆ کاروباری موسوڵمانان دانراوە ، کەواتە هەر کردەوەیەك سوودی ئاینو دونیای تێدابێت ڕەوایە، با موسوڵمانانی ئەم سەردەمە وورد بنەوە چۆن مزگەوتەکانیان خاڵی کردۆتەوە لە معاناتەکانی دنیاو هەموو هێزو توانایەك، وەزۆربەی کات خراوەتە سەرپشت بۆ بێئیشەکان .

---

[1] / متفق عليه، ت: ٣٨٢.
[2] / ابوداود والترمذي ، ت: ٣٨٣.
[3] / ت: ٣٨٤.

وەرێنمایی‌یەکی پێغەمبەری بەرێزە بۆچۆنیەتی دڵخۆشکردنی هاوسەران.

عائیشە دەفەرموێت ( پێغەمبەرم بینی کە بە بەرماڵ دایئەپۆشیم و منیش سەیری حەبەشیەکانم دەکرد ( کە لەمزگەوتەکەدا یاریان دەکرد[1] هەروەها وتی: لە ماڵەوە بە بووکە شووشە یاریم دەکرد لەلای پێغەمبەردا، هەندێ جار لەگەڵ دەستە خوشکێکدا یاریم دەکرد کە دەهاتەوە خۆیان دەشاردەوە[2].

## یـاری سـوارچـاکی

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَالْخَيْلَ وَالْبِغَالَ وَالْحَمِيرَ لِتَرْكَبُوهَا وَزِينَةً﴾ النحل:٨

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( الخيل معقود بنواصيها الخـير )[3]. ولاغەبەرزە خێر بە ناو چاویەوەیەتی ، وەفەرموویەتی: ( إرموا وأركبوا )[4]. واتە: تیرهاوێژن و سواربن.

وەفەرموویـەتی: ( كل شيء من ذكر الله فهو لهو او سهو، إلاّ أربَعُ الخصال: مشي الرجل بين الغرضين (للرمي) وتأديبه فرسه ، وملاعبته أهله ، وتعليمه السباحة )[5].

هەر شتێك لە زیكری خوا بەدەربێت ئەوا یان یاری‌یە یان هەڵە، چوار شت نـەبێت ، رۆیشـتنی پیـاو لـەنێوان دوو نیشـانەدا بـۆ تـیر هاویشـتن، و فێركردنـی ولاغەكەی ، و یاری كردن لەگەڵ خێزانیدا، و فێربوونی مەلەوانی.

عومەر دەفەرموێت: ( علموا أولادكم السباحة والرماية ومروهم فلبثوا على ظهور الخيل وثباً) منداڵەكانتان فێری مەلەوانی‌و تیرهاویشتن بكەن پێیـان بڵێن لەسەرپشتی ولاغ خۆیان هەڵبدەنە خوارەوە یان بدەنە سەرپشتیان.

(ابن عمر) دەڵێت كە پێغەمبەرﷺ ( سبق بين الخيل وأعطى السابق )[6].

ئـەوە بـزانن كەئـەم فەرموودانـە لەپێغەمبـەرەوە ﷺ میكـانیزمی هاندانـە سەبارەت بەپێشبڕكێی ولاغ چونكە ئەم یاری‌یەو وەرزش و راهێنانە بۆ جەسـتە بە ئەنـەس وتـرا: (أكنتم تراهنون على عهد رسول الله ﷺ ؟ كان رسول الله ﷺ يراهن ؟ قال : نعم ، والله لقد راهن على فرس يقال له سبحة، فسبق الناس ، فهش ولذلك وأعجبه)[7].

واتە: پێغەمبەرﷺ پێشبڕكێ بەئەسپ كردووە.

---

[1] / متفق عليه، ت: ٣٨٥ .
[2] / متفق عليه، ت: ٣٨٦.
[3] / البخاري ، ت : ٣٨٧.
[4] / مسلم ، ت : ٣٨٨.
[5] / الطبراني باسناد جيد ، ت : ٣٨٩.
[6] / احمد گێراویەتیەوە ، ت : ٣٩٠.
[7] / احمد گێراویەتیەوە ، ت : ٣٩٢.

کەواتە گرەو کردن بەمەرجێ دروستە کە ئەو شتەی گرەوی لەسەر دەکرێ کەهی سێهەم بێت نەك ئەو دووکەسە، یان بەتەنها هی یەکێکیان بێت لە گرەوکەرەکان ، بەلاّم گەر هەردوولا شت دابنێن‌و کێ بردیەوە هەردووکی ببات بۆ خۆی ئەوا دەچێتە بازنەی قومارەوە، وەئەو جۆرە ئەسپانەی کە بۆ قومار رائەگیران ناوی ناو بەئەسپی شەیتان و پارەو ئالف‌و سواربوونیشی حەرامە[1].

وە ولاّغەبەرزە سێ جۆرە :

الخيل ثلاثة : فرس للرحمن ، وفرس للإنسان، وفرس للشيطان ، فأما فرس للرحمن فالذي يرتبط في سبيل الله، فعلفه وروثه و بوله، وذكر ماشاء الله (يعني ان كل ذلك له الحسنات) ، وأمّا فرس للشيطان فالذي يقامر أو يراهن عليه وأمّا فرس الإنسان فالذي يرتبطه الإنسان يلتمس بطنها (أي للنتاج) فهي ستر من فقر )[2].

واتە: سێ جۆر ولاّغەبەرزە هەیە : ئەسپی رەحمان، ئەسپی مرۆڤ، ئەسپی شەیتان، ئەسپی رەحمان ئەوەیە کە لە رێی خوادا بەکار بهێنرێ، و هەموو پێویستی و ئەندامانی ئەو ئەسپە چاکەی بۆ خاوەنەکەی هەیە، بەلاّم ئەسپی شەیتان ئەوەیە کە قوماری لەسەر ئەکرێ ، وەئەسپی مرۆڤیش ئەوەیە رابگیرێ بۆ بەرهەم و زاوزێ ئەوە هۆی پارێزکاری‌یە لە هەژاری.

## راوکـردن

یەکێکی‌تر لەو یاریانەی ئیسلام رێی پێداوە ، راوکردنە کە لە راستی‌دا ئەم خۆشی‌یەو هەم وەرزشیشەو ماڵ پەیداکردنیشە ، ئیتر ئەو راوە بە تیرو تفەنگ بێت یان بە بازو سەگ‌و هۆکاری تر بێت، لەمەوپێش باسی حەج‌و شێوازی راوکردنمان کردووە ، ئیسلام هیچ راوێکی نەهی لێنەکردووە لە دوو حاڵەتدا نەبێ :

لەحاڵەتی یەکەم بۆ کەسێك لە حەج‌و عەمرەی دابەستبێ چونکە لەقۆناغی ئاشتی‌یەکی تەواودایە لەهەموبوارێکدا نابێت هیچی تێدا بکوژرێ و خوێن برێژێ وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَقْتُلُوا الصَّيْدَ وَأَنْتُمْ حُرُمٌ﴾ المائدة : ٩٥ ، ﴿وَحُرِّمَ عَلَيْكُمْ صَيْدُ الْبَرِّ مَا دُمْتُمْ حُرُماً﴾ المائدة : ٩٦، ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە لەکاتێکدا لە ئیحرامدان راو مەکەن‌و نێچیر مەکوژن.

---

[1] / احمد گێڕاویەتیەوە ، ت : ٣٩٢.

[2] / متفق عليه ، ت : ٣٩٢.

وەحاڵەتی دووەم: کاتی حەرەمی مەککەیە کەئیسلام کردویەتیە مەڵبەندی ئاشتیو هێمنیو ئارامی بۆ هەموو بوونەوەرێك کەپێدا تێپەردەبێت یان بە ئاسمانیدا بفڕێ یان لە زەوییەکەیدا بڕوێت، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (لایصاد صیدها ولا یقطع شجرها، ولا یختلی خلاها ) متفق علیه ، واتە راوی نێچیری ناکرێ ، و دارو درەختی نابڕێ و گژوگیای نادروێ [1].

## یاری کردن بە طاولە ( النرد )

هەر یارییەك لەپێناو شتێکدا بێت حەرامە، بەتایبەت گەر قومار بێت، چونکە خوای گەورە لە ریزی خواردنەوەو بتو ئەزلام دا دایناوە.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( من قال لصاحبه تعال اقامرك فلیتصـدق )[2] واتە: تەنها بانگ کردنیش بۆ قومار تاوانەو پێویستە کەفارەتی بکرێت ، یان خێرێك بکات کە بەهۆیەوە تاوانەکەی بسڕێتەوە.

لەوانەش یاری کردنە بە تاولە گەر لەسەر شتێکی دیاریکراو بێت ئەوا بە رای زانایان حەرامە، بەڵام گەر لەسەر شت نەکرێت هەندێ زانایان دەڵێن حەرامەو هەندێکی تریان دەڵێن حەرام نیە، بەڵام کەراهەتی هەیە، بەڵگەش بۆ ئەوانەی دەڵێن حەرامە ئەو فەرموودەیەیە کە بریدە دەربارەی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە وە دەفەرموێت: ( من لعب بالنرد شیر فکانما صبغ في لحم خنزیر ودمه )[3].

واتە: هەرکەسێك یاری بە تاوڵە کردو وەکو ئەوە وایە دەستی بە گۆشتو خوێنی بەراز رەنگ کردبێت.

ابو موسی لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە: ( من لعب بالنرد فقد عصـى الله ورسوله) هەرکەسێك یاری بەتاوڵە بکات سەرپێچی خواو پێغەمبەرەکەی کردووە[4].

ئەم دوو بەڵگەیە بۆ هەموو تاوڵەیە چ بەشێوەی قومار یان لەسەر هیچ نەبێت، شەوکانی دەڵێت ریوایەت کراوە کە (ابن مغفل) و(ابن المسیب) رێیان بەم جۆرە یارییە داوە گەر لەشێوەی قوماردا نەبێت، وەپێ ئەچێت فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ بۆ حاڵەتی قومار دانا بێت.

---

[1] / متفق علیه ، ت : ٣٩٣.
[2] / متفق علیه، ت: ٣٩٤.
[3] / مسلم واحمد وابوداود ، ت: ٣٩٦.
[4] / احمد وابوداود وابن ماجه ومالك في الموطأ ، ت: ٣٩٥.

## یاری شەترەنج

یەکێکی‌تر لەو یاری‌یە ناسراوانە شەترەنجە ، وەزانایان رایان جیاوازە لە رووی ئیباحەو کەراهیەت و تەحریمیەوە.

بەڵگە بۆ ئەوانەی حەرامیان کردووە چەند فەرموودەیەکە لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاوەتەوە ، بەلاّم شارەزایان و پسپۆرانی ئەم بوارە کاری پێناکەن، چونکە روونیان کردۆتەوە کەئەم یاری‌یە لەسەردەمی هاوەلاّندا دەرکەوتووە بۆیە هەر فەرموودەیەك ئەم رووەوە بگێڕێتەوە بەتاڵە.

بەلاّم هاوەلاّنی پێغەمبەر ﷺ لەم بارەیەوە را جیاوازن بۆ نموونە (ابن عمر) دەڵێت لە (نرد) تاوڵەش خراپترە، وەئیمامی عەلی ئەڵێت ئەویش هەر قومارە ئەشێ لەحاڵەتێکدا بڵێت کەتێکەڵ بەقومارکرا، وەلەهەندێکیشانەوە حاڵیەتی کەراهیەتیان لێ دەگێڕێتەوە وەك چۆن هەندێ لە یاران‌و تابیعیەکان بە مباحیان داناوە لەوانەش (ابن عباس) (ابوهریره) و (ابن سیرین) و (هشام بن عوره) کە (سعید بن المسیب) و (سعید بن جبیر).

ئەصڵ لەهەمووشتێکدا مباحە، وەهیچ دەقێکیش لەسەر حەرامی نەهاتووە ، جگە لەوەی کە یاری‌یەو خۆشی بە دڵ ئەداو، راهێنان و وەرزیششە بۆ مێشك‌و فراوانبوونی زەین، لەبەرئەوە جیاوازە لە تاوڵە، بۆیە وتویانە، یاری کردن لە تاوڵەدا زیاتر دەکەوێتە سەر بەخت کە وەك ئەزلام وایە، بەلاّم شەترەنج پشت بە رێکخستن دەبەستێت کە وەك پێشبڕکێ‌ی تیرهاویشتن وایە.

لەپێناو (اباح) بوونی ئەبێ سێ مەرجی تێدابێت:

١ ـ بەهۆیەوە نوێژەکان لەکاتی خۆی‌دا دوانەخرێت، چونکە گەورەترین مەترسی ئەوەیە کە کات زۆر دەبات.

٢ ـ بەهیچ شێوەیەك قوماری تێکەڵ نەبێت.

٣ ـ یاریزان لەکاتی یاری‌دا زمانی لە قسەی ناشیرین و خیانەت بپارێزێت.

کەواتە گەر لەیەکێك لەم مەرجانە لایدا ئەوا بێگومان بەرەو قومار دەچێت.

# گۆرانـی و مۆسیقـا

یەکێی ترە لەو هۆکارانەی کە دەبێتە مایەی حەوانەوەی نەفس گوێچکە بە بیستنی خۆشحالْ دەبێت، وەئیسلام رێی پێداوە مادام خراپەو ناشەرعی تێدا رەنگ نەداتەوە، وەهیچ ئیشکالیەتێکی تێدانیە گەر مۆسیقای لەگەڵدا بێت، بە مەرجێك زۆر سەرنج راكێش نەبێت، وەزۆر باشیشە کە لە بۆنەو ئاهەنگە خۆشەکاندا وەك دەربرینێك بۆ ئەو خۆشی‌یە بەکاربهێنرێت وەك رۆژەکانی جەژن‌و ژن هێنان‌و هاتنەوەی کەسێکی نادیارو زیندانی‌و لەدایك بوونی منداڵ.

لەعائیشەوە دەگێڕنەوە کە ژنێکیان گواستەوە بۆ پیاوێکی ئەنصاری ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هیچ دەربڕینێکی خۆش‌و شادی‌یان لەگەڵدا نەبوو؟ ئەنصاری‌یەکان حەزیان لەخۆشی‌یە[1] .

و(ابن عباس) وتی: زوجت عائشة ذات قرابة من الانصار فجاء رسول الله فقال: اهديتم الفتاة؟ قالوا: نعم ، قال: ارسلتم معها من يُغني؟ قالت: لا فقال: رسول الله ﷺ ان الانصار قوم فيهم غزل، فلو بعثتم معها من يقول: أَتيناكُم أتيناكُم فَحَيَّانَا وَحَيَّاكُم[1].

واتە: کچەکەتان بۆ نارد ؟ وتیان: بەڵێ ، وتی: کەستان لەگەڵدا نارد گۆرانی بۆ بڵێ؟ عائیشە وتی: نەخێر ، پاشان فەرمووی: ئەنصاری‌یەکان هۆزێکن گۆرانیان تێدایە، چاك وابوو یەکێکتان لەگەڵدا بناردایە، گۆرانی بۆ بوتنایە بیوتایە (أَتيناكُم أتيناكُم ، فَحَيَّانَا وَحَيَّاكُم) .

عائیشە فەرمووی: جارێك لەجەژنی قورباندا ابوبکری باوکم هاتە ماڵەوە کەنزەکێکم لابوو گۆرانیان ئەوت‌و دەفیان لێ ئەداو حەزرەتیش بەجلەکانی خۆی داپۆشی بوو، ابوبکر لێیان تووڕە بوو حەزرەت (جلەکەی لەسەرخۆی لابردو فەرمووی : (دعهما يا أبابكر، فإنَّها أيام عيد)[2]. وازیان لێ بێنە چونکە رۆژی جەژنە.

ئیمامی غەزالی لەکتێبی (الاحیاء)[3] باسی فەرموودەکانی گۆرانی دوو جاریەکە لەو یاری‌یەکەی حەبەشە لە مزگەوتی پێغەمبەردا ﷺ دەکات کەپێی فەرموون : (دونكم يا بني ارفدة) ویاری کردنی عائیشە بە بووکە شووشەکان، پاشان فەرمووی ئیمامی غەزالی: ئەم فەرموودانە هەموویان لە (صحیحین)دان دیارە

---

[1] البخاري ، ت: ٣٩٧.
[1] / ابن ماجه ، ت: ٣٩٨.
[2] / متفق عليه، ت: ٣٩٩.
[3] / لەکتێبی (السماع من ربع العادات)

دەقێکی ئاشکرایە کە گۆرانی دیاری حەرام نیە بەڵگەی زۆریان تێدا بەدی دەکرێ لەسەر ڕێ پێدانیان.

**یەکەم:** یاری یاری و سەمای حەبەشە لە کەس شاراوەنیە.

**دووەم:** جێبەجێ کردنی لە مزگەوتدا.

**سێیەم:** فەرموودەکەی (دونکم یابني ارفدة) ئەمەش هاندان و فەرماندەرکردنە بۆ ئەو یاری و خۆشی یە ، ئیتر چۆن ئەوترێت حەرامە؟

**چوارەم:** ڕێگرتن لەابوبکر کەنەیهێشت گۆرانی بڵێن، وە ڕوونکردنەوەکەی کە وتی: بەهۆی ڕۆژی جەژنەوەیەو کاتێکی خۆشە، ئەمەش یەکێکە لە هۆکارەکانی خۆشی دەربڕین.

**پێنجەم:** وەستانێکی زۆری پێغەمبەر (بۆ سەیرکردن و گوێ لێبوونی ئەو یاری یەو ڕێگەدان بە عائیشە کە سەیری بکات، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی رەوشتی جوان بۆ دڵخۆش کردنی ئافرەت و منالأن بە بینینی یاری و خۆشی باشترە کە ژیانێکی زبرو ناخۆشن.

**شەشەم:** ئەو فەرموودەیەی کە بە عائیشەی فەرموو لە سەرەتادا ، حەز دەکەیت سەیری بکەیت ؟ [1]

**حەوتەم:** ڕووخسەت لە گۆرانیداو لێدانی دەف لەلایەن دوو جاریەکەوە ...

وە لە زۆرێك لە هاوەڵ و تابیعیەکانەوە ریوایەت کراوە کە گوێیان لەگۆرانی گرتووەو هیچ شتێکی خراپیان تێدا بەدی نەکردووە.

وەئەو فەرموودانەی لەسەر خراپی گۆرانی هاتوون هەموویان رەخنە لێ گیراون لەلایەن زانایانەوە: قازی ئەبوبەکری کوڕی عەرەبی دەڵێت: بۆ حەرام کردنی گۆرانی هیچ حەرام کردنێك نەهاتوون.

(ابن حزم) دەڵێت: هەرشتێك لەو بارەیەوە هەبێت ڕاست نیەو دروست کراوە.

زۆرجار گۆرانی لەکۆڕی شەوان و خواردنەوەدا دەوترێت، ئەمە وای کردووە کە زۆرێك لە زانایان حەرامی بکەن، هەندێکیان دەڵێن: گۆرانی لە (لهو الحديث) ە کە لەم ئایەتەدا باسکراوە، ﴿ وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَشْتَرِي لَهْوَ الْحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَيَتَّخِذَهَا هُزُواً أُولَئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُهِينٌ ﴾ لقمان : ٦

---

[1] / اخرجه البخاري ، ت: ٤٠٠ .

لەناو مرۆڤەکاندا کەسی وا هەیە بە ماڵو سامانی خۆی قسەیەك دەکڕێ کە مرۆڤ لەسەر هەق لائەبات وەك قسەی ناڕاست بەمەبەستی لادانی خەڵك ئەوانە سزای سەختیان هەیە.

(ابن حزم) دەڵێت: ئەم ئایەتە باسی سیفەتێك دەکات کە لە مرۆڤی بێ باوەڕدا هەیە، کە ڕێی خواناسی بە سووك سەیر دەکات، بۆ نموونە : کەسێك قورئانێك بکڕێت بەمەبەستی لادانی خەڵك بێگومان کافرە، وەهەرگیز خوای گەورە لۆمەی کەسێکی نەکردووە کە (لهو الحديث) بکڕێت خۆشی‌یەك بە دڵو دەروونی ببەخشێت ، نەك سەرپێچی خوای گەورە بکات.

دیسان (ابن حزم) بەرپەرچی ئەوانەی داوەتەوە کە دەڵێن گۆرانی گومڕایی و سەرلێشێوانە ، پەروەردگار دەفەرموێت ﴿فَمَاذَا بَعْدَ الْحَقِّ إِلَّا الضَّلَالُ﴾ یونس: ٣٦ لە هەق بەدەر چی هەیە ، جگە لە گومڕایی.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( انما الاعمال بالنيات انما لكل امريء مانوى )[1] هەر کەسێك بەهۆی گوێگرتن لە مۆسیقاو گۆرانی بیەوێت سەرپێچی خوای گەورە بکات ئەوە فاسقە، نەك هەر گۆرانی بەڵکو هەمووشتێك ببێتە مایەی خوا لەخۆ ڕەنجان حەرامە ، بەڵام گەرمەبەست لە گوێگرتنەکەی پشوودانێك بێت بۆ دڵو دەروونی بەردەوامی لەسەر خواناسیو هاندانێکی زیاتر بێت لەسەر چاکەکردن ئەوا هیچ ئیشکالیەتێکی تێدانیە، وە هەرکەسێك نە مەبەستی چاکە یان خراپەی هەبێت ئەوە شێوازێکە کە ئەنجامەکەی لێبووردنە، بۆ نموونە کەسێك بۆ گەڕان دەچێتە ناو باخەکەی یان لەبەر دەرگایماڵەکەی دائەنیشێ یان پارچەیەکی لە جلەکانی ڕەنگ دەکات بە (زوردیا) یان سەوز یان هەر ڕەنگێکی تر...)

لێرەدا چەند خاڵێك هەیە دەبێت لەگۆرانی‌دا ڕەچاو بکرێت"

١ ـ دەبێت بابەتی گۆرانی‌یەکە لە ڕەوشتو ڕێنمایی‌یەکانی ئیسلام لا نەدات ، بۆ نموونە گۆرانیەك باسی خواردنەوە دەکات و خەڵکیشی بۆ بانگێشێت بکات ئەوا حەرامە گوێشی لێ بگیرێت.

٢ ـ ئەشێت بابەتی گۆرانی‌یەکە گونجاو بێت بەڵام شێوازی وتنی گۆرانی بێژەکە وای لێ دەکات لە بازنەی حەڵاڵی‌یەوە دەیخاتە نێو بازنەی حەرامەوە ، وەك

[1] متفق عليه، ت: ٤٠١.

جۆرە هەڵس و کەوتێك کەکار لەسەر دەروون و ورووژاندنی غەریزەو ئارەزوو بکات بە شێوەیەکی خراپ.

٣ ـ هەروەك ئاین دژی هەمووجۆرە زیادەڕەوی‌یەك دەکات، تەنانەت لە خوا پەرستی‌دا، کەواتە بۆ(اللهو) خۆشی ئەبێت چۆن بێت کە کاتێکی زۆر دەبات و کاتیش هەموو ژیانە.

گومانی تێدا نییە کە زیادەڕەوی لە (المباحات) دا کاتێك زۆری واجبات دەخوات، وەك وتراوە هیچ زیادەڕەوی‌یەکم نەبینووە کە بەهۆیەوە هەقێك لەناو نەچووبێت.

٤ ـ لێرەدا چەند شتێك ماوە بیڵێین ئەویش دەکەوێتە سەرشانی گوێگرەکە کە خۆی گەر هەستی کرد گۆرانیەکە کار لەنەفسی دەکات و تووشی لادان دەبێت و لایەنی ئاژەڵی بەسەر لایەنی رۆحی‌دا زاڵ دەبێت ، پێویستە لەسەری لێی دوور بکەوێتەوە، وەئەو دەرگایە دابخات کەلێوە کار لەدڵ و رەوشت و ئاینەکەی دەکرێت، ئەوکاتە پشوو ئەدات.

٥ ـ بەرای زانایان گۆرانی حەرام دەبێت گەر لەگەڵ حەرامی تردا تێکەڵ بێت، بۆ نموونە لە کۆری خواردنەوەو بێ رەوشتی دابێت، ئەمە ئەو حاڵەتەیە کە پێغەمبەر ﷺ گوێبیستانی بەسزایەکی قورس و چاوەڕوان کردووە، کە دەفەرموێت: ( ليشربن من أمتي الخمر سيمنحونها بغير اسمها ، يُعزف على رؤسهم بالمعازف والمغنيات يخسف الله بهم الارض ويجعل منهم القردة والخنازير)[1]. کەسانێك لە ئوممەتەکەم ئارەق دەخۆنەوەو جگە لەناوی خۆی ناوی تری لێدەنێن، مۆسیقا بەسەریاندا دەژەنن و ژنانیش گۆرانیان بۆ دەڵێن، خوای گەورە بە زەوی‌دا دەیانباتە ناوەوەو لێیان دەکات بە بەرازو مەیمون.

## قومار لە ئارەق کەمتر نیە

لەکاتێکدا ئیسلامی پیرۆز رێی بەهەندێ یاری‌و خۆشی داوە بۆ موسوڵمان و هەموو یاری‌یەکیشی تێکەڵ بەقوماری حەرام کردوو بەتایبەت لەکاتێکدا یاریزان بەمەبەستی بردنەوە یان دۆڕاندن یاری بکات، پێشتر فەرموودەیەکی پێغەمبەرمان ﷺ باسکرد ( من قال لصاحبة تعال أقامرك فلتصدق).

---

[1] ابن ماجە ، ت: ٤٠٢.

نابێت موسوڵمان (قومار) بکاتە ئالیەتی خۆشیو بەسەربردنی کاتی بێ ئیشی ، یاخود بیکاتە هۆکاری دەست کەوتنی پارە بە هەرشێوەیەك بێت.

ئیسلام لەپشت ئەم حەرام کردنەوە چەند مەبەستێکی هەیە:

١) ئەیەوێت موسوڵمان لە رێی فەرمانەکانی خواو پێغەمبەرەوە پارەی دەست بکەوێت، وەداوای بەرهەم لەپیشەکیەکانی بکات لەو لە دەرگاوە بێت ناو ماڵەکانەوە وەچاوەڕی ئەنجام لە هۆکارەکان بکات ، قوماریش پرۆسەیەکە کار لەسەر بەحتو رێکەوت دەکات نەك لەسەر ئیش کردن.

٢) ئیسلام ماڵی موسوڵمانی بەڕێزو حورمەتەوە سەیر دەکات، نابێت لێی وەربگرێت ئەگەر لە رێگای ئاڵوگۆڕی شەرعیەوە نەبێت، یان بەخشینێك لەلایەن کەسێکەوە ئارەزووی خۆی، بەڵام قومار خواردنی ماڵی خەڵکی بەناهەقە.

٣) هیچ سەرسوڕمانی تیانیە کە دوای تەواوبوونی ئەم پرۆسەیە بە ناخۆشی و رق لێبوون بکەوێتە نێو یاریزانەکانەوە، با بە رووکەشیش رازیبوونیان پێوە دیاربێت چونکە ئەوان هەمیشە لەنێوان زەرەمەندنو زیانداردان ، دیارە کەسی دۆراویش هەرچەند بێدەنگ بێت دڵی پڕە لە خەشمو قین.

٤) ئەو دۆڕاندنە کارێك دەکات کەلایەنی بەرامبەر هەوڵ ئەدات بۆ چەند جارێکی تریش کەئەو پارەیەی دۆڕاندوویەتی بیباتەوەو باربۆی زەرەرەکەی بکاتەوە، و کەسی براوەش ئەیەوێت ئەو چێژەی لە بردنەوەکەدا وەریگرتووە دووبارەو چەندبارە ببێتەوە، یەکەم بەرەو زۆر ڕای دەکێشێ ، دەبینین کارەکە وای لێدەکات نایەڵێت دەست هەڵبگرن، کاتێك دەزانێت بازنەیەك لە خەمو ناخۆشی دەوری ئەدات، پەیوەست دەبن بەو مێزەی یاریەکەیان تێدا دەست پێکردووە ناتوانن لێی جیابنەوە ، ئەمە نهێنی ئەو کارەساتەیە کە لەیاری قوماردا بەدی دەکرێت .

٥) لەبەر ئەمانە ئەم ئارەزووە مەترسی‌یەکی زۆری بۆ سەر کۆمەڵگە هەیە، هەروەك چۆن مەترسی بۆ تاکیش هەیە، بەڕاستی حەزێکە کەهەموو کاتو تێکۆشانێك بەهەدەر دەبات، کەسەکانیش بێئیش دەبن، ماندوو بێ ئەنجام دەمێننەوەو جێگای خواپەرستیشی دەگرێتەوە تەنانەت بێ ئاگای دەکات لە خۆی و خێزان ئەرکی بەرامبەر بە میللەتەکەی .

دوور نیە ئەو کەسەی عەشقی (مێزی سەوز) دەبێت ( بەو شێوەیە ناوی دەبەن) لەپێناویدا ئاینو نیشتمان و رەوشتی خۆی بفرۆشێ، چونکە هاوڕێیەتی

ئەم مێزە لەهەموو هاوڕێیەتی‌یەکی دەخات، بەشێوەیەك كە خۆشەویستی قومار جێی هەموو خۆشەویستی‌یەکان دەگرێتەوە وەك شەرەف و عەقیدەو قەومەکەی لەپێناو بردنەوەیەکی وەهمی‌دا.

بەراستی قورئان جوانی ڕێکخستووە کە قومارو ئارەق لە یەك ئایەتدا باس دەکات ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالْأَنْصَابُ وَالْأَزْلَامُ رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَنْ ذِكْرِ اللَّهِ وَعَنِ الصَّلَاةِ فَهَلْ أَنْتُمْ مُنْتَهُونَ﴾ المائدة: ٩٠، ٩١.

## (اليانصيب) جۆرێکە لە قومار

جۆرێکە لەجۆرەکانی قومار، وەنابێت ئاسانکاری و رووخسەتی بۆ بکرێت بەناوی لەکۆمەڵەی خەیری یان پێویستی‌یە مرۆڤی‌یەکان ئەوانەی یانسیب بەم شێوەیە بەکاردێنن وەك ئەوانەن (تبرعات) کۆدەکەنەوە بەهۆی سەماو هونەری حەرامەوە بەو کەسانە دەڵێن: ( إنّ الله طيّبٌ لا يقبلُ إلاّ طيّباً ). ئەو کەسانەی پەنا بۆ ئەم جۆرە شێوازانە دەبەن وای دائەنێن کە لەناو کۆمەڵگەدا مانای چاکەو سیفەتی ڕەحمی تێدانەماوە، وەهیچ ڕێگەیەك بۆ پەیداکردنی پارە نیە ، قومار نەبێت، ئیسلامیش ئەمە لەکۆمەڵگاکەی‌دا فەرز دەکات ، بەڵکو باوەڕی بەلایەنی خێروچاکە هەیە لەمرۆڤدا ، وەجگە لە میکانیزمێکی پاك بۆ مەبەستێکی ڕێزدار هیچ ناگرێتە بەر، ئەو میکانیزمەش بانگێشت کردنە بۆ چاکەو گەشەپێدانی معانیەکانی مرۆڤە، و باوەڕبوونە بەخواو ڕۆژی دوایی.

## چوونە نێو سینەما

زۆرێك لە موسوڵمانان پرسیار لەهەڵوێستی ئیسلام دەکەن بەرامبەر سینەماو شانۆو هاوچەشنەکانی ، ئایا موسوڵمان ئەتوانێت بەشداریان بکات یان حەرامە؟

گومانی تێدا نییە کە سینەما ئالیەتێکی گرنگە لە ئالیەتەکانی ڕێنمایی خۆشی وەکاری هەر هۆکارێك یان بۆ چاکەیە یان بۆ خراپە ، کەواتە خودی سینەما هیچی تێدانیە، وەئەو حوکمەی لەسەری ئەدرێت بەپێی ئەو مەبەستەیە کە بۆی بەکار دێت.

بەم شێوەیە سینەما دەبینین، کە شتێکی باش و چاکە ، بەڵکو لەوانەیە پێویستیش بێت گەر ئەم مەرجانەی تێدا بەرجەستە بێت:

**یەکــــەم:** پێویسـتە بابـەتی فلیمەکـە لەناشـەرعی و رەوشـت نزمـیو سووکایەتی بەبنەماکانی ئیسلام پاك بێت، وەئەو ئایدۆلۆژیانەی کەکار لەسەر غەریزەکانی دنیا دەکات یان ڕێ بۆ تاوان خۆش بکات یان بانگێشت بۆ بۆچوونی لادان بکات ... ئەمانە هەمووی حەرامن و نابێت موسوڵمان ببینێتو هانیشی بدات.

**دووەم:** بەشێوەیەك سەرقاڵی نەکات کە لەئەرکە ئاینیو دنیایەکانی دوور بخاتەوە، وەك پێنج نوێژەکەی کە دەبێت رۆژانە ئەنجام بدرێن ، کەواتە نابێت موسوڵمان بۆ نموونە نوێژێکی ئێوارەی بڕوات بەهۆی سەیرکردنی ریوایەتێکەوە ، خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ فَوَيْلٌ لِلْمُصَلِّينَ الَّذِينَ هُمْ عَنْ صَلاتِهِمْ سَاهُونَ ﴾ الماعون: ٤-٥ هەروەها یەکێك لەو هۆیانەی کە قورئان خواردنەوەو قوماری حەرام کرد فەوتانی نوێژەکان بوو.

**سـێیەم:** پێویستە ئەوانەی دەچن بۆ سەیرکردنی دووربن لەتێکەڵاوی لەنێوان ژنانو پیاواندا : تا لادانو بەدرەوشتی نزمی بڵاو نەبێتەوە، ئاشکراشە کە تەماشـاکردنەکە لەشـوێنێکی تاریکـدا ئـەنجام دەدرێـت وەك ئـەم فەرموودەیـەی دەفەرموێت: ( لأن يطعن في رأس احدكم بمخيط من حديد خير له من أن يمس امرأة لا تحل له) بەڕاستی ئاسنێکی تیژ بەسەرتاندا بچێت لەوە باشترە کە بەر ئافرەتێکی نا مەحرەم بکەوێت [1]

## لە پەیوەندیە کۆمەلایەتیەکاندا

ئیسلامی پیرۆز لەسەر دوو بناغە پەیوەندی نێوان مرۆڤەکانی بونیاد ناوە:

**یەکەمیان:** چاودێری کردنی برایەتی کە بەپەیوەندیەکی پتەوی نێوانیان دائەنرێت.

**دووەمیـــان:** پاراستنی ئەو مافو رێزانەی کە ئیسلام بۆ هەموو تاکێکی کۆمەڵی داناوە لە خوێنو شەرەفو سامان.

وەهــەموو قســەو کــردارو رەوشــتێك بەرامبـەر بـەم دوو خاڵـە گرنگـە بوەستێتەوە ئەوا ئیسلامی پیرۆز حەرامی کردووە کە پلەکەی بەپێی زیانە مادی و رەوشتیەکەی دەگۆڕێت.

---

[1] رواه البهقي والطبراني ورجاله ثقات رجال الصحيح ، ت: ٤٠٣.

لـەم ئایەتـە پیرۆزانـەدا نموونـەی چـەند سـیفەتێکی تێدایـە کـە زیـان بـە برایەتی و رێزی مرۆڤ دەگەیەنێت

﴿ إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴾ الحجرات: ١٠، موسـولْمانان بـرای یـەکترن ئەگـەر نـاکۆکی کەوتـە نێوانیـان چـاکەخوازیان لەنێوانیاندا بکەن لەخوا بترسن تا بەشکم رەحمتان پێ بکات .

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا يَسْخَرْ قَوْمٌ مِنْ قَوْمٍ عَسَى أَنْ يَكُونُوا خَيْراً مِنْهُمْ وَلا نِسَاءٌ مِنْ نِسَاءٍ عَسَى أَنْ يَكُنَّ خَيْراً مِنْهُنَّ ﴾ الحجرات : ١١، ئەی ئەوانەی گاڵتەی پێدەکەن لە ئـەوانی تر باشتربێت وەهەر ژنێك گاڵتە بەژنانی‌تر نەکەن دوورنیە ئەوان لەمان چاکتر بن.

﴿ وَلا تَلْمِزُوا أَنْفُسَكُمْ وَلا تَنَابَزُوا بِالْأَلْقَابِ بِئْسَ الاسْمُ الْفُسُوقُ بَعْدَ الْإِيمَـانِ ﴾ با کەستان تانەو تەشەر لەوانی ترتـان نـەدەن یـەکتری لەکـەدار مەکەن، نـاوو ناتۆرەی خراپ بەیەك مەڵێن .

﴿ وَمَنْ لَمْ يَتُبْ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ ﴾ الحجـرات : ١١، هەرکەسێك تەوبە نـەکات ئەوە یەکێکە لە ستەمکاران .

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اجْتَنِبُوا كَثِيراً مِنَ الظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ ﴾ خۆتـان لـەگومان بە دوور بخەنەوە هەندێ گومان تاوانە،

﴿وَلا تَجَسَّسُوا وَلا يَغْتَبْ بَعْضُكُمْ بَعْضاً أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَنْ يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتـاً﴾ قسە مەهێنن و مەبەن و غەیبەتی یەکتری مەکەن، کام لەئێوە حەزدەکات کە گۆشتی براکەی بە مردووی بخوات

﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ رَحِيمٌ﴾ الحجرات:١٢، لـەخوا بترسـن بێگومـان لێخۆش بوو بەخشندەیە .

لەسـەرەتای ئایەتەکـەدا خـوای گـەورە بڕیاریـداوە کـە موسـوڵمان بـرای یەکتری بن ، برایەتی ئاینی کۆیان ئەکاتەوە، لەسەر بناغەی مرۆڤایەتی، برایەتیش ئەوەیە کە یەکتری بناسن، پەیوەندیان لەگەڵ یەکتردا هەبێت.

## نابێت موسوڵمان قسە لەگەڵ موسوڵماندا نەکات

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (لا تحاسدوا ولا تـدابروا ولا تباغضـوا وكونـوا لله اخوانا)[1] هەروەها نابێت موسوڵمان لە سێ رۆژ زیاتر قسە لەگەڵ براکەی‌دا نەکات پاش ئەو سێ رۆژە دەبێـت هـەوڵ بـدەن بۆ ئاشـتبوونەوە، چونکە خـوای گـەورە لە

[1] / البخاري وغيره ، ت : ٤٠٤.

**قورئاندا مەدحی ئەوانە دەكات كە بەرامبەر بە ئیمانداران خۆیان بچووك رائەگرن** ﴿أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ﴾ المائدة : ٥٤.

**پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:** ( لا يحل للمسلم أن يهجر أخاه فوق ثلاث فأن مرت به ثلاث فليلقه فليسلم عليه فأن رد عليه السلام فقد اشتركا في الأجر وإن لم يرد عليه فقد باء بالإثم وخرج المسلم من الهجرة )[1].

**وە ئەگەر لەنێوان خزمدا بێت ئەوا جەخت لەسەر حەرام بوونی دەكرێتەوە ، خوای گەورە دەفەرموێ:** ﴿ وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً﴾ النساء : ١.

**پێغەمبەر ﷺ وێنەی ئەو پەیوەندی خزمایەتی‌یەی بۆ كێشاوین كە چەند گرنگە** ( الرحم معلقة بالعرش تقول: من وصلني وصله الله ومن قطعني قطعه الله )[2] ، **سۆزو پەیوەندی خزمایەتی پەیوەستە بە عەرشەوە هەركەس بەسەرم بكاتەوە خواش بەسەری دەكاتەوە وە هەركەس وازم لێ بێنێ خواش وازی لێ دێنێ** ( لا يدخل الجنة قاطع)[3].

**پەیوەندی رەحم ئەونیە كمە تۆ لەگەڵ كەسێك دابیت، كە ئەو لەگەڵتدا باشە، چونكە شتێكی سروشتی‌یە، بەڵكو سەردانی كەسێكە بكات كە لێی دوركەوتوونەتەوە، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:** ( ليس الواصل بالمكافيء القريب ، ولكن الواصل الذي قطعت رحمه وصلتها )[4]. **واتە: بەجێ‌هێنانی ئەم پرۆسەیە بۆ ئەوە نیە كە لەپاداشتدا بەجێی بهێنێ واتە لەبەر ئەوەی ئەو سەردانی كردووە ئەمیش سەردانی بكات.**

**كاتێك ئەم پەیوەندی نەمانە گوناهە كە لەپێناو خواو هەقدا نەبێت، چونكە پتەوترین ئیمان ئەوەیە كە خۆشەویستیش‌و توورەبوونیش لەپێناو خوادا بێت. ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵەكانی دەنگیان لەو سێ كەسە دابڕی كە لە غەزای تبوك دا بەشداریان نەكرد، بۆ ماوەی پەنجا رۆژ تا ئەم زەوی‌یە فراوانەو خۆشەیان لا تەنگ‌و ناخۆش بوو، كەس لایان دانەئەنیشت و قسەیان لەگەڵ نەدەكردن و سەلامیشیان لێ نەدەكردن. خوای گەورە ئایەتی وەرگرتنی تەوبەیانی ناردە خوارەوە**[5].

---

1 / ابو داود ، ت : ٤٠٥ .
2 / متفق عليه، ت : ٤٠٦ .
3 / متفق عليه، ت : ٤٠٧ .
4 / البخاري ، ت : ٤٠٨ .
5 / البخاري ومسلم ، ت : ٤٠٩ .

پێغەمبەر ﷺ بۆ ماوەی (٤) رۆژ قسەی لەگەڵ هەندێ لە خێزانەکانی نەکردووە[1].

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر قسەی لەگەڵ کوڕێکیدا نەکرد تامرد لەبەرئەوەی ئەو فەرموودەیەی جێبەجێ کە باوکی لەپێغەمبەرەوە گێڕایەوە ﷺ کە تێیدا نەهی لە پیاوان کرد کە رێی مزگەوت لە ئافرەتان بگرن[2].

بەڵام گەر دەنگ دابڕینەکە بۆ دنیا بێت، ئەوا دنیا لای پەروەردگارو موسڵمان زۆر لەوە کەم بەهاترە کە قسەو پەیوەندی خزمایەتی لەپێناودا بپچڕێ، چونکە درێژەدان بەم کارە بێبەش بوونە لە سۆزو بەزەیی پەروەردگار.

لە فەرموودەیەکی صحیحدا دەفەرموێت: ( تفتح أبواب الجنة يوم الاثنين والخميس فيغفر الله عزوجل لكل عبد لا يشرك بالله شيئاً، الا رجلاً كان بينه وبين أخيه شحناء فيقول: انظروا هذين حتى يصطلحا ، انظروا هذين يصطلحا انظروا هذين حتى يصطلحا )[3].

خاوەن هەق هێندەی بەسە کە براکەوی هاتەلای و داوای لێبوردنی لێکرد، وەدەبێت لێی قبوڵ بکات، و کۆتای بەو ناکۆکیە بهێنێ، وە حەرامە گەر بەر پەرچی بداتەوەو لێبوردنەکانی بشکێنێ، پێغەمبەرﷺ بەوە ئاگاداری کردوینەتەوە کە ئەو کەسە لە رۆژی دواییدا رێ پێنادرێ بچێتە سەر حەوزەکەی[4].

## چاکسازی نێوان دووکەس

لەگەڵ ئەوەی کە پێویستە کەسانی ناکۆك لەسەربناغەی رێزی برایەتی نێوان بۆیان چاك بکەنەوە، کۆمەڵیش ئەرکێکی تری لەسەر شانە ، کۆمەڵگەی ئیسلامی کۆمەڵگەیەکی تەواو هاوکاری لەنێوان یەکتردا، نابێت هەندێك لەرۆڵەکانی دژایەتییەك بکەن، کەکاری سەیرکەرێك ببینێت و ئاگری ناکۆکیەکە زیاتر پەرە بسێنێت.

بەڵکو پێویستە لەسەر هەموو کەسانێکی بەتوانا و خاوەن بیروڕا کە بێنە پێشەوا بۆ چاکردنی نێوان هەردوولایان وە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴾ الحجرات : ١٠

پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەیەکیدا فەزڵو چاکەی ئەم کارەی نرخاندووە ، لەگەڵ مەترسی ناکۆکیو دەفەرموێت: ( ألا أدلكم على أفضل من درجة الصلاة والصيام

---

[1] / ت : ٤١٠.

[2] / اخرجه احمد ، ت: ٤١١. سیوطي نامەیەکی داناو ناوی ناوە (الزجر بالهجر) واتە: تەمێکردن بەدەم دابرین، و بەچەندین دەق بەڵگەی لەسەر هێناوەتەو باسی شوێنەوای زۆری کردووە.

[3] / مسلم ، ت : ٤١٢.

[4] / الطبراني ، ت : ٤١٣.

والصدقة؟ قالوا بلى يارسول الله قال: إصلاح ذات بين ، فأن فساد ذات البين هي الحالقة ، لا أقول انها تحلق الشعر ولكن تحلق الدين ﴾[1].

## با هيج كۆمەڵێك كۆمەڵێكى تر بە سووك نەزانن

خواى گەورە لەو ئايەتانەى كە باسمان كرد چەند شتێكى حەرام كردووە كە برايەتىو رێزى مرۆڤايەتى دەپارێزێ.

يەكێك لەو شتانە گاڵتە كردنە بەخەڵك، نابێت بۆ موسوڵمانێك كە خوا دەناسێ و باوەڕى بە رۆژى دوايى هەبێت كە گاڵتە بەهيچ كەسێك بكات يا، هەندێ كەس بكاتە خاڵى: بەسووك سەيركردنو پێكەنينو نوكتەكانى، چونكە خۆ بەزل زانێكى شاراوەى تێدا بەدى دەكرێتو ناشرين بوونى خەڵكە ، بۆيە دەفەرموێت: ﴿لا يَسْخَرْ قَوْمٌ مِنْ قَوْمٍ – أي رجال– عَسَى أَنْ يَكُونُوا خَيْراً مِنْهُمْ وَلا نِسَاءٌ مِنْ نِسَاءٍ عَسَى أَنْ يَكُنَّ خَيْراً مِنْهُنَّ ﴾ الحجرات: ١١

چونكە چاكە لاى پەروەردگارە بە ئيمانو دڵسۆزى و پەيوەندى خزمايەتى هەڵدەسەنگێنرێت، نەك لەسەر شێوەو رووخسارو پارە، لە فەرموودەيەكدا ( إن الله لاينظر إلى صوركم ولا أموالكم ولكن ينظر إلى قلوبكم وأعمالكم )[2].

واتە: ئەبێت سووكايەتى بەپياوێك يان ئافرەتێكەوە بكرێت، بەهۆى بوونى كەمو كووڕيەتى جەسەدى يان رەوشتى يا، هەژارى؟

ريوايەتكراوە كە عەبدوڵلاّى كوڕى مەسعود قاچى دەركەوت زۆر لاوازو باريكبوو هەندێك لەوانەى بينيان پێى پێكەنين، پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرمووى: (أتضحكون من قدمه وساقيه والذي نفسي بيده لهما أثقل في الميزان من جبل احد)[3].

قورئانى پيرۆ ز باسى ئەو دوو موشريكەمان بۆ دەكات كە چۆن گاڵتەيان بە موسوڵمانان دەكرد بەتايبەت لاوازەكانيان وەك بيلالو عمار، وەچۆن كێشانەكان لە رۆژى لێپرسينەوەدا پێچەوانە دەبنەوەو ئەو كەسانە خۆيان دەبنە خاڵى گاڵتە پێكردن ﴿ إِنَّ الَّذِينَ أَجْرَمُوا كَانُواْ مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا يَضْحَكُونَ {٢٩} وَإِذَا مَرُّواْ بِهِمْ يَتَغَامَزُونَ {٣٠} وَإِذَا انقَلَبُواْ إِلَى أَهْلِهِمُ انقَلَبُواْ فَكِهِينَ {٣١} وَإِذَا رَأَوْهُمْ قَالُوا إِنَّ هَؤُلَاء لَضَالُّونَ {٣٢} وَمَا أُرْسِلُوا عَلَيْهِمْ حَافِظِينَ {٣٣} فَالْيَوْمَ الَّذِينَ آمَنُواْ مِنَ الْكُفَّارِ يَضْحَكُونَ {٣٤}﴾ المطففين ٢٩ ــ ٣٤.

---

[1] / الترمذي وغيره، ت :٤١٤ .
[2] / مسلم :ت: ٤١٥ .
[3] / اخرجه الطياليسي واحمد ، ت: ٤١٦.

## خۆتـان عەیبدار مەکەن

٢ ـ دووەم کارێك کە حەرامە (اللمز) کە لە زمانەوانیدا واتە، الوخر والطعن ، لێرەدا بە مانای عەیب دێت، ئەو کەسەی عەیبی خەڵك دەردەخات وەك ئەوەوایە کە بە رمەکەی یا شمشێرەکەی بریندارى بکات ، ئەمەش شتێکی راستە وە لەوانەیە بریندار کردن بە زمان و قسەی ناخۆش ئەوپەڕی دڵێشانی لەدواوە بێت وتراوە:

جراحَاتُ السنانِ لَها التئَامٌ   وَلا يَلْتئِمُ مَا جَرَحَ اللّسانُ

واتە: جێی شمشێر چاك دەبێتەوە بەڵام جێی قسە چاك نابێتەوە وە زۆر بە شێوازێکی جوان دەفەرموێت: (وَلا تَلْمزُوا أَنْفُسَكُمْ) واتە یەکتری عەیبدار مەکەن بەڵام قورئان گوزارشت لەهەموو گرۆی موسڵمانان دەکات کە وەك جەستەیەك وان هەر کەس عەیبی براکەی بڵێت ئەوا هی خۆی ئاشکرا کردووە.

## ناوە ناتۆرە لەیەکتر مەنێن

٣ ــ ناو ناتۆرەیەش یەکێکە لەو سیفەتە بلاوانەی کەئیسلامی پیرۆز حەرامی کردووە کەجۆرە بانگ کردنێکە کۆمەڵێ خاسیەتی ناشرین گاڵتەجاری لە خۆ دەگرێ بۆیە نابێت مرۆڤ براکەی وا لێ بکات کە بە لەقەبێکی نەشیاو بانگی بکات و ئازارێکی دەروونی بگەیەنێت، چونکە ئالیەتێکەو بۆ گۆڕانی خەڵكو دژایەتی کردنی برایەتیو هەموو رەوشتێکی جوانو بەرزە.

## گومـانی خراپ ( الظن )

٤ ـ پەیامی ئیسلام دەیەوێت کۆمەڵگەکەی لەسەر بناغەی نەفسێکی پاكو بونیاد بنێ نەك لەسەر گومانو دوودڵی و تاوان بارکردن بۆیە قورئان دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اجْتَنِبُوا كَثِيراً مِنَ الظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ﴾ الحجرات: ١٢

نابێت موسوڵمان گومانی خراپ بکات بەرامبەر بەبراکەی بەبێ بوونی هیچ بەڵگەیەك ئەسڵ لە مرۆڤایەتیدا پاکیو بێ تاوانییە، بۆیە نابێت وەسوەسەی گومان ئەو مەیدانە بێ تاوانییە بگرێتەوەو بەرەو دارمانی بەرێت پێغەمبەر فەرموویەتی ( اياكم والظن فان الظن اكذب الحديث )[1].

مرۆڤیش لەبەر لاوازی خۆی هەندێ کەس لەژێر گومانە خراپەکەیدا دەرناچن بەتایبەت ئەوانەی مامەڵەی خراپی لەگەڵ کردوون، بەڵام پێویستە مرۆڤ

---

[1] البخاري وغيره، ت: ٤١٧.

خۆی نـەدات بەدەسـت گومـانو بەشـوێنیدا نەچـێت، ئەمەیـە ئـەو مانایـەی لـەم فەرموودەیەدا هاتووە: ( اذا ظننت فلا تحقق )[1].

## سـی خوڕیـی ( التجسس )

٥ . نـەبوونی متمانـە لـەنێوان خـەڵکی‌دا پاڵیـان پێـوەدەنێ بـەرەو کـارێکی نادیـار لەدڵدا ئـەویش گومانـە، وەکـارێکی ئاشـکراو جەسـەدی کـە سـی خوڕی‌یـە، ئیسلام هەوڵ دەدات کە بونیادی کۆمەڵگەکەی لەسەر پاکیزەی روخسـارو نـاوەڕۆك بینا بکات بۆیە نەهی لە سیخوڕی کردووە، بە نەهی کردنی گومانی خراپ.

مـرۆڤ خـاوەن ڕێـزو ئەرزشـێکی وایـە کـە نابێت بەشـوێن هـەڵسو کـەوت و ڕەفتارو نهێنی‌یەکانیاندا بگەڕێین تەنانەت گەر زۆر تایبەت بەخۆشیان بکەن، مـادام بە شێوەیەکی نهێنی ئەنجامی ئەدەن.

(ابـي الهیـثم) نووسـەری عقبـەی بـن عـامر یـەکێك لـە هـاوەڵان دەڵێـت: بـە عقبەی کوڕی عامرم وت: دراوسێ‌یەکمان هەیە دەخواتەوە / منیش بەپۆلیس دەڵێم تـا بیانبـەن، وتـی: شـتی وانەکـەیت ئامۆژگاریـان بکـەو وریایـان بکـەرەوە وتـی: ئاگادارم کردوون بەڵام سوودی نەبووە، بۆیە پۆلیسیان بۆ بانگ دەکەم، عقبە وتـی: ماڵ ویران شتی وامەکە گوێم لێ بوو پێغەمبـەر ﷺ دەیفەرموو: هەرکەسێك عـەیبێك بپۆشێ وەك ئەوە وایە کە زیندە بەچاڵێکی لەگۆڕەکەی‌دا زیندوو کردبێتەوە[2].

پێغەمبەر لەم سیفەتەی بەپرۆسەیەکی منافقەکان لەقەڵەمداوە ئەوانـەی کـە تەنها بە زمان ئیمانیان هێناوە.

(ابن عمر) دەڵێت: حەزرەت چووە سـەر مینبـەرو بـەدەنگێکی بـەرز فـەرمووی: ئەی ئەوانەی بەزمان باوەڕتـان هێنـاوەو ئیمـان نەچۆتە دڵی‌یـەوە! ئازاری موسوڵمانان مەدەنو شوێن عەیبـەکانیان مەکـەون، هەرکـەس بەشـوێن هەڵـەی بـرا موسـوڵمانەکەی‌دا بـڕوا پـەروەردگاریش شـوێن عەیبـەکانی دەکـەوێت، و هـەر کەسـێکیش خـوای گـەورە شوێن عەیبی بکەوێ ئابڕووی دەبات با لەژووری خۆیشدا بێت[3].

پێغەمبـەریش ﷺ ئەفـەرموێ: ( من استمع الی حدیث قوم وهم له کارهون صب في اذنیه الانك یوم القیامة )[4] واتە: هەرکەسێ گوێ لەقسەی کەسانێك بگرێـت و ئـەوان

---

[1] / الطبراني ، ت: ٤١٨.
[2] / ابوداود والنسائي وابن حبان في (صحیحه) واللفظ له والحاکم ، ت : ٤١٩
[3] / الترمذي وابن ماجه بنحوه ، ت : ٤٢٠ .
[4] / البخاري وغیره ، ت : ٤٢٢ .

پێیان ناخۆش بێت، که ئەو گوێ ئەگرێ، ئەوا لە رۆژی دواییدا قورقوشمی تواوه دەکرێتە ناو گوێیەکانییەوه.

لەپێناو پاراستنی بەهای مرۆڤایەتی پێغەمبەر ﷺ زۆر بەتوندی چوونە نێو مالآنی بەبێ مۆڵەت حەرام کردووه ( من اطلع في بيت قوم بغير اذنهم فقد حل لهم ان يفقؤوا عينه)[1].

قورئانی پیرۆزیش روونی کردۆتەوه کەهیچ مرۆڤێك بەبێ لە دەرگادان بچێتە مالآن ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَدْخُلُوا بُيُوتاً غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّى تَسْتَأْنِسُوا وَتُسَلِّمُوا عَلَى أَهْلِهَا ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ فَإِنْ لَمْ تَجِدُوا فِيهَا أَحَداً فَلا تَدْخُلُوهَا حَتَّى يُؤْذَنَ لَكُمْ وَإِنْ قِيلَ لَكُمُ ارْجِعُوا فَارْجِعُوا هُوَ أَزْكَى لَكُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ﴾ نور :٢٧-٢٨ لە فەرموودەیەکدا ( أيما رجل كشف سراً فادخل بصره قبل أن يؤذن له فقد اتى حداً لايحل له أن ياتيه)[2] واتە: هەرکەسێك دەرگایەك یان پەردەیەك لابداو بەبێ مۆڵەت سەیر بکات بێگومان کارێکی ناپێکی کردووه کە حەلآڵ نییە.

ئەو دەقانەی کە نەهی لە سیخوری دەکەن پرۆسەیەکی شامل و گشتگیرەو هەموو حاکم و مەحکومێك دەگرێتەوه، گەر شوێن عەیبی خەڵکی بکەویت ئەوا بەرەو تیاچوونت بردوون یان نزیکە بەرەو تیاچوونیان بەریت[3].

لە (ابو امامه) دەگێڕنەوه کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی ( ان الأمير اذا إبتغى الريبة في الناس أفسدهم )[4].

## غەیبەت کردن ( الغيبه )

شەشەمین سیفەت کە راڤەکانی قورئاندا بەحەرام هاتووه، زەم کردنە ﴿وَلا يَغْتَبْ بَعْضُكُمْ بَعْضاً﴾ الحجرات: ١٢.

پێغەمبەر ﷺ ویستوویەتی مەفهومێك بۆ هاوەڵەکانی دیاری کات بە شێوازە تایبەتی‌یەکەی خۆی لە رێی پرسیارو وەلآمەوه، پێی فەرموون: ئەزانن غەیبەت چی‌یە؟ وتیان: خواو پێغەمبەری خوا زاناترە، فەرمووی: باسکردنی براکەت بەوەی پێی ناخۆشە وتیان: ئەی ئەگەر ئەو شتەی باسمانکردو لە

---

[1] / متفق عليه، ت: ٤٢١.
[2] / البخاري وغيره ، ت: ٤٢٢ .
[3] / ابو داود وابن حبان في (صحيحه) ت :٤٢٤ .
[4] / ابو داود ، ت: ٤٢٥ .

براکەماندا هەبوو؟ فەرمووی گەر ئەو سیفەتەی تێدابێت ئەوا غەیبەتت کردووەو ئەگەر تێدا نەبینرا ئەوا بوهتانت بۆ کردووە[1].

مرۆڤ هەمووشتێکی تایبەت بەخۆی پێ ناخۆشە کە باس بکرێت لە رووی دروست بوون و رەوشتو ... لەعائیشەوە دەگێڕنەوە کە وتم: بە پێغەمبەر ﷺ ئەوەت بەسە کە صفیەی خێزانی پێغەمبەر (ئەوەو ئەوەیەتی واتە کورتە بالایە) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڕاستی وشەیەکت درکاند گەر بخرێتە ئاوی دەریاکەوە لێڵ و بۆگەنی دەکات[2].

غەیبەت ئارەزوویەکی وێرانکارییە بۆ خەڵکیو ئارەزوویەکی تەشەر لێدەرە لەپێویستی بەڕێزو حورمەتو بەهای خەڵکی لەکاتێکدا کە لەو شوێنە نین، وەبەڵگەی نەفامییە چونکە تانەو تەشەرە لەدواوە نەك بەرەو روو، وەیەکێکە لە هەرە خراپترین دیاردە سلبییەکان ﴿وَلا يَغْتَبْ بَعْضُكُمْ بَعْضاً أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَنْ يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتاً﴾ مرۆڤ هەمیشە دژی ئەوە دەوەستێتەوە کە گۆشتی مرۆڤ بخوات بە تایبەت گەر برای خۆشی بێت وە ئەگەر مردووش بێت.

پێغەمبەر ﷺ جەختی لەسەر ئەم وێنە قورئانیە کردۆتەوە لە زهن دا بمێنێتەوە وە لەدڵا جێگیری بکات هەرکاتێك هەلێکی بۆ برەخسێ.

(ابن مسعود) دەڵێت: لای پێغەمبەر دانیشتبووین ( پیاوێك هەستاو رۆیشت) پیاوێکیتر غەیبەتی کرد پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دانەکانت پاك بکەرەوە ، ووتی: لە چی؟ فەرمووی ، ئەی گۆشتت نەخوارد، فەرمووی: تۆ گۆشتی براکەت خوارد[3]. کابرا دەڵێت : ( كنا عند النبي ﷺ فهبت ريح منتنة فقال الرسول ﷺ اتدرون ما هذه الريح ؟ هذه ريح الذين يغتابون المؤمنين )[4].

## سنووره مۆڵەت دراوەکان لە غەیبەت کردندا

## سنوورەکانی مۆڵەت لە غەیبەتدا

هەموو ئەم دەقانە دەلالەت لە قودسیەتی بەهای شەخصی دەکەن بۆ تاك لە ئیسلامدا بەڵام چەند حاڵەتێکی إستثنائي هەیە کە زانایان رێیان داوە بە غەیبەت کە بەپێی پێویست دەبێت رەچاو بکرێت.

---

[1] / مسلم وابو داود والترمذي والنسائي ، ت: ٤٢٦.
[2] / ابوداود والترمذي والبيهقي ، ت : ٤٢٧.
[3] / الطبراني ورواته رواه الصحيح ، ت : ٤٢٨.
[4] / احمد ورواته ثقات ، ت :٤٢٩ .

بۆ نموونە: ستەم لێکراوێك سکالاّ لە ستەمکارەکەی دەکات، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لا يُحِبُّ اللّٰهُ الْجَهْرَ بِالسُّوءِ مِنَ الْقَوْلِ إلَّا مَنْ ظُلِمَ وَكَانَ اللّٰهُ سَمِيعاً عَلِيماً﴾ النساء: ١٤٨

یان کەسێك پرسیار لە شەخصێکی دیاریکراو دەکات تا بەشداری بکەن لە کارێکی بازرگانی یان ژنهێنان یان هەرکارێکی تری گرنگ، لێرەدا ئامۆژگاری پێویستە، ئەتوانرێت باسی ئەو کەسە بکرێت کە لەو تۆڕەدا نیە، بەمەرجێك شتی ناڕاستی تێدا نەبێت، فاتمەی کچی قەیس بەپێغەمبەری فەرموو ﷺ کە دوو کەس هاتوونەتە داوای ئەویش سەبارەت بەیەکێکیان فەرمووی ( إنَّهُ صُعْلُوكٌ لا مَالَ لَـهُ ) هەژارە وەهیچی نیە، وەئەوی تریان ( إنَّهُ لايَضَعَ عَصَاهُ عَن عَاتقه) گۆچانەکەی لەشانی دانانێت واتە زۆر لە ئافرەت ئەدات.

هەروەها راپرسی ، یان پەناگرتن لە گۆڕانی خراپەدا ، یان کەسێك بەناوێك یان سیفەتێك ناسراوە وەك شەل، کوێر ، یان کوڕی فلان کەس . بەناوی دایکی‌یەوە هەرچەند غەیبەتە بەلاّم دروستە، یان (تجريح)ی شایەت و ریوایەتی فەرموودەو هەوال[1] .

دوو خالّی گرنگ دەبێت هەبێت لە رێگەدان بە غەیبەت:

**١ ـ پێویستی ٢ ـ نیەت**

١) **پێویستی:** گەر پێویستی نەکرد بەباسی کردنی کەسی سێیەم روون بوو، بۆی نیە خۆی بهاوێتە نێو ئەو لەرزو تا حەرامەوە، وە ئەگەر پێویستی‌یەکە بە هێماو رەمز دابین ئەکرا، ئەوا نابێت زۆر بەئاشکرا روون بکرێتەوە ، یان بەگشتی کۆتایی بێت پێویست بە تایبەتی ناکات .

بۆ نموونە : گەر پرسیار کرا تۆ رات چۆنە کە فلاّن کەس وابکات و وابکات ؟ نابێت لەوەلاّمدا بلّێت : رات چۆنە بەرامبەر بەفلاّنی کوڕی فلاّن؟ ئەمانەش هەمووی بەمەرجیّ نابێت هیچ شتێك بووترێت کە لە راستی‌یەوە دوور بێت ئەگینا حەرامە.

**نیەت:** لەدوای هەموویان نیەت جیاکەرەوەیەکی راستە، مرۆڤ لەهەموو کەسێك باشتر نیەت و مەبەستی خۆی دەزانێت، نیەت ئالیەتی جیاکردنەوەی ستەمو رق و کینە لەنێوان راپرسی‌و ئابڕوو بردندا ، غەیبەت و رەخنە ، ئامۆژگاری و ناوبانگ، هەروەك وتراوە موسولّمان توندو تیژترە لە لێپرسینەوەی نەفسی خۆی دا لە کاربەدەستێکی ستەمکار.

---

[1] بگەڕێتەوە بۆ (الاحياء) ی پێشەوا غەزالی لەکتێبی( افات اللسان من ربع المهلكات) و بگەرێرەوە بۆ شەرحی النوی کە مسلم کردوویەتی و و (رفع الريبه يجوز ومالا يجوز الغيبه) دانانی الشوکانی ، ت: ٢٣.

له ئیسلام دا وابڕیاره كه گوێگر هاوبەشی كەسی غەیبەتكاره ، پێویسته یارمەتی براكەی بدات و بەرپەرچی غەیبەتەكە بداتەوە، له فەرموودەیەكدا (هەر كەسێك بەرهەڵستی بكات لەغەیبەتی براكەی ئەوا پەروەردگار واجبی كردووه لەسەرخۆی كه له ئاگر بیپارێزێ )[1] . یاخود ( من رد عن عرض أخيه في الـدنيا رد الله ﷻ عن وجهه النار يوم القيامة )[2].

وه هەركەسێك نەیتوانی بەرپەرچی غەیبەتەكه بداتەوە له ڕووی براكەیدا ئەوا باشتروایه كەوا ئەو كۆڕه بەجێ بهێڵێ ، وەگەرنا وەكو ئەوان سەیری دەكرێ ﴿ إِنَّكُمْ إِذاً مِّثْلُهُمْ ﴾ النساء: ١٤٠..

## قسـه گێڕانەوه ( النميمه )

٧. كاتێك لەئیسلامدا ناوی غەیبەت دێنین هەر لەپاڵیدا شتێكی تر پەیوەسته پێوەی كه ئەویش قسه گێڕانەوەیە، دەچێته نێو قاڵبی ڕەوشته حەرامەكانەوە، ئەویش گواستنەوەی ئەو وشەو دەربڕینانەیه كه مرۆڤ گوێ لێ دەبێت لەكەسێكەوه بۆ كەسێكیتر، برایەتیو خۆشەویستی لەنێواندا دەپچڕێ ، قورئانی پیرۆز بۆ سووك كردنی ئەم سیفەته هەر لەسەرەتای عەهدی مەككیدا دەفەرموێت: ﴿ وَلَا تُطِعْ كُلَّ حَلَّافٍ مَّهِينٍ {١٠} هَمَّازٍ – طعان فى الناس – مَّشَّاء بِنَمِيمٍ {١١}﴾ القلم .

نەكەی به قسەی ئەوانه بكەیت كه سوێند زۆر دەخۆن و بێ بەهان، و زۆر تانەو تەشەر لەخەڵكی ئەدەن و قسه دەگێڕنەوه.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (لا يدخل الجنة قتـات)[3] واته: دوو زمان ناچێته بەهەشتەوه ، (النمـام) ئەو كەسەیه لەناو كۆمەڵێكدا بن كەقسه دەكەن ئەمیش قسەكانیان دەگێڕێتەوه ، بەڵام (قتات) بەبێ ئاگاداری كۆمەڵەكه گوێیان لێدەگرێ و دەیگێڕێتەوه.

وەفەرموویەتی : (شرار عباد الله المشاؤون بالنميمة المفرقون بين الاحبة البـاغون للبر العيب)[4] . خراپترین كەسی ئومەتەكەم ئەوانەن كه ئاژاوه دەنێنەوەو دۆست و خۆشەویستان له یەك دەكەن عەیب و لەكه له مرۆڤی بێ عەیب ئەدۆزنەوه.

---

[1] / احمد باسناد حسن ، ت: ٤٣١.
[2] / الترمذي واسناده حسن ، ت: ٤٩٢
[3] / متفق عليه، ت: ٤٣٣ .
[4] / رواه احمد ت :٤٣٤ .

ئیسلام لەپێناوی پاك كردنەوەی پەیوەندی‌یەكان لەئاژاوەو دووركەوتنەوە ، ڕێگـەی بەشـاردنەوەی قسـەی نابـەجێ داوە كەیـەكێكیان ووتویـەتی و بـە پێچەوانەشەوە قسەی ڕاست بكات لەپێناو ئاشتبوونەوەیان، وەك دەفەرموێت (لیس بكذاب من أصلح بين اثنين فقال خيراً او نمى خيراً).

وە ئیسلام بەنواندنی ئەو سیفەتە دەوەستێتەوە ، ئەو كەسانە هەربەوەوە ناوەستن بەڵكو ئەتوانن زۆرێك قسەو دەربڕینـی تـری بۆ زیاد بكەن لەپێناو زیاتر تێكدانی پەیوەندی‌یەكان:

ان يسمعوا الخير اخفوه وان سمعوا شراً اذاعوا وان لم يسمعوا كذبوا

پیاوێك چووە لای عومەری كوڕی عەبدولعەزیزو هەندێ قسەی بۆ گێڕایەوە زۆری پێ ناخۆش بوو وتی: گەر ویستت سەیری قسەكەت ئەكەیت، ئەگەر درۆت كرد ئەوا ئەهلی ئەم ئایەتـەیت: ﴿إِنْ جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَأٍ فَتَبَيَّنُوا﴾ وەئەگـەر ڕاستگۆ بیت ئـەوا لەكۆمـەڵی ئـەم ئایەتـەیت ﴿هَمَّازٍ مَّشَّاءٍ بِنَمِيمٍ﴾ وە ئەگـەر حـەزت كـرد لێت دەبوورین وتی: لێبوردن ئەی ئەمیری موسڵمانان ، جارێكی تر بۆی ناگەڕێمەوە.

## ڕێزی شەرەف ( حرمة الاعراض )

٨ ـ هەروەك بینیمان ئیسلامی پیرۆز چۆن گرنگی بەڕێزو بەهای مرۆڤەكان دەدات تادەگاتە ئاستی پیرۆزیی، عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﷺ ڕۆژێكیان سەیری كەعبەی كردو وتـی: ما اعظمك وأعظم حُرمتك ، والمؤمن أعظم حرمة منك[1] ئەی كەعبە چەند گەورەو بەڕێزیت، بەڵام موسوڵمان زۆر لە تۆ بەڕێزترە، وەڕێزی موسوڵمان لە خوێن و شەرەف‌و پارەكەی‌دا دەردەكەوێت .

لەحـەجی ماڵئـاوایی‌دا پێغەمبـەر ﷺ وتـارێكی پێشـكەش بـە موسـوڵمانان كردو فـەرمووی : ( ان أموالكم وأعراضكم ودماءكم حرام عليكم كحرمة يومكم هـذا في شهركم هذا في بلدكم هذا[2].

مـاڵ‌و كەرامـەت‌و شـەرەفتان و خوێنتـان بـۆ یـەكتر حەرامـە ، وەكـو ڕێـزی ئەمڕۆتان لەم مانگ و شارەتاندا.

ئیسلامی پیرۆز حـەرامی كـردووە كـە باسـی یـەكێك بكرێت‌و پێـی نـاخۆش بێت، هەرچەند ئەو سیفەتەیشـی تێدابێت، ئیتر چۆن باسكردنی سیفەتێك ئەدات

---

[1] / اخرجه الترمذي ، ت : ٤٣٥ .
[2] / ت : ٤٣٦ .

که تێیدا نەبینرێ پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( من ذكر امرءا بشيء ليس فيه حبسه الله في نار جهنم حي يأتي بنفاذ ماقال فيه )[1].

عائیشە (خوا لێی رازی بێ) ئەڵێت پێغەمبەر ﷺ بەهاوەڵەکانی فەرموو: (أتدرون أربى الربا عند الله؟ قالوا الله و رسوله أعلم، قال: فأن أربى الربا عند الله إستحلال عرض إمريء مسلم)[2].

واتە: ئەزانن لە سوو خواردن سەختتر چی‌یە؟ وتیان خواو پێغەمبەری خوا زاناترە، فەرمووی: ئەوەیە کە باسکردنی براکەت بەخراپە بەبێ ئاگاداری خۆی بە حەلاڵ بزانیت، پاشان ئەم ئایەتەی فەرموو: ﴿والَّذِينَ يُؤْذُونَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ بِغَيْرِ مَا اكْتَسَبُوا فَقَدِ احْتَمَلُوا بُهْتَاناً وَإِثْماً مُبِيناً﴾ الأحزاب:٥٨

ترسناکترین جۆری دەست درێژی بۆ سەر شەرەف ئەوەیە کە ئافرەتانی موسوڵمان، بەداوێن پیس باس بکرێت چونکە کە ترسی‌یەکی زۆر بۆ کەسێتی خۆی و خێزانو دوارۆژیان هەیە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ خستوویەتیە ریزی حەوت تاوانە گەورەکەوە قورئانیش گەورەترین تۆڵەو هەڕەشەمان لێ دەکات: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ الْغَافِلَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ لُعِنُوا فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ {٢٣} يَوْمَ تَشْهَدُ عَلَيْهِمْ أَلْسِنَتُهُمْ وَأَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ {٢٤} يَوْمَئِذٍ يُوَفِّيهِمُ اللَّهُ دِينَهُمُ الْحَقَّ وَيَعْلَمُونَ أَنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَقُّ الْمُبِينُ {٢٥}﴾ النور.

﴿إِنَّ الَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ الْفَاحِشَةُ فِي الَّذِينَ آمَنُوا لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ {١٩}﴾ النور.

## رێزی خوێن ( حرمة الدماء )

٩- ئیسلام ژیانی مرۆڤایەتی رێزدار کردووە، و رێزی نەفسەکانی پاراستووە، وە دەستدرێژی کردنە سەری بەگەورەترین تاوان داناوە، دوای بێ باوەڕی بە پەروەردگار ﴿ أَنَّهُ مَنْ قَتَلَ نَفْساً بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الْأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعاً ﴾ المائدة: ٣٢ واتە: هەرکەسێك یەکێك بکوژێ وەك ئەوە وایە هەموو خەڵکی کوشتبێ.

چونکە مرۆڤایەتی وەك یەك خێزان وان ، وەدژایەتی یەکێکیان دژایەتی هەموویانەو وەتاوانەکە توندتر دەبێت گەر کوژراوەکە موسوڵمان بێت ﴿وَمَنْ يَقْتُلْ

[1] / الطبراني ت :٤٣٧ .
[2] / اخرجه ابن حاتم وابن مردويه والبيهقي وابو يعلى : ت: ٤٣٨.

مُؤْمناً مُتعَمِّداً فَجزاؤُهُ جَهنَمُ خالداً فيهَا وَغضب اللهُ عَليْه وَلعَنَهُ وَأعدَّ لهُ عَذاباً عَظيماً﴾ النساء: ٩٣ ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ( لزوال الدنيا أهون على الله من قتل رجل مسلم )[1] واتە : نەمانی هەموو جیهان لای خوا ئەهوەن ترە لە کوشتنی پیاوێکی موسوڵمان ، هەروەها دەفەرموێت ( لايزال المؤمن في فسحة من دينه مالم يصب دماً حراماً) موسوڵمان خاوەن ئاینێکی تەواوە گەر کەسێك بەناهەق نەکوژی.

وەدەفەرموێت: ( كل ذنب عسى الله أن يغفره الا الرجل يموت مشركاً أو رجل يقتل مؤمناً متعمدا )[2] هەموو کەسێك ئەشێ خوای گەورە لێی ببورێت، تەنیا پیاوێك کە بە بێباوەڕی بمرێت یان موسڵمانێك بەدەستی ئەنقەست بکوژێ.

لەبەر ئەم فەرموودەو ئایەتانە (ابن عباس) دەڵێت: تەوبەی پیاوکوژ وەرناگرێت. چونکە یەکێك لە مەرجەکانی تەوبە دانەوەی مافەکانی خەڵکییە، کەواتە چۆن ئەتوانێت هەقی کوژراوەکە بداتەوە؟

هەروەها وتویانە، تەوبەی پاكو نصوح وەردەگرێت و هاوەڵو دانانیش دەسڕێتەوە ئیتر چۆن تاوانیتر ناسڕێتەوە؟

## بکوژو کوژراو لە ئاگردان

پێغەمبەر ﷺ کوشتنی موسوڵمانی خستۆتە بابی کوفرەوە، و بە کردەوەیەکی نەفامەکانی لە قەڵەم داوە کە لەپێناو ئەسپێك یان حوشترێکدا جەنگیان هەڵدەستان و خوێنیان دەڕشت، حەزرەت دەفەرموێت: ( سِبابُ المُسْلِمِ فُسُوقٌ وَقتالُهُ كُفْر )[3].

( لاتَرجِعُوا بَعدي كُفاراً يَضرِبُ بَعضُكُم رِقابَ بَعْض )[4] لەدوای من مەگەڕێنەوە بۆ کوفرو هەندێکتان لەملی هەندێکتان بدەن.

( إذا المسلمان حَمَلَ أحَدَهُما علَى أخيه السِّلاح فهُما عَلَى حَرف جَهَنَّم ، فإذا قَتَلَ أحَدَهُما صَاحبَهُ دخَلاها جَميعاً، قِيلَ يارَسُولَ الله ﷺ هَذا قاتلٌ ! فَما بَالُ المَقتُولِ ؟ قَالَ إنَّهُ أرادَ قَتْلَ صَاحبه )[5] . واتە: کاتێك دوو موسوڵمان یەکێکیان چەکی بەرامبەر براکەی هەڵگرت ئەوا لە کەنار دۆزەخدان، وە گەر یەکێکیان ئەوی تریانی کوشت ئەوا

---

[1] / مسلم،والنسائي والترمذي ، ٤٣٩
[2] / ابوداود وابن حبان والحاكم ت :٤٤١.
[3] / متفق عليه ، ت : ٤٤٢ .
[4] / متفق عليه ، ٤٤٣.
[5] / متفق عليه ، ٤٤٤.

دەچنە دۆزەخەوە، وترا ئەی پێغەمبەری خوا ، ئەوە بکوژە حەقی خۆیەتی، ئەی کوژراو بۆچی؟ فەرمووی: ئەویش هەوڵی کوشتنی براکەی داوە.

لەبەرئەوە پێغەمبەر ﷺ بەرگری لەهەموو کردەوەیەك کردووە کە سەر بکێشێ بۆ جەنگو کوشتن هەرچەند هێماکردنێك بێت بەچەك ، و فەرموویەتی: ( لا يشر أحَدَكُم الى أخيه بسلاحٍ فأنَّهُ لا يَدري لَعَلَ الشَّيطانَ يَنزِعُ في يَدِه في حُفرَةٍ مِنَ النّار)[1].

واتە: باهیچ کەسێك لە ئێوە رووی چەك نەکاتە براکەی چونکە نازانێ لەوانەیە شەیتان لە دەستی بسێنێو بەهۆیەوە بخرێتە ناو چاڵێکی ئاگرەوە.

(من أشار إلى أخيه بحديدة فأن الملائكة تلعنه حتى ينتهي وإن كان أخاه لأبيه و أمه)[2]

هەرکەسێك رووی چەك بکاتە براکەی، فریشتە نەفرینی لێ ئەکەن هەتا دایئەنێتەوە بابراشی بێت لەدایكو باوکیەوە وەفەرموویەتی: (لا يحل للمسلم ان يروع مسلماً)[3].

وە رادەی تاوان تەنها لای بکوژەکە ناوەستێت، بەڵکو هەموو ئەوانەشی بە دەورەوەن و بەگوفتار لەگەڵیدا بەشداری تاوانەکەن، هێندەی بەشداریەکەی و تاوانەکەدا تووشی سزای پەروەردگار دەبێتەوە لە فەرموودەیەکدا هاتووە ( لا يقفن احدكم موقفاً يقتل فيه رجل ظلماً ؟ فان اللعنة تنزل على من حضره ولم يدفع عنه )[4].

واتە: باهیچ کەس لەئێوە لەو شوێنەدا نەوەستێت کەکاری کوشتنەکەی تێدا دەکرێت چونکە لەعنەتی خوا بەسەر ئەوانەدا دەڕژێ کە لەو شوێنەدانو بەرگریان لێ نەکردووە.

## رێزی خوێنی پەیمان لەگەڵ بەسراو ( الذمي )

بەپێی دەقەکان بۆمان دەرکەوت کە جەخت لەسەر حەرامی کوشتن کراوەتەوە ، بەتایبەت کوشتنی باوەڕدار، چونکە بۆ یاساو رێنموویی موسوڵمان هاتووە، ئەوەش ناگەیەنێ کە خوێنی ناموسڵمان حەڵاڵە، وەنەفسی مرۆڤایەتی پارێزراوەو خوای گەورە حەرامی کردووەو بەپێی حوکمە بەشەریەکەی، مادام ئەو ناموسڵمانە لەجەنگی دژی موسڵماندا نەبێت، چونکە لەوکاتەدا خوێنی حەڵاڵ دەبێت، بەڵام گەر معاهدە پەیمان لەگەڵ دابەسترابوو یان (ذمي) بوو ئەوا نابێت دەستدرێژی بکرێتە سەر پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ( من قتل معاهد لم يرح رائحة الجنة

---

[1] / اخرجه البخاري ت: ٤٤٥.
[2] / مسلم ت: ٤٤٦.
[3] / ابو داود والطبراني ورواته ثقات ، ت:٤٤٧.
[4] / الطبراني والبيهقي باسناد حسن ت: ٤٤٨.

وان ريحها يوجد من اربعين عاما)[1] واته ئەوەی پەنا دراویٚ بکوژی بۆنی بەهەشت ناکات کە چل ساڵ ڕێگا بۆنی دەڕوات . لە ڕیوایەتێکی تردا (من قتل رجلاً من أهل الذمة لم يجد ريح الجنة)[2].

## کەی کوشتن ڕەوایە؟

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَا تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ﴾ الأنعام: ١٥١ و هەقەی قورئان تیشکی خستۆتە سەر تۆڵەی تاوانە لە سێ ڕووەوە:

١ـ کوشتنی بەناهەق، هەرکەس تاوانی کوشتنێکی بەسەردا دەرکەوت پێویستە ئەو کەسەش بکوژرێتەوە ﴿وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ يَا أُولِي الْأَلْبَابِ﴾البقرة:١٥٩.

٢ـ بەد ڕەوشتی ئاشکرا بەمەرجێك چوار کەس ببینن لەکاتی ئەنجامدانی کارەکەداو شایەتی لەسەر بدەن، بەمەرجێ ئەو ژنە یان ئەو پیاوە قۆناغی (زواج) یان بڕی بێت . ئەگەر خۆشی لەبەردەم حاکمدا چوارجار دان بە تاوانەکەیدا بنێت ئەوە وەك شایەتی چوارکەسەکە وایە.

٣ ـ گەڕانەوە لە ئیسلام پاش باوەڕهێنان پێیو دژایەتی کردنی موسڵمانان ، ئیسلام زۆر لە کەس ناکات بۆ هاتنە بازنەی پەیامەکەی لەهەمان کاتیشدا گاڵتە کردن بەئاین ڕەت دەکاتەوە، وەك جولەکەکان کە پەروەردگار دەربارەیان دەفەرموێت: ﴿آمِنُوا بِالَّذِي أُنْزِلَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَجْهَ النَّهَارِ وَاكْفُرُوا آخِرَهُ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ آل عمران: ٧٢ ، واتە: بەخەڵکیان دەوت باوەڕبێنن بەوەی هاتۆتە خوارەوە بۆ باوەڕداران وە لەنێوان بەیانیو ئێوارەدا کافر ببنەوە بەڵکو ئەوانیش لەو ئاینە هەڵگەڕێنەوە.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( تەنها لەو سێ حاڵەتەدا کوشتنی موسوڵمان دروستە ( لايحل دم امريء مسلم الا باحدى ثلاث ، النفس بالنفس ، والثيب الزاني، تارك لدينه المفارق للجماعة )

لەگەڵ ئەمەشدا هەستان بەم کارە لەم سێ حاڵەتەدا دەبێت لەلایەن کار بەدەستان و بەرپرسانەوە بێت نەك لەلایەن تاکەکانی کۆمەڵ . بۆ ئەوەی لایەنی ئاسایشیو هێمنی تێك نەچێت، مەگەر لەکوشتنی ناهەقدا کەببێتە هۆی (قصاص) تۆڵە کە بۆ کەسوکارەکەی هەیە بیکوژنەوە بە ئامادەبوونی کاربەدەستێك تاکەمێك کێشی ئەو ئازارە کەم بکاتەوە وەخوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمَنْ قُتِلَ مَظْلُوماً فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِ سُلْطَاناً فَلا يُسْرِفْ فِي الْقَتْلِ إِنَّهُ كَانَ مَنْصُوراً ﴾ الإسراء:٣٣.

---

[1] / البخاري وغيره، ت: ٤٤٩.

[2] / النسائي ت: ٤٥٠.

## خۆکوشتن ...

ئەو باسانەی دەربارەی پرۆسەی کوشتن روونمان کردنەوە، خۆکوشتنیش و کوشتنی کەسانی تریش دەگرێتەوە، هەرکەسێك بەهەر هۆکارێك خۆی بکوژێ ، ئەوا نەفسێکی کوشتووە کەخوای گەورە حەرامی کوشتنی کردووە.

ژیانی مرۆڤ موڵکی ئەو نیە چونکە ئەو دروستی نەکردووە، بەڵکو ئەو رۆحە ئەمانەتێکی خوای گەورەیە، نابێت زیادەرەوی تێدا بکات، ئیتر چۆن ئەتوانێت دەست درێژی لێ بکات؟ ئەتوانێت رۆح لەجەستەیدا دەربهێنێ خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلا تَقْتُلُوا أَنْفُسَكُمْ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيماً﴾ النساء: ٢٩

ئیسلامی پیرۆز دەیەوێت موسڵمان خۆگرو تۆکمە بێت بەرامبەر هەموو ئاستەنگەکانی ژیان، وەنایەوێت لەدونیادا رابکات لەبەرئەوەی تووشی کارەساتێك بووە، یان هیوایەکی نەهاتۆتە دی، موسڵمان بۆ تێکۆشان دروست بووە نەك بۆ دۆگما بوون . رەوشتو ئیمانەکەی رێی دوورکەوتنەوەو ژیانی لێگرتووە، و چەکێکی لەبن نەهاتووی بەدەستەوەیەو توێشوویەك کە کۆتایی نایەت، ئەوانیش چەکی ئیمان توێشووی رەوشتێکی بەهێزە.

پێغەمبەر ﷺ ئاگاداری ئەوانەی کردووە کە هەڵدەستن بەم کارە تاوانی خۆ کوشتن کە سۆزو بەزەیی پەروەردگار بێبەش دەبێت لەبەهەشتدا چوونە ژێر قەهرو تووڕەیی پەروەردگارەوە حەزرەت دەفەرموێت: (كان فيمن قبلكم رجل به جرح، فجزع ، فأخذ سكينا فحز بها يده، فما رقأ الدم حتى مات، فقال الله: بادرني عبدي بنفسه فحرمت عليه الجنة)[1].

پێش ئێوە پیاوێك برینێکی پێوەبوو ، خۆی نەگرتو بەچەقۆیەك دەستی خۆی پێ بڕی خوێنەکەی نەوەستایەوە هەتا مرد، پەروەردگاریش فەرمووی : ئەم بەندەیە پەلەی کرد بەمردنی خۆی منیش بەهەشتم لێحەرام کرد).

لەکاتێکدا بەهەشتی لێ حەرام کراوە کە لەبەر ئازار خۆی کوشت، ئەبێ حاڵی ئەو کەسە چۆن بێت کە لەپێناو ژیانێکی کەم یان زۆر خۆی دەکوژێ؟ یان لە تاقیکردنەوەدا دەرنەچووە یان لەبەر کچێك کە نەبۆتە هاوسەری...

با ئەو کەسانەی کە کۆنترۆڵی نەفسی خۆیان پێ ناکرێت ئەم هەڕەشەیەی پێغەمبەر ﷺ ببیستن دەفەرموێت: ( من تردى من جبل فقتل نفسه ، فهو في نار جهنم

---

[1] / متفق عليه ت: ٤٥٢.

يتردى فيها خالداً مخلَدا فيها أبداً ، ومن تحسى سماً فقتل نفسه فسمه في يده يتحساه في نار جهنم خالداً مخلداً فيها ابداً، ومن قتل نفسه بحديدة ، فحديدته في يده يتوجأ بها في نار جهنم خالداً مخلداً فيها أبداً )[1].

پێغەمبەر ﷺ جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە هەرکەس بە چی خۆی بکوژێ بەوە سزا دەدرێ لە دۆزەخدا بۆ هەتا هەتایە ، واتە گەر کوشتنەکەی خۆی بە حەڵاڵ بزانێت.

## رێزو حورمەتی سامان و دارایی

١٠ ـ هیچ ئیشکالیەتێکی تێدانیە گەر موسڵمان هەرچەندی بوویت پارە کۆ بکاتەوە مادام لە رێگایەکی حەڵاڵەوە بێت و لە میکانیزمی پرۆژەی بەسووددا بەکاری بهێنی.

وەگەر لەهەندێ لەئاینەکاندا هاتبێ لەدەوڵەمەند ناچێتە بەهەشتەوە هەتا حوشتر بەکونی دەرزیدا تێپەڕ نەبێت) ئیسلامی پیرۆز دەفەرموێت: سامانی چاك و حەڵاڵ بۆ پیاوی چاك کە لە رێگای خودا بەختی ئەکات)[2].

وەلەبەر ئەوەی ئیسلام دان بەخاوەنێتی پارەی مرۆڤدا دەنێت ، ئەوا بە پێی یاسایەکی شەرعی دەیپارێزێت بەرێنموویەکی رەوشتی لەهەموو زەوت کردنێك دووری دەخاتەوە ئایا بە بردن یان بە دزی یان فێڵ کردن.

پێغەمبەر ﷺ بەهای سامان و خوێن و شەرەفی لەنێو یەك بازنەیەکدا کۆ کردۆتەوەو دزی کردنی دژ بەباوەڕ داناوە فەرموویەتی: (لايَسْرِقُ السَّارِق حِينَ يَسْرِقُ وَهُوَ مُؤمِن)[3] هیچ مرۆڤێك دزی ناکات لەکاتێکدا دزی بکات و باوەڕداریش بێت.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُوا أَيْدِيَهُمَا جَزَاءً بِمَا كَسَبَا نَكَالاً مِنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾ المائدة: ٣٨ ، ئەو کەسە ، کە دزی دەکات چ پیاو بێت چ ئافرەت دەستی ببڕن لە تۆڵەی ئەو کردەوە ناپەسەندەی کە کردویانەو پەروەردگاریش بالادەست و دانایە.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لايحل للمسلم أن يأخذ عصا بغير طيب نفس منه)[4] واتە: نابێت موسوڵمان داردەستەکەی بەبێ رەزامەندی خاوەنەکەی ببات.

---

[1] / متفق عليه . ت: ٤٥٣.
[2] / احمد ت: ٤٥٤.
[3] / متفق عليه، ت: ٤٥٥.
[4] / ابن حبان في صحيحه ت ٤٥٦.

ئەمەش لەبەر حەرامی موڵکی موسڵمانێك بۆ موسڵمانێکی تر.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ إِلَّا أَنْ تَكُونَ تِجَارَةً عَنْ تَرَاضٍ مِنْكُمْ ﴾ النساء: ٢٩ ، ئەی موسڵمانان سامانی یەکتری بە ناهەق مەخۆن مەگەر بە رەزامەندی و بازرگانی خۆتان نەبێت.

## بـەرتیل حـەرامـە

یـەکێك لـە میکانیزمـەکانی خـواردنی ماڵی خـەڵك بـە حـەرام (بـەرتیل)ە کـە پارەیەك بدرێ بە پایەدارێك یان خاوەن کارێکی گشتی تا حوکمێکی بۆ بدەن، یـان کـارێکی بـۆ ئـەنجام بـدەن بـە غـەرامـە کـارێکی بـۆ دواخـەن بـەپێی ویسـتی خـۆی، ئیسـلامی پـیرۆز ئـەو رێگایـەی حـەرام کـردووە کـە لـە بەرتیلـەوە بچـێتە لای کـار بەدەست و پارمەتیدەرەکانیان، هەروەکو سەرزەنشتی ئەوانیشی کردووە کە وەری دەگرن، وەبۆ ئەوانـەش کـە لەنێوانیانـدان خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ وَلا تَـأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ وَتُدْلُوا بِهَا إِلَى الْحُكَّامِ لِتَأْكُلُوا فَرِيقاً مِنْ أَمْوَالِ النَّاسِ بِالْـإِثْمِ وَأَنْـتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾ البقرة: ١٨٨، هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفـەرموێت: (لعنة الله على الراشي والمرتشي في الحكم)[1]. واتە: نەفرین لەو کەسە بێت کە بەرتیل ئەدات ئەوەشی وەریدەگرێت.

هەروەها لە ثوبان دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ نەفرینی کردووە لە ( الرَّاشِي والمُرْتَشِي والرَّائش)[2]. **الرائش**: ئەو کەیە لـەنێوان بـەرتیل بـەخش‌و وەرگردایـە ، ئـەگـەر ئەو کەسەی بەوەرگرتنی بەرتیلەکە توشی ستەم‌و حـەرامی بێـت، ئـەبێ تـاوانەکـەی چـەند بێـت! چـونکە گـەر بەهـەق بێـت نـابێ لەبەرامبـەرکردنی کارەکـەیدا هـیچ وەربگرێت .

پێغەمبـەر ﷺ عەبـدوڵڵای کـوڕی رەواحـەی نـارد بـۆ یـەهود تابزانێـت لـە دار خورماکانیـان چـەندیان زەریبـەوە دەکـەوێت، داوای رێژەیـەك پارەیـان لێکـرد کـە بیدەنێ، پێی وتن: ئەوەی پێتان وتم ئەوە بەرتیلەو ئێمەش حەرام ناخۆین)[3] .

هـیچ سەرسوڕمانێك لەحەرام کردنـی بەرتیلـدا بـەدی ناکرێـت لەئیسـلامدا، لەگەڵ ئەو توندو تیژیەی بۆ ئەوانـەی کـە بەشـداری دەکـەن، چـونکە بڵاوبوونـەوەی دەبێتە هۆی بڵاوبوونەوەی خراپـە لەکۆمەڵدا، بـۆ پرۆسـەی حـوکم کـردن بەناهـەق‌و رێگرتن لەحوکم بە ناهەق، وەپـێش خسـتنی ئـەو کەسـەی دەبێـت درەنـگ بکـەوێت،

[1] احمد والترمذي وابن حبان في صحيحه ت: ٤٥٧.
[2] احمد والحاكم ، ت: ٤٥٨ .
[3] مالك ، ت: ٤٥٩.

وه دواخستنی کەسێك کە دەبێت پێش بکەوێت، وەبڵاوبوونەوەی ڕۆحی سوود وەرگرتن نەك ڕۆحی بەجێی هێنانی ئەرکەکان.

## دیاری هاوڵاتی بۆ سەرکردە

ئاینی پیرۆزی ئیسلام بەهەموو شێوەیەك بەرتیلی حەرام کردووە، بەهەر شێوەو ناوێکەوە بێت، بۆ نموونە بە (دیاری) ناوبرێت ئەوا بەهیچ شێوەیەك لە بازنەی حەرام نایهێنێتە دەرەوە، لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێت: ( من إستعملناه على عمل فرزقناه رزقاً (منحناه راتباً) فما أخذه بعد ذلك فهو غلول)[1]. گەر یەکێکمان خستە سەر کارو مووچەیەکمان بۆ بڕییەوە جگە لەوەی هەرچییەك وەربگرێ حەرامە.

دیارییەك نێردرا بۆ عمری کوڕی عەبدولعەزیز لەکاتێکدا خەلیفە بوو، ئەویش ناردییەوە پێی وترا، پێغەمبەر ﷺ دیاری وەرئەگرت، وتی: ئەوەی ئەو دیاری بوو بەڵام ئەمە بەرتیلە.

پێغەمبەر ﷺ والیەکی نارد بۆ هۆزی (الاذر) بۆ کۆکردنەوەی (صدقات) کاتێك هاتەوە لای پێغەمبەر ﷺ هەندێك پارەی بەدەستەوە بوو وتی: ئەوەندەی بۆ ئێوەو ئەوەش دیارییە بۆ من، پێغەمبەر ﷺ تووڕە بوو وتی: ئەی بۆ لە ماڵی دایكو باوکت دانانیشیت ئینجا ئەگەر ڕاست دەکەیت با دیاریت بۆ بێت !

پاشان فەرمووی: (مالي أستعمل الرجل منكم فيقول: هذا لكم وهذا لي هدية؟ ألا جلس في بيت أمه لهدي له! والذي نفسي بيده ، لايأخذ أحدكم شيئاً بغير حق إلاّ أتى الله بحمله يعني يوم القيامة فلا يأتين أحدكم يوم القيامة ببعير له رغاء أو بقرة لها خوار، أو شاه يتعر!! ثم رفع يديه حق رئي بياض أبطيه، ثم قال: اللّهم هل بلغت ؟[2].

واتە: چی بکەم پیاوێك لەئێوە دەخەمە سەرکارێك و ئینجا ئەڵێت ئەوە بۆ ئێوەو ئەوەش دیارییە بۆ خۆم؟ بۆچی لەماڵی دایکیدا دانەنیشتووەو دیاری بۆ بێتە ماڵەوە؟ سوێند بەو کەسەی گیانمی بەدەستە ، هەرکەس لەئێوە شتێکی ناهەق وەربگرێ ئەوا بەشێوەیەك دێتە لای خوای گەورە کە ئەو شتەی بەکۆڵەوەیە، بەڕاستی هیچ کامتان نایەت بە حوشترێ کە قوڕەی بێ، یان ڕەشەوڵاغێ کە بقۆڕێنێ یان بە مەڕێ کە .... واتە: هەر بەکۆڵیەوە دەبێت ، پاشان دەستەکانی بەرز کردەوەو تا سپیایی بن باڵی دەرکەوتو فەرمووی: خوایە فەرمانەکەی تۆم گەیاند.

---

[1] / ابو داود ، ت : ٤٦٠ .

[2] متفق عليه ت : ٤٦١ .

ئیمامی غەزالی فەرموویەتی: کاتێك ئەم توندوتیژی‌یە لە بەرتیلدا روون کرایەوە قازی‌و فەرمانبەرەکان وایان دەزانی کە لە ماڵی دایك‌و باوکی‌دان نەك لە فەرمانگە.

ئەوەی بۆی دەهات لەپاش دەرکردنی لەکارەکەی ئەتوانێت لەماڵی خۆی‌دا وەری بگرێت، ئەوەش بزانێت بەهۆی کارەکەیەوە بۆی هاتووە حەرامە وەری بگرێت.

## بەرتیل بۆ لابردنی ستەم

هەرکەسێك مافێکی خوراوی هەبێت و جگە لە بەرتیل هیچ رێگەیەك نەبێت بۆ وەرگرتنەوەی ، یان ستەمێکی لێکراوەو بەبێ بەرتیل چارەسەر نابێت باشتر وایە ئارام بگرێت تاخوای گەورە بواری بۆ دەرەخسێنێ بۆ وەرگرتنەوەی مافەکەی یان لابردنی ئەو ستەمە، وەئەگەر لەم حاڵەتەدا بەرتیلی‌دا ئەوا تەنها بەرتیل وەرگرەکە تاوانبار دەبێت، ئەویش بەمەرجێ هەموو هەوڵێکی تری دابێت و لە هیچ دەروازەیەکی ترەوە نەتوانێ کارەکەی بکات‌و دەستدرێژیشی بۆ کەسی تر تێدا نەبێت.

هەندێ لە زانایان بەڵگەیان بەهەندێك لە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ هێناوەتەوە لەکاتێکدا داوای زەکاتیان لێدەکرد ئەویش پێی دەبەخشین لەگەڵ ئەوەی هەقیان نەبوو، عمر دەفەرمووێت: کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ( ان احدکم لیخرج بصدقته من عندي متأبطها ــ یجعلها تحت ابطه ــ وانما هي له نار قال عمر : یارسول الله کیف تعطیه وقد علمت انها له نار؟

بەراستی تیاتاندا هەیە کەلای من دەڕوات، زەکاتەکەی لە بن باڵیدایە، ئەوە ئاگرە واتە هۆی چوونە ناو دۆزەخە . عمر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا گەر ئەزانی ئاگرە بۆچی ئەیدەیتێ؟ فەرمووی: من چی بکەم وازناهێنن‌و داوا ئەکەن و خواش ڕێ نادات من بەخیل و چرووك بم [1].

## زیادەڕەوی لە ساماندا حەرامە

هەروەك دەست درێژی کردنەکە سەر سامانی خەڵك حەرامە، بەنهێنی بێت یان ئاشکرا، ئاوهاش حەرامە خاوەنەکەی زیادەڕەوی تێدا بکات، و بەهەڵە خەرجی بکات، چونکە گەل مافی بەسەر پارەی تاکەوە هەیە.

---

(1) ابو یعلی باسناد جید، وروی احمد نحوه ، ورجاله رجال الصحیح ، ت: ٤٦٢.

قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: ﴿ وَلا تُؤْتُوا السُّفَهَاءَ أَمْوَالَكُمُ الَّتِي جَعَلَ اللَّهُ لَكُمْ قِيَاماً وَارْزُقُوهُمْ فِيهَا وَاكْسُوهُمْ وَقُولُوا لَهُمْ قَوْلاً مَعْرُوفاً ﴾ النساء: ٥

لێرەدا خوای گەورە ئومەتەکەی ئەدوێنیّ و دەڵێت ﴿وَلا تُؤْتُوا السُّفَهَاءَ أَمْوَالَكُمُ﴾ لەگەڵ ئەوەی بە رووکەش پارەی ئەوانە لەراستیدا پارەی هەموو تاکێکی ئەو کۆمەڵەیە.

ئیسلام ئایینێکی دادپەروەریی‌و پەیامێکی مامناوەندە، و گەلی ئیسلامیش کۆمەڵگەیەکی مامناوەندە، موسوڵمانیش دادپەوەرە لەهەموو پرۆسەیەکیدا بۆیە خوای گەورە نەهی لە موسڵمانان کردووە لە زیادەڕەوی لە پارەو ساماندا لەهەمان کاتدا لە رژدی و بەخشیندا وەك دەفەرموێت: ﴿ يَا بَنِي آدَمَ خُذُوا زِينَتَكُمْ عِنْدَ كُلِّ مَسْجِدٍ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا وَلا تُسْرِفُوا إِنَّهُ لا يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ ﴾ الأعراف: ٣١

ئیسراف‌و زیادەڕەوی ئەوەیە کە پارەکەی لە حەرامدا خەرج بکات وەك قومارو ئارەق و (ماددە بیّ هۆشکەرەکان) قاپی زێرو زیوو...ئیتر کەم بێت یان زۆر پێغەمبەر ﷺ ( قد نهى عن اضاعة المال )[1].

ئیمام رازی لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا فەرموویەتی : ﴿ وَيَسْأَلُونَكَ مَاذَا يُنْفِقُونَ قُلِ الْعَفْوَ...﴾ البقرة: ٢١٩.

خوای گەورە ئامۆژگاری خەڵکی کردووە لە بەخشینداو بەپێغەمبەری فەرمووە ﷺ ﴿وَآتِ ذَا الْقُرْبَى حَقَّهُ وَالْمِسْكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَلا تُبَذِّرْ تَبْذِيراً إِنَّ الْمُبَذِّرِينَ كَانُوا إِخْوَانَ الشَّيَاطِينِ﴾ الاسراء: ٢٦

واتە: لە سامانی خۆت بەشی خزم‌و هەژارو رێبواران بدە چونکە ئەمانە مافیان هەیە لە سامانی هەموو موسڵمانێکدا، بەڵام زیادەڕەوی تێدا مەکە، چونکە ئەوەی وابکات ئەوە برای شەیتانە.

وە فەرموویەتی : ﴿وَلا تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَى عُنُقِكَ وَلا تَبْسُطْهَا كُلَّ الْبَسْطِ ﴾ الإسراء: ٢٩ ، واتە: دەستت بە گەردنتەوە مەبەستە لەبەر ژردی، وە بەتەواویش مەیکەرەوەو فەرموویەتی ﴿وَالَّذِينَ إِذَا أَنْفَقُوا لَمْ يُسْرِفُوا وَلَمْ يَقْتُرُوا﴾ الفرقان:٦٧.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ( اذا كان عند احدكم شيء فليبدأ بنفسه ثم بمن يعول وهكذا هكذا )[2] ئەگەر یەکێکتان شتێکتان هەبوو با لەخۆیەوە دەست پیّ بکات، لەپاش خۆی ئەوەی ژیانی لەسەریەتی و بەو شێوەیە).

---

[1] / البخاري، ت: ٤٦٣.

[2] / اخرجه مسلم ت: ٤٦٤.

وەفەرموویەتی: (خير الصدقة ما أبقت غنى)[1] واتە چاکترین چاکە ئەوەیە کە پێویستیەکانی مرۆڤ پڕ بکاتەوە.

جابری کوڕی دەڵێت: لەکاتێکدا لای پێغەمبەر بووین ﷺ پیاوێك پارچە زێڕێکی بۆ هێنا بەقەد هێلکەیەك بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە زەکات وەری بگرە لەوە زیاتر هیچ شك نابەم پێغەمبەر ﷺ رووی لێ وەرگێڕاو، دووبارە هاتەوە بەردەم پێغەمبەر ﷺ و فەرمووی: وەری بگرە ئینجا بە تووڕەییەوە لێی وەرگرت و بۆی فڕێدایەوە، ئەگەر بەری بکەوتایە ئازاری پێدەگەیاند، یەکێك لەئێوە دێت ماڵی دێنێ‌و هیچی نیە، پاشانیش دەست لەخەڵکی دەگرێتەوە ، خێرو زەکات لە تێری ئەدرێت، هانێ سامانەکەت هەڵگەرەو پێویستمان پێی نیە[2].

هەروەها لە پێغەمبەرەوە، کە (إِنَّهُ كَانَ يَحْـبِسُ لأَهْلِـهِ قُـوتَ سَـنَةٍ)[3] واتە: توێشووی ساڵێك بۆ خێزانەکەی هەڵدەگرێت، زانایان وتویانە " چاکە لەنێوان دوو لایەندایە لادان‌و زیادەڕەوی، کەواتە مامناوەندە، بەخشینی زۆر زیادەڕەوییە وە زۆر کەمیش ڕژدییە وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلِ الْعَفْـوَ﴾ بناغەی یاسای محمد ﷺ لەسەر ئەو وردی‌و شارەزاییە بەڵام شەرعی یەهود لەسەر توندوتیژی بونیادنراوەو نەصرانیەکان بەپێچەوانەوە، بۆیە ئاینی محمد (أَكْمَلُ مِنَ الكُلْ)[4].

## پەیوەندی موسڵمان بە ناموسڵمانەوە

گەر بمانەوێت پەیوەندی ڕێنماییەکان ئیسلام بە ناموسڵمانەوە روون بکەینەوە لەژێر ڕۆشنایی حەرام‌و حەڵاڵدا، ئەم دوو ئایەتەی خوای گەورەمان بەسە ﴿لا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُمْ مِنْ دِيَـارِكُمْ أَنْ تَبَـرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ إِنَّمَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ قَـاتَلُوكُمْ فِـي الـدِّينِ وَأَخْرَجُوكُمْ مِنْ دِيَارِكُمْ وَظَاهَرُوا عَلَى إِخْرَاجِكُمْ أَنْ تَوَلَّوْهُمْ وَمَـنْ يَتَـوَلَّهُمْ فَأُولَئِـكَ هُـمُ الظَّالِمُونَ﴾ الممتحنة: ٨ ــ ٩

ئایەتی یەکەم هەر بەوەوە نەوەستاوە کە لەگەڵ ناموسڵماندا دادپەوەر بین، ئەوانەی کە جەنگیان لەگەڵ موسوڵمانەکاندا نەکردووە لە ماڵەکانیان دەریان نەکردوون . واتە ئەوانەی کە هیچ دژایەتیەکیان لەنێوادا نییە ـ بەڵکو بەپێی

---

[1] / الطبراني باسناد حسن وقريب من الصحيح ا: ٤٦٥.
[2] / ابو داود والحاكم ، ت: ٤٦٦.
[3] / البخاري ، ت: ٤٦٧.
[4] / تفسير فخر الرازي ج٦. لا :٥١ بەکەمێك دەستکارییەوە.

ئایەتەکە حەز بەچاکە دەکات لەگەڵیاندا ، وە (البر) وشەیەکی گشتگیرەو لەسەرو دادپەوەریشەوەیە وەك (بر) ی دایكو باوك.

(إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ) موسوڵمان هەمیشە هەوڵی بەجیْهێنانی ئەو کارانەیە کە خوای گەورە خۆشی دەوێت ، ومانای حەزو داواکردن لەناو دەبات لەناو ئایەتەکەدا، بەڵکو بە دەربڕینی (لا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ) هاتووە، مەبەست نەفی کردنە لەوەی لای خەڵکی بوو کە ناموسڵمان شایەنی چاکەکردن نیە لەگەڵیدا.

خوای گەورەش روونی کردۆتەوە لە نەهی چاکە کردن ناکات لەگەڵ ئەو ناموسڵمانانەی کە دژایەتی ئیسلام ناکەن بەڵکو ئەوانەی کە هەمیشە پیلانی ناشیرین کردنی دەگێڕن.

ئەم دەربڕینەی پەروەردگار لەبواری (الصفاء والمروة) دەچێت کە لە سەردەمی نەزانیندا هەندێ کەس بەلایانەوە خراپ بووە کە هاتووچۆی لەنێواندا بکرێت ﴿ فَمَنْ حَجَّ الْبَيْتَ أَوِ اعْتَمَرَ فَلا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَنْ يَطَّوَّفَ بِهِمَا ﴾ البقرة : ١٥٨، بەرگری لە گوناه بۆ لابردنی ئەو بیروڕا ناڕاستە بوو، هەرچەند بەجیْهێنانی ئەم پرۆسەیە یەکێکە لە پایەکانی حەجو عەمرە.

## تێڕوانینێکی تایبەت بۆ خاوەن پەیامە ئاسمانییەکان

لەبەرئەوەی ئیسلام رێ لەچاکەکردن ناگرێت بەرامبەر ناموسڵمان ، ئەگەر موشریکیش بن – وەکو بت پەرستەکانی عەرەب – کە ئەو دوو ئایەتەیان دەربارە هاتبووە خوارەوە، لەهەمان کاتدا ئیسلام تێڕوانینێکی بۆ خاوەن پەیامەکان هەیە، لە یەهودو نەصارییەکان گەر لە سایەی ئیسلامدا بن یان لە دەرەوەی.

قورئان بە (اهل الکتاب) نەبێت ناویان ناهێنێ یان ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ﴾ ئاماژە بەوە دەکات کە لە بنەڕەتدا خاوەن ئاینێکی ئاسمانیین، لەنێوان ئەوانو موسوڵمانەکاندا سۆزو نزیکایەتیەك بەدی دەکرێ، کە بە یەك پەیامەوە دەبەسرێتەوە ئەویش خوای گەورە بۆ پێغەمبەرانی رەوانە کردووە ﴿شَرَعَ لَكُمْ مِنَ الدِّينِ مَا وَصَّى بِهِ نُوحاً وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى وَعِيسَى أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ ﴾ الشورى : ١٣.

پێویستە موسڵمان باوەڕیان بەهەموو پەیامە ئاسمانیو پێغەمبەرەکانی پەروەردگار هەبێت، وەگەرنا باوەڕیان دانامەزرێ ﴿ قُولُوا آمَنَّا بِاللَّهِ وَمَا أُنْزِلَ إِلَيْنَا وَمَا أُنْزِلَ إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالْأَسْبَاطِ وَمَا أُوتِيَ مُوسَى وَعِيسَى وَمَا أُوتِيَ النَّبِيُّونَ مِنْ رَبِّهِمْ لا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ ﴾ البقرة: ١٣٦.

وەخــاوەن پەیامــەکان گــەر قورئــان بخوێننــەوە سوپاســی پــەیامو پێغەمبەرەکانیانی تێدا بەدی دەکەن.

وە ئەگەر موسڵمانەکان کەوتنە بیروڕا گۆڕینەوە لەگەڵیاندا، با دووربن لەو شێوازەی کە رق دەخاتە دڵەکانیانەو دوژمنایەتی دروست ەکات ، ﴿ وَلا تُجَـادِلُوا أَهْلَ الْكِتَابِ إِلَّا بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِلَّا الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْهُمْ وَقُولُوا آمَنَّا بِالَّذِي أُنْزِلَ إِلَيْنَا وَأُنْـزِلَ إِلَيْكُمْ وَإِلَهُنَا وَإِلَهُكُمْ وَاحِدٌ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ ﴾ العنكبوت: ٢٦

وەك زانیمان کە ئاینی پیرۆزی ئیسلام چۆن رێی خواردنو خواردنەوەو بەکار هێنانی گۆشتی سەربڕاوی خاوەن پەیامەکانی داوین، هەرواش رێی تێکەڵاو بوونو ژن هێنانی پێداوین، کە هیچ بنەمایەکی هاوسەری دانامەزرێ بە سۆزو بەزەیەی نەبێت.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَطَعَامُ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حِلٌّ لَكُمْ وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَهُمْ وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ الْمُؤْمِنَاتِ وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِكُمْ ﴾ المائدة: ١٥.

ئەمە بەشێوەیەکی گشتی بۆ خاوەن نامەکان، بەڵام نصاری‌یەکان و تایبەتیان هەیە ، قورئان لەجێگایەکی نزیک لە دڵی موسوڵمانەکانی داناوە، دەفەرموێ ﴿ وَلَتَجِدَنَّ أَقْرَبَهُمْ مَوَدَّةً لِلَّذِينَ آمَنُوا الَّذِينَ قَالُوا إِنَّا نَصَارَى ذَلِكَ بِأَنَّ مِنْهُمْ قِسِّيسِينَ وَرُهْبَاناً وَأَنَّهُمْ لا يَسْتَكْبِرُونَ ﴾ المائدة: ٨٢.

## خاوەن پەیمانەکان

ئەم ئامۆژگاری‌یانە هەموو خاوەن نامەکان دەگرێتەوە لەهەر شوێنێك بن، لەگەڵ ئەوەی ئەوانەی لەژێر سایەی ئیسلامدان، شوێن و قەوارەی تایبەتیان هەیە لەنێو دەسەڵاتەکەی‌دا، ئەوانەن کە بەزاراوەیەکی ئیسلامی بە (اهل الذمة) ناو دەبرێن ، (الذمي) واتە پەیماننامە بەرامبەر خواو پێغەمبەر ﷺ هەموو موسڵمانان کە لە سایەی ئیسلامدا بەهێمنیو ئارامی بژین.

بەپێی دەربڕینی نوێ پێیان دەوترێت هاونیشتمانی لەدەوڵەتی ئیسلامدا، هەر لە سەرتاوە تائەمرۆ ئەوەی بۆ موسڵمان هەیە لەژیانیدا، بۆ ئەوانیش هەمان ماف هەیە، جگە لە بەجێ‌هێنانی ئەرکە عەقیدیی‌و ئاینی‌یەکان.

پێغەمبەر ﷺ زۆر بەتوندی ئەو کەسانەی ئاگادار کردۆتەوە کە سەرپێچی ئەو پەیماننامەیە دەکەن، بەسزای خوای گەورە، لەچەند فەرموودەیەکی پیرۆزدا هاتووە: (من أذى ذمياً فقد أذاني ومن أذاني فقد أذى الله)[1] هەرکەسێك ئازاری یەکێك لە

[1] / الطبراني له في (الاوسط) بسناد جيد ت :٤٦٨ .

ئەهلی زیمی بدات ئەوە ئازاری منی داوەو هەرکەسێکیش ئازاری من بدات ئەوە ئازاری خوای گەورەی داوە.

(من اذى ذمياً فأنا خصمه ، ومن كنت خصمه ، خصمته يوم القيامة)[1] ( من ظلم معاهداً أو انقصه حقاً ، أو أنقصه حقاً، أو كلفه فوق طاقته ، أو اخذ منه شيئاً بغير طيب نفس منه ، فأنا حجيجه يوم القيامة)[2].

بەهەمان شێوەش خەلیفە راشدینەکان رێزو بەهای ئەو هاونیشتمانیانەیان پاراستووە ، زانایان جەخت لەسەر جیاوازی مەزهەبەکان دەکەن سەبارەت بەو ماف و بەهایانە.

المالكي شهاب الدين القراني دەڵێت: بێگومان چوونە نێو پەیمانێکی ئاوا بەچەند مافێکمانەوە دەبەستێت، چونکە دەبنە دراوسێ و نزیکمان و دێنە ژێر سایەی پارێزکاری خواو پێغەمبەرو ئیسلامەوە جا هەرکەسێك دەستدرێژیان بکاتە سەر بەکردەوە یان گوتار یان باس کردن دەربارەی خۆیان و خێزانیان یان هەر جۆرە ئازارێك ئەوە سەرپێچی خواو پێغەمبەری خوایان کردووە[3].

وابن حزم الفقيه الظاهري دەڵێت: هەر ناموسڵمانێك لەژێر سایەتی دەوڵەتی ئیسلامیدا بێت و کۆمەڵێك بەمەبەستی جەنگ بێنە ناو ولاتەوە بۆیان ئەوا لەسەرمان پێویستە کە بەرەنگاریان بکەین و دژیان بوەستین و خۆمان بەکوشت بدەین لەپێناو پاراستنیان چونکە گەر نەچین بەهانایانەوە ئەوا پەیمانی خواو پێغەمبەرمان ﷺ شکاندووە[4].

## پشتگیریی و خۆشەویستی نواندن بۆ ناموسڵمانان و ماناکەی

ئەشێ ئەم پرسیارە بەنێو هەندێ ئاستەنگ و مەترسیدا بڕوات، یان لەسەر هەندێ زمان تووشی دوودڵی دەبێت، ئەوەش چۆن چاکەو خۆشەویستی و مامەڵەی باش لەگەڵ ناموسڵمانەکاندا بەجەستە دەبێت، لەکاتێکدا قورئان خۆی نەهی لەلایەنگیری و یارمەتیدانی بێباوەڕەکان کردووە: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَتَّخِذُواْ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى أَوْلِيَاء بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ إِنَّ اللّهَ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ {٥١} فَتَرَى الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ يُسَارِعُونَ فِيهِمْ﴾ المائدة: ٥١ ــ ٥٢.

---

[1] / الخطيب، باسناد حسن ، ت :٤٦٩ .
[2] / ابو داود ، ت : ٤٧٠ .
[3] / لەکتێبی (الفروق) دانانی قراق .
[4] / لەکتێبی (مراتب الاجماع) دانانی: ابن حزم .

له وه‌لاّمدا ده‌لّێین: ئه‌م ده‌قه قورئانیانه شێوازێکی ره‌هایی له‌خۆنه‌گرتووه ، و هه‌موو یه‌هودو گاورو بێباوه‌ڕێك ناگرێته‌وه، گه‌ر له‌وه تێگه‌یشتیت ئه‌وا روو به رووی چه‌ند ئایه‌تێك ده‌بیته‌وه كه هانمان ده‌دات بۆ خۆشه‌ویستی كۆمه‌لّی چاكه له هه‌ر ئاینێك دابن و رێگه‌ی به بواری هاوسه‌رێتی داوه وه‌ك ده‌فه‌رموێت : ﴿وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً﴾ الروم. ١

وه‌ده‌رباره‌ی گاوره‌كان ده‌فه‌رموێت: ﴿وَلَتَجِدَنَّ أَقْرَبَهُمْ مَوَدَّةً لِلَّذِينَ آمَنُوا الَّذِينَ قَالُوا إِنَّا نَصَارَى﴾ المائدة: ٨٢.

ئه‌و ئایه‌تانه بۆ كۆمه‌لّێك هاتوون كه دژایه‌تی ئیسلام ده‌كه‌ن، كه‌واته نابێت موسلّمان هه‌ولّی سه‌ركه‌وتن و ده‌رخستنیان بدات كه مانای (مـوالاة) به‌رجه‌سته ده‌كات‌و نهێنی‌یه‌كانی خۆی بخاته ژێر ده‌ستیانه‌وه خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَتَّخِذُوا بِطَانَةً مِنْ دُونِكُمْ لا يَأْلُونَكُمْ خَبَالاً وَدُّوا مَا عَنِتُّمْ قَدْ بَدَتِ الْبَغْضَاءُ مِنْ أَفْوَاهِهِمْ وَمَا تُخْفِي صُدُورُهُمْ أَكْبَرُ قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ الآيَاتِ إِنْ كُنْتُمْ تَعْقِلُونَ هَا أَنْتُمْ أُولاءِ تُحِبُّونَهُمْ وَلا يُحِبُّونَكُمْ﴾ آل عمران: ١١٨ ــ ١١٩ .

له‌م ئایه‌ته‌دا سیفه‌تی ئه‌و كه‌سانه‌مان بۆ روون ده‌كاته‌وه كه رق‌و دوژمنایه‌تی به‌رامبه‌ر به موسلّمانان له‌دلّیاندا چه‌كه‌ره ده‌كات‌و شوێنه‌واری له‌سه‌ر زمانیان به‌ده‌ر ده‌كه‌وێت.

خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێت: ﴿ لا تَجِدُ قَوْماً يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ﴾ المجادلة : ٢٢، ئایه‌تی كۆتایی مناقشه‌و قسه وتن له‌سه‌ر ئیسلام و ده‌رباره‌ی خواو پێغه‌مبه‌ر نه‌ك هه‌ر بێ باوه‌ڕی‌یه به‌لّكو ده‌ربڕینی ناحه‌زی‌و دوژمنایه‌تی به‌رامبه‌ر ئیسلام‌و موسلّمانان.

هه‌روه‌ها فه‌رموویه‌تی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاءَ تُلْقُونَ إِلَيْهِمْ بِالْمَوَدَّةِ وَقَدْ كَفَرُوا بِمَا جَاءَكُمْ مِنَ الْحَقِّ يُخْرِجُونَ الرَّسُولَ وَإِيَّاكُمْ أَنْ تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ رَبِّكُمْ﴾ الممتحنة:١.

ئه‌م ئایه‌ته بۆ پشتگیری بێباوه‌ڕه‌كانی مه‌ككه به‌رامبه‌ر به‌خواو پێغه‌مبه‌ر ﷺ هاته خواره‌وه، كه موسلّمانه‌كانیان له مالّه‌كانیان وه‌ده‌ر ئه‌كرد، له‌به‌رئه‌وه‌ی ده‌یانووت خوامان (الله) ه ، بۆیه ئه‌وجۆره كه‌سانه نابێت خۆشه‌ویستی و نزیكایه‌تیان له‌گه‌لّدا پته‌و بكرێت، له‌گه‌لّ ئه‌مه‌شدا قورئانی پیرۆز له‌هه‌مان سووره‌تدا ده‌فه‌رموێت: ﴿عَسَى اللَّهُ أَنْ يَجْعَلَ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ الَّذِينَ عَادَيْتُمْ مِنْهُمْ مَوَدَّةً وَاللَّهُ قَدِيرٌ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ ﴾ الممتحنة : ٧

ئـەم ئایەتـە ئاگادارمـان دەکاتــەوە لەدوژمنایـەتی ، ئاشـکرا وەك لــە فەرموودەیەکدا هـاتووە (أبغض عَدُوك هَوناً ما عسى أن يَكُون حَبِيَبــكَ يَومــاً مــا)[1] بـا بەرامبەر دوژمنەکەت رقت نەبێت نەوەك رۆژێك ببێتە دۆستت.

وەزیاتر جەخت لەسەر حەرامی ئەو نزیکایەتی‌یە دەکات بەتایبەتی بەهێز بوون و جێگەی هیـواو مەترسـی بـوو چونکە ئەو کاتە زۆر لە دووڕووەکـان ئیمان لاوازەکـان هـەوڵی قۆسـتنەوەی ئـەو خۆشەویسـتی‌یە ئـەدەن و ئەیکـەن بەچـەکی دەستیان خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿فَتَرَى الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ يُسَــارِعُونَ فِــيهِمْ يَقُولُونَ نَخْشَى أَنْ تُصِيبَنَا دَائِرَةٌ فَعَسَى اللَّهُ أَنْ يَأْتِيَ بِالْفَتْحِ أَوْ أَمْرٍ مِنْ عِنْدِهِ فَيُصْبِحُوا عَلَى مَــا أَسَرُّوا فِي أَنْفُسِهِمْ نَادِمِينَ﴾ المائدة: ٥٢.

﴿بَشِّرِ الْمُنَافِقِينَ بِأَنَّ لَهُمْ عَذَاباً أَلِيماً الَّذِينَ يَتَّخِذُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاءَ مِنْ دُونِ الْمُؤْمِنِينَ أَيَبْتَغُونَ عِنْدَهُمُ الْعِزَّةَ فَإِنَّ الْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعاً﴾ النساء: ١٣٨ - ١٣٩.

## پشت بەستنی موسڵمان بە ناموسڵمان

ئەشێ موسڵمان بە سەرۆك و هاوڵاتیانەوە پەنا بۆ ناموسڵمانەکان بەرێ لە بـواری هونـەر کـە پەیوەنـدی بەئاینـەوە نیـە لـە بازنـەی پزیشـکی و پیشەسـازی و کشتوکاڵ و .... گەر بەدانە پێویستی‌یە خودی‌یەکانی خۆیان جێبەجێ بکـەن، لە ژیانی پێغەمبـەردا ﷺ دەبینـین چـۆن عەبـدوڵڵای کـوڕی أریقـطی بـە کـرێ گـرت کـە موشریك بوو بۆ رێبەری لەکاتی کۆچ کردنیدا بۆ مەدینە، زانایـان دەڵێن: پێویست ناکـات گـەر کـافربوو ئـیتر متمانـەی پـێ نـەکرێت، هـیچ شـتێك لـە رێبـەری رێگـا مەترسـیدارتر نیـە، بەتایبـەت لـەو کاتەشـدا لـەوەش زیـاتر رێیـان بـە ئیمامـە موسڵمانەکان داوە کە پەنا بـۆ ناموسـڵمانەکان بـەرن، بەتایبـەت خـاوەن نامـەکان لە بواری سەربازی‌دا، وەکو موسڵمانان بەشێکیش کە غەنیمەتیان بەربکەوێت.

(الزهری) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ داوای یارمـەتی لەخـەڵکی یـەهود کردووە هـەروەها صـەفوانی کـوڕی ئومەییـە لەگـەڵ پێغەمبـەردا ﷺ بەشـداری کـردووە لـە شـەڕی حنینـدا[2] وە دەبێـت ئـەو کەسـەی داوای یارمەتی‌یەکـەی لێـدەکرێت خـاوەن بیروڕایـەکی باش بێت لای موسڵمانان، چونکە گەر جێ متمانە نەبوو نابێت پشتی پێ ببەسترێت.

[1] / الترمذي والبيهقي في (شعب الايمان)و ابوهوريرة گێڕاویانەتـەوە، والسـيوطي (الحسن) هێمـای بـۆکردووەو سەرەتاکەی (احبب حبيبك هونا ما ، عسى أن يكون بغيضك يوما ما) والبخاري في (الادب المفرد) دا لـە عەلییـەوە بـە (موقوف) گێڕاویەتیەوە ، ت :٤٧٢ .

[2] / سعيد لە سەنەدەکەیدا گێڕاویەتیەوە .

موسڵمان ئەتوانێ دیاری بۆ ناموسڵمان بنێرێ لێشی وەربگرێ هەروەك دەركەوتووە كەپێغەمبەر ﷺ پاشاكان دیارییان بۆ ناردووەو پێشی بەخشیبوون[1] (حافظ الحديث) ووتویەتی ئەو فەرموودانەی دەربارەی وەرگرتنی دیاری وتراوە لەلایەن پێغەمبەرەوە كەموسڵمان نەبوون زۆرە، (ام سلمه)ەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ پێی وت: ( اني قد اهديت الى النجاشي حلة وأوراقي من حريـــر)[2] ئیسلام رێزی مرۆڤ دەگرێت بەپێی بەها مرۆڤییەكەی خۆی چ جای لەخاوەن نامەكان بێت یان معاهدیان اهل الذمه بێت.

تەرمێك بەلای پێغەمبەردا ﷺ برا، و هەستا لەبەری پێی وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە تەرمی یەهودیەكە، فەرمووی: ئەی خاوەن روح نیە؟ بەڵێ هەموو گیاندارێك خاوەن رێزو مەكانەتی تایبەتیە لە ئیسلامدا.

## ئیسلام بەزەییەكی گشتیە بەتایبەت بۆ گیاندارانیش

چۆن ئیسلام رێ بەموسڵمان ئەدات كە خراپ مامەڵە لەگەڵ ناموسڵماندا بكات! لەكاتێكدا فەرمان بەچاكەو سۆز دەكات لەگەڵ هەموو خاوەن رۆحێكدا پێش چەند سەدەیەك لەمەوپێش ئیسلام هەوڵی‌داوە لەگەڵ گیانداراندا نەرمو نیان بین و كردوویەتی بە بەشێك لە باوەر، وە بەپێچەوانەشەوە سزاكەی ئاگرە.

پێغەمبەر ﷺ باسی ئەو پیاوە بۆ هاوەڵەكانی دەكات كە سەگێك تێرئاو دەكات، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوای گەورە سوپاسی كردو لێی خۆش بوو، هاوەڵان وتیان ئێمە بەچاكە كردن لەگەڵ گیانداراندا پاداشتمان دەست دەكەوێ؟ فەرمووی: بەرامبەر هەموو خاوەن جگەرێكی تەڕ پاداشت هەیە[3].

لەتەنیشت ئەم وێنە رووناكەوە كە بەخشندەیی خوای گەورە پیشان ئەدات پێغەمبەر ﷺ وێنەیەكی تر دەكێشێت كە باس لەسزای خوای گەورە دەكات، و دەفەرموێت: ( ژنێك چووە ناو ئاگرەوە بەهۆی بەندكردنی پشیلەیەكەوە، كە نە خواردنی ئەدایەو نە ئەیهێشت خواردن بخوات)[4].

---

[1] / احمد والترمذي ، ت : ٤٧٢.
[2] / احمد والطبراني ، ت : ٤٧٣.
[3] / البخاري ت : ٤٧٥ .
[4] / البخاري، ت: ٤٧٦ .

هەروەها عەبدوڵڵای کوڕی عەباس دەفەرموێت: نهى النبي ﷺ عن التحريش بين البهائم[1] ، پێغەمبەرﷺ نەهی لە بە شەڕدانی گیانداران کردووە تا یەکێکیان ئەوی‌تر دەکوژێت.

هەروەها (ابن عباس) گێڕاوی‌یەتیەوە: أنَّ النَّبِيَّ نهى عن إخصاء البهائم نهياً شديداً[2].

هەروەها قورئانی پیرۆز باسی سەردەمی نەفامی دەکات کە گوێچکەی گیاندرانیان هەڵئەدڕی‌و بەکارێکی شەیتانیان داناوە (النساء ۱۱۹) . وە ئەوەشمان زانی کە لەکاتی سەربڕینی هەرگیاندارێك دەبێت ئاسانترین ڕێگا بەکاربهێنرێت و ئەوەشی سەری پێ دەبڕێت دەبێت زۆر تیژ بێ وەنەهی لە سەربڕینی گیاندارێك کردووە لەبەردەم یەکێکی تردا.

هەرگیز جیهان پاراستنی گیانداری بەم شێوەیە بەخۆوە نەبینیووە کە لە ئاستێکی خەیاڵیدایە.

---

[1] / ابو داود والترمذی، ت :٤٨٠ .

[2] / البزار ت :٤٨١ .

# کۆتایی

لەم پەرتووکەدا تەنها مەبەستمان خستنە رووی لایەنی حەرامو حەڵاڵی ژیانی موسڵمانە، لەرووی هەڵسوکەوتە رووکەشەکانیەوە بەلاّم پرۆسەکانی دڵو جووڵەکانی نەفسو سۆزو ئیدارە ئەوەی ئیسلام رێی پێداوەو ئەوەشی رێی پێنەداوە وەك ( ئێرەیی‌و رق‌و کینەو خۆبەزل زانین و رووپامایی و ... حەرامی کردووە، نەبووەتە مەبەست کە لەم پەرتووکەدا هەرچەندە ئەو سیفەتە نەفسیانەی کە ئاینی پیرۆزی ئیسلام زۆر دژایەتی کردووو پێغەمبەری لە بەرەنجامە خراپەکەی ئاگادار کردووەو هەندێکیانی بە (نەخۆشی کۆمەڵگەکان) ناوبردووە.

هەموو لێکۆڵینەوە قورئانی‌و سونەتە محمدی‌یەکان وای بۆ دەچن کە سەلامەتی گیانی مەعنەوی مرۆڤ (دڵ)ە و بەبناغەی سەرکەوتنیان داناوە، بۆ تاك‌و کۆمەڵ لە دنیاو قیامەتدا ﴿إِنَّ اللَّهَ لا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنْفُسِهِمْ﴾ الرعد: ١١٠ ﴿يَوْمَ لا يَنْفَعُ مَالٌ وَلا بَنُونَ إِلَّا مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ﴾ الشعراء: ٨٨

لێرەدا پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودە بەناوبانگەکەدا کە دەفەرموێت: ( ان الحلال بين، والحرام بيّن ، وان بينهما مشتبهات من اتقاها فقد استبرأ لدينه و عرضه، ومن وقع فيها أوشك أن يواقع الحرام ، وان لكل ملك حمى وان حمى الله في ارضه محارمه ) ئینجا ماهیەت و ئەرزش دڵو ئەوەی لە دڵەوە دەرئەچێت لە پاڵنەرو مەیل‌و ویستەکان بارز دەبێت و دەبێتە بنچینەی هەڵسوکەوتی مرۆڤایەتی بەگشتی بەفەرموودەکەی (ألا وإن في الجسد مضغة إذا صلحت صلح الجسد كله وإذا فسدت فسد الجسد كله ألا وهي القلب)

کەواتە: دڵ سەرکردەی هەموو ئەندامەکانی جەستەیەو شوانی هەموو بەشەکانی‌یەتی، هەر ئەو شوانە ئەتوانێ ژێر دەستەکانی و بەرەو چاکەیان خراپە بەرێت.

وەکێشانی وەرگرتن لەلای خوای گەورە دڵو دەروونیەتی، نەك شێوەو زمان (إن الله لاينظر الى صوركم ولكن ينظر الى قلوبكم ) ( انما الاعمال بالنيات وانما لكل امريء مانوى ) ئەمە مەکانەتی پرۆسەکانی دڵو کارە نەفسی‌یەکانە لەئیسلامدا، بەلاّم لێرەدا تیشکیان نەخستۆتە سەر چونکە خراوەتە نێو بازنەی (رەوشت)ەوە لە بابی (حەرامو حەڵاڵەوە) بۆیە زانایانی رەوشت‌و تەصەوف موسڵمانەکان ئەو حەرامانەیان ناوناوە بە (نەخۆشی‌یەکانی دڵ) و (المهلكات / وێرانکارەکان) بە

واتای میکانیزمی به هیلاك بردنه له دونیادا خەسارەتمەندی و دارمان له قیامەتدا بە چوونە ناو ئاگرە ، وەلەو حەرامانەی کە خستوومانەتەڕوو تەنها لایەنی (پۆزەتیڤ) مان باسکردووە، چونکە پرۆسەی حەرام دوو جۆرە یان (محظور) کە (پۆزەتیڤ) ە یان واز لێهێنانی پێویستە کە لایەنی (نێگەتیڤ)ە جۆری دووەمیان، مەبەست نیە لە نووسینی ئەم پەرتووکەدا، ئەوەی پێویست بووە لەسەرمان ئەوە بوو کە باسی ئەو واجباتانە بکرێت کەخوای گەورە بۆ موسڵمانانی داناوە، کەواتە واز لێهێنان و کەم تەرخەمی تیایاندا بێ شك حەرامە وەداواکردن و بەدواداچوونی زانست پێویستە لەسەر هەمو موسڵمانێك بەپیاوو ئافرەتەوە.

وە هەرکاتێك موسوڵمان خودی خۆی لە تاریکاییەکانی نەزانیندا نوقم بکات ئەوا تێکەڵ بەحەرام دەبێت وەفەرزەکانی پەرستش کە نوێژو رۆژو زەکات و حەج کە پێنج روکنەکانی سەرەکی ئیسلامن نابێت موسوڵمان بەهیچ شێوەیەك بە بێ هۆ وازی لێ بهێنێت ، وە هەرکەسێکیش لێی وردبکەوێتەوە ئەوا یەکێك لەتاوانە گەورەکانی ئەنجامداوەو هەرکەسێکیش لەبەهاو نرخی کەم بکاتەوە ئەوا بازنەی ئیسلامی لەگەردن داناوە، وەدەبێت کۆمەڵگە هەرچەند ئەتوانێت هێزو توانای گەلاڵە بکات، بۆ سەر کۆمەڵگا بەگشتی و لێپرسراوان بەتایبەتی بۆیە گەر کەم تەرخەمییەك بەدی کرا ئەوا توشی حەرامییەکی گەورە بووەتەوە، ئەتوانین ئەم هەڵوێستەی کە باسمان کردو وێنە بکەین بۆ هەموو واجباتەکانیتر لەژیاندا تایبەت بێت یان گشتی، وەناڵێین ئێمە هەموو واجباتەکانیتر لەژیاندا چ تایبەت بێت یان گشتی، وەناڵێن ئێمە هەموو وردو درشتێکمان لەبواری حەرام و حەڵاڵدا لەم پەرتووکەدا باس کردووە گرنگ ئەوەیە موسڵمان بزانێت حەڵاڵ و حەرام چییە لە ژیانی تایبەتی و خێزانی و کۆمەڵایەتی بەتایبەتی ئەوانەی کە خەڵکی لە حوکم و حیکمەتەکەی بێ ئاگان یان بەچاوی رێزەوە سەیری ناکەن، وایداناوە کە رێ رووناك کردنەوەیە کە بۆ هەمووخاوەن چاوێك کە خوای گەورە نایەوێت بە شتە حەڵاڵکراوەکان دڵی خەڵکی رابگرێت ، یان بەحەرام کراوەکان تووشی دڵتەنگیان بکات، بەڵکو ئەو کارانە لە بەرژەوەندییانە رێی پێداون، وە هەموو ئەوانەی بۆ ئاسان کردوون لە ئاین و دنیایان دەپارێزیو عەقڵ و رەوشت و سامانیان و عەقڵی مرۆڤایەتیتیان بۆ دەخاتە بازنەیەکی پارێزراوەوە.

کەم و کووڕی یاسای مرۆڤایەتی لەسەر زەوی ئەوەیە کەم و کووڕی زۆر تێدایە گەر دانەرەکەشی تاك یان کاربەدەست یان پەرلەمەنتار بێت چونکە خۆیان لە بەرژەوەندی‌یەکی ماددی‌دا دەبیننەوەو دوور لەهەموو بەهایەکی ئاینی‌و ڕەوشتی هەمیشە لەنێو چوارچێوە نیشتمانی‌و قەومی‌یەکاندا بەندن.

لەسەر ئەمانەشەوە مرۆڤی نەقسی مرۆڤایەتی‌و ئارەزووەکانی تێدایە ﴿إِنَّهُ كَانَ ظَلُوماً جَهُولاً﴾ الأحزاب : ٧٢.

بۆیە هیچ جێی سەرنج نیە گەر تەشریعە مرۆڤی‌یەکان، بە گۆشە نیگایەکی تەسکەوە بۆی بڕوانرێت، و بیرکردنەوەیەکی ڕووکەشی و ماددی گەرایی‌و چارەسەرێکی کاتی تێدا بەدی بکرێت.

چونکە زۆربەی کات حەرام‌و حەڵاڵکراوەکان بەپێی ئارەزوو ڕازیکردنی مەشاعرو بیروڕای گشتی‌یە ، کە مەترسی‌یەکی گەورەی لە دوایە.

بۆ نموونە کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ڕێی بەحەڵاڵکردنی خواردنەوە داوە لەگەڵ ئاگاداربوونی بەزەرەو زیانی بۆ سەر تاك و خێزان کۆمەڵگاکەمان.

بەڵام تەشریعی ئیسلام لەهەموو ئەم کەم و کووڕی‌یانە بەری‌یەو یاسای دروستکارێکی زانا ، دانایە بەدروستکراوەکانی‌و بەوەی بەسوودە بۆیان، کە خوای گەورەیە ﴿يَعْلَمُ الْمُفْسِدَ مِنَ الْمُصْلِحِ﴾ البقرة: ٢٢٠ ﴿أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ﴾ الملك : ١٤

## ئەمە تەشریعێکی إلهی زانایە، هیچ شتێك

تەشریعی پەروەردگارێکی بەخشندەیەو ئاسانکاری بۆ بەندەکانی دەوێت ، نەك پێچەوانەکەی، کە لە دایکێك بۆ کۆرپەکەی بەخشندەترە!

ئەوە تشریعی پادشایەکی خاوەن تواناو هێزە، وشارەزای بەندەکانی، وە تایبەت نیە بەکۆمەڵێك یان تاکێك یان ڕەگەزێکەوە، چۆن کە ئەو پەروەردگاری هەموو جیهانیانە.

موسوڵمان بەم شێوەیە دەڕوانێتە حەرام و حەڵاڵەکانی پەروەردگار بۆیە نەقڵ و ئیدراکێکی بەئاگاوە وەری دەگرێت، وە بەدڵیش پێ ڕازی‌یەو یەقینی پێیەتی، هەموو ئیدارەشی لەسەر جێبەجێ کردن تصمیم کراوە، وەبڕوای وایە کە خۆشی لە دنیادا ڕزگاربوونی لە قیامەتدا بەستراوە بەپاراستنی سنوورەکانی

خوای گەورەوە بۆیە دەبێت هەمیشە هەڵویستە بکات لەبەردەم ئەم سنوورانەدا، تا خۆشیو رزگاربوونی هەردوو دنیا بەدەست بهێنێ.

با دوو نموونە بهێنینەوە لە ژیانی موسڵماندا لە سەردەمی یەکەمدا، کە چۆن ئاگاداری سنووری خوا بوون، پەلەیان لە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانیدا کردووە:

**یەکەمیان/** ئاماژەمان پێکرد لەو فەرموودەیەی کە خواردنەوە حەرام دەکات ، کە لەلایی عەرەب خواردنەوەو پەرداخو کۆرەکانیان لا گرنگ بووە، خوای گەورەش ئاگادارە بۆ سوونەتی قۆناغ بەندی بەکارهێنا لە حەرام کردنی هەتا دوا ئایەت بە تەواوەتی حەرامی کردو فەرمووی: ﴿رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ﴾ المائدة: ٩.

بەم شێوەیە پێغەمبەر ﷺ خواردنەوە کرینو فرۆشتنو بەخشینی نا موسڵمانی حەرام کردو عەرەبەکانیش هەر ئەوەندەیان لە دەست هات خواردنەوەکانیان بەکۆڵانەکاندا رشت تا جەخت لەسەر بێ تاوانی خۆیان بکەن.

سەیر لە رادەی پەیوەست بوون بەم ئایەتەوە ئەوەیە کە کۆمەڵکیان لەم کاتەدا پەرداخە ئارەقەکەیان بەدەستەوە بوو کە هەندێکیان خواردبووە هەندێکیانی تێدا مابوو، ئەوەی تێدا بوو رشتیو وەك وەڵامێك بۆ خوای گەورە وتی: ﴿فَهَلْ أَنْتُمْ مُنْتَهُونَ﴾ المائدة: ٩١ ، وتیان: کۆتایمان پێ هێنا ئەی پەروەردگار.

ئەگەر ئەم حاڵەتەمان بەسەردەمی ئێستا بەراورد بکەین کە دژایەتی کردنی خواردنەوە لە ژینگە ئیسلامی‌یەکاندا، کە ولاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا[1]. هەوڵی کەم کردنەوەی دا رۆژێك ویستی دژی ئەم حاڵەتە ببێتەوە بەیاساو سیستەمە دانراوەکان ، نەزانین کە مرۆڤایەتی بەتەشریعی ئاسمانی بێت بەرەو چاکە ناڕۆن، کە پشت بە ویژدانو باوەڕ دەبەستێت پێش هێزو دەسەڵات.

**دوەمیان:** هەڵوێستی ئافرەتە موسڵمانەکان کە تەبەرجی نەفامیانە لێ حەرام کرا، و خۆداپۆشینیان بەسەردا فەرز کرا ، ئافرەت لەسەردەمی نەفامی‌دا سنگی بە هیچ دانەپۆشرا بوو، و هەموو گەردنو قژیان بە دەرەوە بوو، بۆیە ئەم شێوازانەی لە ئافرەتی موسڵمان حەرام کرد، و فەرمانی پێکردن کە لە ئافرەتانی سەردەمی نەزانی جیا بکرینەوە بەشێوەیەك بە سەرپۆشەکانیان سنگ و بەرۆکیان داپۆشن.

---

[1] / ئەم هاوسەنگییە لەکتێبی ( الفقیه ضرورة الحیاة) دابخوێنێتەوە، لەباسی (الایمان والاخلاق) دا.

لێرەدا عائشە دایکی موسوڵمان (ڕەزای خوای لێبێ) بۆمان دەگێڕێتەوە کە ئافرەتەکانی کۆچکردوو ئەنصاریەکان چۆن بەدەم ئەم فەرمانەوە هاتن، کە جەخت لەسەر گۆڕینی شتێکی گرنگی ئافرەت دەکات لە ژیانیدا کە جوانیو جلو بەرگو خۆ گۆڕینە.

عائیشە وتی: خوای گەورە ڕەحم بە ئافرەتە کۆچکردووەکان بکات کە خوای گەورە ﴿وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ﴾ النور: ٣١، هاتە خوارەوە، جلەکانی خۆیان دڕی وسەریان پێ داپۆشی[1].

ڕۆژێکیان هەندێك ئافرەت لای دانیشتبوون و باسی ئافرەتی قورەیشیان دەکرد، فەرمووی ( إن لنساء قريش فضلاً ، وإنّ والله ما رأيت أفضل من نساء الأنصار، ولا أشد تصديقاً لكتاب الله ولا إيمانا بالتنزيل ) سوورەتی نور هاتەخوارەوە ﴿ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ ﴾.

وپیاوانیش بۆ ئافرەتەکانیان دەخوێندەوەو ، هەموو پیاوێك بۆ ژنەکەی و کچەکەیو خوشكو خزمەکانی دەگێڕێتەوە، ئافرەتەکان هەموویان ئەو قوماشانەی کە وێنەی تیابوو بۆ جوانی هەڵیان واسیبوو، یەکسەر لێیان کردەوەو پێچایان لە سەریانەوە بۆ تەصدیق کردنی ئەوەی کە خوای گەورە ناردوویەتیو بەو جۆرە لە دوای پێغەمبەرەوە ﷺ بوون[2] .

ئەمە هەڵوێستی ئافرەتانی موسڵمانە لە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خوای گەورە هەڵوێستی زوو بەدەمەوە چوون و وازهێنان لە نەهیەکانی بەبێ دوو دڵی، وە وەستانو چاوەڕێ کردن، بەڵێ ڕۆژوو دوو ڕۆژ چاوەڕێیان، نەکرد، پارچە قوماشێکی نوێو باش بکڕن و خۆیانی پێ داپۆشن بەڵکو هەر قوماشو ڕەنگێك ئامادە بوایە بەکاریان دەهێنا ، وەگەر نەبووایە بەکراسەکەی خۆی بۆ ئەدڕاندو سەری پێدائەپۆشی. بەبێ گوێدانە شێوەو روخساریان ، هەروەك دایکی موسڵمانان ئاماژەی پێکرد.

لێرەدا جەخت لەسەرئەوە دەکەین کە مەعریفەی ئاڵتونیدەربارەی حەلاڵو حەرام بەس نیە، پرۆسەکانی حەلاڵو حەرام کەبەرچاوی لەموسڵمان ناشاردرێتەوە لەگەڵ ئەوەشدا زۆرێك دەکەونە نێو ئەو بەرچاوی خۆیان دەچنەناو ئاگرەوە.

---

[1] / البخاري .
[2] / ابن كثير باسی کردووە لەئایەتی النور لە ابن ابی حاتم ، ت: ٤٨٢.

کەواتە دەبێت پارێزکاری لەخوا ترسان پتەوتر بکەین، کە بەدەربڕینێکی حەدیسی نەبێت ویژدانێکی زیندوو هەبێت بۆ وەستانی موسڵمان لە سنووری حەڵاڵدا ئەو ویژدانەی سەوز نابێت لە کێڵگەی بڕوا بەخواو ڕۆژی دوای نەبێت.

وەئەگەر مەعریفەیەکی واعی بۆ موسڵمان ڕەخسێنرا سەبارەت بەحەڵاڵو حەرام لەنووری ئاینو شەریعەتەکەیدا ویژدانێکی زیندووشی هەبێت ئەوا تووشی هەموو کارێکی خێرو چاکە دەبێت ، پێغەمبەر ﷺ ڕاستی فەرمووە (اذا أراد الله بامريء خيراً جعل له واعظاً من نفسه)[1] .

با کۆتای پەرتوکەکەشمان بەم پاڕانەوەیە بەپایان بگەیەنین کە لە پێشینانمانەوە بۆمان ماوەتەوە:

( اللهُمَ أَغْنِنَا بحَلالِكَ عَنْ حَرامِكَ وَ بطَاعَتِكَ عَنْ مَعصيَتِكَ وَبفَضْلِكَ عَمَّنْ سِوَاكَ ) .

---

[1] / العراقي ئەفەرموێ: الديلمي لە (مسند الفردوس) دا بەئیسنادێکی باش گێڕاویەتیەوە ت :٤٨٣.

| عنوان | ژمارەی پەرە |
| --- | --- |



*دەروازەی یەکەم*

***دەروازەی دووەم***

*دەروازەی سێیەم*



وەرگێڕ لە چەند دێڕێکدا

ناوی مامۆستا مەلا حەمە ئەمین حەمەکەریم رەسوڵ، ناسراوە بە مەلا حەمە ئەمینی هۆمەر مەندان لە ساڵی ۱۹۲۷ ی‌زایینی لەگوندی **رەشان** سەر بە قەزای پێنجوێنی چاوی بە دنیا هەڵهێناوە لەتەمەنی ۸ ساڵیدا نراوەتەبەر خوێندن و، هەر لەسەرەتای تەمە نیەوە شەیدای قورئان و زانستە شەرعیەکان بووە،و لە خزمەتی زور لە زانایانی ناوچەکەدا خوێندوویەتی، وەکو مامۆستا مەلا شیخ خالید و مامۆستا مەلاعبداللەی ملا سلیمان و مامۆستا مەلا فیض الله و مامۆستا مەلا شیخ توفیق و مامۆستا مەلا شریف ومامۆستا مەلا عبدالرحیمی پەرخی و مامۆستا مەلا محمدی مەلا بها و چەندەهای تر...

لە ساڵی ۱۹٤۷ ی‌زایینی ئیجازەی عیلمی وەرگرتووە و، لەتەمەنی مەلایەتیدا لە زۆر ناوچەی جیاجیای کوردستاندا خزمەتی زوری بە قوتابیانی علومی شەرعی کردووە و، چەندەها مامۆستای بە توانا و شارەزا لەسەردەستی تێگەیشتون تائێستا چەند بەرهەمێکی نوسیوەو وەرگێراوە، کەئەمەیان یەکەم بەرهەمیەتی کە بە چاپ گەیشتووە. ئومێدی سەرکەوتن و بەرەکەت بۆ مامۆستا و تەمەنە پیرۆزەکەی دەخوازین

ئێوەش هەر خۆش بن...


ISBN 964-356-269-7
9789643562694